دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

● ڕێبازە ئەدەبییەکان

● نووسینی: هـیمـداد حـوسـێن

● نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جمال ڕواندزی

● بەرگ: هۆگر سدیق

● سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات

● ژمارەی سپاردن: ٣٥

● نرخ: ٥٥٠٠

● چاپی یەکەم : ٢٠٠٧

● تیراژ: ٢٠٠٠

● چاپخانە: چاپخانەی دەزگای ئاراس (هەولێر)

زنجیرەی کتێب (٢٠٨)





ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com


تێبینی:

وێنەکانی ناو ئەم کتێبە بێجگە لە تابلۆکانی تایبەت بە کتێبی، هەموویان لە ئینتەرنێتەوە وەرگیراون.

## ئەم بەرهەمە پێشکەشە بۆ

**ئەو مامۆستا و نووسەرانەی حەرفێکیان لێوە فێربووم.**

**قوتابی و خوێندکارەکانم، ئومێدمە لە من باشتر بن...**

**نووسەر**

# پێرست

## پێشـــەكی

لە ساڵی( ١٩٩٥ )ەوە ، كە وەكو مامۆستای بەشی كوردی لە زانكۆی سەلاحەدین دەست بەكاربووم ، گەلە جاران لە وتنەوەی بابەتی ڕێبازە ئەدەبییەكاندا خوێندكارەكان كێشەیان ئەوە بوو ، كە داوام لێدەكردن لەم رووەوە سەرچاوە بخوێننەوە و بە تایبەتی بە زمانی كوردی ، كتێبخانەی كوردیی زۆر هەژار بوو، من لە كاتی خوێندنەوەدا چەندین سەرچاوەم بە زمانەكانی عەرەبی و فارسیی و كەم كەمەش بە ئینگلیزی بەرچاو دەكەوت ، ئەوە بێجگە لە هەوڵی برادەران بە زمانی كوردی وەكو كتێب یان نامیلكەو وتار و لێكۆڵینەوەی نێو رۆژنامە و گۆڤارانم كەم و زۆر خوێندۆتەوە، ئەم كتێبەی بەردەستتان پوختەی ئەم خوێندنەوانەی منن، هەندێكی لە كتێبان وەرگێڕراون و هەندێكی شیكردنەوە و لێكدانەوەی خۆمن ، بەڵام دوای ئەو ساڵانە ئەورۆ لە بۆ من گەلە زەحمەتە بتوانم هەموو ئەو سەرچاوانە و ژمارەی لاپەڕەكانیان دروست یادداشت بكەمەوە، پێم باشبوو لەگەڵ باسكردنی ئەو ڕێبازانەدا كەم تا زۆرێكیش باسی رەنگدانەوەی ئەو ڕێبازانەو كاریگەرییان بەسەر ئەدەبی كوردییەوە دیاریی بكەم، هەرچەندە ئەوە لە هەوڵی تاقە كەسیی بەدەرەو كاتێكی زۆریشی دەوێ، بەڵام دیسانەوە لەو شوێنانەی پێویستی كردبێت ، ئاماژەم بۆ كردووە ، لە كۆتایی و ناوەڕاستی كتێبەكەشدا چەند ساڵێك لەوە پێش هۆنراوە و درامای هەندێ لەو نووسەرە رۆژئاواییانەم كردبووە كوردی وەكو نموونەی بەرهەمی ئەوان جارێكی دی هەندێكیانم چاپكردۆتەوە.هیوادارم وەكو سەرچاوەیەك لە كتێبخانەی كوردی هەم بۆ خوێندكارەكانمان و هەم بۆ خوێنەران سوودی هەبێت.

**پ.ی.د.هیمداد حوسێن**



## مێژووی ڕێبازە ئەدەبییەكان

مێژووی دەركەوتنی ڕێبازە ئەدەبییەكانی ئەوروپا ئەوەندە كۆن نییە ، دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای چەرخی نوێ ، لەگەڵ دەركەوتنی ئەدەبی نەتەوەیی لە ئەوروپای ڕۆژئاوا یان بە واتایەكی دی بلێین دوای سەردەمی بووژانەوە " ڕێنیسانس " ی ئەوروپا ، كە میللەتانی ئەوروپا كەوتنە دانانی وڵاتانی نەتەوەیی و ئەدەبی نەتەوەییان لە ئینگلتەرا و فەرەنسا و ئیسپانیا . سەرەتای ئەو ڕێبازە ئەدەبییانەش بە ڕێبازی كلاسیك دەستی پێ كرد ،كە توانی گۆڕانكارییە مێژوویی و كۆمەڵایەتی و ئەدەبییەكانی ئەو میللەتانە بنوێنێ . پاشان ڕێبازە سەرەكیەكانی دی وەكو ڕۆمانسیزم و ڕیالیزم هاوشانی حاڵەتە دەروونی و فیكرییەكانی ئەو میللەتانە بەرەو پێشەوە چوون . كەوابێ لێكۆڵینەوەی مێژووی ئەدەبیاتی هەر یەكێك لەو نەتەوانەی ئەوروپا بە بێ لێكۆڵینەوە و ڕەوتی بەرەو پێشەوەچوونی ڕێبازە ئەدەبییەكان مەحاڵە . ناوەڕۆكی ئەو بزووتنەوە مێژووییە " ڕێنیسانس " خاڵی وەچەرخانێكی گەورە بوو لە تێكشكاندنی ڕۆشنبیریی و كلتووری دەرەبەگایەتی – كڵێسا و لە جێگەدانانی ئەوەوە ڕۆشنبیرییەكی تازەی دنیایی و پڕ لە بەهای مرۆڤایەتی و لە هەمانكاتدا سەدەی پازدەهەم بە سەرەتایەك دادەنرێت بۆ قۆناغی بۆرژوا لە ئەوروپا و لە سەدەی شازدەهەم قۆناغی سەرمایەداری گەشەی كرد. لە نێو مێژوونووساندا ، جیاوازی بیرو ڕا هەیە دەربارەی سەرەتای سەدەی ڕێینسانس وچەمك و ناوەڕۆكی ئەم بزووتنەوە مەزنەی مێژووی مرۆڤایەتی.

( ئارنۆلد هاوزەر ) دەڵێ:

خاڵی وەرچەرخانی ڕاستەقینە لە سەدەی هەژدەهەمەوە دەست پێ دەكات. سەردەمی نوێ لە ڕاستیدا لەگەڵ سەردەمی ڕووناكبیری و بیری پێشكەوتن خوازی و پیشەسازییەوە دەست پێدەكات.

له كۆتایی سەدەكانی ناوەڕاستدا گۆڕانكارییەكی گەورەو خێرا لە كۆمەڵی ئەوروپیدا ڕوویدا، هەر لە سەدەی یازدەهەمەوە لە ناو جەرگەی ڕژێمی دەرەبەگایەتیدا، پێوەنییە سەرمایەداری نوێ ڕوو لە گەشەكردندا بوو، هۆیەكانی بەرهەم هێنای كشتوكاڵی و پیشە دەستییەكان بە هۆی دۆزینەوەی ئامێری تازەوە بەرهەمیان ڕوو لە زیادبووندا بوو، ئەگەرچی ڕژێمی دەرەبەگایەتی دەیچەوساندەوە، بەڵام زۆری بەرهەم هێنان بووە هۆی گۆڕاكاری ئابووری گەورە لە ئەوروپای ڕۆژئاوادا. بازرگانی دەرەوە لە پێشكەوتندا بوو هاوكات لەگەڵ ئەوە ژمارەیەكی زۆر لە جووتیارەكان كە بێ زەوی و هەموو هۆیەكی ژیان بوون، بوون بە كرێكاری نێو مانیفاكتۆرەكانی سەرمایەداران، واتا وورده وردە لەگەڵ كزبوونی دەستەڵاتی دەرەبەگایەتی چینێكی تازە، كە لە كۆتایی سەدەی پازدەهەمدا دەركەوت، بەرژەوەندیان لەگەڵ ڕژێمی پشوودا نەبوو ئەویش بۆرژوایە بوو. بە ماوەیەكی كەم ئەو چینە لە ئینگلتەرا گەشەی كردو كامڵ بوو. بە پلەی یەكەم هۆیەكەی دەگەڕێتەوە بۆ چینی ئەنتلیجینسیای بۆرژوا كە چینێكی ڕۆشنبیر بوون و لە هەوڵی گەشە پێكردنی ماددی و فیكریی ئەوروپی دابوون هەر ئەمانە سوودیان لە پێشكەوتنی زانستی و تیۆری فەلسەفی وەردەگرت بۆ لەبەین برنی یەكجارەكی ڕژێمی دەرەبەگایەتی. شایانی باسە، ئەو چینە ڕۆشنبیرە زۆربەیان سەر بە چینی هەژار و نەدار بوون، بۆیە جێگەی سەرسوڕمان نییە ئەدەبیات و هونەرەكانیان ڕەنگدانەوەی چینەكانیان بن. هەر لەو سەردەمەشدا بوو بۆ یەكەم جار چینی " پرۆلیتاریا " یش دەركەوت، لەو جووتیارە بێ زەویانە كە لە دەزگاكانی بۆرژواكاندا كاریان دەكردو بەشێكی بچووكی پێكهاتەی كۆمەڵایەتییان پێك دەهێنا.

## خاسیەتە سەرەكییەكانی ڕێنیسانس

١ — ئەگەرچی ڕێنسانس لە هەموو وڵاتانی ئەوروپا لە یەك كاتدا وەكو یەك دەرنەكەوتووە، بەڵام دەكرێ سروشتی مرۆڤایەتی پێ بدرێ، چونكە لە ئەنجامی ڕۆشنبیری ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا كامڵ بوو و پێ گەیشت.

٢ — پێشكەوتنی چەمكی ڕێنیسانس و خێرایی گەشەكردنی پەیوەندی بە ئابووری و پێكهاتەی كۆمەڵایەتی وڵاتەكانی ئەوروپاوە بووە، بۆ نموونە لە ئینگلتەرا بە هۆی شەڕی ناوخۆیی دواكەوتووە، هەروەها لە ئیسپانیادا دواكەوتووە.

٣ — ئەگەرچی وڵاتانی ئەوروپا لە دیاردە و ڕەگەزی ڕێنیسانسدا هاوبەشن، بەڵام هەریەكەشیان سیمای تایبەتی خۆی هەیە. بۆ نموونە لە ئەڵمانیا ( ئینسانییەكان — هیومانیزمەكان ) هەوڵی



خۆیان لە " فەلسەفەی مەسیحییەت " دا چڕكردبۆوە فەڕەنسییەكان دیراسەی یاسای ڕۆمانییان دەكرد. لە ئینگلتەرەدا خەریكی مەسەلەی فەلسەفەو جوانناسیی بوون لە بواری ئەدەب و كۆمەڵناسیی و شانۆدا.

٤ — ڕابەرانی ڕێنیسانس، بە تایبەتی لە ئیتاڵیادا تەنها پسپۆڕ نەبوون و خۆیان بەوە نەبەستبۆوە، كە پسپۆڕی تاكە بوارێك بن، بەڵكو كانگەی زانست و داهێنانی تریشیان بەسەركردۆتەوە. بۆ نموونە وێنەكێشی ناسراو لیۆناردۆ داڤینشی پەیكەرتاش و ئەدیب و ماتماتیك زان و داهێنەری زۆر ئامێر بووە خەریكی پزیشكیی بووە.

٥ — ڕابەرانی ڕێنیسانس لە قۆناغی یەكەمی پێشكەوتنیدا گرنگییەكی زۆریان بە بەرهەمی فیكری بەر لە دەرەبەگایەتی دەدا. هەر ئەوەش بوو وای لە زۆربەی خەڵك كردبوو، كە سەردەمی ڕێنیسانس تەنها بە بووژانەوەی سەردەمی ڕۆمان و گریك دابنێن.

٦ — داهێنانە زانستییەكانی سەردەمی ڕێنیسانس بە شێوەیەكی گشتی لە بەرژەوەندی بۆرژوای تازە پێگەیشتوو بوو، بە تایبەتی دروستكردنی كەشتی و زانیاری كەشناسی و فەلەكی و جوگرافی بۆ دۆزینەوەی ڕێگەی بازرگانی تازە.

٧ — ئینسانییەكان و ئایدۆلۆژییەكان بە دەست پێشكەری سەردەمی ڕێنیسانس و دامەزرێنەری ڕۆشنبیریی تازە و دنیایی دەژمێردرێت. ئەوان بەهایەكی تازەیان بە ڕۆشنبیری دنیایی و هێزی تاكە كەس لە ژیاندا بەخشی و مرۆڤیان بە سەرچاوەی هەموو شتێك دادەنا و بڕوایان بە هێزی لە بن نەهاتووی مرۆڤ هەبوو بۆ بەختەوەری بە پێچەوانەی سەردەمی پێشوو، كە میرات و پلەو پایەی كۆمەڵایەتی دەوری خۆی هەبوو.

٨ — هەموو ئەو بیروبۆچوون و باوەڕانەی لە سەردەمی ڕێنیسانسدا دەركەوتن بە سەرەتایەك دادەنرێن بۆ هاتنەكایەی ئایدۆلۆژیای بۆرژوا.

## هۆیەكانی سەرهەڵدانی ڕێنیسانس

١ — لاوازبوونی دەستەڵاتی كڵێسا، واتا ئیمپراتۆریەتی گێرمانی پیرۆز.

٢ — بووژانەوەی بیروبۆچوونی نەتەوەیی و بایەخ دان بە زمانە نەتەوەییەكان، بە تایبەتی چەند سەدەیەك بوو زمانی لاتینی لە كڵێسادا زمانی گشتی بوو.

٣ — بێ هێزبوونی ڕژێمی دەرەبەگایەتی هۆیەكی تر بوو بۆ سەرهەڵدانی ڕێنیسانس، چونكە ئەو ڕژێمە ساڵەها بوو خەڵكی دەچەوساندەوە، جۆرە ڕق و كینەیەكی تایبەتی لە دڵ و دەروونی

خەڵکدا دروست کردبوو، ئەمە بێجگە لەوەی رۆژ بە رۆژ چینی بۆرژوا کاروباری بازرگانیی و سەروەت و سامانی ئەوروپایان بە دەستەوە دەگرت.

٤ — دۆزینەوەو دروستکردنی کاغەز. لە راستیدا وەکو لە هەندێ سەرچاوەدا هاتووە مێژووی دۆزینەوەی کاغەز بۆ مێژووییەکی کۆنتر و سەردەمی چینییە کۆنەکان دەگەڕێتەوە، بەڵام لە سەردەمی رێنیسانسدا بە شێوەیەکی فراوانترو بە رێژەیەکی زۆرتر، ئەمەش بێگومان رۆڵی لە کاراکردنی بڵاوبوونەوەی خوێندەواریی و روناکبیرییدا بینی.

٥ — دۆزینەوەی قیبلەنومای دەریایی، کە بێگومان بۆ خێرایی گەشت و گواستنەوەی دەریایی کاریگەرییەکی ئابووری تایبەتی هەبوو.

٦ — دۆزینەوەی باروت، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی سوارچاکی و ئازایەتی تاک دەوری نەمێنێ، چونکە ئەوەی جاران تاکەکەس یان لەشکرکێشی بە هۆی شیر و تیر و رمەوە ئازایەتی و بەجەرگی خۆی دەردەبڕی و خۆی پێ هەڵدەداوە باروت و تۆپێك بە ساتێك دەیتوانی قەڵایەك شارێك وێران بكات.

٧ — دۆزینەوەی ئامێری چاپ لە لایەن گۆتنبێرگەوە، کە دواتر پەرەی پێدرا، خاڵێکی زۆر گرنگ بوو، ئەگەر جاران بە هۆی نەبوونی چاپ و کەرەسەکانی چاپەوە بەرهەمێکی زۆر دەفەوتان و لە نێو دەچوون، ئێستا ئەو بەرهەمانە دەنووسرانەوەو بە ژمارەیەکی زۆرترەوە بڵاودەبوونەوە، یان وەردەگێڕدران و یارمەتیدەرێکی گەورە بوون لە پەرەپێدانی کلتووری میللەتان بەناو یەکتردا و چەسپاندنی بەهایەکی مرۆڤایەتی بە ئەدەبیات و هونەر.

٨ — دۆزینەوەی کیشوەرەکان لەودیو ئۆقیانووسەکانەوە، کە بێگومان شوێنی ژیان و زانیاریی مرۆڤی بە باڵا بردو لە رووی ئابووریشەوە کاریگەریی خۆی هەبوو.[1]

## **مرۆڤخواکان** ( Humanistic – Humanisms )

دەستەواژەیەکی کۆمەڵایەتی و فیکری بوو لە سەدەی هەژدەهەمدا وەکو زاراوەیەك دەرکەوت، لایەنگرانی ئەو رێبازە نوێیە بۆیە ناوی مرۆڤ و مرۆڤایەتیان هەڵبژارد بۆ ئەوەی جەخت لە سروشتی دنیایی زانست و ئەدەب و بەها و نرخی تاکە کەس لە ژیان دابکەن. کە ساڵەها بوو کەوتبووە ژێر کۆت و بەندەی سەدەکانی ناوەڕاست. لە سیما هەرە دیارەکانی ئەو رێبازە جەختکردن بوو لەسەر شەخسییەتی تاکە کەس و مرۆڤیان بە پێوەری هەموو ئەو شتانە دەزانی، چۆن سوود لە توانای خۆی

١- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە : د.کمال مظهر احمد، النهضة، الموسوعة الصغيرة ( ٣٧ )، بغداد، ١٩٧٩.



وەربگرێ بۆ ئەوەی سوود بگەیەنێ، بەم شێوەیە مرۆڤ بووە گرینگترین رەگەزێك لە رەگەزەکانی سروشت یەکێ لە پیاوە مەزنەکانی ئەو رێبازە " لۆرێنزۆ ڤالا" بووە، زۆر بە توندی جەختی دەکرد بە مەبەستی ژیان بەختەوەرییە، بۆیە دەبێ خەڵکی چاوی تێ ببڕن، هەروەها مرۆڤایەتییەکان دەیانویست کۆمەڵ رووەو رەوشت ئاراستە بکەن، بە پێی ئەوەی کە تاکەکەس نابێ هەر ئێستای لەبەر چاو بێ و رۆشنبیری ئەو سەردەمە بێ، بەڵکو ئاوڕ لە رابردووش بداتەوە و هاووڵاتییەکی باشتر و بە سوودتر بێت، لەوەی کە هەیە رێبازی مرۆڤایەتییەکان شۆڕشێك بوو دژی کەنیسە و پاپاکانی، کە سەرپێچی دەستوورەکانی خۆیان دەکرد و لەگەڵ یاس ئایینییەکانی خۆیان نەدەگونجان، کەچی هەمیشە مرۆڤایەتییەکان مەبەستیان ئەوە بوو مرۆڤ ڕاستگۆ بێت و ئەرك و توانای خۆی بۆ خزمەتی خێر و دنیا بەکاربهێنێ.

## ئیتاڵیا و رێینسانس

لە ئیتاڵیا بە هۆی هەندێ هۆکاری مێژوویی بەر لە وڵاتانی تری ئەوروپا سیما دیارو پێگەیشتووەکانی رێینسانسی تیا دەرکەوت، رۆشنبیریی هونەریی بۆ یەکەمجار لەسەر شانۆی ئیتاڵیا دەرکەوت، چونکە ئەو وڵاتە لە رووی ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە لە پێش وڵاتانی ترەوە بوو، بۆیە نوێ بوونەوەی ژیانی ئابووری لەوێ لە گەشەدا بوو، بواری گواستنەوە و پارەو پووڵ بە هۆی شەڕی خاچییەکانەوە لەوێ رێکخراو بوو و یەکەم سیستەمی بانقی لە ئەوروپا لەوێ دەرکەوت. بەمەش چینی ناوەڕاست لە دانیشتوانی شارەکان بەر لە وڵاتانی تر لەوێ رزگار بوون، ئەمە سەرباری ئەوەی رژێمی دەرەبەگایەتی و سوارچاکی هەر لە سەرەتاوە لەو وڵاتەدا بەقەد وڵاتانی باکوور جێ پێی خۆی قایم نەکردبوو و کەلوپووری کلاسیکیش بە تەواوی لە ناوچوو نەبوو.

لە گرینگترین دەستکەوتەکانی رێینسانس، بە هێزبوونی هۆشیاری و نەتەوەیی بوو لە وڵاتانی ئەوروپا، کە ئەمەش بووە هۆی دەرکەوتنی چەندین وڵاتی نەتەوەیی. ئەمەش لە رووی سیاسییەوە، لە رووی ئەدەبیشەوە بووە هۆی پێشکەوتنی شێوەزارە ناوچەییەکان بۆ ئەوەی ببن بە زمانی نەتەوەیی لە ساڵی **١٥٣٩** لە فەرەنسا فەرمانێکی پاشایی دەرچوو بۆ ئەوەی زمانی فەرەنسی ببێت بە زمانی دادگایی و هەموو دەزگا رەسمییەکانی دەوڵەت، کە پێشتر تەنیا زمانی بۆنە ئایینییەکانی کڵێسای پرۆتستانتی بوو، ئەدەب و هونەر هەر لە سەرەتای سەردەمی رێینسانسەوە خۆی لە دوو شێوەدا دەدۆزییەوە، ئەوەش پەیوەند بوو بە کێشە و ململانێی دووبەرەی دژ بە یەکی کۆمەڵایەتی. یەکێکیان چینی دەرەبەگی کۆن بوو، کە جەنگە ناوخۆییە درێژ خایەنەکان پەکی خستبوو، ئەوی دیکە چینی بۆرژوا بوو کە لە سەرەتای رێینسانسەوە دەرکەوتبوو وەکو هێزێکی ئابووری و فیکری

سەربەخۆی بەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی ئەو کاتەدا سەپاندبوو. ئەدەبەکەش بەسەر دوولایەندا دابەش ببوو، ئەدەبێکی کۆشك و تەلار و ئەدەبێکی میللی. ئەوەی یەکەمیان هەوڵی بەهاکانی چینی ئۆرستۆکراتی کۆنە پارێز و ڕەوشتەکانی یان پیشان بدات و ئەوەی دووەمیان دەیوست هەست و نەستی بۆرژوازی و خورپە و سەربەستی دەربڕین و هێزی کەسییەتی و دەوروبەری تاکەکەس و ئاواتی کۆمەڵانی خەڵك بۆ ئاشتی و داد و خێر و برایەتی دەرببڕێت. یەکێ لە دەستکەوتەکانی تری ڕێینسانس گرنگیدان بوو بە ئافرەت هیومانیزمەکان یەکەم تێڕوانینیان بۆ تاکەکەس لە نێو کۆمەڵدا، کە ئافرەت نیوەی کۆمەڵە، دووەم پێویستی بە هەوڵی ئافرەت لە بەرهەم هێناندا بە تایبەتی لە سەرەتای سەرمایەداری، کە پێویستیان بە هێزی کارگەر هەبوو.

## بۆچی ڕێینسانس لە ئیتاڵیا بە هێز بوو

١- دەستەڵاتی بەسەر ئالوگۆڕی بازرگانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا گرتبوو.

٢ — ئیتاڵیا لانکەی شارستانییەتە کۆنەکە بوو — شارستانی ڕۆمانی.

٣ — ئیتاڵیا لە نیوەی دووەمی سەدەی پازدەهەمدا هێمنی باڵی بەسەردا کێشا بوو.

٤ — بەر لەوەی ڕێنیسانس تیشکی بەسەر ئەوروپادا پەرش بکاتەوە بە چەند سەدەیەك ئیتاڵیا بووە مەڵبەندی کەنیسە.

٥- پەرەسەندن و نەشونماکردنی پیشەسازی لەم وڵاتەدا تەنها لە شاری ڤینیسیادا ژمارەی ئەو کرێکارانەی لە پیشەسازی چنیندا کاریان گەیشتە ١٦ هەزار و لە پیشەسازی کەشتی دروستکردندا ژمارەیان خۆی لە ( ٦ ) هەزار کرێکار دەدا.

## رابەرانی ڕێنیسانس

### ١- دانتی ١٢٦٥ — ١٣٢١ ز:

دانتی ئەلیجێری لە فلۆرەنسا لە ئیتاڵیا لە ساڵی ١٢٦٥ زاینی لە دایك بووە و لە ساڵی ١٣٢١ زاینیدا کۆچی دوایی کردووە لە هەرەتی لاویدا بەشداری کۆڕی سیاسیی شارەکەی کردووە و لەگەڵ کۆمەڵی بەرهەڵسکارانی ئەو کاتەی شارەکەیاندا بووە، بۆیە نەفی کراوە و ماوەیەکی زۆر دوور لە شارەکەی خۆی ژیاوە. پاشان بەدەسخەتی خۆی تۆبەی کردووە، بەڵام سوودی نەبووە تاوەکو لە غەریبیدا لە شاری ریڤاندا مردووە. بە گوتەی زۆر لە شارەزایانی ئەدەب و مێژوو بە ڕابەری یەکەمی سەردەمی ڕێنیسانسی لە قەڵەم دەدەن و بە ڕۆشنبیرێکی گەورە و خاوەن هەستێکی بەرزی



دادەنێن. دانتی یەکەم کەس بوو بە کردار ئەوەی سەلماند، کە زمانی نەتەوەیی ڕێگەیەکە بۆ زیاتر داهێنانی ئەدەبی لای ئەدیب. بۆیە داوای کرد زمانی ئیتاڵی ببێ بە زمانی ئەدەب، کە پێشتر زمانی لاتینی زمانی ئەدەب و نووسین بوو، کە ئەوانیش لە کڵێساکان، ژمارەیەکی کەم لەوانەی ئەو زمانەیان دەزانی پێیان دەنووسی.



**کۆنترین وێنەی چاپی دانتی لە ساڵی ١٥٦٣ز لە لاپەڕەی یەکەمی (کۆمیدیای یەزدانی ) دانتی ئەلیگێری چاپی شەهرۆنیز، ئیتالیا، دەزگای** Sessa di Venezia **ساڵی ١٥٦٤.**

لە سەرەتادا باسێکی بەناوی " دەربارەی زمانی میللی " نووسی، ئەم باسەی بە زمانی لاتینی نووسی بۆ ئەوەی سەرنجی ئەوانەی پێ ڕابکێشێ، کە بە لاتینی دەنووسن، دەکرێ زمانی ناوچەیی بکرێ بە زمانی نووسین، کە تیایدا بەراوردی زمانی ڕۆمانی و شیعری ڕۆمانی دەکات و بە وتارێکی زمانەوانی گرنگ لە قەڵەم دەدرێت. دانتی، زمانی میللی بە " نانی جۆ " لە قەڵەم دەدا، لەو ڕوانگەی، کە هەژارەکان بە ژمارە زۆرن ئەو نانە دەخۆن و زمانی لاتینی بە نانی گەنم، کە ژمارەیەکی کەم، لە سەرمایەداران دەیخۆن. دانتی یەکەم نۆبەرەی ئەدەبیی خۆی بەناوی " ژیانێکی نوێ La vita nuova" بڵاوکردەوە، کە بە زمانی ئیتاڵی نووسیویەتی. ئەم بەرهەمە کۆمەڵێ شیعر و پەخشانە بۆ خۆشەویستەکەی " پیاتریس پۆرتیناری " نووسیوە. لە بەشی یەکەمیدا ئەو شیعرە دڵداریانەیە، کە بۆ خۆشەویستەکەی نووسیوە و بەشی دووەمی بە بۆنەی کۆچی دوایی خۆشەویستەکەی نووسیوە و بە پەخشان دەری بڕیوە.[2] لوتکەی داهێنانەکانی دانتی خۆی لە بەرهەمە بەناوبانگەکەی (کۆمیدیا ) دا دەدۆزێتەوە، کە پاشان بە(کۆمیدیای یەزدانی La Divina Commedia) ناوبانگی دەرکرد [3]، کە ئەویش لەو کتێبەوە سەرچاوەی گرتووە. ئەم بەرهەمە بە مرواری زمانی ئیتاڵی و بە تایبەتی شێوەزاری تۆسکانی دادەنرێت و نووسەر تیایدا پەند و قسەی نەستەق و نموونەی مێژوویی زیندوویی میللەتەکەی دەربڕیوە و کتێبەکەی لە سێ بەش دایە :

١ – دۆزەخ INFERNO.

٢ – پاکژگە PURGATORIO.

٣- بەهەشت PARADISO.

ئەم بەرهەمە ئەدەبییە مەزنە لە (١٠٠) سروود پێکهاتووە و هەر بەشێکی (٣٣) سروودە و سروودێکیشی لە سەرەتادا بۆ زیادکردووە و بووە بە سەد سروود. ( کۆمیدیای یەزدانی ) سروشتێکی ئایینیی هەیە، بەڵام نکۆڵی لەوە ناکرێ، کە گەورەترین ڕەخنەیە لە پیاوانی ئایینی و کەنیسە و پاپا. دانتی لە سروودی یەکەمدا، باس لە چاوچنۆکی پیاوانی کڵێسا دەکات. لە

---

٢- بڕوانە: دانته الیگیری، زندگانی نو، برگردان فریده مهدوی دامغانی، مؤسسة نشر تیر، چاپخانه رامین،اهواز، ١٣٧٦.

٣- دانته الیگیری، کمدی الهی، ترجمة از متن ایتالیائی، با مقدمة و شرح و حواشی، از شجاع الدین شفا، چاپ چهاردهم، مؤسسة انتشارات امیر کبیر، تهران،١٣٨٤.(٣ جلد).



سروودەکانی دواتریش لە ناوەڕاستی ئاگری دۆزەخدا تووشی پاپاکان دەبێت لە پاڵ ئەوانەی، کە لە ژیاندا تاوانیان ئەنجامداوە.

بە پێچەوانەی ئەوەش ڕێزی زانا و فەیلەسووفە وەسەنێەکان دەگرێت، کە خزمەتی گەل و کۆمەڵیان کردووە، بە تایبەتی لە قۆناغی ناوەند دا، لە پاکژگە یان بەرزەخدا پێیان دەگات، هەر لەو بەشەدا (دانتی) زۆر باسی عیشق و سەرچاوەی عیشق لە دەروونی مرۆڤدا دەکات و خەفەت بۆ چارەنووسی خەڵکانی ڕژدو قرچۆك دەخوات و هەروەها باسی توانای سروشتی و خۆڕسکی مرۆڤ دەکات لە سروودی هەژدەمدا وەها دەست پێدەکات : ڤەرجیلیۆ لە لێدوانی پێشوو بووەوە، ئینجا دانتی پرسیاری عیشق وەکو سەرچاوەی هەمووکردەوەیەکی چاك و خراپ لێکرد. ڤەرجیلیۆ وتی : دەروون خۆی وەك خۆشەویستی خۆڕسك لە بنیادەمدا هەیە و تەنیا بە بابەتی عیشق دەتوانێ سوکنایی بدات، هەموو عەشقێکیش خۆی لە خۆیدا باشە.)[4] دواتر بەم شێوەیە دانتی بەردەوام دەبێت و تا دەگاتە: (زانیاری و ئارەزووەکانی سەرەتایی غەریزەیەکە لە هەموو مرۆڤێکدا هەیە هەروەکو غەریزەی هەنگ بۆ دروستکرنی هەنگوین ئەمە شایستەی ستایش یان لۆمەکردن نییە.) [5] ئەمەش بەڵگەی زاڵبوونی هەستی مەسیحییەتی دانتی دەسەلمێنێ، لە هەمانکاتدا زەوی بە دۆزەخ دادەنێت. لەو ڕۆژەوەی کە ئادەم و حەوا سێوەکەیان خوارد، زەوی بەختەوەری تیا نییە و داد و یەکسانیی تیا بەدی ناکرێت.

( کۆمیدیای یەزدانی ) یەکەمین چیرۆکە، کە ناوەرۆکێکی نیشتمانیی قووڵ و هەستی نەتەوەپەروەری ئیتاڵی دەربڕێت.

نووسەرەکەی خەونی بە یەك پارچەیی خاکی ئیتاڵیا و زاڵبوون بە سەر شەڕو ناکۆکییە ناوەخۆییەکان و ڕەتکردنەوەی دەسەڵاتی دنیای پاپاکانەوە دەبینی. ئەم بەرهەمەی دانتی، کە خۆی ناوی ناوە (کۆمیدیا)، پاشان لە دوای خۆی ئەوانەی، کە زۆر بە بەرهەمەکەوە سەرسوڕمابوون بە هۆی بەرزی بیرویۆچوون و جوانیی گوزارشت و بەرزی زمان و وەسف و

---

٤- دانتی الیجییری،الکومیدیا الالهیة، المطهر، ترجمة حسن عثمان، ط ٢، دار المعارف بمصر، ١٩٦٩، ص٢٤٧.

٥- دانته الیگیری، کمدی الهی، برزخ، ترجمة از متن ایتالیائی، با مقدمة و شرح و حواشی، از شجاع الدین شفا، چاپ چهاردهم، مؤسسة انتشارات امیر کبیر، تهران،١٣٨٤،ص٨٠٦.

وردبینی دانتییەوە، وشـەی (یەزدانی )یان بۆ زیاد کرد، بەو پێیەی گەیشتۆتە حاڵەتی ( ڕەهـا )و لە هەموو ڕوویەکەوە کامڵە و کەم و کورتی تیا نییە.

دانتی لەو گەشتەیدا لە سەرەتاوە شاعیری گـــەورەی ڕۆمـانی (ڤێرجیلیـۆ ٧٠- ١٩ پ. ز.)ی کردووە بە ڕێنوێنی خۆی، ئەم هەڵبژاردنە بۆ ڤێرجیلیۆ هەروا بە خۆڕایی نییە، لەسەر ئەو بنچینەی، کە ڤێرجیلیۆ گوزارشتی لە بۆچوونی سەردەمێکی کۆن و دەرکەوتنی تیشکی زێڕینی سـەردەمێکی نـوێ لـە شـیعرەکانیدا کـردووە، هـەروەها (ڤێرجیلیـۆ )لـە نـەزەری ڕابـەرانی ڕێینسانسدا نموونەی مرۆڤی سەردەمەکەی خۆی بووە، لەوەی کە باسـی مـەزنی ڕۆمانییـەکانی کردووە و خاوەنی هەستێکی بەرزی مرۆڤایەتی بووەو چـالاکی زۆر بـووەو خـاوەن ڕەوشـتێکی بەرزو ڕەســـەن بووە. بەم شـێوەیە دانتی (ڤێرجیلیۆ) ی کردووە بە ڕێنـوێنی خـۆی تـا بـەر دەرگای بەهەشت، کە لەوێ (پیاتریس) ی خۆشەویستی چاوەڕوانی دەکات، بـەڵام (ڤێرجیلیـۆ) لەوێ دەوری تەواو دەبێت، چونکە لە کۆمەڵێکی وەسەنی بوو، بۆیە ناکرێ بچێتە بەهەشتەوە، بە تێڕوانینی هەسـتی ئـایینی مەسـیحییانەی دانتییـەوە.هـەروەکو ئاماژەمـان پێـدا عەشـق سەرچاوەی هەوەڵ و ئاخرە لە دوا دێڕی سروودی سی و سـێیەمی (بەهەشـت)دا دەڵـێ:( ئەمـە کاری عەشق بوو،کە خۆر و ئەستێرەکانی تریش هەڵدەسووڕێنێ.)[٦]

٦- دانته الیگیری، کمدی الهی، بهشت، ترجمة از متن ایتالیائی، با مقدمه و شرح و حواشی، از شجاع الـدین شفا، چاپ چهاردهم، مؤسسة انتشارات امیر کبیر، تهران،١٣٨٤، ص١٦٣٥.





**به منی وت : ( زوو، زوو، به ئەژنۆدا بکەوە، ئەوە فریشتەی خودایە دێت.)**

**تابلۆی گۆستاڤ ڤێرە پەیکەرسازی بەناووبانگی فەڕەنسی سەدەی نۆزدەهەم**

(کۆمیدیای یەزدانی )بەڕای هەندێ مێژوونووس، بە تایبەتی (پلاسیۆس) وایە، کە دانتـی لە ژێر کارتێکەری چەند بەرهەمێکی عارەبی و ئیسلامیدا کۆمیدیاکەی نووسیوە، لەوانە :

١ — ( رساله الغفران ) ی ئەبو عەلای مەعەڕی.

٢ — (الاسراو والمعراج ) ی پێغەمبەر.

٣ – (الفتوحات المكية)ی ابن العربی[7]

بەڵام ئەمە لە گەورەیی و مەزنیی کتێبی کۆمیدیای یەزدانی کەم ناکاتەوە، چونکە لە ئەدەبی بەراوردکارییدا ئەمە بە حاڵەتێکی ئاسایی سەیر دەکرێت، کە نووسەرێك بیری یان ئیلهامی لە بەرهەمێکی تر بە زمانێکی دی وەرگرتبێت و ئەو ئەدەبە جا لە ڕێگەی هۆکاری ئایینی یان سیاسیی سنووری ئەدەبیی نەتەوەیی بەزاندبێت و بۆ سنووری ئەدەبی نەتەوەکانی دی پەڕیبێتەوە، واتا بە (جیهانیبوونی ئەدەب )، نەوەکو حسێبی (دزیی ئەدەبی) بۆ بکرێت.



**چەندین ڕۆحمان بینی ئامادەی قسەکردن بوون**

**تابلۆی گۆستاڤ ڤێرە پەیکەرسازی بەناووبانگی فەڕەنسی سەدەی نۆزدەهەم**

٧- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: عبدالمطلب صالح، دانتی ومصادره العربية والاسلامية،الموسوعة الصغيرة ( ٧ )، بغداد، ١٩٧٨، ص ٢٢- ٣٢.



## پیترارك Petrarca ١٣٠٤ – ١٣٧٤

شاعیر و نووسەرێکی ئیتاڵی بووە لە فلۆرەنسا لە دایك بووە و سەرکردایەتی بزووتنەوەی هیومانیزمەکانی کردووە. سەر بە خێزانێکی بازرگانی فلۆرەنسایی بووە، لەگەڵ دانتی بە هۆی هەڵوێستی سیاسیان لە شارەکەی خۆیان دەرکراون. یاسا و زانستە ئایینییەکانی خوێندووە و خزمەتی زۆری کڵێسای کردووەو زۆر پابەندی ڕۆشنبیریی کۆن بووەو خۆی فێری زمانی لاتینی کردووەو کەم زانای سەردەمی خۆی هەبووە، بەقەد ئەو شارەزایی لەو زمانە و ساغکردنەوەی دەستنووسەکانی بەو زمانە هەبێت. ڕەنگە بە یەکەم کەس دابندرێت، کە هەوڵی ئەوەی داوە (زانستی مرۆڤایەتی ) ڕووبەڕووی لاهوت بکاتەوە، ئەم ئەدیبە نیشتمانپەروەرە، کە خاوەن هەستێکی بەرزبووەو سەردەمی ڕۆمانەکانی بە سەردەمێکی نموونەیی مێژووی وڵاتەکەی داناوە، پێوانەی سەرەکی لای ئەو بۆ مرۆڤ ئەوە بووە، کە چەندی خزمەتی کۆمەڵ و نیشتمان کردووە، هەروەها لە سەر ڕێبازی دانتی تاکەکەسی پەیوەست کردووە بە خودی کەسەکە خۆیەوە نەوەکو لەسەر بنچینەی خانەوادەکەی، کە سەر بە چینێکە، لەبەر ئەوەش نووسینەکانی جۆربەجۆرن لە بواری مێژوو و سیاسەت و ڕەوشت و فەلسەفە دابووە.

کتێبە ناسراوەکانی ئەمانەن:

١ – گیانی بەرز

٢ – نیشتمانەکەم ئیتاڵیا

٣ – ئەفەریقا

٤ – چەند نامەیەکی بێ ناونیشان

پیترارك نەیتوانی تاوەکو کۆتایی لەسەر ئەو بیروباوەڕیانەی بەردەوام بێت و لە دوا ڕۆژانی تەمەنیدا لە گۆشەگیرییەکی تەواودا دەژیا و گەیشتە ئەو بیروڕایەی، کە تەنها ژیاندنەوەی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیی پیرۆز دەتوانێ چارەسەری کێشە سیاسییەکانی وڵاتەکەی بکات، چونکە خەونی پیترارك لە کاتی خۆیدا بۆ یەکیەتی ئیتاڵیا نەهاتە دی.

## پۆکاشیۆ Boccaccio : ١٣١٣ – ١٣٧٥

نووسەری ئیتاڵی جیۆڤانی پۆکاشیۆ لە پاریس لە خێزانێکی فلۆڕەنسی لە دایك بووە. سەرەتا لە شاری ناپۆلی دەستی بە چالاکی ئەدەبیی خۆی کرد. لە شاری ناپۆلی لای مەلیك مایەوەو حەزی لە کچە ناشەرعییەکەی (ماریا) کردووە و هەروەکو ( پیاتریسی) دانتی

و(لاورا)ی پیترارك دەورێکی کاریگەریی لە ژیانی پۆکاشیۆدا بینیوە. لە هەرەتی لاویدا گەڕایەوە بۆ فلۆرەنسا و تێکەڵ بە کاروباری سیاسی بوو، بە تایبەتی لەو کاتەدا چینی بۆرژوا لە گەشەکردندا بوو. ئەگەرچی لە پاڵ کۆمەڵانی خەڵکدا کاری نەدەکرد، بەڵام چالاکییەکانی سروشتێکی دیموکراسی و نیشتمانی قووڵی هەبوو و دەورێکی باڵای لە بڵاوکردنەوەی هەستی نەتەوەییدا بینی. لوتکەی داهێنانەکانی ئەم نووسەرە لە (دیکامیرۆن Decameron ) دا خۆی دەدۆزێتەوە. کە پێکهاتووە لە سەد کورتە چیرۆك و لە ماوەی ( ١٠ ) رۆژدا، (١٠) کەس لە باڵەخانەیەکدا، حەفت کچ و سێ کوڕی گەنج، کە لە ترسی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی کۆلێرا خۆیان حەشارداوە، دەیگێڕنەوە. ئەم کۆمەڵە چیرۆکە باس لە پاڵەوانییەتی هەندێ بازرگانی شارەکان و هەندێ چیرۆکی ئەفسانەیی و چیرۆکی میللی و هەقایەتە رۆژهەڵاتییی دەکات. پاڵەوانی ئەم چیرۆکانە هەر لە پاشا تا خزمەتکاری تیا بەدەی دەکرێت. سروشتی چیرۆکەکان گاڵتەجارییە، کارە ناشیرینەکانی پیاوانی ئایینی ڕێسوا دەکات. پۆکاشیۆ هەروەکو دانتی بۆ پاڵەوانەکان پەنای نەبردۆتە بەر ڕابردوو، بەڵکو پاڵەوانەکان نموونەی واقعی سەردەمن و زۆریشیان ژیانی کۆمەڵایەتی ئەو چینە نوێیە دەردەبڕن، کە هاوتەمەنی خۆین[٨].. لە ساڵانی کۆتایی تەمەنی خۆی بۆ ڕاڤەکردنی کۆمیدیای دانتی تەرخانکرد بۆ ئەوەی بە خوێندنەوەیەکی تازە راڤەی بکات، کە لەگەڵ گیانی سەردەمدا بگونجێت.

## ڕەخنەی سەردەمی ڕێنیسانس

لەگەڵ ئەوەدا، کە بەرهەمی سەرەکی سەردەمی ڕێینسانسیی فرەنسا لە زەمینەی ڕەخنەی ئەدەبیدا هاتنەکایەی پەیامی ناسراوی (دیبیللیە) لە (١٥٢٥-١٥٦٠ز) بوو بە ناونیشانی (لە بەرگریی و ڕازاندنەوەی زمانی فەڕەنسییدا)یە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەم لێکۆڵینەوە ئەدەبییە بە شێوەیەکی خیتابی بوو، ڕەخنەی ئەدەبی زۆربەی کات لە فەڕەنسادا لەسەر بنچینەی بیری ڕەخنەیی دامەزرابوو، هەرچەند لەبەرامبەر کەلەپووری ناسراوی (دیکارت) دا (بیردەکەمەوە، کەواتە هەم)و هەندێ لە ڕەخنەگرەکان پێڕەویان دەکردو جارجاریش بە دروشمی جۆرێك لە

٩- لە بارەی ناوەڕۆکی دیکامیرۆن بڕوانە : د.کمال مظهر احمد، النهضة، الموسوعة الصغيرة ( ٣٧ )، بغداد، ١٩٧٩،ص ٨٦ — ٩١. هەروەها بڕوانە : ول ديورانت، قصة الحضارة، عصر النهضة، ترجمة محمد بدران، مكتبة الاسرة، المجلد التاسع(١٧- ١٨)، القاهرة، ٢٠٠١، ص٥٠ - ٦١.



(هەست دەکەم، کەوابێ هەم) دەست بەکاربوونو هەروەکو دەردەکەوێت بە درێژایی مێژووییەکی درێژ (بیر) شانبەشانی (ڕەخنە) بووەو ئەدەبیاتی فرەنسیی لە ڕێگای ڕەخنەی لە(بیر) گرتووەو بوونی خۆیشی لەگەڵ ئەو ئەندێشەیەدا دۆزیوەتەوە.

پەیامی ( دیبیللیە)ش ئەڵبەتە لە ئەدەبدا پێش ئەویش، هەتا لە ڕەخنەی ئەدەبی سەدەکانی ناوەڕاستیشدا لە ئەدەبیاتی فەڕەنسیی ئەو مەسەلەیە هەستی پێکراوە، بەڵام زۆربەی لێکۆڵەرەوەکان بە یەکەمین بەرهەمی سەرەکی ڕەخنەی ئەدەبی فرەنسیی لە قەڵەمی دەدەن.

لە ڕاستیدا ئەم پەیامە بەرگریی کردنە لەو خاسیەت و بنچینانەی، کە پێر ڕۆنسار (١٥٢٤-١٥٨٥ز)و کۆمەڵی ناسراوی ئەدەبی لە پلەئیاد (حەوت کچەکەی پەروین — pleiada ) لە پەیڕەوکردنی شێوەی کۆنی یۆنانو ڕۆمان پشتیوانیان دەکردو هەر بۆیەش لەو پەیامەدا ڕەخنە لە شێوەی شاعیریی کیلمان مارۆ (١٤٩٤-١٥٤٤ز) دەگرێت، کە جگە لە بلیمەتی شاعیرانەو ڕووکردنە ئایینی پرۆتستانت هەموو بیرو بۆچوونەکانی بە تەکنیكو شێوەو ناوەرۆكو ڕووخساری سەردەمی سەدەکانی ناوەڕاست دەردەبڕی. پەیامی دیبیللیە بەرگریی لە زمانی فرەنسیی دەکرد لە بەرامبەر دەستەڵاتی لاتینی، لە ڕاستیدا هاوشێوەی پەیامی (قسەی میللی) بەرهەمی دانتی ئیتالییەو هاوشێوەی دیکەش لە ئەدەبیاتی ئیتالیدا هەیە.

(دیبیللیە) لەو پەیامەیدا ئەوە دەردەخات، کە زمانی فرەنسیی دەتوانێ بە لاسایی کردنەوەو وەرگرتنی ئەدەبی کۆنی یۆنانو ڕۆمان خۆی دەوڵەمەند بکات. ئەڵبەتە دەوڵەمەند کردنی ئەو زمانە تەنها لە ڕێگای وەرگرتنی وشەی یۆنانی و لاتینییەوە نابێت.

وەرگرتنی ئەم وشانە دەبێ لە شێوەزارە ناوخۆییەکانەوە وەربگیرێن، بەڵام زمانی شیعر بە ڕای ( دیبیللیە )بەوە دەوڵەمەند دەبێت کە لە جۆرو هونەرە باوەکانی شیعری یۆنانی سوود وەربگیرێتو بەم شێوەیە دەتوانرێت ئەدەبیاتی فەڕەنسی فراوان بکرێت و بۆی زیاد بکرێت. دەبێ ئەو ڕووخسار و تەکنیکە سادەو بازاڕیو پەیوەند بە گۆرانیو سەما لە بەرهەمی کەسانی وەکو کیلمان مارۆدا پێڕەوی لێ دەکرێت، وازی لێ بهێنرێتو ڕوو لە ژانرە بەهێزو گرنگەکانی شیعری یۆنانی و لاتینی سەردەمی کۆن بکرێت.

بێگومان پەیامەکەی (دیبیللیە ) لە ڕووی گرنگیو ڕەسەنییەوە گرنگترین بەرهەمی هونەری شیعرو مەسەلەکانی تایبەت بە ڕەخنەی سەدەی شازدەهەمی فرەنسییە، لەگەڵ ئەوەشدا چەندین بەرهەمی تر لەو سەردەمەدا هاتنەکایەوە لەوانە پەیامێك بەناوی (پێنجین Le Quintil) کە لایەنگرانی مارۆ لە بەرپەرچی دی بیللیەدا بڵاویان کردەوەو ناڕەزایی توندیان

بەرامبەر گوتەکانی ئەو دەربڕی، بەتایبەتی لەبەرامبەر ئەو قسەیەی دی بیللیەدا، کە دەیگوت زمانی فەرەنسیی بە وەرگرتن‌و خواستنی وشەی بێگانە دەوڵەمەند بکرێت بە توندی نارەزاییان دەبڕی‌و گوتیان ئەگەر ئەو قەسەیە بەرگریکردن‌و جوانکردنی زمانی فرەنسیی بێت گلەیی‌و سەرکوتکردنی زمانی فرەنسیی چ پێویست دەکات؟ سەرباری ئەوەیش ئەو ژانرە تازانەی دی بیللیە داوای دەکرد کە لە یۆنانەوە وەربگیرێت دانەری ئەو پەیامە نەفرەتی لێدەکرد لەو ژانرانە، کە هونەری شیوەن (Elegie) بوو و دی بیللیە بە چاکی دەزانی‌و ئامۆژگاری بۆ دەکرد، سەرچاوەی خەم و پەژارەیە، کەچی شیعر دەبێ وەکو وێنەکێشان ببێتە هۆی خۆش‌و شادی‌و لەو جۆرانەش وەکو (تراژیدی) کە دی بیللیە دیسان ئامۆژگاری بۆ دەکات لە ڕووی شاعیرییەوە نرخێکی ئەوتۆی نییە.

لەو بەرهەمانەی دی کە لەو سەردەمەدا هاتە ئاراوەو لە بابەتی ڕەخنەی ئەدەبیدا شایستەی ئاماژە پێکردنە هونەری شیعری (پلەتیە)و هۆنراوەی (ڤیکلن)ە لە بارەی (هونەری شیعر)ەوە، پلەتیە (Pelletier) پێڕەوی لە ڕێنوێنی‌و ئامۆژگارییەکانی دی بیللیە کردووە، بە تایبەتی لەبارەی پێویستی ڕووکردنە تراژیدیاو کۆمیدیا بە شێوەی یۆنانی ئەو بۆچوونانەی لە (هونەری شیعر)ەکەیدا (١٥٥٥ز) دەربڕیبون لە ڕواڵەتدا سوودی لە وتەی هەندێ لەو کەسانە بینیوە، کە (هونەری شیعر)ەکەی ئەرستۆیان بە زمانی ئیتاڵی شیکردۆتەوە، بە تایبەتی لەوانە لە (ئیسکالیجرۆ) سوودی بینیوە.

هەروەها ڤیکلن (١٥٣٦-١٦٠٨ز) لە هۆنراوەی (هونەری شیعر)ەکەی خۆیدا سوودی لە ڕاڤەکەرە ئیتاڵییەکان‌و تاڕادەیەکی زۆریش سوودی لە (هونەری شیعر)ەکەی هۆراس بینیوەو ئیلهامی لێ وەرگرتووە.

لە ڕاستیدا ئەو دوو بەرهەمە هەردووکیان ناساندنی شێوازی ئەنجوومەنی ئەدەبی لە پلەییادن لە بارەی شیعرو شاعیرییەوە ڕێخۆشکەرن، بۆ ئەو خاسیەت‌و بنەمایانەی ئەو ڕێبازەی بە کلاسییزم ناودەبرێت. لە مێژووی بیری ئەدەبی فرەنسیدا ئەنجوومەنی لەپلەییاد گرنگییەکی تایبەتی هەیەو بۆچی ڕێنوێنییەکانی ئەو ئەنجوومەنە بووە هۆی ئەوەی کە شیعر هەندێ خاسیەت‌و بنەمای خۆی وەربگرێت.

ئەڵبەتە بیری فرەنسیی لەو ماوەیەدا بلیمەتی دیارو بەرچاوی وەکو ڕابلێ (١٤٩٠-١٥٥٣)و مۆنتینی (١٥٣٣-١٥٩٢) لە میانەی پەخشاندا تیا دەرکەوت، هەروەکو چۆن لە شیعردا کەسانی وەکو ڕۆنسارد (١٥٢٤-١٥٨٥)و مالێرب (١٥٥٥-١٦٢٨) ڕەونەقیان پێدا،



لەگەڵ ئەوەی کە دەورەی ڕێینسانس لە فرەنسا، بە پێچەوانەی ئیتاڵیا، شتێکی ئەوتۆی شایانی سەرنج لە بواری ڕەخنەی ئەدەبییدا نەهاتە بەرهەم‌و ئەوەی کە هەشبوو لە چوارچێوەی گفتوگۆی ئەدەبی بەدەر نەبوو، زۆربەی کات شیکردنەوەو ڕاڤەکردنی هونەری شیعریی ئەرستۆ یان گفتوگۆی بۆچوونی لێکۆڵەرە ئیتاڵییەکانی سەردەمی ڕێینسانس بوو.

هەربۆیە ئەوەی، کە لەو سەردەمە لە بواری ڕەخنەی ئەدەبی فرەنسیدا باوی بوو پێوەندی بە تویژینەوەکانی دەستوور (Les Regles) بوو، زۆربەی ڕۆشنبیران لەو باوەڕەدابوون، کە شتێك بەناوی جوانیی ئایدیا (Le Beau ideal)ەوە هەیە، کە یۆنانییە کۆنەکان بۆی چوون‌و بەرهەمەکانی ئەوان ئێمەی بە دوای خۆیدا کێش کردووە، تا زیاتر لێی بکۆڵینەوە. هەتا بە یارمەتی چەند دەستوورێکی هونەری شیعرەکەی ئەرستۆ بە تایبەتی لەبەرهەمی ڕاڤەکەرەکانی ئیتاڵیایی لەبارەی ئەوەوە ئەمرۆش دەتوانرێ داهێنانی شاکاری وەکو بەرهەمی ئەوان سەرکەوتن بە دەست بێنیێ، کەسانی وەکو شاپلن (١٥٩٥-١٦٧٣)، دۆبنیاك (١٥٥٠-١٦٣٠)و ئەوانی دی لە دوو تویی پەیام‌و بەرهەمەکانی خۆیاندا ئەو مەبەستەیان بە شێوەیەك دەرخستووە کە پێویستی پێڕەویکردنی دەستوورەکانی کۆنیان لەلای هەموان بە پەسند زانیوە.

لە کۆتاییدا چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەو دەستوورانەو دەستووری بەکارهێنانیان بێگومان بووە هۆی ئەوەی بۆچوونی جیاواز لەلای شاعیران‌و نووسەرانی لێ بکەوێتەوەو لە دیباجەی کتێب‌و لە نامەگۆڕینەوەکانیاندا قڕەو ناکۆکی بکەوێتە ناوەوە.

لەو قڕەو دەمەقاڵێیانەدا دەتوانین ئاماژە بە ناکۆکی پەیوەند بە سەید ( Querelle du cid) بکەین، کە ڕیشیلیۆ وەزیری گەورەی ئەو سەردەمە لە دژی کۆرنێ بەرپای کرد، لە زۆر ڕووەوە تا ڕادەیەك لە ناکۆکی نێوان لایەنگرانی (صاحب بن عباد)و ئارەزوومەندانی (متنبي) لە ئەدەبیاتی عەرەبی دەچێت. مەسەلەکەش ئەوەبوو، کە ڕیشیلیۆ (١٥٨٥-١٦٤٢) سەرۆك وەزیرانی ناسراوی فرەنسا لە نمایشنامەی (سەید)ی بەرهەمی کۆرنێ (١٦٠٦ - ١٦٨٤)، کە لە واقیعدا قبوڵ کرابوو، هاتە دەنگو ڕیسوای کرد.

هەر بۆیە هەندێ لە ڕەخنەگرانی ناچار کرد هەروەکو ئەو لە دژی شاعیر بجووڵێنەوەو هەجوی بکەن‌و هەندێکیشیان بە بەرهەمێکی دزیاری‌و خوازراوی لە قەڵەم بدەن. کە شاعیر خۆی ئەوەی دەرخستبوو، کە لە بەرهەمێکی ئیسپانییەوە وەریگرتووە.

(کۆرنێ)ش وەڵامی ئەو ڕەخنانەی دایەوەو جەنگی بێنەو بەردە گەرم بوو سەرەنجام کەسێکی دیاریی (شیر و قەڵەم) بەناوی سکۆدەری (١٦٠١-١٦٦٨) کە خۆیشی شانۆنامەنووس بوو،

بەڵام زیاتر لە نووسیندا کارامەتر بوو لە ئامادەیی شانۆیی پەیامێکی بە ناونیشانی (چەند سەرنجێك لەبارەی سەید)ەوەی نووسیو تیایدا (کۆرنێ)ی گوناهبار کردبووو ڕەخنەی لێ گرتبوو، ئەو لەو پەیامەدا ئەوەی دیاری کردبوو، کە هەندێ نووسین وەکو کرمی درەوشاوەی شەو وان لە دوورەوە دەدرەوشێنەوە، بەڵام لە نزیکەوە لە کرمێك زیاتر نین.

شۆرەتو ناوبانگی (کۆرنێ)ش بنچینەی نییەو بە بڕوای ئسکۆدەری زۆر شتی تێکەوتووە، لەوانە بنچینەو بابەتی چیرۆکەکە خۆی شتێکی ئەوتۆ نییە، ئەمە سەرباری ئەوەی نووسەر لە زۆر ڕووەوە لەو شانۆنامەیەدا دەستوورەکانی تایبەت بە هونەری تراژیدی بەزاندووە.

هەروەها لەو شانۆنامەیەدا زۆر شیعری ناپەسەندو بێ بایەخ هەیەو بیروڕا جوانکارییەکانیشی، کە هەستی پێ دەکەی سواوو دزراون، بڵاوبوونەوەی ئەو سەرنجانە لەبارەی (سەید)ەوە ناکۆکییەکانی توندتر کردو لایەنگرانو نەیارانی خستە شەڕەوەو چەندین پارچە هەڵبەستو پەخشانیان بۆ لایەنگری کۆرنێو ئسکۆدەری نووسیو سەرەنجام بۆ داوەری لەم بابەتە کار گەیشتە (ئەکادیمیای فرەنسا) کە لەو ڕۆژانەدا تازە ڕیشیلیۆ دروستی کردبوو و پاشان (بۆچوونی ئەکادیمی لەبارەی سەید)ەوە بڵاوبووەوە کە هەندێ کەس بە شاکارێکی ڕەخنەیی دەژمێرنو هەندێکیش بە ڕەخنەیەکی ناواقیعی لە قەڵەم دەدەن. لەو پەیامەدا ئەکادیمیا هەموو بۆچوونەکانی سکۆدەری قبوڵ نەکردبوو، بەڵام زۆربەیانی پەسند کردبوو، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ڕیشیلیۆش خۆشی لەو حەکیمیەتەی ئەکادیمی نەهاتو (کۆرنێ)ش لەگەڵ دانی بەو ڕایەدا نەناو لەوە بەدوا لە پەیڕەوکردنی یاساو دەستوورەکانی ئەرستۆ وردتر بوو و زیاتر چووە ژێر باری خاسیەتەکانی ڕێبازی کلاسییزم.

ڕێبازی کلاسییزمی فڕەنسیی لە ڕووی خاسیەتو بنەماکاندا زیاتر قەرزباری بنیادنەرانی فەلسەفەی فڕەنسیی ئەرستۆو بە تایبەتی ڕاڤەکەرانی ئیتاڵی بۆ (هونەری شیعر)ە وەکو ڤیدا، سکالیگرۆو کاستلوترۆ بوو.

لەو بابەتە سەرەکییانەی کە لەلایەن ڕەخنەگر و شاعیرانی سەر بەو ڕێبازە دەخرانە ڕوو، بریتی بوو لە مەسەلەی ئامانج و مەبەستی هونەر، مەسەلەی لاسایی کردنەوەو سروشت، بەهرەو توانای شاعیر بۆ ناسینەوەی جۆرەکان، پێڕەوی‌و لاساییکردنەوەی کۆنەکان، ڕۆڵو کاریگەری (عەقڵ)و (چێژی ڕاستەقینە) لە کارو ئەرکی شاعیردا.

لەنێو هەموو ژانرەکاندا زۆربەی باس و لێکۆڵینەوەکان تایبەت بوون بە پێڕەوی ئەرستۆو ڕاڤەکەرەکانی لە بورای نمایشو هونەری شیعرەکەی ئەرستۆوە.

## دەروازەیەک

یۆنانییەکان خاوەنی ئەدەبێکی بەرزو مەزن بوون، ڕۆمانییەکان کە لە دوای ئەوانــە هــاتن ئەو ئەدەبەیان قۆزتەوە و لاسایی کارە ئەدەبییە ئینسانییەکانی ئەوانیان کردەوە پاشان بە تێپەڕ بوونی کات هەر ئەدیبێك خاسیەتی باش و توانای مانەوەی هەبوایــە ســەرنجی نــەوەکانی دوای خۆی بۆ لای خۆی ڕابکێشایە بە کلاسییزم یان کلاسیکی ناو دەبــران.. زاراوەی کلاســییزم، بــە واتای ئستول و پۆلی قوتابخانە دێت. لە ناوەڕاست سەدەی حەڤدەهەمدا ڕێبازێکی ئــەدەبی لــە فرەنسا سەری هەلدا، ئەو ڕێبازە، ڕێبازی کلاسییزم یان کلاسییزمی نوێ بوو، ئەدەبی ناوچــەیی لە ئەوروپا ڕەتدەکردەوە و تەنیا ئەدەبی کۆنی بە ئەدەبێکی بەرز دادەنا و داوای دەکرد هــەموو نووسەران لاسایی ئەدەبی گریك و ڕۆمان بکەنەوە و ئیلــهامی لێ وەربگــرن و لەســەر ڕێبــازی ئەوان برۆن، ئەدەبەکەی خۆشیان بە درێژە پێدانی ئەدەبی کلاسییزم ناو دەبرد، بەلام ئەوان زیاتر بانگەوازەکەیان تیۆری بوو، کۆمەلێکی ئەدەبی بەناوی ( لەپلەییاد)ەوە ئــەو بانگــەوازەیان بــۆ ئەدەبی کلاسییزم دەکرد. ڕابەری ڕاستەقینەی ڕێبازی کلاسییزم شاعیری فرەنــسوا دی مــالیرب (١٥٥٥ – ١٦٢٨) بوو لە سالی ١٦٠٥ ز لە سەردەمی مەلیکی فەڕەنسا هێنری چــوارەم لــە پاریس بووە شاعیری کۆشك. لێکۆلەرەوەکان ڕێبــازی کلاســییزم بەســەر دوو قۆناغــدا دابــەش دەکەن:

قۆناغی یەکەم لە ١٦٣٠ – ١٦٦٠ دەست پێدەکات کە شاعیری گەورە ( کــۆرنی ) چــەند شانۆنامەیەکی گرنگی تیا نووسی، لەوانە (السید ١٦٣٦، هۆراس ١٦٤٠ )

قۆنــاغی دووەم لــە ١٦٦٠ – ١٦٨٨ دەســت پێــدەکات. کــە چــەند ئــەدیبێکی گــەورە دەرکەوتن، وەکو (راسین) و (مۆلییێر)، کە بە هــۆی شــانۆنامە داهێنــەرەکانیان بوونــە مایــەی شانازی بۆ ئەدەبی فرەنسی و جیهانی. لە ســەدەکانی ناوەڕاســتدا چــەند میرنــشینێکی جیــاواز دەسەلاتیان بەدەستەوە بوو، کە هەریەکــەیان تــا ڕادەیــەکی زۆر ســەربەخۆیی خۆیــان هــەبوو و خاوەنی ئالا و پۆلیس و سیستەمێکی ئیداری بــوون، تەنانــەت هەنــدێکیان ســکەی پارەشــیان بەناوی خۆیانەوە لێ دابوو، بەلام شەڕی خاچییەکان بووە هۆی دەولەمەنــدبوونی ئــەو شــارانەی لەسەر بەندەرەکان بوون، بە تایبەتی شارەکانی ئیتالیا و چینی بۆرژوا دەرکــەوت. لــە ســەدەی یازدەهەم بەدواوە، میرنیشە دەرەبەگاتییەکان بۆ دەست بەسەر داگرتنی پارەو پوول و لــە پێنــاو دەولەمەندکردنی خۆیاندا کەوتنە شەڕی یــەکترەوە. لــە ئــەنجامی ئــەو شــەڕانەدا هەنــدێ لــەو



میرنیشیانە یەك خران وخرانە ژێــر دەســتەلاتی یــەك میرنــشینەوە. ئەمــە بــووە هــۆی ئــەوەی دەستەلاتێکی ناوەندی دروست ببێت.

( دەولەتی حوکمی ڕەها )، واتا پاشا دەبێتــە خــاوەنی میرنــشینەکە و ئــەوانی تــر دەبنــە پاشکۆی ئەو میرنشینە، بۆ نموونە لە ئینگلستان ڕوویدا، هەردوو خێزانی تیــۆدرۆ و لانگــستەر لە شەڕی ( دوو گول – جووتە گول ) ڕووبەڕووی یەك بوونەوە لــە ســالی (١٣٧٥ – ١٤٧٥ )، کە هەردوو خێزان هەریەکەی خاوەنی گولی خۆیان بوون خێزانی تیۆدرۆ گولی سپیان هەلدەگرت و ئەوانی تر گولی سور، لە ئەنجامدا خێزانی تیۆدرۆ ســەرکەوتن، کــە ئەلیزابێــسی شــاژن لــەو خێزانەیە، بەم شێوەیە سیستەمی حــوکمی رەهــا لــە بــەریتانیا هاتــە کایــەوە، خەلکەکــە بــە شێوەیەکی گشتی لە شەڕی ناوەخۆ بێزار ببوون، پێویستیان بە ڕزگاربوون هەبوو لەو بارودۆخە، بۆیە بە گەرمییەوە پــشتگیریان لــە دەســتەلاتی تــازە کــرد، بــێ ئــەوەی گــوێ بدەنــە جــۆری دەستەلاتەکە مادام ئاشــتی و ئاســوودەییان بــۆ دابــین دەکــات. لێــرە دژایەتیــەك کەوتــە نێــو دەسەلاتەوە چونکە پاشا نەیدەویست بۆ یەکجارەکی دەرەبەگایــەتی لــە نێــو ببــات، خــۆی لــە خێزانێکی دەرەبەگە، هەروەها نەدەبوو دژی بۆرژوازییەتیش بوەستێتەوە، چونکە ئــەوان خــاوەن سامان بوون، و پێویستی بە سامانی ئەوان بوو بۆیە جارێکیان لەگەل ئەملاو جارێکیان لەگــەل ئەولا خۆی یەك دەخست بەو پێیە لە سەدەی پازدەهەمــەوە دوو تــەوژمی جیــاواز لــە ئــەدەب دروست بوو، یەکێکیان تەوژمێکی کۆنە پارێز و ڕوو لە نەریتی کۆن بــوو لــە خزمــەتی زەوقــی ئۆرستوکراتی و پاشادا بوو. تەوژمەکــەی تریــان، تــەوژمێکی هەلــچوو، کــە لــە گــەل زەوق و چەشەی گەنجە شۆڕشگێڕەکەیدا بوو، واتا هاوسەنگییەکی نائارام لە سیاسەت و ئەدەبــدا هاتــە کایەوە. بۆرژوای ئینگلیزی بە گیانی سەرەڕۆیی ناسراوە. بۆرژوای فەرەنــسی بــە گیــانی کۆنــە پارێز ناسراوە، دەرەبەگایەتی فرەنسی بە توندوتیژی ناسراوە و دەیوست بەهــەر شــێوەیەك بێــت بگاتە دەستەلات. دەرەبەگایەتی ئینگلیزی ئارەزووی ئەوەی دەکرد، کــە خــەلك بــۆ لای خــۆی ڕابکێشێ و پارێزگاری لە دەستەلاتی خۆی بکات، پاشا پێویستی بە سامان و بــۆ بــەرێوەبردنی زلات، سامانەکەیش لە ژێر دەستی بۆرژوا بوو، بۆیە بە ناچارییەوە ڕێــی خۆشــکرد بــۆ ئــەوەی بۆرژوا نازناوی ( بەگزادە – النبیل ) وەربگرن و لە دەستەلات نزیك ببنەوە. لە دەربــاری پاشــا دوو عەقلی جودا بالا دەســت بــوون، یــەکێکیان (دەرەبەگایــەتی ) و کــە خــۆی بــە ئایینــەوە هەلواسی بوو چاوی بڕیبوو ڕابــردووی خــۆی، ئــەوەی تریــان ئــەقلێکی بــۆرژوایی دنیــایی. لــە کۆمەلێشدا هەردوولا لایەنگری خۆیــان هــەبوو، ئــەقلێکی ڕۆحــی و پەیوەنــد بــە کەنیــسەوە،

ئەقڵێکی دنیاش پەیوەندی بە بۆرژواوە. دوای ئەوەی کە چەند میرنشینێك لەناو یەك میرنشینی دەرەبەگیدا یەکخران و دەستەڵاتی حوکمی رەها دروست بوو، بێگومان ئەو دەرەبەگانەی بوونە دەست و پێوەند و پاشکۆی ئەو میرنشینە گەورەیە هەروا بە ئاسانی وازیان نەهێنا، هەمیشە لە هەوڵی ئەوە دابوون هەڵێکیان بۆ برەخسێ تاوەکو پاشا لەسەر کار لاببەن و خۆیان جێگەی ئەو بگرنەوە. ئەمەش لە ساڵی ١٥٩٧ ڕوویدا، کاتێ کۆمەڵێکیان لە شاژنە ئەلیزابیپ یاخیبوون بەلاٌم سەرنەکەوتن، هەمان حاڵەت لە ساڵی ١٧٤٠ — ١٦٤٢ ز شۆڕشی (کرۆمۆیل ) ڕوویدا و توانی شاژن لاببات و وای لێ بکات بە خاو خێزانەوە بەرەو فرەنسا ڕابکەن، پاشان لە ساڵی ١٦٦٠ بە زەبری چەك دەسەڵاتی پاشایەتی خۆی بەسەر وڵاتدا سەپاندووە و گەڕانەوەی پاشایەتی ئەدەبی دەستەڵاتی ڕەهایش گەڕایەوە ئینگلستان و ئەدەبی پێشکەوتنخواز فەرامۆش کرایەوە. بەم شێوەیە هاوسەنگییەکی نائارام لە دەسەلاٌت و ئەدەب لە ئینگلستان هەستی پێدەکرا. بەلاٌم فڕەنسا لە سەدەی شازدەهەم لە سەردەمی پاشا( هێنری چوارەم ) دا هاوسەنگییەك هەبوو لە نێوان بیری دەرەبەگایەتی و بۆرژوادا، بۆیە وڵات ئارام بوو ئەدەبیش لە گەشەکردن و پێشکەوتندا بوو، بۆیە کلاسییزم لە فڕەنسا بەر لە ئینگلتەرا دەرکەوت لە ناوەڕاستی سەدەی شازدەهەمدا ( ١٥٤٦ — ١٥٥٠ ز ) کۆمەڵێك ئەدیب و نووسەری ڕۆشنبیر دەرکەوتن، ئەمانە داوای لاسایی‌کردنەوە و فێربوونی بنەماکانی ئەدەبی کۆنیان دەکردو پێیان دەگوتن (پلێیاد— لەپلەیاد )[1]. ئەمانە حەوت شاعیر بوون، کە بریتین لە (ڕۆنسار، دێبیللیە، ریمی بیللو، جۆدیل، دۆرا، باین، بۆنتۆس، دیتیار).

ئەم کۆمەڵە دەیانویست بەر لەوەی دەست بە نووسین بکەن، فێر بن و بگەڕێنەوە سەر بەرهەمی شاعیرانی گریك و ڕۆمان پێڕەوی دەستورەکانی ئەوان و لاساییان بکەنەوە. واتا شیعر تەنیا خورپە نەبوو لای ئەو کۆمەڵەیە دەیانویست ( شاعیر بەقەد ئەوەی. کە خورپەی لە خواوەند وەردەگرێ، دەبێ لێ بووردوو بێت، سوودی ئەو لێ بووردییەش لەوەدایە کە لە بەرامبەر پیاوە مەزنەکانی بواری پێش خۆی سەردانەوێنێ، واتا گریك و ڕۆمانەکان.. دەبێ ئەوان مامۆستامان بن ) شاعیرە ناسراوەکانی (لەپلەیاد)، بریتی بوو لە (رونسار ) و ( دێبیللیە ) و ( بێرتۆ ) و ( دیبۆرت ).

١- لەپلە یێاد: ناوی حەوت کچی ئەتلەس و پەیلەوەند بووە، ئەم حەوت کچە لە بەر بێ ئومێدی خۆیان دەکوژن و دەبنە ئەستێرە.



(ئەو شاعیرانە، ئەوەی چوارەمیانی لێ دەرچێت، ئەوانی تر بلیمەت بوون لە شیعردا، ئەمە نکۆڵی لێ ناکرێ، هێزی خەیاڵیان فراوان بوو، لە داهێناندا نەترس بوون، لەوەسفدا وردبوون) بەلاٌم دیبۆرت لە وەسفدا خێرا و دەستەواژەی نەرم و نیان بوو. یەکێ لە تیۆرەکانی ( ڕۆنسار Ronsard - 1524-1585 ) ئەوەبوو، کە دەیووت ( شاعیر پەیامبەری نێوان خواو خەڵکە، بوونەوەرێکی باڵا دەستە. سەبارەت بە شیعر و چەمکی شیعر دەڵێ : شیعر لەسەر دوو کۆڵەکە دامەزراوە:




( رۆنسارRonsard - 1524-1585 )

١- سەنعەت : واتا شارەزایی لە دەستوورەکانی شیعر، بە — خورپە. بۆیە داواکردنی شارەزایی لە یاساو دەستوورەکانی شیعر بەدوای ڕۆنسار هاتە دی، کە دەیووت : ( دەبێ شیعر ڕاستییە گەورەکان پێشکەش بکات ) ئەم بیروڕایانەی رونسار لایەنگرەکانی پێش ٥٠ ساڵ لە بیروڕاکانی مالیێرب و لایەنگرەکانی بوو، کە بریتی بوون لە ( ماینار ) و ( راکان ) و ( دی مۆنتتیە ) و ( ئیڤرارند) بۆیە سەیر نییە، بیروڕای ڕۆنسار و لایەنگرەکانی سروشتی سەردەمی ڕاپەڕینیان پێوە دیار بوو، بە پێچەوانەی( مالێرب )و لایەنگرەکانی کە سروشتی ڕێبازی کلاسیکیان پێوە دیار بوو، کە دوای (٣٠ )ساڵ لە سەدەی حەڤدەهەم لە فەڕەنسا دەرکەوت. لێرەوە دەتوانین خاڵی جیاوازی نێوان رونسار و مالێرب بەوە دەست نیشان بکەین، کە شیعر لای مالێرب سروشتێکی ئاسمانی هەبوو، بە پێچەوانەی ڕۆنسار کە دەیویست لە زەوییەوە بۆ ئاسمان بەرز بکاتەوە و تایبەت بێ بە کۆمەڵی مرۆڤایەتی. هەروەها، دەیویس شیعر کات بەسەربردن وەك یارییەك بێت، بە پێچەوانەوە(ڕۆنسار)، کە دەیوت شیعر دەبێ سوودی هەبێ و ڕاستییە گەورەکان پێشکەش بە جەماوەر بکات.

## پرەنسیپەکانی کلاسییزم

١ — داواکردن لە ئەدیبان ( شاعیران ) بۆ فێربوونی دەستوورەکانی کۆن (یۆنان و ڕۆمان ).

٢ — ئەدەب لە خزمەتی دەسەڵات دابێت.

٣ — دەرنەبڕینی هەستی تاکەکەسی (ئەدیب گوزارشت لە بیروڕای خۆی نەکات، بەڵکو گوزارشت لەو ڕایە بکات، کە لە کۆمەڵدا پەسندە).

٤ — داواکردن لە ئەدیبان، کە سادەو ساکار بن ( خاکەڕا ) بن و بەرامبەر بە نەتەوەکانی پێش خۆیان ( یۆنان و ڕۆمان ) خۆیان بە بچووك بزانن، ئەمەش پێویستییەکی دەوڵەت بوو بۆ ئارامی بارودۆخ و بڵاوکردنەوەی گیانی خۆی بە نزم زانین بەرامبەر بە دەسەڵات و ڕێزگرتن لە یاسا، چونکە گەل تا ئەو کاتە ڕانەهاتبوو لە ڕێزگرتنی دەسەڵاتی ناوەندیی و یاسا.

٥ — ڕەوشت بەرزی : واتا ئەو شتانە بکرێت، کە خەڵکی تر ڕازی دەکات ئەو شتانە باس بکرێت، کە خەڵکی تر نەوروژێنێ، واتا ڕەوشتی کەسیەتی لە بەر چاو بگیرێ و باسی ئازایەتی و وەفا و ڕاستگۆیی بکرێت و بەرەنگاری کرداری ناشیرین و نابەجێ بکرێت.

٦ — هەموو کردەوەیەکی ئەدەبی دەبێ لەسەر یاساو دەستوور بەڕێوە بڕوات، کەچی بە پێچەوانەوە ئەگەر داوای ئەوە بکرێت ئەدەب پێش بکەوێت، دەبێ سەربەست بێ، نووسەر



خۆی بە دەستوور و یاساوە نەبەستێتەوە کلاسییزمەکان هەموو هەست و سۆزێکی تاکەکەسیان مەحکوم دەکرد و داوای پێڕەوی عەقڵیان دەکرد بۆ جیاکردنەوەی هەق لە ناهەق، ئەمەش لە پێناو هێمنی و ئارامی ڕژێمی سیاسیی ئەو کاتە بووە. چونکە کۆمەڵی ئەوروپا تازە لە شەڕی خاچیی تەواو بوو، بوون ئاژاوەیەکی زۆر لە گۆڕێ دابوو. ئەدەبی کلاسییزمیش وەکو پێویستییەکی ئەو قۆناغە دەرکەوت بۆ ڕێ گرتن لە ئاژاوەو سەپاندنی ئاشتی وازهێنان لە مافی تاکەکەس لە پێناو ئەرکی نیشتمانیی.

٧ — ڕوون و ئاشکرایی لە دەربڕین و دوورکەوتنەوە لەم تەم و مژ، چونکە تەم و مژ دەبێتە هاندانی ئاژاوە و کاری تاکەکەسی.

٨ — گرنگیدان بە پاك و بێگەردی جۆرەکان. (صفاء النوع ). واتا ئەگەر دراما کۆمیدی بێ، دەبێ بە تەواوی کۆمیدی بێ ئەگەر تراژیدی بێ تا کۆتایی دەبێ تراژیدی بێت و تێکەڵ بە یەك نەکرێن.

٩ — گرنگیدان بە یەکیەتی کات و شوێن. واتا زەمەن لە ٣٦ سەعات تێ نەپەڕی و شوێنیش لە چوارچێوەی شارێك نەچێتە دەرەوە، ڕووداویش دەبێ یەك لە دوای یەك بێ.

## کلاسیزم و دراما

کلاسییزمەکان لە درامادا ئەدیبیان ناچار کردبوو، کە لە سەر کۆمەڵێ دەستووری گشتی بڕوات واتا بە شێوەیەك، کە لەگەڵ قەوارەی تەختەی شانۆدا بگونجێ، چونکە شانۆگەری ناتوانێت جووڵەی زۆر بە خۆوە بگرێ. ئەگەرچی ڕووداوەکان لەسەر شانۆ پێشکەش بە جەماوەر بکرێ، بەڵام هەموو ڕووداوێك ناتواندرێت پێشکەش بکرێت، بە تایبەتی ڕووداوی سێکسی. بەڵام ڕۆمان چونکە بۆ خوێندنەوەیە، دەتواندرێ، هەموو بابەتێکی تیا دەربخرێت. بۆیە نووسەری شانۆیی دەبێ دوو مۆڵەت وەربگرێت، یەکەمیان بۆ مەبەستی بڵاوکردنەوەی بۆ خوێندنەوە. دووەمیان بۆ مەبەستی تەمسیل ( نمایش ) کردنی لەسەر شانۆ. هەر لە کۆنەوە دراما دابەشکرابوو بۆ سەر دوو بەش، لە یۆنانەکانەوە لە سەدەی پێنجەمی پێش زایینەوە،

یەکەم : تراژیدیا، لە ڕێگەی سێ شاعیرەوە ( ئەسخیلۆس و سۆفۆکلیس و یۆربیدیس ).

دووەم : کۆمیدیا، لە ڕێگەی تاکە شاعیرێکەوە، کە (ئەرستۆڤانیس Aristophanes)ە.

## کورتەیەک لەبارەی تراژیدیا

لە سەدەکانی پێنجەم و چوارەمی پێش زاییندا شیعری شانۆگەری بڵاو بووە و گەشەی کرد. بەر لەو مێژووە بە شێوەیەکی سادە لە بابەت و شێوازیدا پێشکەش دەکرا. لەو ئاهەنگانەی کە یۆنانییەکان لە جەژنەکانی"باخۆس"ی خواوەندی مەیدا دەیانگێڕا لەوکاتەوە فێری شانۆگەری بوون. هەندێ کەس لەو ئاهەنگانەدا چەند نمایشێکی جوانیان پێشکەش دەکردو گفتوگۆ لە نێوان ئەو کاراکتەرانەدات دەهاتە کایەوە، کە نیوەی سەرەوەیان لە شێوەی مرۆڤی ئاساییدا دەپۆشی و نیوەی خوارەوەیان لەشێوەی بزندا پێستەیان دەپۆشی.

ئەم ئاهەنگە سادەو ساکار و نواندنانە مۆسیقاشی لەگەڵدا پێشکەش دەکرا. وشەی"تراژیدیا"لە لە دووبەش پێکهاتووە، کە بەهەردوو بەشەکە واتای "گۆرانی بزن"دەگەیەنێت. نووسەرێکی تر پێی وایە تراژیدیاو ئەم جۆرە نواندنانە هیچ پەیوەندییەکیان بە گۆرانی و ئەو سروود و ئاهەنگانەی"باخۆس"ەوە نییە، بەڵکو لە ئەنجامی ئەو سەمایانەدا هاتۆتە کایەوە، کە لەو سەردەمەدا بەچوار دەوری گۆڕی منداڵاندا لە گۆڕستانەکاندا سازدەکرا.

لە مێژووی ئەدەبیاتی گریکیدا سێ شاعیری دیار دەورێکی کاریگەریان لە بەرەو پێشەوە بردنی سیعری تراژیدا دا بینیوە، ئەوانیش:"ئەسخیلۆس و سۆفۆکلیس و یۆربیدس"ن. تەنانەت هەندێ کەس رایان وایە سەرەتای شانۆگەری لە یۆنان لە ٤٩٠ پ. ز. لەسەر دەستی"ئەسخیلۆس "ەوە دەستی پێکردووە، کە شانۆگەری"نزاکاران"ی لەبەردەم خەڵکی ئەسینادا پێشکەشکرد. دەڵێن ئەسخیلۆس "حەفتا"تراژیدیای نووسیوە، بەڵام تەنیا"حەفت" تراژیدیای لەبەر دەستان ماوە.

لە ئاکامدا دوای ئەم قسانە دێتە سەر ئەوەی پێناسەی تراژیدیا بکات بە وردی"تراژیدیا لاساییکردنەوەی کارێکی بەرێز و بەجێیە، درێژیەکی دیاریکراوی هەیە و لە چوارچێوەی گوتەی بە پێز و چێژدا، لە چەند بەشێك پێك دێت، لاساییکردنەوە لەلایەن کەسەکانەوە ئەنجام دەدرێت و پشت بە چیرۆك نابەستێت و تیایدا ترس و بەزەیی بەرجەستە دەکرێت بۆ ئەوەی لەو جۆرە وروژانانە پاك بکرێنەوە ".

مەبەستی ئەرستۆ لە گوتەی بە چێژ و پێز، گوتەی کێشدار و ئیقاع و گۆرانییە.



## رەگەزەکانی تراژیدیا

لە تراژیدیادا هەندێ رەگەز هەن بە رەگەزی دەرەکی دەناسرێن و شاعیر هیچ پەیوەندییەکی پێیانەوە نییە، کە بریتین لە: چیرۆك، رەوشت، دەستەواژە، بیر، دیمەنی شانۆیی، گۆرانی، بەڵام ئەو رەگەزە ناوخۆییانەی، کە کاری شاعیری تراژیدییە لە خوێندنەوەی تراژیدیادا، بریتین لە: کردەوە، رەوشت، بیر، مەبەست. لە"بیر"لێرەدا بەلای ئەرستۆوە هەموو ئەو گوتانە دەگرێتەوە، کە پاڵەوانەکان بۆ دەربڕینی رایەك دەری دەبڕن.

گرنگترین رەگەزە ناوخۆییەکان، پێکهاتەی کردەوە"جووڵە"یە، چونکە تراژیدیا باس لە کەسەکان ناکات، بەڵکو باس لە کردەوە جووڵە و ژیانیان دەکات، بەختەوەری و کلۆڵییان، چونکە بەختەوەری و کلۆڵیش دەرئەنجامی کارو کردەوەکانیانن.

نووسەر لەسەرجەم ئەو تراژیدیانەدا بڕوای تەواوی بە"خواوەند" هەیەو پەنا وەبەر ئەفسانەکان دەبات و شانازی بە خاك و نەتەوەکەی خۆیەوە دەکات. پاشان شانۆگەری یۆنان بەهۆی"سۆفۆکلیس Sophocles"(دەوروبەری ٤٩٦ – ٤٠٦پ.ز.)ەوە بەرەو پێشەوە رۆیشت و ژمارەیەك ئەکتەری لێهاتووی هێنایە ناوەوە، کە شارەزاییان لە گفتوگۆ و جووڵەدا هەبوو و ژمارەی ئەکتەرەکانی گەیاندە "سێ ئەکتەر"بەپێی قسەی ئەرستۆ. دوای ئەوەیش"یۆربیدس Euripides"(٤٨٠یان ٤٨٥ – ٤٠٦پ.ز.) لە هەموویان زیاتر واقیعی بوو. ئەم نووسەرە شۆڕشێکی بەسەر خواوەند و ئەفسانەکاندا کرد، کە خەڵکی ئەسینا بڕوایان پێ بوو و پێی راگەیاندن، کە ئەم شتانە هیچی لەگەڵ ئەقڵ و لۆجیکی مرۆڤدا ناگونجێ. پاڵەوانەکانی لە واقیعی خۆیدا هەڵدەبژارد و زیاتر لە دەروونی پاڵەوانە ئافرەتەکان شۆڕدەبووەوە وەك لە پاڵەوانە پیاوەکان. زمانێکی سادەو رەوانی بەکارهێناوە.

ئەرستۆ لە کتێبی"پیوتیکا"دا پێی وایە سەرەتای تراژیدیا داستانە. ئەم رایەش تا رادەیەك راستیی تیایە، بەڵام زۆر شتیش هەن بە تەواوی لێکیان جیا دەکاتەوە. ئەرستۆ جیاوازییەکان لەم خاڵانەدا کۆدەکاتەوە:

١- داستان یەك جۆر کێش بەکار دەهێنێ، تراژیدیا چەند جۆرە کێشێك بەکاردەهێنێ.

٢- لاساییکردنەوە لە داستاندا بەهۆی چیرۆك گێڕانەوە دێتەدی، بەڵام لە تراژیدیادا بەهۆی کردارو گفتوگۆی کەسەکانەوە، یان بەهۆی جووڵەو دیالۆگ.

٣ — لە رووی درێژییەوە جیان، تراژیدیا فۆرمەکەی کورتە و هەوڵ دەدا لە جوغزێکی تەسکدا خۆی کۆ بکاتەوەو کاتێکی دیاریکراوی هەبێت، بەڵام داستان لەرووی کاتەوە درێژترەو خۆی بە زەمەنەوە پەیوەست ناکات.

## بەشەکانی تراژیدیا

**١- دەروازە"بەرکۆڵ":**

شاعیر لەوبەشەدا هەوڵ دەدات رێگە خۆشکەرێك بۆ ئەو رووداوە سازبکات، کە دەیەوێ لە تراژییاکەیدا پێشکەشی بکات، ئەم بەشە لە رێگەی یەك ئەکتەرەوە پێشکەش دەکرێت و هەندێ جاریش لە شێوەی دیالۆگی نێوان دوو ئەکتەرەوە نمایش دەکرێت.

ئەرستۆ دەربارەی ئەم بەشە دەڵێت: بەشێکی سەربەخۆیەو دەکەوێتە پێش دەرکەوتنی کۆراڵ.. هەندێ رەخنەگر دەڵێن: ئەمە پێشەکییە و دەروازە دواتر دێت، واتا دەروازە بەلای ئەوانەوە بریتییە لە دەرکەوتنی کۆراڵ لەسەر شانۆدا، کە سەرەتا دێت پارچە سروودێکی کورت یان درێژ لەسەر ئیقاعێکی خێرا هاوشان لەگەڵ هەنگاوی کۆراڵەکە پێشکەش دەکرێت.

**٢- فەسڵ"پارچە":**

ئەم بەشەیش لە تراژیدیادا بەشێکی سەربەخۆیە، دەکەوێتە نێوان دوو سروودی تەواو لە سروودەکانی کۆراڵ، کە تیایدا رووداوەکانی شانۆگەرییەکە بە شێوەی پارچە پارچەو بە گفتوگۆ نمایش دەکرێت، جا ئەو گفتوگۆیانە درێژ یا کورت بن، هەروەکو لە شانۆگەری نوێدا ناوی"فەسڵ"ی لێنراوەو و گۆڕانی"کوڕاڵ"یش بە وەستانی نێوان هەردوو فەسڵی جیاواز لە قەڵەم دەدرێت.

ژمارەی فەسڵەکان لە شانۆگەرییەکەوە بۆ شانۆگەرییەکی دی دەگۆڕێ. زۆربەی شانۆگەرییەکانی ئەسخیلۆس بریتی بوون لە سێ فەسڵ، بەڵام شانۆگەرییەکانی سۆفۆکلیس و یۆربیدس چوار فەسڵ بوون.

بە شێوەیەکی گشتی شانۆگەریی یۆنانی لە هیچ کات و سەردەمێکدا لە پێنج فەڵ زێتر نەبووە.



**٣- دەرچوون:**

بەشێکی سەربەخۆی تراژیدیایە. ئەوبەشەیە، کە ئیتر سروودی کۆراڵی بەدوادا نایەت. لە دوای وەستان"بۆشایی"کۆتایی دادێت، کە ئەمە کۆتایی تراژیدیایە.[٢]

## راستیی لە تراژیدیادا

بیری فەلسەفی جگە لەوەی، کە مەودای هونەر فراوان دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا ئاسۆی نوێ دێنێتە کایەوە بۆ سەر لەنوێ دارشتنەوەی، لەگەڵ ئەوەی، کە تاوەکو زیاترگفتوگۆی لەسەربکرێت دوژمنایەتییەك لە بەینی هونەر و فەلسەفەدا دێتە کایەوە. یەکەم روو بەرووبوونەوە لە نێوانیاندا، کە رویدا ئەوەبوو، یان کێشەی بنجی ئەو ناکۆکییە ئەوەبوو کە تاوەکو ئێستا لەگەڵ ئێمەشدا بەردەوامە، لە دەوری ئەم پرسیارەدا دەسورێتەوە:- ئایا هونەری ئەدەبی بە شێوەیەکی گشتی و شانۆ بە شێوەیەکی تایبەتی، توانای هەیە، کە پڕوپاگەندە بۆ راستی و حەقیقەتی خۆی بکات؟. گومان لەوەدا نییە، کە ئەمە بەسەر هەموو ئەو تیۆریانەدا دەچەسپێ، کە فەلسەفین و لەبارەی ئەدەبەوەن، ئەگەرچی ئەم تییۆریانە جەخت لەسەر قسە دەکەن یان لەسەر دەربڕینی سەربەست دەکەن و پێویستە راڤەی ئەم پرسیارە بدۆزنەوە، لەگەڵ ئەوەی، کە باسەکەمان لە دەوری پەیوەندی نێوان فەلسەفەو ئەدەبدا دەخولێتەوە. ئاسانترین وەڵام بۆ ئەم گیروگرفتە دەتوانین لە شانۆدا، لە دید و بۆچوونی "قەشە ئۆگستین ٣٥٤ — ٤٣٠ز"دا بدۆزینەوە، لەبەر ئەوەی، رەنگدانەوەیەکی ئەو تێکەڵبوونە لەو بۆچوونانەی، کە بەرەنگاری یەك بوونەتەوە دەربارەی"راستی"لە شانۆدا واتا راستی شانۆیی، قەشە دەڵێ:

لەبەر ئەوەی ئەو ئازار و زوڵم و زۆرەی، کە لە شانۆدا"تراجیدیا"دا هەستی پێ دەکرێ مادام راستەقینە نین، کەواتە ئەو سۆز و عاتیفەیەی، کە بەرامبەر بەم ئازارە دەبزوێ لە جێگای خۆیدا نییە. دوای ئەوە کاتێك وای دابنێین کە شانۆ نمایشی راستەقینەیی دەکات، ئا لەو کاتەدا لەززەت لێوەرگرتنی تاوانێکی دیار و ئاشکرایە، لەبەر ئەوەی نواندنی ئازاردانی مرۆڤ لەم شانۆنامەیە یان ئەویاندا، ئەوا خزمەتکردنێکی خراپە بۆ بەنی ئادەم.

٢- ئەم وتارە پوختەی باسێکی ئەم کتێبەیە: د. بدوی طبانة، النقد الادبی عند الیونان، بیروت ١٩٨٦، ص٩٥.

سەرەڕای ئەوەش ئەو قوتابخانە ڕەوانبێژییەی ئۆگستین تیایدا فێری زمان بووە، کە ڕێگایەکی سەرەکییە بۆ قسەکردن لە نێوان مرۆڤەکاندا، هەروەها فێری ئۆگستنیان کردبوو، کە هەر زمانە دەتوانێ ڕاستییەکان بگوازێتەوە، بەڵام ئۆگستین دەیوت، کە ڕاستی زمانی شانۆنامە ئەگەر هەبێ ئەوا پێویسە ئەم ڕاستییە لەگەڵ ڕاستی کتێبی پیرۆزی"ئینجیل"دا بەراوورد بکرێ، ئەمە لەکاتێکدا، کە خوێندکارانی فەلسەفە دەیانوت دەبێ بەڕاستی فەیلەسووف پسپۆڕ بێ، کەواتە هەردوو بۆ چوونەکە "کلاسییزم و مەسیحییەت"بە لایانەوە ئەمانە هەمووی بیانوون بۆ هەبوونی شانۆو ڕاستی لە شانۆدا. چاکی بابەتەکەی بەهۆی هێزی عەقڵییەوە بنچینەی بابەتەکەی ئاوا پڕشنگدار دەبێت و ئێمە ئەگەر ئاوا سەیری شانۆ بکەین دەبینین خۆی لەخۆیدا گرفتێکی سەختە. ئێمەش لەبەر ئەوەی هەست و سۆزمان دەبزوێنێ و کاتێکی خۆشی لەگەڵدا دەبەینە سەر لەوانەیە هەر ئەم هۆیەش بێ کەوای لە"ئەرستۆ"کردووە، کە لە کتێبی(پیوتیکا) دا پرسیار لەخۆی بکات و بڵێت: دەبێ لە تراژیدیادا ڕاستییەکان چی بن ؟

هەروەها وەکو ئەوەی، کە پاڵی بە"ئیفلاتوون"ەوە ناوە، بەرگری لە فەیلەسووفەکان کردووەو وتویەتی ئەوان ڕاستبێژی ڕاستین و دژی ئەدیبەکان قسەی کردووە و بە نابینای لە قەڵەم داون و وتویەتی ئەمە سەرەڕای ئەوەش ئەگەر درۆزن نەبن.

هەروەها وای لە ئۆگستین کرد، کە دژی وەسەنییەکان بەرگری لە کتێبی پیرۆز بکات. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا گیروگرفتەکە هەروەکو خۆی دەمێنێتەوە، ئەگەر ئێمە وای دابنێین، ئەی ڕاستییەکان لەکوێدا خۆیان حەشار دەدەن؟ لەبەر ئەوەی شانۆنامە بە شێوەیەکی ڕوونتر بڵێین شتێکی دروستکراوە.

شانۆگەری ئەنجامی خەیاڵێکی ڕاهێنەرانەیەو چیرۆکە جێماوەکان لەگەڵ یەکتردا دەبەستێتەوەو تێکەڵی یەکیان دەکات، هەروەها چەند ئەسپێکی چەمووش لە شێوەیەکی نمایشکراودا بخرانەیە ڕوو ئەوا بینەران وەڵامیان دەدایەوە و بۆ ئەو بیر و ڕووداوانە کاری لەهەست و سۆزیان دەکرد، کە هەر دەبوایە کاریگەری هەبێ، بەڵام ئەگەر لە بەرامبەریان نمایش بکرایە دەبووە ڕووداوێکی ڕاستەقینە، کەچی ڕووداوی ڕاستەقینە نەبوون"ئەگەرچی هەندێکیان ڕاستیبوون ئەوەی، کە ئێمە مەبەستمانە وەکو ڕاستی ڕێی تێدەچێ یان دەشێ".
هەندێ ڕووداو لە شانۆگەریدا شتێکی زۆر دوورو مەحاڵە ڕوودەدات. کەواتە ئەو ڕووداوە زۆرانە چۆن دەتوانن کار لە هەست و سۆز و بیرو بۆچوونمان بکەن، کە لەسەر تەختەی شانۆ نمایش دەکرێن؟



کاتێك، کە بینەران شانۆ بەجێ دەهێڵن سۆز و چەسپاندنی ئەو شتانەی، کە بینیویانە لە لایەکەوە لەلایەکی ترەوە هیچیان بۆ دانانێن، کە ڕووداوێکی مێژووییان دیوەو هەندێکی تر ڕووداوەکانی شانۆنامەکە ناگێڕنەوە لەبەر ئەوەی بەڕووداوی ڕۆژانەی دادەنێن، بەڵام دەبێ ئەوکاتە بێ کە ڕاستی شانۆگەرییەکە بناسرێت وەکو، ڕووداوی مێژوویی و ڕۆژانە، ئەمەش لەبەر ئەوەی هەموو نەوەیەك پێویستە،کە نمایشە درامییەکان بە چاوی خۆیان ببینن. لەو کاتەدا ڕەگەزێك پەیدا دەبێ کە هاریکاری کارە درامییەکان بکات، کە جیاوازی نییە لەگەڵ ئەو ڕەگەزانەی کە هاریکاری لەگەڵ مێژووی ڕاستەقینەدا دەکات و ئەو هەستەش لەناو خەڵکیدا، کە هاریکاری یەکتری دەکەن لە دەربڕینی داب و نەریت و ڕۆشنبیری و نەریتە ئایینییەکان لەبەر ئەوەی پێویستە بۆ هەریەکێك، کە تەماشای شانۆگەرییەکی دیاریکراو بکا وەکو بابەتێکی تایبەتی لێکی بداتەوە. بەشداریکردنی کەسێکی ڕۆشنبیر یان خاوەن شارەزا دەربارەی ئەوانەی، کە لەدەوریدا دەژین، شارەزاییەك بێت کە لە ڕێگەی وتە ئەدەبییەکانەوە بێت، هەروەکو لە"ئەلیادە"دا دەبینرێ، یان هەندێ شانۆنامەی تر، کە پاڵەوانەکانی بوونەتە جێی پەند لێوەرگرتن.

گومان لەوەدا نییە، کە ئەو بارودۆخەی، کە ئۆگستین تیایدا ژیاوە لە شارەکەیدا، لەگەڵ هەموو نووسەرانی شانۆ، کە زۆربەیان باوەڕیان بە دینی مەسیحی هەبوو، هەردوولایان بەربەرەکانێی یەکتریان دەکرد بۆ ئەنجامدانی کارێکی گرنگ، بۆ ئەوەی ئەو بۆچوونانەیان بخەنە ڕوو، کە دەڵێ: ڕاستییەکان نرخی تراژیدیا دیاری دەکەن. ئەگەر ئەو ڕاستییانە لە باشترین بارودۆخدا بن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا جێگەی گومانن، لەبەر ئەوەی بە لایەنی کەمەوە لاوازوو ڕووخاو لەرزۆك و گۆڕاون. هەروەها ئەگەر لەگەڵ ئایدۆلۆژیای فەلسەفیدا، کە نەمرییەکەی لە کاکڵەی بیرو بەڵگەنەویستی یەکەمدا دەردەکەوێت، یان لەگەڵ کتێبی پیرۆزدا"ئینجیل"، کە ڕاستی و ڕاستگۆییەکەی لە ئاستێکە بەرزدایە بەراورد بکرێن، ئەوا بێگومان لاواز دەردەچن، بەڵام هەرچی شانۆییە ئەو ڕووداوانەی پێشکەشمان دەکات، لە ڕێگەی هەردوو هەستی چاوو گوێوە کار لە هەڵچوونی دەروونمان دەکات. هیچ سەر سوڕمانێکی تێدا نییە، کە لەلای نووسەری شانۆنامە ئاسانە کەوای دابنێت، کە ئەو شتانەی دەینوسێ یان بینیویەتی و گوێی لێیان دەبێ و بڕوایان پێ دەکات بە لای فەیلەسووفەوە جێگەی گومان بێت. ئەو جیاوازییە لە خەیاڵی (ئەرستۆ)دا بزر نەبووە، کە ویستوویەتی بەرگری لەشانۆ بکات وەکو هونەرێك کە شتی بەردەواممان پێشکەش دەکات، ئەو شتانەی، کە لەگەڵ ڕاستییە فەلسەفییەکان لە یەك دەچێ.

بەپێی وتەی ئەرستۆ شیعر زۆر لە فەلسەفەوە نزیکەو لە مێژووش بەرزترە. لەبەر ئەوەی چەند بەڵگەیەکی لە مێژوو بەهێزتری هەیە، ئەو بەڵگەیەشە جیاوازی لە نێوان فەلسەفەو شانۆگەری دیاری دەکات، ئەمەش جەدەلییەکەیەتی"ئەگەر شانۆ جگە لە پاکبوونەوە هیچی دیکە نەهێنێتە کایەوە کەواتە کاریگەرییەکی ئەوتۆی نابێ و زوو لەناو دەچێ، کەواتە هیچ پێویست بە رابەرایەتی کەمێکی کە لە راستییەکان بکات لەبەر ئەوەی پێویستە زۆر نزیك بێت لە هەوای دیانەتەوە، ئەوەی زیاتر ئاشکرایە بەلامانەوە لەو سرووتە ئایینییانە ئەوەیە، کە لە بەینی روودانی کارەسات و هەناسە هەڵکێشان بۆ سۆز و ئارەزوو کەم دەکاتەوە وەکو لە شانۆگەریدا دەبینین، بەشداربووانی شانۆ نامەکە وا سەیری گیانی خۆیان دەکەن،کە لە هەڵچوونە دەروونییەکان خۆیان پاککردۆتەوەو یان بە شێوەیەکی تر دەڵێن واتا دوورکەوتنەوەو کشانەوە لە هەست و سۆزە توندوتیژەکان، کە بەو هۆیەوە هەست بە حەسانەوەو دڵنیایی دەکەن.

بیروبۆچوونی ئەرستۆ بە شێوەیەکی بنەڕەتی لێرەدا ئەوەیە: کە تراژیدیا دەتوانرێ جیا بکرێتەوە بەوەی، کە بە رێگایەك دابنرێ لەو رێگایانەی تر، کە ئەرستۆ لەبابەت شیعرە دینییەکانەوە ژماردوونی، هەر لەبەر ئەوەشە، کە باسی ڕاستییەکان دەکرێت خەسڵەتێکی تایبەتی خۆی هەیە، چونکە دانراوێکە سەربەخۆ، لێرەدا پرسیارێك دێتە ئاراوە: ئەزموونی شانۆگەری تراژیدیی لە چییەوە سەرچاوە دەگرێت ؟ وەڵامی ئەم پرسیارە لە راڤەو شیکردنەوەدا ئالۆزە، بەڵام لە بنەڕەتدا سانایە، ئەزموونی دراما بەم جۆرە روودەدات، کە روویداوەو روودەدات، بەهۆی ئەو رۆژانەی، کە بۆی دانراوە، واتا گرێچنی چیرۆکە درامییەکە بڕیار لەسەر فۆڕمی درامایەکەو دانانی شێوازەکەی دەدا، ئەگەر شانۆنامەکە لەسەر بنچینەیەکی باش و بە رێگەیەکی باش نووسرابێ و چیرۆکەکەی چیرۆکێکی گونجاو و پتەو بێت ئەوا ئامادەبووان و بینەرانی شانۆییەکە لە رێگەی هەست و سۆزیانەوە رەخنەی لێ دەگرن.

کە دەوترێ "گرێچن"واتە سەرەتاو ناوەڕاست و کۆتایی هەیە، دوورخستنەوەی ئەم بەشانە لە یەکتری نابێ لەناو رۆنانی دەقە ئەدەبیەکەدا چاوپۆشی لێبکرێت. ئەوکات بینەر و پاڵەوانی شانۆییەکە لە یەکتر دووردەبن. ئا لێرەوە بینەران باشترین جۆری تراژیدیا دەست نیشان دەکەن بۆئەوەی بڕیاری خۆیان لەسەر پاڵەوانی شانۆییەکە بدەن، کە خۆی بۆ خۆی ناتوانێ ئەو بڕیارە بدات. ئەگەر بینەران و ئامادەبووانی شانۆییەکە سیفەتی باش بدەنە پاڵ پاڵەوانەکەو پشتگیریی لێبکەن ئەوا تراژیدیاکە لە راستییەوە نزیك دەبێتەوە و ئەو شانۆییە کار لە بەزەیی و سۆزمان دەکات، ئەوکات حوکم و بڕیاردان لەلایەن دەوڵەت یان خواوەندەوە دەبێت بەرامبەر



بە پاڵەوان. بە کورتی ئەو راستییەی، کە ئەرستۆ پێی گەیشتووە ئەوەیە، کە گرنگی بەڕاستی شانۆیی داوە، بە لایەنی کەمەوە لە یەکێ لە بەشەکانی شانۆدا: تراژیدیا کە هەڵگەڕانەوەو شارەزابوون دەگرێتەوە بریتییە لەو شانۆنامەیەی، کە دڵسۆزی و گەورەیی و هێزی تێدا دەردەکەوێت، گرێ هەردوو جۆر، واتا هەڵگەڕانەوەو شارەزابوون دەگرێتە خۆی، پاڵەوانێك کە سروشتێکی مەزنی هەبێت، ئەو کار و کردەوانەی لە خۆشبەختییەوە دەگۆڕێن بۆ بەدبەختی. ئەمە لەسەر بنچینەیەك دامەزراوە کەوا لە کۆتایی دەکات، کە چارەسەری گرفتە پڕسۆزەکان بەهۆی"پاکبوونەوە" بکات، ئەو زاراوەو دەربڕینەی، کە ئەرستۆ مەبەستی بووە بەکاری بێنێ. ئەوەی شایەنی باسە ئەوەیە، کە ئەم جۆرە شانۆییانە، کە راستییەکی وەها دەگرنەخۆ، کە دەتوانرێ بەرگرییان لێ بکرێ، ئەمە بریتییە لە بابەتی کتێبە بەناوبانگەکەی ئەرستۆ"پیوتیکا".

لێرەدا پرسیارێك سەر هەڵدەدا ئەویش ئەوەیە"ئەو راستییانە کامانەن، کە ئەرستۆ ئاماژەی بۆ کردوون" کە هیچ یەکێك لە ئەفلاتوون و ئۆگستین نەیانزانیوەو هەستیان بەبوونی نەکردووە؟ پێویستە پێش ئەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە بدرێتەوە لە راو بۆچوونی ئەرستۆ بکۆڵینەوە دەربارەی بۆچوونی لەبارەی پەیوەندی نێوان ئەدەب بە سروشتەوە. بە واتای ئەو رووداوو کردەوانەی، کە لە واقیعدا روو دەدەن"ئەو رووداو و کردارانەی، کە دەتوانرێ ببن بە کانگەی سوود لێوەرگرتنیان بۆ بابەتی فەلسەفی، یان بۆ لایەنە زانستییەکان دەتوانرێ سوودیان لێ ببینرێ، ئەو خاڵەی، کە پەیوەندی نێوانیان دەردەخات واتا ئەدەب و واقیع خاڵی وێکچوونیانە، واتا ئەو رووداوانەی، کە لەسەر تەختەی شانۆ دەبینرێن جا ئەگەر توندوتیژبن یان جۆرێکی دی بن، ئەوا لەگەڵ ژیانی ئاسایی لێکدەچن، کە تیایدا خەڵك دژی یەك دەوەستن و هێرش بۆ یەکدی دەبەن و یەکتری لە بارودۆخی ناهەمواردا دەبیننەوە، کە تیایدا هەندێکیان بەرهەڵستی قەزاو قەدەر دەکەن و هەندێکی تر لە ناز و نیعمەتێکی وادا دەژین، کە بە هیچ جۆرێك شایستەی نین، گرنگی قسەکان لەم چەند وشەیەدا دەردەکەوێت، کە تراژیدیا جیهانی خێرو شەڕ، دادپەروەری و زوڵم وا دەردەخات، جا هەرچەندە ئەو کردارانە زیاتر جەخت لەسەر دڵتەنگی و خەفەتباری دەکەنەوە لە بری دڵخۆشی و دڵفراوانی.[٣]

٣- بۆ بابەتی راستی لە تراژیدیا سوود لەم سەرچاوەیە وەرگیراوە : الادب والفلسفة- الحقیقة في تراجیدیا- مجلة الثقافة الاجنبیة- العدد ٢، س٥، ١٩٨٥.

## کورتەیەک لەبارەی کۆمیدیا

((کۆمیدیا پەیوەندی بە پەرستنی (دیونوسیس)خواوەندی (مەی)یەوە هەیە. لە ئەنجامی ئەو گۆرانییە خۆشانەدا هاتەکایەوە کە، خەڵکی گوندەکان لە جەژنەکانی ئەم خواوەندەدا گوتویانە. میهرەجانیان سازدەداو سەیرانیان دەکرد، خواردن و خواردنەوەی زۆریان سەرف دەکردو سەرخۆش دەبوون و ئاگایان لە خۆیان نەدەما نمایشی شێتانەیان پێشکەش دەکردو سەمایان دەکرد. جلی پێکەنیناویان لەبەر دەکرد، لق و چڵە داریان دەخستە سەر سەریان.

هەر لەو ئاهەنگانەدا جنێوی پیسی یان پێك دەداو نوکتەی ڕووت و بێتامیان دەوت و وێنەی ڕووت و قووتیان بەرزدەکردەوە. لە ناویاندا سروود خۆشێك بە خواوەندی (مەی)دا هەڵدەگوت. گۆرانییان بەسەر (مەی) دا دەوت. لەمەوە لای گریکەکان جۆر شانۆگەرییەك هاتەکایەوە بە (کۆمێدیا) بەناووبانگە. ناوەڕۆکەکەی پڕی بوو لە شتی سەیرو سەمەرە و گۆرانی و زێدەڕۆیی و خەیاڵ و کاروباری سیاسی و فەلسەفی بە شێوەیەکی ڕووت و بەربڵاو شێتانە نمایش دەکرا، هەموو شتێ دەوتراو دەکرا.

بنچینەی کۆمیدیا لە ( کۆمۆس )ەوە هاتووە، کە جۆرێکە لە جۆرەکانی نەریتە میللییەکان. کۆمەڵێ کەس گۆرانییان دەوت،کە خاوەنی ئەو گۆرانیانە دیار نەبوو، پاشان لەناو زمانە ئەوروپاییەکاندا بەشێوەی زاراوەی (کۆمێدیا) بڵاوبووەوە. کۆمەڵی (کۆمۆس )یش زۆربەی کات ( ماسك )یان دەپۆشی و پەڕی باڵندەو جل و بەرگی ئاژەڵانیان دەپۆشی.

بۆ یەکەم جار نمایشی کۆمیدیی لە ساڵی ٤٨٦ پ. ز. لە جەژنەکانی (دیونیسیس)دا پێشکەش کرا. دوورگەی (صقلیة) لە پێش ( ئەسینا )یشەوە چەمکی( کۆمیدیا )یان وەرگرت و گەشەیان پێدا، چونکە خەڵکی ئەو دورگەیە هەر سروشتیان وایە حەز لە بەزم و گاڵتە دەکەن، ناسراوترین کۆمیدیانووسیی ئەو دوورگەیە (ئەفیخارمۆس )ە، کە (ئەرستۆ) لە کتێبی ( هونەری شیعر) دا ئاماژەی بۆ کردووە.گریکەکان لە ئەسینا گەشەیان پێ کردو لەسەر دەستی (ئەرستۆڤانیس) و لە شانۆگەری کۆمیدی (بۆقەکان ) گەیشتە چڵەپۆپە. یازدە کۆمێدیا ئەو شاعیرە ماوەتەوەو پایەی بەرزیان لە ئەوە بیات دا هەیە، کە تیایدا شاعیر باری ژیانی کۆمەڵایەتی و ئایینی و هونەری ئەو سەردەمەی یۆنانی بە شێوەیەکی هونەری سەرکەوتوو دەربڕیوە و گاڵتەی زۆری بە فەیلەسووف و سۆفستاییەکان کردووە.



ئەرستۆ دەربارەی هونەری کۆمیدیا دەڵێ :

" دەربارەی سەرهەڵدان هیچ نازانین، لەبەر ئەوەی کەم بایەخەو گرینگیمان پێی نەداوە لە شوێنێکی تر دەڵێ یەکەم کەس لە ئەسینا کۆمیدیای نووسیبی ( ئەڤراتیس ) ە کە بیری لە چارەسەری چەند بابەتێکی گشتی کردۆتەوە بە شێوەیەکی پڕوپووچ.

دەربارەی بەشەکانی کۆمیدیاش هەروەکو تراژیدیا وایە. سەرەتاو پاشان کۆڕاڵ و گفتوگۆی نێوان ئەکتەرەکان پاشان کۆڕاڵ ڕووی قسە لە جەماوەر دەکات پاشان سروودێك یان پاڕانەوەیەك بۆ خواوەند، ئینجا ڕۆڵی شیعر دێت بە پارچە شیعرێك گاڵتە ئامێزی ڕەخنەگرانە ڕەخنە لە یەکێ لە دیاردەکانی ژیانی ڕۆژانەی خەڵك دەگرێت ئینجا قەسڵەکانی کۆمیدیاکە پێشکەش دەکرێت و لە نێوانیشیاندا کۆڕاڵ گۆرانی خۆی پێشکەش دەکات، دوا دیمەنیشە کە کۆتایی کۆمیدیایەکەیە بە خۆشی و شادییەوە دەبێت. ئەکتەرەکان ماسك بە دەم و چاویانەوە دەبەستن. لەسەرەتادا ژمارەی ئەکتەرەکان زۆر بوون پاشان بە پێی بڕیارێکی تایبەتییەوە ژمارەی ئەکتەرەکان بۆ سێ کەس کەم کرایەوە و ژمارەی ( کۆڕاڵ ) یش ٢٤ کەس بوو. دوازدەکەس لە پیاوانەو دوازدەش لە ژنان و جلی ئەوتۆشیان لەبەر دەکرد، کە لەگەڵ دەورەکەیاندا بگونجێت و بە تایبەتی پەڕەمووچەی باڵندان و پێستەی ئاژەڵان کە زۆربەیان ڕوخسارێکی گاڵتەجارانەی هەبوو.

بە شێوەیەکی گشتی ڕەخنەگرەکان کۆمیدیای یۆنانی دابەش سەر سێ قۆناغ دەکەن بەم شێوەیە:

١ — **کۆمیدیای کۆن:** ئەم قۆناغە کۆمیدیا لە سەدەی پێنجەمی پێش زایینە گەیشتە چڵەپۆپە، بە تایبەتی لەسەر دەستی ئەرستۆڤانیس کە ڕەخنەکانی لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە توندوتیژ بوو و کەس و ڕووداوەکانی دەستنیشان دەکرد و ڕووداوەکانی لە ژیانی ڕۆژانەدا هەڵدەبژاردو نووسەر سەربەستی تەواوی هەبوو لە ڕەخنەگرتن لەو کەسانەی کە لە ژیانی ڕۆژانەدا دیارو بەرچاو بوون و بە شێوەیەکی تایبەتی خۆیان هەبوو.

٢ — **کۆمیدیای ناوەڕاست:** لە ساڵانی ٤٠٠ پ. ز. دەرکەوت نووسەر لەم قۆناغەدا وازی لە ڕەخنەگرتنی کۆمەڵ و ئەفسانەو پاڵەوانەکانی هێنا بوو. شاعیرەکان لە ترسی بڕیاری دادگاو دادوەرەکان نەدەوێران هەموو بابەتێك بخەنە ڕوو، بەڵکو زیاتر بابەتەکانیان لە دەوری خەڵکی مشەخۆرو درۆزن و ئەویندارى سەرەڕۆ و ماسی فرۆشان و خەڵکانی دوو ڕوو و مەرایی کەر بوو.

هەروەها لەم قۆناغەدا شاعیرەکان بە زمانێکی سادەی دوور لە داڕشتنی ئەدەبی ئالۆزو دەوروپێچەوە گوزارشتیان لە ڕووداو و کەسان دەکردو دەوری ( کۆڕاڵ ) یش کز بوو، لە جیاتی ئەوە ژمارەیەك مۆسیقاژەن و سەماکەر دەوری دەبینی و گۆرانیان دەچڕی.

**٣- کۆمیدیای نوێ:** ئەم لەگەڵ قۆناغی ناوەڕاستدا جیابوونەوەی ئەوتۆی نەبوو، لە چارەسەرکردنی ژیانی ڕۆژانەدا و زیاتر بە ناخی دەروونی پاڵەوان دا شۆڕدەبۆوەوەو ڕەوشت و ئاکاری مرۆڤی دەخستەڕوو پاشان لەگەڵ بەرەو پێشەوە چوونی ژیانی سیاسی و ئابووری و کۆمەلآیەتی یۆنان کۆمێدیاش بەرەو پێشەوەچوو.))[4]

**کلاسییزمەکان لەبەر دوو هۆ دژی میلۆدرامی بوون:**

١ – میلۆدراما گرنگییەکی زۆری بە جوولەی دەرەوە دەدات و جوولەی کردەی ناوەوە کەم دەکاتەوە.

٢ – دژایەتی هەبوو لە نێوان سەرەتا و کۆتاییدا واتا لە سەرەتادا پاڵەوان تووشی کارەساتێك دێت دەهات، پاشان بە دڵخۆشییەوە کۆتایی دێت.

**لەبەر ئەم هۆیانە کلاسییزمەکان دەیانویست میلۆدراما وابێ :**

١ - کەم کردنەوەی کردە یان جوولەی دەرەوە و زۆرکردنی جوولەی ناوەوە.

٢ – گونجان هەبێت لە نێوان سەرەتا و کۆتاییدا.

دیارترین ژانری ئەدەبی، کە لەگەڵ دەرکەوتنی ڕێبازی کلاسییزمدا گۆڕانکارییەکی زۆری بەسەرهات، شانۆ بوو. هەر لە سەرەتای سەدەی حەڤدەهەمدا ڕابەرانی ڕێبازی کلاسییزم کەوتنە ململانێییەکی توند و تیژ دژ بە یاسا باوەکانی هونەری درامی ( بارۆك Baroque )کە لە پێش خۆیان لە فەڕەنسا باو بوو. دراماکانی ( بارۆك) یش هەمووی لەسەر شانۆی ( ئۆتێل یۆرگۆن ) پێشکەش دەکران و بۆ کات بەسەر بردن بوو و هیچی تر.

[4] : ئەم وتارە پوختەی باسێکی ئەم کتێبەیە : د. بدوی طبانة، النقد الادبی عند الیونان، بیروت، ١٩٨٦، ص ١٠٨.



ئەلیکساندەر ئاردی ( ١٥٧٠ – ١٦٣٢ ز ) دامەزرێنەری هونەری درامی سەردەمی بارۆك بوو لە فڕەنسا. ئەو هونەرە لەسەر بنچینەی تراژیکۆمیدیا بوو. بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە دەتوانین بڵێین دیارترین خاسیەتەکانی ئەو بابەتە درامییە وا دەستنیشان بکەین:

١- چیرۆکی خۆشەویستییەکی میلۆدرامییە، کە لەژیانی ئۆرۆستکراتییەوە وەرگیرابێت.

٢- پشت بەستن بە هەردوو رەگەزی کۆمیدی و تراژیدی و کردنەوەی گرێی دراماکە بە خۆشییەوە.

٣- زاڵ بوونی کرداری دەرەکی بەسەر ناوەکیدا، لە ئەنجامی سەپاندنی هەڵوێستی دژوار بەسەر پاڵەوانەکاندا.

٤- نەبوونی (یەکەکان- الوحدات)و سەربەستی گواستنەوەی رووداو لەسەر هەردوو ئاستی کات و شوێندا.

لە کۆتایی بیستەکانی سەدەی حەڤدەهەمدا، دوای ئەوەی حەزی جەماوەری دەستەبژێر بۆ شانۆ لە زیادبووندا بوو و لەو نمایشانەی بارۆکیش بێزار ببوون، ئەوە بوو لە ١٦٢٩دا شانۆییەك بە ناوی (ماریەس- maries )ەوە لە پاریس کرایەوە بۆ ئەوەی لایەنگرەکانی ئەو درامایانە پێشکەش بکەن، کە لەسەر بنەمای هەرسێ یەکییەتییەکە دامەزرابێ (کات و شوێن و رووداو). ئەمە وەکو دەروازەیەك، لەپاشان پێر کۆرنێ (Pierre corneille) وەکو دیارترین نوێنەری تراژیدیای کلاسییزم دەرکەوت، بەڵام چونکە کۆرنێ هەر لە سەرەتای گەنجییەوە لەژێر کارتێکەری شانۆی بارۆك دابوو نەیدەتوانی کارەکانی تەواو لە ژێر یاسای کلاسییزم دابێت. یەکەم بەرهەمی (کۆرنێ )،کە بە ناوی( السید) ەوە کێشەو گفتوگۆی زۆری لەسەر دروست بوو. تا ئەوە بوو (کۆرنێ) شتێکی نووسی بەناوی (السید) و تیایدا ئەوەی ڕوونکردنەوە، کە هەر نووسەرەو ڕێبازی تایبەتی خۆی هەیە و نابێ کت و مت لەسەر دەستوور و پێڕەوی نووسەرانی تر بڕوات ).

## کۆرنێ

پیر کۆرنی Pierre Corneille- 1606-1684 لە نوێنەرە هەرە دیار و ناسراوەکانی درامای کلاسییزمە، هەر لە گەنجییەوە حەزی بە شیعر نووسین کردووە و بەرهەمەکانی خۆی بڵاو کردۆتەوە؛ (( یەکەمین بەرهەمی درامای پێر کۆرنێ کۆمیدیای (مەلیت) دەبێت کە لە

سالّی (١٦٢٩ ز) دا نووسیویەتی و لە هەمان سالّدا لەسەر شانۆی شاری پاریس پێشکەش بە بینەران کراو سەرکەوتنێکی مەزنی بە دەست هێنا. زۆر لە مێژوونووسانی شانۆ باوەڕیان وایە، کە کۆمیدیای (مەلیت) کۆمیدیی نووسی لە فەرەنسادا بە قۆناغێکی نوێ و سەرکەوتوو گەیاندووە.))[٥] بە تایبەتی لە قۆناغی یەکەمییدا. لە سەرەتای گەنجییەتیدا زۆر لە ژێر کاریگەریی هونەری درامی سەردەمی بارۆك Baroque دابوو.



**کۆرنێ**

هونەری بارۆك بە ماوەیەکی زۆر بەر لەوە لە فەرەنسا بلاّوبووەوە. کۆرنێ هەتا مردیش نەیتوانی خۆی لەو کاریگەرییە ڕزگار بکات. ڕەنگە هەر لە بەر ئەوەش بێ دراماکانی کۆرنێ چ ئەوانەی سەرەتای گەنجییەتی و چ ئەوانەی تری زۆر کێشە و گفتوگۆ بە خۆیەوە هەلّدەگرن و

٥- مەهدی مەجید جاف، درامانووسانی جیهان، گ؛ رامان، ژ ١٩٨، ل .



هەمیشە ململانێی لە سەر بوو.[٦] بە هەر حالّ ئەم نووسەرە توانی بە داهێنانی لە درامای کلاسییزمدا خۆی بە هەموو جیهان بناسێت. ڕەخنەگرەکان دەلّێن کۆرنێ، بەو قەسیدەی، کە ستایشی پاشا لویسی سێزدەهەم و شاژن و سەرۆك وەزیران کاردینال ریشیلیۆی کرد بوو توانی سەرنجی ریشیلیۆ بۆ لای خۆی ڕابکێشێ و ببێتە هۆی ئەوەی ناوی لەگەلّ نووسەرانی دی بۆ خزمەتکردنی خۆی بنووسێ، کە دراماکانیان بە ڕێنوێنی سەرۆك وەزیران دەنووسی، بەلاّم دوای ماوەیەك کۆرنێ لە ڕۆحی خۆ بە نزم و ملکەچییە بۆ لێپرسراوان و زورنا ژەنییە بۆ سەرۆك وەزیران نەیتوانی بەردەوام بێ و حەزی بە سەربەخۆیی خۆی دەکرد. هەر ئەو ڕۆحی گۆڕانەیش بوو وای کرد، کە لەگەلّ بلاّوکردنەوەی شانۆنامەی (سید Le cid)نووسەر پێشەکییەکی درێژ بلاّو بکاتەوە و تیایدا ئەوەی ڕوون کردەوە، کە دەتواندرێ بی تێڕوانینێکی نوێ دەستوورەکانی داهێنانی شیعریی فراوان بکرێتەوە. هەروا بەرگری لە مافی نووسەر دەکرد لە شێوازی تایبەتی نووسیندا، هەروەها باوەڕی بە جیاوازی تێڕوانینی شانۆیی هەبوو. بۆیە کۆرنێ، لە پێش(مۆلییێر)ەوە چەشەی جەماوەری بە خالّێکی گرنگ لە قەلّەم دەداو دژی ڕێبازی عەقلّی بوو بە شێوەیەکی کوێرانە بڕوای وابوو، ئەگەر درامایەك بە تەواویش پێڕەوی یاسا و دەستوورەکانی کردبێ، بەلاّم جەماوەری نەبێ، ڕەخنەگرەکان لە جیاتی ئەوەی ستایشمان بکەن بەرگریمان لێ بکەن بەوە تاوانبارمان دەکەن، کە خراپ لە چەمکی یاساکان تێگەیشتووین. شانۆگەریی Le cid لە سالّی ١٦٣٩ پێشکەشکرا. پێش ئەوەی کۆرنێ شانۆگەری کۆمیدی دەنووسی و پاشان سروشتی تراژیکۆمیدی تا سالّی ١٦٣٥ تراژیدیای ( میدیا )ی نووسی.

٦- هونەری درامای بارۆك، نوێنەرەکەی لە فەرەنسا ئەلکساندەر ئاردی ( نزیکەی ١٥٧٠ — ١٦٣٢ ز ) بوو. بە بەردەوامی نمایشەکانی خۆی لە پاریس لە سەر شانۆی ئۆتێل بۆرگۆن پێشکەش دەکرد. گرینکترین خاسیەتەکانی ئەم جۆرە درامایە ئەوانە بوو :

(١) چیرۆکی خۆشەویستی میلۆ درامی، کە لە ناو جەرگەی ژیانی ئۆرستکراتییەوە وەرگیرا بوو.

(٢) بە یەکەوە گونجاندنی هەردوو ڕەگەزی کۆمیدی و تراژیدیای، بە شێوەیەك، کە هەمیشە کرانەوەی گرێ ( Plot ) یەکە بە دلّخۆشیەوە کۆتایی دێت.

(٣) — زالّبوونی جوولّەی دەرەکی بەسەر جوولّەی ناوەکیو زۆرکردنی هەلّوێستی جۆراوجۆر.

(٤) — بزربوونی سێ یەکییەتییەکان (الوحدات)، ڕووداو بە سەربەستی لەسەر ئاستی زەمەن و شوێندا دەسووڕایەوە. ئەم خاسیەتانە وای کردبوو، کە ئەو کارە تراژیدیکۆمیدیانەی ئاردی دەینوسین لە (کۆمیدیا)ی ئینسانی نزیك بێتەوە. بڕوانە : د. جمیل نصیف التکریتی، المذاهب الادبیه، ص ٦٩ — ٧٠.

ئەگەرچی وەکو تراژیدیایەك ناوبانگییەکی ئەوتۆی نەبوو، لەسەر ئەو بنەمایەش دانەمەزرابوو، کە لەسەر ئەرکی نیشتمانی و بەرژەوەندی تاکە کەسی بێت. تا ئەو کاتەیش نووسەر بە تەواوی خوچی لە کەش و هەوای تراژیکۆمیدی ڕزگار نەکردبوو و چەمکی تراژیدیا بە تەواوی لە لای گەلاڵە نەببوو

( راسین و کۆرنیێ ) لە دوو گۆشەی جیاوازەوە دەیان ڕوانییە بابەتەکانی درامای تراژیدی. لای کۆرنیێ : پەیوەندییەکی توند و تۆڵی بە چینی یاخی بووری ئۆرستۆکراتی هەبوو، بۆیە گرنگی بە چارەسەری جۆری تراژیدیای مێژووی پاڵەوانییەتی دەدا.

لای راسین : ئەو جۆرە تراژیدیایەی وەردەگرت، کە پەیوەست بوو بە خۆشەویستی هەست و سۆز و ویژدان و نەستەکانی دەروون، بەڵام بە شێوەیەکی ئەوتۆ نرخ و بەهایەکی فیکری و سیاسی گەورەی پێ بەخشی بوو لە لای چینە پێشکەوتن خوازەکانی کۆمەڵی فڕەنسی سەدەی حەڤدەهەم ناسراو بوو.

**هەندێ لە دراماکانی کۆرنیێ:**

١- شانۆنامەی بێوەژن، ساڵی ١٦٣٢.

٢- شانۆنامەی گالێری، ساڵی ١٦٣٢.

٣- شانۆنامەی خزمەتکار، ساڵی ١٦٣٣.

٤- شانۆنامەی گۆڕەپانی پاشا، ساڵی ١٦٣٦.

٥- شانۆنامەی هۆراس ١٦٤٠

٦- شانۆنامەی سینا.

٧- شانۆنامەی پۆلیکیۆت.

٨- شانۆنامەی مردنی پۆمئی.

٩- شانۆنامەی سیرتیۆس ئەگسیلاوس.

١٠- شانۆنامەی ئەتێلا.

١١- شانۆنامەی تیتۆس و برنیس.

١٢- شانۆنامەی سەرنیۆس

١٣- شانۆنامەی پیتریس پاشای لمبادی، ساڵی ١٦٥١.



*** درامای (سید Le Cid) ی کۆرنیێ:**

**کورتەی شانۆگەرییەکە:**

گەنجێکی ئۆرستوکراتی، کە ناوی ( ڕۆدریك )ە حەز لە کچێکی ئۆرستوکراتی دەکات، کە ناوی ( شیمیم ) ە، باوکی کوڕەکە بە باوکی کچەکە دەڵێ و ئەویش ڕازی دەبێت، دوای ماوەیەك پاشا پێویستی بە پەروەردەکەرێك دەبێت بۆ کوڕەکەی – باوکی (ڕۆدریك) بۆ ئەم کارە هەڵدەبژێرێ، باوکی " شیمیم " حەسادەتی پێ دەبات و ئیهانەی دەکات، بەڵام باوکی " ڕۆدریك، کە پیرێکی بە ساڵا چوو بوو، داوا لە کوڕەکەی دەکات ئەمە قبووڵ نەکات و واز لە باوکی " شیمیم " بێنێ و کچەکەشی نەخوازێ. " ڕۆدریك " باوکی " شیمیم " دەکوژێت. " شیمیم " خۆشەویستەکەی دەیەوێ تۆڵەی لە " ڕۆدریك "بسێنێتەوە. داوا لە پاشا دەکات، کە " ڕۆدریك " لەگەڵ یەکێ لە خزمەکانی ئەو "شیمیم " کە بە تەمایە زەماوەندی لەگەڵدا بکات ڕووبەڕووی یەك ببنەوە. " ڕۆدریك " سەردەکەوێت. دوایێ پاشا داوا لە " شیمیم " دەکات، کە لە " ڕۆدریك "خۆش بێت، چونکە نیشتمان لە شەڕەکانی دیدا پێویستی پێیەتی و کوڕێکی ئازاو بە جەرگە. دەینێرن بۆ شەڕ، ئەگەر کوژرا ئەزا شیمیم تۆڵەی خۆی کردۆتەوە، ئەگەر نەیشکوژرا ئەوا نیشتمان پێویستی بە خزمەتی ئەو کوڕە ئازایە دەبێت لێی خۆش دەبن، لە ئاکامدا " ڕۆدریك " سەردەکەوێت.

**ئەو ڕەخنانەی ئاراستەی ئەم درامایە کراون ئەمانەن:**

(کۆرنیێ) لە یاساکانی کلاسییزم سەرپێچی کردووە، چونکە شمشێربازی ڕۆدریك لەگەڵ باوکی کچەکە دەرچوونە لە بەرژەوەندی دەوڵەت و لە بەرژەوەندی تاکەکەسی ( خێزانی )یە نەوەکو بەرژەوەندی گشتی. هەروەها داواکردنی کچەکە بۆ کوشتنی "ڕۆدریك" لە بەرژەوەندی دەوڵەت دا نییە،چونکە دەوڵەت پێویستی بە ئەوە. هەروەها ڕازی بوونی پاشا لەسەر شمشێربازی دەرچوونە لە یاسا، چونکە پێشتر شمشێربازی قەدەغە کرابوو لە هەمانکاتدا لاوازی کەسیەتی پاشا پێشان دەدا. هەروەها شانۆگەرییەکە نەیتوانیوە خۆی لەگەڵ کەش و هەوای ملیۆدرامی بپارێزێت " ڕووداوی شمشێربازی و شەڕوشۆڕی زۆری تیایە، واتا یەکییەتی شوێن و کات مەودای تەسکە " هەروەها بابەتی دراماکە لە مێژووی کۆن " یۆنانی و ڕۆمانی " وەرنەگیراوە. شانۆگەرییەکە شانازی بە پاڵەوانییەتی تاکەکەسی دەکات، شانازی بە کەسییەتی "سید" دەکات، کە کەسایەتییەکی ئیسپانییە، ئەمەش نابێت، چونکە دەبێ شانازی بە

کەسایەتییەکی نیشتمانی بەوە بکات. هەروەها لە پاشا هەست دەکات کە قەرزباری یەکێك لە دەست و پێوەندەکانییەتی، ئەمەش ناشێت، چونکە پاشا دەبێت کەسایەتییکی بەهێز بێت هەمیشە. لە بەر ئەم ڕەخنانە " کۆرنێ " بۆ ماوەی سێ ساڵ خۆی دووره پەرێز گرت و لەو ماوەیەدا درامایەکی نوێی نووسی،خۆی لەو هەڵانەی ڕابردوو پاراست، کە شانۆگەری" هۆراس " ی نووسی و پەیڕەوی ئەم خاڵانەی کرد :

١ — بابەتەکەی لە مێژووی ڕۆمانی ( ٧ — ٨ پ.ز.) ەوە وەرگرت.

٢ — جەختکردن لەسەر ئەرکی نیشتمانی و فەزڵکردنی بەسەر بەرژەوەندی تاکەکەسیدا.

٣ — کرداری دەرەکی کەم کردەوە.

٤ — کۆتاییەکەی هەروەکو سەرەتا تراژیدی بوو. هەردووکی بە یەکەوە گونجاند.

## دراماى ( هۆراس )

کورتەی دراماکە: دوو خێزان یان دوو دەوڵەت (ڕۆما — ئەلب) ن، پەیوەندییەکی باش و دۆستانەیان لە نێوان دایە. ئەوەی یەکەمیان ڕۆما (هۆراس) و ئەوەی دووەمیان ئەلب (کریاس)، هەریەك لەو خێزانانە سێ کوڕیان هەیە. هۆراس کوڕە گەورەکەیان کچی کریاسی هێناوە.(کریاس) کوڕە گەورەی خێزانەکەی تر دەزگیرانی خوشکی (هۆراس ) ە، لە کاتی زەماوەندێك کێشەیەکی زۆر دەکەوێتە نێوان بۆ سووك کردنی ئەو توندوتیژیە. لە هەر یەکێك لە خێزانەکان سێ کوڕ هەڵدەبژێرن بۆ شمشێربازی. هەر سێ کوڕەکەی هۆراس و سێ کوڕەکەی کریاس هەڵدەبژێرن. شمشێربازییەکە ئەنجام دەدرێت و لە ئاکامدا دوو کوڕی کریاس برینەدار دەبن. هۆراس لە بەردەم ئەوەی سێیەمیاندا ڕادەکات، بەمە باوکی زۆر تووڕە دەبێت و ئەم ڕاکردنە بە شەرمەزاری دادەنێت بۆ ڕۆما، بۆیە بڕیار دەدا، کە بە دەستی خۆی بیکوژێت. بەڵام مەبەستی لەو ڕاکردنە دا ئەوە بوو بە تەنیا بن و خەڵکیان لە لا نەبێت و (کریاس ) بکوژێت. وایش دەبێت و هۆراس کریاس دەکوژێت. بەم پێیە هەر سێ کوڕەکەی خێزانی ئەلب دەکوژێت. باوکی هۆراس زۆر دڵخۆش دەبێت و شانازی بە کوڕەکەیەوە دەکات. ئەم سەرکەوتنەی هۆراس دەبێتە هۆی دڵتەنگی ژنەکەی، چونکە برایەکانی کوژران. هەروەها خوشکی(هۆراس)یش بەهۆی کوژرانی دەستگیرانەکەیەوە دڵتەنگ بوو. ژنەکەی هۆراس ئەم مەسەلەیەی قبووڵ کرد ، چونکە ئەرکی نیشتمانییە و لە ڕێگەی وڵات دایە و لەبەرئەوە نەیکوشتووە، کە ڕقی لێیان بووبێ، خوشکی هۆراس نەفرەتی لە ڕۆما کرد. بۆیە هۆراس خوشکەکەشی کوشت، چونکە



ئیهانەی دەوڵەتی کرد بوو بە ئەرکی نیشتمانی خۆی هەڵسا وەکو دەردەکەوێت ( کۆرنێ ) لە شانۆگەریەکانیدا شانازی بە پاڵەوانیەتی و بابەتی شمشێربازی شیروەشاندنەوە دەکات.

شارەزایانی ئەدەب بنەماکانی ئەدەبی کلاسیزم لە نیوەی دووەمی سەدەی شازدەهەم و نیوەی یەکەمی حەڤدەهەمدا بەم خاڵانە دەست نیشان دەکەن :

١ — پارێزگاری کردن لە کەلەپوور(خاسیەتە کۆنەکان یان جێماوەکان).

٢ — نووسینی ئەدەبی بۆ بەرژەوەندی سیاسەتی سەردەم یان دەوڵەت.

٣ — جەختکردن لەسەر پێکهاتنی زمان (بەهێزو تۆکمەیی وشەبازی) واتا پارێزگاری کردنی پێڕەو و ڕێکخستنی زمان و دوورکەوتنەوە لە تەم و مژ.

٤ — عەقڵ بکرێت بە پێوەر و دژی هەموو هەست و نەستێکی دەروون و حەزی شەخسی.

٥ — گوزارشت کردن لە گشتی نەوەکو تایبەتی واتا (النمطی) نەوەکو ( الفردی )، یان ئامادە نەبوونی شەخسییەتی ئەدیب.

٦ — ڕزگارکردنی دراما لە ململانێ و ئەرك لەسەر ڕووی هەموو بەرژەوەندییەکی کەسییەوە دابنرێت.

## راسین J ،1639-1699 - Racine

لە ساڵی ١٦٣٩ دا لە شاری فێرت ملیۆن  لە دایکبووە، لە بواری دادوەریدا کاری کردووە. تەمەنی چوار ساڵان بوو. دایك و باوکی مردووە و لای باپیری ژیاوە، دوای باپیریشی داپیری بەخێوی کردووە، سەر بە تاقمێك بووە، کە پێیان گوتون ژانسیسینەکان. ئەو کۆمەڵەیەش قەشەیەك دروستی کردووە، کە بە ناوی ژانسینۆسە، کە لە ساڵی ١٥٨٥ — ١٦٣٨ ز ژیاوە.

خانەوادەی ڕاسین هەمیشە لە هەوڵی ئەوە دابوون، ئەم منداڵە ( ڕاسین )بە شێوەیەکی وا پەروەردە بکەن، کە حەزی لە کەلەپووری یۆنانی کۆن بێت و داب و نەریتی ژانسینەکان لە دڵ و دەروونیدا بچەسپێ. پاشان زانکۆی لە ساڵی ١٦٦٠ دا تەواوکرد. ڕووی لە جیهانی ئەدەب کرد، سەرەتا چەندین شیعری ناسکی نووسی و سەرنجی خەڵکی بۆ لای خۆی ڕاکێشا، دوای ماوەیەك لەگەڵ نووسەری ناسراوی فەرەنسیی (لاڤۆنتین) یەکتریان ناسی و هەولێدا چەند بەرهەمێکی شانۆیی بنووسێت. سەرەتا هۆنراوەیەکی ( بووکی سین )ی نووسی و تیایدا باسی ژن هێنانی مەلیکی لویسی چواردەهەمی کردووە، کە ژنەکەی ناوی ( ماریا )بووە و ئیسپانی بووە. ئەم هۆنراوەیە سەرنجی ڕەخنەگری کلاسیکیی ( شاملێن )ی بۆ لای خۆی ڕاکێشا، توانی

پارەیەکی باش بۆ ئەم شاعیرە دابین بکات و هەروەها ناویشی لە لیستی ئەو نووسەرانە تۆمار کرا، کە مووچەیان لە خەزینەی مەلیك وەردەگرت.

جیاوازی سەرەکی نێوان ( کۆرنێ ) و ( راسین ) لەوەدا خۆی دەنوێنێ، کە لە لای کۆرنێ هەمیشە خواست بەسەر شەهوەت و ئارەزوودا سەردەکەوێ. کەچی لە شانۆنامەکانی (راسین)دا، هەمیشە هەست و سۆز سەردەکەوێ، مل کەچکردن بۆ هەست و سۆز تاڵترە، کە بەرهەڵستی لە ئیرادە و خواستی مرۆڤ بکات، بۆیە پاڵەوانەکانی (راسین) زیاتر لە خەڵکەوە نزیکن و رەخنەگرەکانیش دانیان بەمەدا ناوە. راسین لە دوای درامای ( ئەندرۆماك ) چەند درامایەکی دیکەی نووسیوە، لەوانە بریتتانیکس ١٦٦٩، پرینیس ١٦٧٠، بایەزید ١٦٧٢، ڤیدا ١٦٧٧. پاشان بە ئەندامی ئەکادیمیای فرەنسیی هەڵبژێردرا و خۆی و ( بوالۆ N.Boileau - 1636-1711 ) ئەرکی نووسینەوەی مێژووی ژیانی مەلیکیان کەوتە سەر شان و بەردەوام یاوەریی مەلیکی دەکرد لە هەموو شەڕوشۆڕەکانیدا.



( بوالۆ N.Boileau - 1636-1711 )



لە ساڵی١٦٧٧ دا بۆ ماوەیەك وازی لە دراما و نووسین هێنا. پاشان دووبارە لەسەر داوای ژنێکی رۆشنبیری ئەو سەردەمە، کە ناوی (مەدام دی مانتۆن) بوو و سەرپەرشتیاری پەیمانگای سانسێری بوو، لە پێناو رێنوێنی کچە بێ باوکەکانی ئەو پەیمانگایە هەندێ درامایان بۆ بنووسێ، بە شێوەیەك کە لایەنی پەردوەردەیی و رەوشت دەربخات و ئەو کچانە لە شەهوەت و هەست و سۆزی دڵداری دووربخاتەوە. راسین، لە سەرەتادا رازا بوو، بەڵام پاشان شانۆنامەی (ئەستێر)ی بۆ نووسین، کە ئەم شانۆنامەیە رووداوەکانی لە ( کتێبی پیرۆز ) ەوە وەرگیراوە و شانۆنامەکە لە سێ بەش پێکهاتووە و چەندین گۆرانی و سروودی تیایە، کەڵە مۆسیقاژەنێکی دیاری ئەو سەردەمە(جۆن پاتێست مۆرۆ )ەوە وەرگیراوە. ئەم شانۆگەرییە لە ساڵی ١٦٨٩ دا پێشکەشکراو لە هەمان ساڵیشدا چاپکراوە.



راسین J، **Racine - 1639-1699**

## کورتەی دراماکە

رووداوی دراماکە لە شاری ( سووز ) روودەدات، لەو سەردەمەی کە جوولەکەکان دەست بەسەر بوون و گوازرابوونەوە بۆ وڵاتی کلدانییەکان، سەرۆك وەزیرانی مەلیك، ( هامان ) زۆر بە دڵڕەقییەوە راوەدووی ئەو جوولەکە دەست بەسەرانە دەنێ و هانی مەلیکیش دەدا بە یەکجاری لە ناویان ببات، مەلیك بەم بڕیارە رازی دەبێت و فەرمان دەدات لە ماوەی (١٠ ) رۆژدا

جوولەکەکان هەموو قەڵاچۆ بکرێن. سەرۆکی جوولەکەکان، کە ناوی(ماردۆشێت ) بووە، خۆی لە هامان بە گەورەتر دەزانی و رقەبەرایەتیان هەبوو. ئیتر بەنی ئیسرائیل بیر لە ڕێگەیەك دەکەنەوە، ئەویش هەڵبژاردنی کچێکی جوانی خۆیانە بۆ مەلیك، کە کچەکە دەبەن، مەلیك حەز لەو کچە دەکات، ئەو کچە ناوی ( ئەستێر ) بوو و جوانییەکەی لە ڕادەبەدەر بووە، مەلیك بڕیار دەدات ( ئەستێر ) بخوازێت و نەیدەزانی ئەمە جوولەکەیە، مەلیك زۆر ژنەکەی خۆش دەوێ،(ماردۆش)یش سەرۆکی جوولەکەکان مامی( ئەستێر ) دەبێت. مامی داوای لێ دەکات، کە ئەستێر کڕنوش بۆ مەلیك ببات و تێی بگەیەنێ کە جوولەکە هیچ مەترسییەکیان بۆ سەر مەلیك نییە و ئەم شتانەی ڕوویداوە هەمان بە هانە و شتی دروستکراون (هامان ) خۆی دروستی کردوون، بە پێچەوانەوە ئەمان هیوای سەرکەوتن بۆ مەلیك دەخوازن، لە لایەکی دیکەوە، ( ماردۆش ) پیلانێکی کوشتنی مەلیکی لە لایەن ( هامان ) ەوە بۆ مەلیك ئاشکرا کرد، بۆیە کەلیك بڕیار دەدات جوولەکەکان پارەیان بدرێتێ و ڕێگەیان بدرێ (پەرستگا)بۆ خۆیان دروست بکەن. لەو کاتەدا چەند کچێك سروودی سوپاس بۆ خوا پارێزەری بێ تاوانان دەچڕن. شانۆنامەکە تەواو دەبێت.

* ئەو لایەنەی ڕاسین لە زۆر لە شانۆنامەکانیدا تیایدا سەرکەوتووە، ئەوەیە، کە توانیویەتی هێزی سۆزی مرۆڤ دەربخات، چونکە لەو بڕوایە دابوو هەست و سۆزی ئادەمیزاد هێزێکی زۆر کاریگەریی هەیە و کار لە دڵی مرۆڤ دەکات، ئەگەر ئەو هێزە لە سنوور دەرچوو دەبێتە مایەی سەرهەڵدانی دڕندەترین سروشتی ئادەمیزاد، هەر چەند ئەو مرۆڤە زۆر ژیاری و شارستانیش بێت.

* بە بۆچوونی ( ڕاسین ) دڵداری لە هەمو هەست و سۆزێك بەهێزترە، بۆیە لە شانۆنامەکانیدا قورساییەکەی خستۆتە سەر دڵداری.

* ڕاسین مرۆڤ وا نیشان دەدات، کە بە دوای شەهوەتی خۆیدا و پلە و دەسەڵاتی نییە تا بەرگەی ئەو شەهوەتە بگرێت.

کۆرنێ و ڕاسین هەردووکیان لە بواری تراژیدیای کلاسییزمدا داهێنانیان ئەنجامدا، (کۆرنێ) بە نوێنەری داهێنانی قۆناغی یەکەمی کلاسییزم ناودەبرێ و ( ڕاسین ) یش بە نوێنەری قۆناغی دووەم.



**قۆناغی یەکەم و دووەم لەوەدا جیادەبنەوە**

١ — لە قۆناغی یەکەمدا لای کۆرنێ زۆر بە ئاشکرایی کردەی دەرەکی (ململانێی کەسیەتییەکان ) زۆر زاڵ بوو و پرینسیپی وێنەی ناوەوە ( موعاناتی دەروونی پاڵەوان )ی هێنایەکایەوە.

٢ — کۆرنێ جەختی لەسەر کردەی پاڵەوانیەتی دەکردەوە، واتا وێنەکێشانی نێوان بەرژەوەندی کەسی و ئەرکی نیشتمانی و زاڵ کردنی ئەرك بەسەر بەرژەوەندی کەسیدا. هەروەها وێنەی موعاناتی کەسیەتی پاڵەوانی کێشاوە. کە چۆن قوربانی بە بەرژەوەندی تایبەتی خۆی دەدا لە پێناو ئەرکی نیشتمانیی، ئەمەش پێویستی بە شمشێربازی و زیادکردنی کردەی دەرەکی هەیە.

٣ — لای کۆرنێ ئایدیا ڕاستەوخۆیە، پاڵەوان هەمیشە سەردەکەوێ. بۆیە گرنگی بە ململانێی خیتابی دەدا، واتا هەست و نەستی ناوەوەی تیا نییە.

**بەڵام لە قۆناغی دووەمدا لای ڕاسین:**

١ — لە قۆناغی دووەمدا جەخت لەسەر بابەتەکانی خۆشەویستی دەکاتەوە. سۆزێکی دەروونییە. بۆیە لای ئەو لە جوانترین شێوەدا جێبەجێ دەبێ. زۆربەی پاڵەوانەکانی لە شانۆدا بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە وێنەکێشی موعاناتی قووڵایی و ناخی دەروونیان کراوە.

٢ — لای ڕاسین پاڵەوانەکان ژمارەیان کەمە و گرێ و چنینەکەشی باش و سادەیە.

٣ — لای ڕاسین پاڵەوان خودییە، لە ئاست بەرژەوەندی تایبەتی خۆی نابینایە، تەنیا ئەرکی نیشتمانی بەهای باڵایە. بۆیە کەسایەتییەکانی ڕاسین خەفەتبارن و مەینەتبارن. چونکە کۆت و پێوەندی زۆری خستۆتە هەست و سۆزەکانی خۆی، بۆیە سەیر نییە لە کۆتاییدا دەروونی خۆی و ئەوانەی دەوروبەری وێران دەکات. هەروەك پاڵەوانەکانی لە شانۆنامەکانی (ئەندرۆماك - بیرینز — ڤیدا ) دابە دیار دەکەوێ.

## مـــۆلـــيێر Moliere - 1600-1673






(جان پاپتێست پۆكلين)، له سەرەتا ئايينى مەسيحييەتى خوێند و پاشان چووە زانـستگا و له بەشى ياسادا دەيخوێند. له خێزانێكى بۆرژواى خاوەن پيشه له پاريس له دايك بووە. بـاوكى نازناوى " خزمەتكارى پاشايى " وەرگرتووە. مۆلييێر هەر له تەمەنێكى زووەوە حەزى بە شانۆ كردووە. له سەرەتادا به هاوكارى خێزانێكەوە كه سێ كچ و دوو كوڕ بوون مادلين و جەنەڤينه و ئارماندۆ كوڕەكانيش جۆزيف و لويس بوون، توانى هەندێ نمايشى سادەى كۆميدى گاڵتـەجارى پێشكەش بكات. نووسەر هەتا مردنيش لەو خێزانـه دانـەبڕاوە دەڵـێن پەيوەندييـەكى دڵـدارى لەگەڵ مادلين دا هەبووە، پاشان (ئارماندۆ ) ى خواست. لەو كاتەدا دوو تيپى شانۆ له مێژ بوو له پاريس كاريان دەكرد، مۆلييێر بۆ بەرەبەرەكانى كردنى ئەم دوو تيپـه پـرۆژەى دامەزرانـدنى شانۆيەكى نوێى دانا، بەڵام تيايدا سەرنەكەوت و جارێكيش خرايه زيندان و به يارمەتى بـاوكى ئازادكرا، دوو كوڕەكەى به منداڵى مردن پەيوەندى لەگەڵ ژنه گەنجەكەى سارد بوو، له شوباتى ساڵى ١٦٧٣ له كاتى پێـشكەشكردنى درامـاى (نەخۆشـيى بـه خـەياڵ) ژمارەيـەك درامـاى نووسيوە. سەرەتا بۆ يەكەم جار له ساڵى ١٧٥٥ يەكەم دراماى ئەدەبى خـۆى بـه ناونيـشانى (المتهور، يان هەموو شتێك له شوێن خۆيدا نييه) ى نووسى. له ساڵى ١٦٥٨ له بـەردەم پاشـا لويسى چواردەهەم دراماى (پزيشكى ئەويندار)ى نمايش كردوو پاشان زۆر دڵخۆش بوو و ڕێگەى پێدا له پاريس له پـاڵ تيپێكـى ئيتـاڵى هـەموو هەفتەيـەك نمايـشەكانى پێـشكەش بكـات. پاشـــــــــان دراماى (قوتابخانەى مێردان) ى نووسـى، كـه ناوبانگيـەكى زۆرى پەيـدا كـرد. پاشان چەند شانۆگەرييەكى دى پێشكەشكرد. وەكو نووسەر و ئەكتەر دەركەوت. سـاڵى ١٦٦١ له ژيانى مۆلييێردا خـاڵى وەچـەرخانێك بـوو و ڕووى كـردە كۆميـدياى ڕەوشـت و كێـشەكانى خۆشەويستى و ژن هێنان و پەروەردەكردنى منداڵان و بنياتنانى خێزانى بۆرژوازى كردە بابـەتى سەرەكى دراماكانى. دواى ئەم درامايـه درامـاى (بێزاركـەرەكان) و (قوتابخانـەى ژنـان )ى نووسى، ئەوەى دواييان وايكرد پێڕەوى ڕێبازى كلاسييزم بكـات و دراماكـه لـه پێـنج فەسـڵ پێكهاتبوو و به شيعر بوو، هەر بۆيه ( بوالۆ )يش پـشتگيرى لـەو شـانۆگەرييه كـرد. مـۆلييێر كۆميدياى له تراژيديا به باڵاتر دەزانى و دەيوت، " تراژيديا " بۆچـوونى پاڵەوانەكانـه، بـەڵام كۆميديا بۆچوونى خەڵكى ئاساييه. هەروەها له تراژيديادا پاڵەوانەكان وەكو تابلۆيەك شـاعير مەوداكانى دەستنيشان دەكات به پێى ئارەزووى خۆى، كەس له چۆنيەتى بەراوردكردنى يان له واقيعدا ناپێچێتەوە، بەڵام له كۆميديا و وێنەكێشى خەڵك دەكەيت و له سروشتەوە بابەتەكەت وەردەگرى، دەبێ ئەو شتانه ڕێك له واقيعدا هەبن. هـەروەها دەيـوت نووسـينى كۆميـديا لـه

تراژیدیا قورسترە. کۆمیدیا لە بابەتە قورسەکانە، چونکە نووسەر دەبێ بابەتەکەی لەناو جەرگەی ژیان هەڵبژێرێت، بە شێوەیەکی وایش پێشکەشی بکات، کە بینەر قەناعەت پێ بێنێ، بابەتەکە گرنگ و بە بەهایە. ئەم حاڵەتەش پڕ مەترسییە، چونکە ئەگەر سەرنەکەوێ ئەوا پایەی ئەدەبی خۆت لە کیس دەچێ، مۆلییێر زۆر سەرکەوتوو بوو. مۆلییێر، کەمتر لە ڕابەرانی پێش خۆی گوێی بە یاسا و دەستوورەکانی کلاسییزم داوە ئەوەندە خۆی دەروەست نەکردووە، تەنانەت هەندێ لە ئەدیبەکان دەڵێن تا ڕادەیەك جۆرێك لە ڕیالیزم لە ئەدەبەکەیدا خۆدەنوێنێ. کاتێ مۆلییێر شانۆگەرییەکانی دەنووسی، کۆمیدیا لە ئەدەبی فەرەنسیدا نەبوو. مۆلییێر لە چارەسەری کەم و کوڕییەکانی کۆمەڵدا توند و تیژ بوو. بە تەواوی لەسەر مەنتقی کلاسییزم نەدەڕۆیشت، بەڵکو تەنها بە چوارچێوەی گشتی کلاسییزمەوە بەستبۆوە، لەگەڵ ئەوەشدا سەربەستی کەسییەتی خۆی پاراستبوو. جارێ بۆرژوا و جارێ دەرەبەگایەتی و جارێ ئەوانەی لە پشت پەردەی ئایینەوە مەرامەکانی خۆیان جێبەجێ دەکرد، ڕیسوا دەکرد.

لەو پرێنسیپانەی کلاسییزم، کە لای مۆلییێر هەستی پێ دەکرا، ئەوەبوو ئەگەر عەقڵ فەرامۆشکرا ئەوە هەموو کاروکردەوەیەك ئاکامێکی خراپی دەبێت. واتا هەر کەسایەتییەك بە دوای هەست و سۆزێك بکەوێت ئاکامەکەی ناهەموار دەبێت. مۆلییێر هەر لە سەرەتاوە لە ژێر کاریگەری زەوق و چەشەی میللی ڕەسەندا بوو و لە دژی کۆنەپەرستی بوو.

**شانۆگەری " بۆرژوای بەگزادە " ١٦٧٠:**

کورتەی دراماکە :

بۆرژوایەك، کە ناوی ( جۆردان )ە دەیەوێت ببێتە بەگزادە. پێی دەڵێن دەبێ فێری سێ شت ببێت :

١ – شمشێربازی ٢ – سەم ٣ – زۆرڕەوی بە شیعر ( گەرەلاوژە ). ئەویش دوو مامۆستا دەگرێت ( دوانت ) و ( دوورینیمیا )، بۆ ئەوەی فێری ئەو سێ شتەی بکەن. ماڵەکەی پڕ مامۆستا دەبێت. لە دواوە گاڵتەی پێ دەکەن و پێی پێ دەکەنن. کابرای بۆرژوا گەرەکییەتی کچێکی بەگزادە بێنێ. کچە بەگزادەیەکی تورکی خەیاڵاوی بۆ دەدۆزنەوە. دەیخوازێت، ئەم ژن هێنانە دەبێتە هۆی نەگبەتی و ماڵ وێرانی بۆی و دەبێتە مەسخەرە و گاڵتەجاری هەمووان.



**سەرنجێك لەسەر دراماکە:**

مۆلییێر ئەم شانۆگەرییەی لەسەر داوای پاشا لویسی چواردەهەم نووسیوە و داوای لێ کردووە تورکەکان بە شێوەیەکی گاڵتەجاڕی نیشان بدرێنن.

**درامای ( دۆن جوان ) – ١٦٦٥ :**

کورتەی دراماکە :

گەنجێکی هەژار، بەڵام و چالاك و قسەزانە. بەم سیفەتانە کچان هەڵدەخەڵەتێنێ و ماوەیەك لەگەڵیاندا دەمێنێتەوە و وازیان لێ دێنێ. دوای ماوەیەك دەبێتە کەسایەتییەکی خوانەویست (ملحد ) خوا تۆڵەی لێ دەکاتەوە و دەکەوێتە بەر برووسك و دەسووتێت. لە شانۆگەریەکەدا مۆلییێر لە پشت کەسیەتی خزمەتکارێکەوە کە ناوی

(سگاناریل)ە ڕەخنە لەو بیروڕایانە دەگرێت و ئەم تۆڵەسەندنەوە بە پەسند نازانێت، نووسەر وا خۆی دەردەخات لەگەڵ تۆڵە سەندنەوەکەدا نییە، بەڵام خۆی لە ڕاستیدا ئەو بیروڕایانەی بەناو خەڵکدا بڵاوکردەوە. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کڵێسا لە دژی مۆلییێر بوەستێت. لە چەند شانۆگەرییەکی دیکەشدا، پاڵەوانەکانی بە ئاسانی خۆیان بە دەستەوە نادەن و بیری پێشکەوتن خوازانەیان هەیە و دژی ئاینن، بابەتەکانی مۆلییێر لەگەڵ کلاسییزمەکاندا زۆر ناگونجێت، چونکە کلاسییزمەکان گرنگییان بە چارەسەری کێشەکانی کۆمەڵ نەدەدا، هەر بۆیەش داوایان لە تراژیدیا دەکرد، بابەتەکانیان لە کۆنەوە وەربگرن :

**چەند سەرنجێك :**

ئەم درامایە تا ساڵی ١٨٤١ نەتوانرا پێشکەش بکرێ و نزیکەی دوو سەدەی پێ چوو، ئینجا وەکو تێکستی بنچینەیی نووسەر خۆی پێشکەشکرا. نووسەر هەروەکو خۆی دەیویست دەبوایە ئاین سەربکەوێ، چونکە مەترسییەکی زۆر بە هۆی شانۆگەرییەکەی پێش ئەوە (گرگوف) دڵی گرتبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەم شانۆگەرییەدا، کە پاڵەوانەکە و هەقایەتەکە لە بنچینەدا ئیسپانییە نووسەر توانیویەتی مەسەلەی دین و ڕیسواکردنی بۆرژوا بخاتە ڕوو، لە ڕووی هونەریشەوە خۆی لە خاسیەتەکانی هونەری درامای ئیسپانی نزیك کردۆتەوە، بە تایبەتی لە تێکەڵ کردنی تراژیدیا و کۆمیدیا و فەرامۆشکردنی سێ یەکیەتییەکە و وێنەکێشانی هەست و سۆزی ناوەوەی پاڵەوانەکان. بەم خاڵانەش لە خۆ بەستنەوە بە یاسا و دەستووری کۆن وتێکەڵ

نەکردنی جۆرەکان ( صفاو النوع )ی بەزاندوو. ئەم درامایە و شانۆگەری ( گرگوف ) لە نێو هەموو شانۆگەرییەکانی دیکەی مۆلییێردا جیان بەوەی، کە سروشتێکی تراژیدیان هەیە. لە درامای(دۆن جوان)دا ژنەکە مۆلییێر( ئارماندۆ ) دەوری ( شارلۆcharlotte )ی بەسەرکەوتوویی بینی و(مادلین)یش دەوری (ئەلڤیرا ) ی بینی، جوزیف بیژارت ( joseph Bejart )یش دەوری عاشقی دەگێڕا، ( دۆن جوان ) و ( لویس بیژارت ) یش دەوری (سگاناریل) ی خزمەتکاری کۆمیدیان دەبینی. چونکە کارێکی ئاسان نییە وا لە کەسانێکی بەرێز بکەی پێبکەنن. مۆلییێر سەرپێچی چەند یاسایەکی تری ڕێبازی کلاسییزمی کرد، لەوانە لەگەڵ ئەوەدا نەبوو پاك و بێگەردی جۆرەکان(صفاو النوع ) هەبێت و ئەو جیاوازییە چینایەتییە لە نەزەری ڕێبازی کلاسییزمدا هەبێت. هەروەها سەرپێچی سێ یەکیەتییەکەی (الوحدات الثلاث)ی کرد. هەروەها دەربارەی یاسا و دەستوور ئەو پێی وابوو مرۆڤ خاوەن عەقلێکی بێگەردو کاملە چ پێویستی بە ئەرستۆ و هۆراس دەبێت، خۆی دەتوانێ ڕاستییەکان بەرجەستە بکات. مۆلییێریش وەکو کۆرنێ و راسین چەشەی جەماوەری بە خاڵێکی گرنگ لە قەڵەمدەدا بەڵام لەوەدا لەگەڵ ئەوان جیاواز بوو، کە چەشەی چینە جیاوازەکانی کۆمەڵی بینەرانی بە شێوەیەکی بەرفراوان تر لە کۆرنێ و راسین لە بەرچاو دەگرت.

**هەندێ لە دراماکانی مۆلییێر :**

١ — قوتابخانەی مێردان

٢ — قوتابخانەی ژنان

٣ — بێزارکەرەوەکان

٤ — دۆن جوان

٥ — گرگوف

٦ — قرچۆك

٧ — فێڵەکانی سکاپن

٨ — پزیشکی ئەویندار... هتد..



**گرینگترین خاسیەتەکانی ئەدەبی مۆلییێر:**

١ — دەرچوون لە یاسا و دەستوورەکانی کلاسییزم، لەوانە بە شێوەیەکی بەر فراوان کەلەپووری گاڵتەجاری میللی بەکارهێناوە. هەروەها لە کۆمیدیاکانیدا ژمارەیەکی زۆر پاڵەوانی میللی وەکو فێڵباز و خزمەتکاری زمان لووسی بەکارهێناوە. تەنانەت هەندێجار جووتیاری لادێشی وەرگرتووە، بەمەش لە یاسا دەرچووە و ڕووداوەکانی بردۆتە گوند. لە دراماکانیدا زمانێکی جەماوەریی سادەی بەکارهێناوە و هەوڵی داوە پاڵەوانی کۆمیدیاکانی هەر کەسەو زمانی تایبەتی ڕۆژانەی خۆی بەکاربێنێ.

٢ — مۆلییێر هەمیشە درامای بۆ نمایشکردن نووسیوە نەوەکو بۆ خوێندنەوە بۆیە ڕادەی تێگەیشتنی جەماوەری لەبەر چاو گرتووە نەوەکو تێگەیشتنی خوێنەران.

٣ — بە شێوەیەکی بەرفراوان فۆلکلۆری نەتەوەکەی بەکارهێناوە، لە پەند و نوکتە و بیروباوەڕەی میللی، ئەمە سەرباری ئەوەی گۆرانی میللی لە زۆربەی دراماکانیدا هەیە، ئەم سیفەتەش لە سەردەمی ئەو بە لای ئەدیب و ڕۆشنبیرانەوە کارێکی باش بوو.

٤ — شێوازی مۆلییێر و هەڵبژاردنی بابەتەکانی تا ڕادەیەك لە دراماکانی (شکسپیر-1616 1564 Shakespeare ) دەچێت.[٧]

## کلاسییزم و رەخنەی ئەدەبی

دیارە بێگومان بۆ بابەتی ئەدەب و فەلسەفە و هەموو بابەتەکانی تر بۆ شارستانییەتی بەرزی گریکەکان دەگەڕێینەوە، لەبەر ئەوە بۆ رەخنەی ئەدەبییش بە هەمان شێوە ناتوانرێ رۆڵ و کاریگەری رەخنەی ئەدەبییش لەبەر چاو نەگیرێ و لەوانەوە دەست پێنەکەین.

### ڕێبازی رەخنەی رەوشتی (ئیفلاتوونی)

((زۆر لە زانایانی رابردوو لەو باوەڕەدابوون کە دەبێ هونەر پەیڕەوی رەوشت بکاتو ئەگەر لە سنووری رەوشت دەرچوو ناپەسەند دەبێت. ئیفلاتوون لە کتێبی (کۆمار)ەکەی خۆیدا،

---

٧- بۆ بابەتی مۆلییێر سوود لە موحازەرەکانی د.جمیل نصیف التکریتی وەرگیراوە، کە لە ساڵی ١٩٩٦ بۆ خوێندکارانی دکتۆرای بەشی کوردی زانکۆی بەغدای پێشکەش کردووە.

شیعرو مۆسیقا بە کارو ئامرازێك دادەنێ بەدەست حکوومەت و سیاسەتەوە، (ئەرستۆ)یش لەو رووەوە هەمان بۆچوونی هەیە، بەڕای ئەو شیعر، بە تایبەت تراژیدیا هۆیەکە بۆ پاکبوونەوەی دەروونی، لە هەر وروژانێکدا زۆربەی بیرمەندانی کۆن لەگەڵ کاریگەری پەروەردەیی هونەرو ئەدەبیاتدا بوون، دیدرۆ دەڵێ: (بە هێزکردنی رێزو حورمەت و خستنەڕووی ناهەمواریو ناچیزیو خەوش دەبێ خواستو ئامانجی هەر مرۆیەکی شەریف و بە جەرگ بێت، کە قەڵەم یان فلچە یان قەڵەمی پەیکەرتاشی بەدەستەوە دەگرێت) جۆنسۆن لە پێشەکی (شکسپیر)دا دەڵێت: (ئەرکی نووسەر هەمیشە ئەوەبوو، کە دنیا لەوەی کە هەیە چاکتر پیشان بدات).

بە پێچەوانەشەوە باری ژیان و سەرەڕۆیی و بێباکی و بێ هوودەیی هەندێ شاعیر لە رۆژگارەکانی کۆندا وایکرد کە هەندێ کەس لە دژیان بوەستن و شیعر و ئەرکی شیعری و شاعیران بە جارێ رەت بکەنەوەو نەفرەتیان لێ بکەن، گوایا دەڵێن موسڵمانەکانی بەرایی جنێوفرۆشیو فەسادیو زەلالەتی هەندێ شاعیر وای کردبوو دژی شیعر بن. دەڵێن (امروو القیس) گەنجێکی بێ بار بووە لەسەر ژنان جنێوی بە باوکی خۆشی داوە، بۆیە ئەویش دەری کردووەو کەسێکیشی راسپاردووە کە بیکوژێ. هەروها (حطئیة)و (ابو الینبغی)و (ابو الشمقمق)یش هەروا. لەلایەکی ترەوە دیسانەوە کاتێك کە ستایشو داشۆرین بووە هۆیەك بۆ نان پەیداکردن، شاعیران پلەو پایەی کۆمەڵایەتییان لە لای خەڵکی زۆر دابەزێ

ئەگەر جاران شیعر بە زمانی پیرۆزی خوداوەندەکان دادەنراو لە سەرووی هەموو پێویستییەکانی مرۆڤایەتییەوە بوو وردە وردە وای لێهات خەڵکی پلەو پایە بەرزی لە خوێندنەوەی شیعر بە دوور دەگرتو شیعر وتنو نووسین بووە مایەی خەوشو نەنگی. ئەم شێوازە زێدەڕۆیی ئامێزە خاڵی نییە لە راستییەك ئەویش ئەوەیە بەرهەمی هەندێ لە هونەرمەندە گەورەکانیشی پێ مەحکووم کراوە. (بۆدلێر) بە هۆی بڵاوبوونەوەی کتێبی (گوڵەکانی شەڕ) بانگیان کرد. راستە کە هەندێ کۆپلە و پەرەگرافی ئەو کتێبە دژی پاکیو پەروەردەییە، بەڵام ئەوانیش بە شاکاری راستەقینەی ئەو دەژمێردرێن. دەقەکانی (گەوهەرەکان)و (لیتە- Lethe) کە خرانە بەردەم دامودەزگای دادوەریی ئەو رۆژە لە بەشێك لە شیعرەکانی سورنیو قائانیو ئەبی نەواسو نووسراوی ناو کتێبەکانی لای خۆمان توندترو ناشیرینتر نییە، بەڵام سەرزەنشتکردنی راستەقینەی مەسەلەی (بۆدلێر) لەلایەن لایەنگرانی رەخنەی رەوشتییەوە بوو، کە باڵیان بەسەر بیرو بۆچوونی خەڵکی سەدەی نۆزدەهەمی فەڕەنسەدا کێشابوو.



هەروا (ئۆسکار وایڵد)یش لە بەرامبەر هەندێ لە شیعرەکانیدا مەحکووم کراوە. نێوڤیل گۆتیە دەڵێت (ئەوە نووسەران نین سەردەم و رۆژگار پڕ لە فەسادی رەوشتی دەکەن، بەڵکو فەسادی رەوشتی گشتی ئەو سەردەمەیە کە ئەو نووسەرانەی بەرهەمهێناوە)، هەروەها دەنووسێت: (هەر کتێبێ سۆراغی داب و نەریت و بۆچوونی خەڵك دەکەن، نەوەکو بۆچوونو نەریتی باو لە ئاکامی کتێباندا هاتینە کایە). بەڵام ئەو تێورییە زێدەڕۆیی تیایە. ئەندرێ مۆرۆ راست دەڵێت کە هەندێ جاریش ئادابو نەریت پەیڕەوی کتێبان دەکەن. هەروەکو چۆن بە هۆی شۆرەتو بە هەرمێنی کتێبی (ڤارتەر) ماوەیەك لە ئەورووپا نەخۆشی خۆکوژی لە پێشتری زێتر بڵاوبۆوە. هەندێ لە رەخنەگران لە رەخنەی بەرهەمی ئەدەبیدا باری کۆمەڵایەتی بە بنچینە دادەنێن.

لێکۆڵینەوە لە بارەی پێوەندیی ئەدەبیات بە کۆمەڵەوە بابەتی ئەو گروپەی رەخنەگرانە. گومان لەوەدا نییە، کە باری ئەدەبی کاریگەری ژینگەی کۆمەڵایەتی بە سەرەوە نەبێت بیرو بۆچوونو چێژو خەیاڵ و ئەندێشەکان پاشکۆی باری کۆمەڵایەتین.))[8]

## کلاسییزم لە ئەدەبی کوردیدا

بە پێی بۆچوونی مێژوونووسانی ئەدەبی کوردی سەرەتاکانی ئەدەبیاتی کوردی وەکو زۆربەی میللەتانی جیهان بە شیعر دەستی پێکردووە، یان بە واتایەکی دی راستتر بڵێین ئەو دەقانەی وەکو بەڵگەو دۆکیۆمێنتێك لەبەر دەستدا ماون، بە شیعر نووسراون،ئەمەش حاڵەتێکی سەیر نییە، چونکە وەکو ئاماژەمان بۆ کرد زۆربەی میللەتانی رۆژهەڵات پێشینەی مێژوویان شیعرە، ئەمەش هۆکاری خۆی هەیە، رەنگە دیارترین ئەو هۆکارانە پێنەگەیشتنی بیری مرۆڤ و ناکامڵ بوونی هزری مرۆڤی سەرەتاییە و هەروا نەبوونی کەرەسەکانی نوسین و

---

٨- ئەم وتارەم لەم کتێبە وەرگێڕاوە: دکتر عبدالحسین زرین کوب، نقد ادبی، جستجو اصول و روشها و مباحث نقادی با بررسی در تاریخ نقد و نقادان، چاپ ششم، تهران، ١٣٧٨، ص ٣٨-٤١.

هەروەها هەر لەبارەی رەخنەی رەوشتییەوە بڕوانە : ویلبر سکۆت، رەخنەی ئەخلاقی لە ئەدەبدا، و: عەتا قەرەداخی، گ؛ نووسەری نوێ، ژ ٨، کانوونی دووەمی ١٩٩٩، ل ٣٢-٣٧.

چاپ و چاپەمەنی و سادەیی ژیان و ئەمانەو چەندان هۆکاری تر وایکردووە لە ئەدەبی کوردییشدا دەقی شیعریی زیاتر لە هەزار ساڵێك بەر لە ئەمڕۆمان هەبێت، بەڵام دەقی پەخشانی وا کۆنمان نەبێت.

چوارینەکانی بابا تاهیری هەمەدانی ( ۹۳۵- ۱۰۲۷ ز) بە سەرەتاکانی شیعری کلاسییزمی کوردی دادەنرێ. لە رووی مێژووییەوە سروودە ئایینییەکانی (سەرئەنجام) و شیعرەکانی مەلا پەرێشان و ئەدەبی (یارسان) لە قۆناغی یەکەمی شیعری کلاسییزمی کوردیدا نموونەی دیار و بەرچاون. دواتر ئەدەبیاتی کوردی و بە تایبەتی شیعر بە شێوەزاری کرمانجی و نموونە شیعرییە میللییەکانی فەقێ تەیران وعەلی حەریری و نموونە بەرزەکانی شیعری مەلای جزیری و ئەحمەدی خانی بە لاساییکردنەوەی روخسار و ناوەرۆکی شیعری میللەتانی رۆژهەڵاتیی موسڵمان، ئەدەبیاتی کوردییان دەوڵەمەند کرد. لە رووی ناوەڕۆکەوە هەر لە سەرەتاوە شاعیری کورد بە کاریگەری شارستانییەتی ئیسلامییەوە کاریگەر بووە، لە رووی روخسارییشەوە قاڵبە شیعرییەکانی تاك و فەرد و چوارین و مولەممەع و تەرکیب بەند و تەرجیع بەند و پێنج خشتەکی و موستەزاد و غەزەل و قەسیدەو... لەلایەکەوە، لە لایکی تریشەوە لە رووی وێنەی شیعری و زمان و کێشی عەرووز و قافیەی یەکگرتوو و موردەدەف و... لە شیعری کوردیی هەروەکو ئەوان دەرکەوتووە. لەگەڵ ئەم بنەما هاوبەش و چوونیەکییەمان لەگەڵ میللەتانی رۆژهەڵاتدا شیعری کلاسییزمی کوردی لە رووی ناوەڕۆکەوە خەسڵەتی نەتەوەیی زۆرتر و غوربەت و دووری لە نیشتمان و وەسفی سروشتی تایبەتیی کوردستانی پێوە دیارە.

شیعری کلاسییزمی کوردیی بەم شێویە تاوەکو سەرەتای سەدەی بیستەم درێژەی کێشا، دواتر بە هۆی گۆڕان و بارودۆخی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و رۆشنبیریی و ئابووریی ناوچەکە و کاریگەری تازە بوونەوەی ئەدەبیاتی میللەتانی دراوسێ لە رێگەی ئەدەبیاتی رۆژئاوا و هەست و هۆشی نەتەوەیی و بەرزبوونەوەی رادەی هۆشیاری نەتەوەیی و گەڕانەوە بۆ کلتووری دێرینی کوردی و بە تایبەتی گەڕانەوە بۆ کلتووری دەوڵەمەندی ناوچەی هەورامان شیعری کوردی بە ئاراستەیەکی جیاوازدا برد.



**شیعری کلاسییزمی کوردی و ئەورووپی**

شیعری کلاسییزمی ئەورووپی و کوردی لە زۆر رووەوە لە یەکتر جیاوازن، رەنگە دیارترین ئەو خاڵانە ئەمانە بن:

١- لە رووی سەرچاوەی شیعرەوە، سەرچاوەی شیعری کلاسییزمی ئەورووپی، پێڕەویکردنی یاسا وەدەستووەرەکانی یۆنان و رۆمانی کۆن بوو و لاساییکردنەوەی بۆچوونەکانی ئیفلاتوون و ئەرستۆ و هۆراس بوو، بەو واتایەی ئیلهام سەرچاوە بوو. بە پێچەوانەوە شاعیری کورد سەرچاوەی شیعریی بە لایەوە سەنعەت بووە و فێربوون و شارەزایی پەیداکردن بووە لە هونەرەکانی رەوانبێژی و زمان و زاراوەکانی میللەتانی رۆژهەڵاتی و بەتایبەتی کاریگەری زمانی فارسی و شیعر و سەبکی شیعری حافز و سەعدی شیرازی و کەلیمی هەمەدانی و شەمسی تەبریزی و هاتفی و رودکی و جامی و فیردەوسی و... بە شیعری کلاسییزمی کوردییەوە دیارە.

٢- لە رووی ناوەڕۆکەوە شیعری کلاسییزمی ئەورووپی زیاتر بابەتیی بوو، بەو واتایەی زاڵکردنی بەرژەوەندی گشتی بەسەر بەرژەوەندی تایبەتی، لە رێگەی دەربڕینی کێشەی گشتی و دوور کەوتنەوە لە خود، بۆ ئەم مەبەستەیش درامایان کردووە بە هۆیەك بۆ دەربڕینی جووڵەو کرداری پاڵەوانەکان و مەبەستەکانییان، بە پێچەوانەوە شیعری کلاسییزمی کوردی بە شێوەیەکی گشتی خودییەو دەربڕی ناخی تایبەتی شاعیرە و بۆ ئەم مەبەستەش هەموو ئەو مەبەستە شیعرییانەی بەکاریان هێناوە دەچنەوە خانەی شیعری لیریك.

**نموونەی کلاسییزم لە شیعری کوردیدا**

شـــیعری : مەلای جزیری (١٨٠٠-١٨٧٢ز)

کەس ب دادا مە نەپرست گلەهـ و داد دێ چ کت؟

تە نەبت دادڕەسەك بیـهوودە فـــەریاد دێ چ کت؟

ب شرینێ نە گەهت دەست ئەگەر رۆستەم بت

دێ ب بازوو و ملان شـــوبهەتی فەرهاد دێ چ کت؟

فاعلەك لازمە دا فعل و ئەپەر پەیدا ببت

گەر تو حەدداد نەبن کوورەیێ حەدداد دێ چکت؟

مومکنەك دێ هەبتن داکو گهلەب حاصل ببت

صەیدو نێچیر کو نەبت توولەیێ صەییاد دێ چ کت؟

هەر گل و سەنگ دبتن زێر ب تەدبیرێ حەکیم
قابلییەت کو نەبت حکمەتێ ئوسـتاد دێ چ کت؟
کان ب گەوهەر چ بکت گەوهەر ئەگەر پاك نەبت
تو بەصیرەت تە نەبت سیرەتێ ئەجداد دێ چ کت؟
زێر و زیوەر دکرن جەلبێ قولووبان حاشا
حوسن و سورِ ژات نەبت قامەتێ مەییاد دێ چ کت؟
عاشقێ مەست بە عشقێ نییە حاجەت ب مەیێ
واردێ وارد و ئەحـوال ب ئـەوراد دێ چ کـت؟[9]

شیعری نالی (مەلا خدری شارەزووری ١٨٠٠- ١٨٧٢)
تا لـە مـن ئـەو زولفە رێی بۆسـە و کـەناری گـرتووە
نـاو دەمم بێ شـوبهە تامـی زەهـری مـاری گـرتووە
خۆش لەسەر سینەی سەری هەڵداوە دووگۆی سەر بە مۆر
مـات و حەیـرانم کـە عەرعەر کـەی هەناری گرتووە !
ئەژدەهای زوڵـفی لـە دەوری گەنجی حوسـنی حاریـسە
حەلقە حەلقە، چین بە چین، سـەر تا بە خواری گرتووە
مـاهی من تەنها مـەهێکە صـەد نـوجـومـی مـەحو کـرد
یـاری مـن تـەنها گـوڵـێکە صـەد هـەزاری گـرتووە
دامـەنی پـاکی مـەداری دائیـرەی خـامـەك نیـیـە
خـوێـنـی مـەقـتـوولانە وا دامـێـنـی یـاری گـرتووە
گرد و بادی هیجری تـۆ وا عالـەمـی لێ کردمـە تـۆز
نـەك دووچـاوم، بەڵکـە حـەتتا دڵ غوباری گـرتووە[10]

---

٩- دیوانا مەلایێ جزیری، بەرهەڤکرن و ڤەوژارتنا تحسین ابراهیم دۆسکی، پێداچوون و لێ زڤڕینا اسماعیل طـە شاهین، دهۆك،٢٠٠٠، ل ٨١.

١٠- دیوانی نـالی، لێکدانـەوەو لێکۆڵینـەوەی مـەلا عەبدولکـەریمی مـودەڕیس و فـاتح عبدالکریم،بەغـدا، ١٩٧٦،.

## ١- بزووتنەوەی ڕۆشنگەریی - Enlightement :

بزووتنەوەی ڕۆشنگەریی[1] وەکو قۆناغێکی بەر لە ڕۆمانسییزم دەورێکی گرنگی لە ژیانی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریی ئەورووپادا گێڕاوە. ئەو بزووتنەوەیە بە خەباتێکی ئایدۆلۆژی چینی ناوەڕاست لە دژی دەرەبەگایەتی لە قەڵەم دەدرێت. کۆتایی ئەو بزووتنەوەیە بە شۆڕشی بۆرژوازی فەڕەنسی ١٧٨٩ هات. لایەنگرانی ئەو بزووتنەوەیە هەموو هەوڵ و تەقەلایەکیان بۆ ئەوە بوو، کە هەموو لقەکانی زانست و زانیاری گشتی ئینسکلۆپیدی بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی بەکاربهێنن. تەنانەت یەکێ لە پیاوانی بزووتنەوەی ڕۆشنگەریی دەڵێ " فەلسەفە ئەو زانستەیە لە بەختەوەری دەکۆڵێتەوە " یەکێکی دیکەیان دەڵێ : " ڕۆشنگەرەکان پیاوانی مەزن بوون. لە فەڕەنسا ئەوان بوونە هۆی ڕۆشنکردنەوەی بیری خەڵك و ئامادەکردنیان بۆ شۆڕشی فەڕەنسا. تا ئەو پەڕی گیانی شۆڕشگێڕیان تیا بوو. ڕەخنەیان لە هەموو بیروباوەڕ و یاسا و دەستوورێك دەگرت و (عەقڵ) یان کردبووە تاکە پێوانەیەك و هەموو شتێ نەیتوانی مەعقولێیەتی خۆی بسەلمێنێ، لە دژی دەوەستن ". مەملەکەتی عەقڵ بە نەزەری ئەوان، مەملەکەتی بۆرژوا بوو. خۆی لە دادوەری و یاساکانی بۆرژواکاندا دەدۆزییەوە.

ڕۆشنگەرەکان دەیانوت مرۆڤ لە خۆڕسکەوە دەروونی باش و چاکە. ئەمەش هەنگاوێك بوو لە دژی کلێسا، کە دەیانوت مرۆڤ بە هۆی " گوناهی یەکەمەوە " لە زەوی یان دۆزەخدا دەژی و شوێنی سزای خودایە و زەوی بە شەهوەتی مرۆڤ پیس بووە. ڕۆشنگەرەکان دەروونی شەڕانی و شەڕی بە کۆمەڵی مرۆڤیان دەگەڕاندەوە بۆ هۆکاری ژینگە و کۆمەڵایەتی و دەوروبەر. پێشکەوتنی پەیوەندی بۆرژوازی لە ئینگلتەرە و بڵاوبوونەوەی ئەنجامەکانی بووە هۆی بەرقەرار بوونی هەوایەکی لەبار بۆ پەلەکردن لە هاتنە کایەکی فەلسەفەی بۆرژوازییەت و زانست و هونەری بۆرژوازی. لە سەدەی هەژدەهەمدا ئینگلتەرا بووە مەڵبەندی بیری پێشکەوتنخوازی و ڕووناکبیریی و هەموو ڕۆشنبیرانی ئەورووپا سوودیان لە بیری ئینگلستان وەرگرت. مۆنتسکیۆ و ڤۆلتێر و دیدرۆ و لیسنك و ڕۆسۆ و کۆمەڵی زریان و هەڵچوونی ئەڵمانیا هەریەکە و بە شێوەیەکی تایبەتی خۆی ئیلهامیان لە نموونە ئینگلیزییەکان وەردەگرت. تەنانەت زاراوەی

١- (کانت)ی فەیلەسوف ڕۆشنگەریی وەها پێناسە دەکات : بریتییە خۆ ڕزگارکردنی مرۆڤ لەو حاڵەتە ناهەموارەی کە خۆی بۆ خۆی دروستی کردووە. بڕوانە: عبدالرحمن البدوی، نیتشه،القاهرە، ص ١٢١.



ڕۆشنگەریی Enlightement وەها بە وڵاتانی ئەورووپا بە تایبەتی فەڕەنسا و ئەڵمانیا و ڕووسیادا بڵاوبووەوە، کە لەناو ئینگلتەرا خۆی وەها نەناسرابوو.

بیروباوەڕەکانی فەیلەسووفی ئینگلیزیی جۆن لۆك John Locke کاریگەرییەکی گەورەیان کردە سەر بڵاوبوونەوەی ئەو بزووتنەوەیە. بە تایبەتی لەو ڕووەوە، کە ئەو لە دژی بیروباوەڕی غەریزە بوو، کە لەگەڵ مرۆڤدا لە دایك ببێت و فەلسەفەی ئایدیالزمی دیکارتی لەسەر چەسپا بوو.



**جۆن لۆك** John Locke

لێکۆڵەرەوەکان دەڵێن " سویفت " لە سەرەتای سەدەی هەژدەهەمدا تاکە نووسەری ڕۆشنگەریی بوو، کە لە ڕەخنە ساتیرییەکانی بۆ پێشکەوتنی بۆرژوا زۆر مەنتقی بوو. ئەدەبی ڕۆشنگەرەکان خاسیەتێکی تری هەیە، ئەویش لایەنی کۆسمۆپۆلیتی Cosmopolitan یەکەیەتی. نووسەرە پێشکەوتنخوازە فەڕەنسییەکانی سەدەی هەژدەهەم لە سنووری نەتەوەیی دەرچوو بوون و خۆیان بە " هاووڵاتییەکی جیهانی " لە قەڵەم دەداو لە پێناو گۆڕینەوەی ڕۆشنبیریی نێو دەوڵەتیی لە ئەورووپا کۆششیان دەکرد و چەمکی "کۆماری ئەدەبی" یان داهێنا، کە هیومانیزمەکانی سەردەمی ڕێینسانس بناغەیان بۆ دانا. پایتەختی ئەو کۆمارە ئەدەبییەش لە

سەدەی هەژدەهەمدا پاریس بوو. زمانی فەرەنسیش، کە لە سەدەی حەڤدەهەمدا زمـانی دەربـار و کۆشکی پاشاکان بوو لە سەدەی هەژدەهەمدا لە هەموو ئەوروپادا بڵاوبووەوە و بووە زمانی زانـست و فەلسەفە. بزووتنەوەی رووناکبیریی لە سەدەی هەژدەهەمدا لە ئەوروپا باشترین خەباتی ئایدۆلۆژی چینی ناوەڕاست بوو دژ بە دەرەبەگایەتی و پاشماوەکانی ئەو سیستەمە و کۆتاییەکەشی بە شۆڕشـی فەرەنسی ۱۷۸۹ هات. رووناکبیرەکانی ئەوروپا، کە خاوەن رۆشنبیرییەکی ئینسکلۆپیدی بوون، لـە هەوڵی ئەوە دابوون، کە هەموو لقەکانی زانست لە خزمەتی مرۆڤایەتی دابێت و بۆ ئەو مەبەستەش تا ئەوپەڕی شۆڕشگێڕی شۆڕشگێڕ بوون و دەسەڵاتی (عەقڵ) یان کردبووە مەحەك و لە دژی هەموو شتێکی ناماقوڵ و نا مەنتقی بوون. مەسەلەکانیان هەمووی بە دەوری مـرۆڤ و سروشـتی مرۆڤـدا دەسوڕایەوە و بانگەوازیان ئەوە بوو، کە مرۆڤ بە سروشت و لە ئەزەلەوە باش و چاکەخوازە، ئەمەش هەنگاوێك بوو دژی عورف و یاسا کۆن و رزیوەکانی کڵێسا، کە بـاوەڕی وا بـوو مـرۆڤ لـە گونـاھ کەوتۆتەوە، یەکێ لە خاسیەتەکانی ئەدەبی رۆشنگەرەکان ئەوە بوو، هەر ئـەدیب یـان هونەرمەنـد نەبوون، مامۆستایەکی کۆمەڵایەتی و ڕابەرێکی سیاسیی و ئامۆژگاریکەری ڕەوشت و فەیلەسـووف بوون، بۆ نموونە لە ئەدەبی فەرەنسیدا ڤۆلتێر و مۆنتـسیکیۆ و دیـدرۆ و رۆسـۆ و بۆمارشـیە ئـەوە دەوریان بوو.

لە کاتێکدا، کە بزووتنەوەی رۆشنگەریی لە چڵەپۆپەی پێشکەوتنی دابـوو، ڕووەو جیابوونـەوەو دابەش بوون دەچوو، ئەمەش لـە ئـەنجامی لێـك دابڕانـی کۆمەڵایـەتی نێـو چـینی سـێیەم بـوو. دیموکراسیترین باڵی ئەو بزووتنەوەیە هونەرمەندو ئەدیبی ناسراو (رۆسۆ J. J. Rousseau 1712-1778) بەرێوەی دەبرد و زۆر بە توندی دژی سروشتی میتافیزیکی عەقڵ وەستا، رۆسۆ فەلسەفەی (هەست و ئیمان) ی دەربڕی، کە زۆر بە گەرمی بەرگری لە مافی کەسـایەتی مـرۆڤ دەکـرد دژ بـە چەوساندنەوەی چینایەتی و نایەکسانی کۆمەڵایەتی. بەر لـەوەی سـەدەی هەژدەهـەم تـەواو بێـت، تەوژمی سۆز (النزعة العاطفية) وەکو دیاردەیەك لە نێو بزووتنەوەی رۆشنگەریی هەموو ئـەوروپای گرتەوە. ئەو تەوژمەیش هەروەکو درێژە پێدانێکی خەباتی سیاسیی و ئـەدەبیی چـینی ناوەڕاسـت وابوو لە دژی بنەماکانی ڕژێمی دەرەبەگایەتی لە ڕێگەی ئەم تەوژمەشەوە بوو چینی ناوەڕاست بووە چەند باڵێك.



J. J. Rousseau 1712-1778 ڕۆسۆ

لە ساڵانی سی تاوەکو پەنجاکانی سەدەی هەژدەهەم شیعری ویژدانی تاکە هونەری ئەدەبی بوو لەو مەیدانەدا. ئەمەش هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ خۆبەستنەوەی ئەو تەوژمە نوێیە (سۆز) بە لایەنی – خود – بە شێوەیەکی وا کە دوو بابەتی سەرەکی نێو شیعرەکانیان، مەسەلەی سروشت و مەسەلەی مردن بوو.

## سانتمانتالییزم Sentemintalism

زاراوەی سانتمانتالییزم : مەبەست لەم زاراوەیە ئەوەیە، بەشداربوونی هەموو چین و توێژەکانی گەل لە کردەی فیکر و هونەر و ئەدەب و زانستەکانی تردا. ئەمە لە چەمکە گشتییەکەی ڕۆشنگەریدا، بەڵام چەمکە تایبەتییەکەی، واتا : لە سەردەمێکی دیاری کراوی مێژووی ئەوروپادا دەکۆڵێتەوە، کە تیایدا بزووتنەوەیەکی فیکری پێشکەوتنخوازی گەورە باو بوو، لەو قۆناغەدا، کە ململانێیەکی توندوتیژی بەرژەوەندییەکانی چینی دەرەبەگ و ئۆرستۆکراتییەکانی سەدەی هەژدەهەم لە ئارادا بوو.



ڕۆشنگەریی خاڵی وەرچەرخانێك بوو، ڕۆشنگەرەکان دەیانویست گۆڕانێکی بنجی و بنەڕەتی لە کۆمەڵەکەیاندا بەرپا بکەن و لەسەر بنەڕەتێکی ئیستاتیکی سەیری ڕۆڵی پەروەردەی هونەر بکەن. چالاکییەکانی هونەر خۆی لە بارێکی دیموکراسیدا بنوێنێ و بکەوێتە بەردەستی هەموو لایەك، بە شێوەیەك لە تێڕوانینێکی واقیعانە ئەم جیهانە وێنەکێش بکرێت. هەروەها هەوڵی ئەوەشیاندا تێڕوانینی کلاسییزمەکانی سەدەی حەڤدەهەم بۆ فەلسەفەی ئەرستۆ، کە شێواندبوویان، ڕاست بکەنەوە. بەرهەمە ئەدەبییەکانی سەردەمی ڕۆشنگەری لە فەڕەنسا مۆرکێکی فەلسەفیی هەبوو. تەنانەت بەشی زۆری ئەم بەرهەمانە بریتی بوون لە لێکۆڵینەوەی فەلسەفی، بۆیە ڕێبازێکی عەقلانیان پێوە دیار بوو. لەو سەردەمەدا، (لە سەدەی هەژدەهەمدا)، بیر و بۆچوونی ریالسیتی ڕەخنەیی سەری هەڵدا و کۆمەڵێ ڕۆمانی کۆمەلایەتی و سیاسی ڕەوشتی دەرکەوتن. لە هەمانکاتدا ڕۆشنگەرەکانی ئەو سەردەمە داوای ئەوەیان دەکرد، کە هونەرمەند ماوەی ئەوەی بدرێت، کە باسی سۆز و ویژدان و پاڵەوانەتییەکان و ڕۆڵە هەژارەکانی میللەت بکات، بۆیە سەیر دەکەین بۆ یەکەم جار لە مێژووی ئەدەبیاتی ئەوروپادا خەڵکی ساکار و چینە هەژارەکان وەکو پاڵەوانێکی پۆزەتیڤ لە بەرهەمەکاندا دەردەکەون.

بۆ یەکەم جار زاراوەی سانتمانتالیزم لە ساڵی (١٧٦٨) ی زایینی دا لە لایەن (ستێرن) ی نووسەرەوە بەکارهاتووە لە کتێبێکدا بەناوی " گەشتێکی سانتمانتالی ".

ئەم تەوژمە زیاتر بایەخی بە سۆزی مرۆڤ دەدا، هەندێك لە نووسەران دەڵێن سەرچاوەی هەموو زانستێك لەسەرەتاوە هەست و سۆزی ئێمەیە. هەست ئەو شتەی، کە بوونیان هەیە لێك ناترازێت.

سانتمانتالییەکان بە تێکڕا لەناو خودی خۆیاندا مەلە دەکەن، یەکێ لە خاسیەتەکانی ئەو ڕێبازە دەڵێت، عەقڵی مرۆڤ توانای دۆزینەوە و کەشف کردنی دنیای نییە، بۆیە زۆر جار شاعیر دەچێتە جیهانی ناوەوەی خۆی و هەوڵی ئەوە دەدات بە ڕێگەی فراوانکردنی هەستەکانی خۆیەوە لە جیهان تێبگات.

(ستێرن) لە گەشتەکەیدا بۆ فەڕەنسا و ئیتالیا، ئەوەندە گرنگی بە وەسفی شوێنەکان نادات ، کە بینیویەتی، بەڵکو ڕەنگدانەوەی ئەو حاڵەتانە و ئەو تابلۆیانەی بینیویەتی باسی دەکات.

هەندێ لە سانتمانتالییەکان پەیڕەوی ڕێچکەیەکی ئایینیان کرد، هەندێکی دیکەشیان ڕوویان لە ژیانی گوند و سروشت کرد. سانتمانتالی بە ڕێچکە ڕەشبینییەکەیەوە لای ئێدوارد هیوم ١٦٨٣ – ١٧٦٥ دەرکەوت. ئەم نووسەرە دووچاری کارەساتێکی خێزانی هات و بووە هۆی ئەوەی ڕوو لە ئایین بکات و زۆربەی کاتی خۆی لە نێو گۆڕستاندا بەسەر ببات و بیر لە چارەنووسی خەمباری مرۆڤ بکاتەوە. بە بیروڕای هیوم مرۆڤ بوونەوەرێکی بێ هێزە، جیهانیش دوو شت بەسەریدا زاڵن، یەکێکیان شەوی تاریك و سارد و سڕ و مەسەلەی دووەم ئەوەیە، کە مەملەکەتی تاریکی گەلێك لە جیهانی ڕووناکی بەهێزترە.

(هیوم) لەم ڕوانگەیەوە دژی ڕۆشنگەرانی فەرەنسیی وەستا و شالاٌویٚکی زۆری بردە سەر (ڤۆلتیٚر).

(هیوم) بە دامەزریٚنەری شیعری گۆڕستان لە قەلەٌم دەدریٚت و نویٚنەرایەتی لایەنە ڕەشبین و دواکەوتووەکەی سانتمانتالی کردووە. لە دوای خۆی ژمارەیەك شاعیری ئینگلیزی پەیڕەوی ڕیٚبازەکەی ئەویان کردۆتەوە. ئەم شاعیرانە بە نیٚو گۆڕستانەکاندا دەسوڕانەوە و لەگەلٌ ئیٚسقان و جوجومەی کەللە سەری مرۆڤ دەدوان و دەچوونە تابووتی مردوانەوە و باسی مردنیان دەکرد، کە هیچ جیاوازییەك لە نیٚوان هەژار و دەولٌەمەندەکاندا ناکات. یەکیٚ لەو شاعیرانە (تۆماس مان) بوو، کە دەیویست سروشتیٚکی دیموکراسیشی پیٚ بەخشیٚ و دلٌنەوایی ئەو کەسانە بکات، کە هەموو ژیانیان بە ماندوبوون و کلٌۆلٌی بەسەر بردووە. دەربارەی سانتمانتالیزم لە بواری چیرۆکدا، زیاتر لای چیرۆکنووسی ئینگلیزی (ئۆلیڤەر گۆلٌد) دا دەرکەوت وتیایدا سەرکەوتوو بوو.

## ئەدەبی ئینگلیزیی لە سەدەی هەژدەهەمدا

لە سەدەی حەڤدەهەمدا شۆڕشی کرۆمۆیل Cromwell ویستی ڕژیٚمی پاشایەتی بە ڕژیٚمی کۆماری بگۆڕیٚت، سەرکەوت و ماوەیەك حوکمی کرد، پاشان جاریٚکی دی خیٚزانی پاشایەتی گەڕایەوە ولاٌت. ئەو شۆڕشە کاریگەرییەکی زۆری بەسەر ئەو ولاٌتەدا هەبوو، لە سالٌی ١٧٨٩ یشدا، کە شۆڕشی فەرەنسی بەرپا بوو، بنەماکانی کۆمەلٌی ئەورووپی کە ئینگلتەرەیش دەگریٚتەوە هەمووی هەژاند.

لە سەدەی هەژدەهەمدا ئینگلیزەکان خەریکی کۆمەلٌیٚك شەڕی ئیستعماری بوون بۆ ئەوەی سنووری دەستەلاٌتی خۆیان فراوان بکەن. توانیان لە شەڕەکانی ١٧٠١ — ١٧١٣ پاشماوەی ئەوانەی لە ژیٚر دەستی ئیسپانیادا بوون دابەشی بکەن. توانیان جەبەل تاریق و دوورگەکانی مینۆرکی کە دەروازەی دەریای سپی ناوەڕاست بوو کۆنترۆلٌ بکەن. هەروەها توانیان پورتوگال بخەنە ژیٚر ڕکیٚفی خۆیان و لە هەمانکاتدا شۆڕشی ئیٚرلەندەیان لە سەدەی حەڤدەهەمدا دامرکاندەوە و بەروبوومی ئەو ولاٌتەیان بۆ خۆیان تالاٌنکرد، توانیان زیاتریش پەل بهاویٚژن و لە ئەمریکاش هەندیٚ کۆلۆنیالی بۆ خۆیان دروست بکەن.

چەندین کاری دیکەیان ئەنجامدا، وەکو دەست بەسەر داگرتنی بازرگانی قولەڕەشەکان و بەشداریکردن لە شەڕیٚك دژی نەمسا و بەشداری لە شەڕیٚکی تری حەوت سالاٌنەدا، لە بەرامبەر ئەوەی شتیٚکی دەست بکەویٚ، هەروەها توانی کەنەدا لە فرەنسییەکان بسەنیٚتەوەو بە دەریان بنیٚت.

هەموو ئەنجامەکانی ئەم شۆڕشە کۆلۆنیالییە لە بەرژەوەندی دەرەبەگایەتی و چینی بۆرژوای ئینگلیزیدا بوو، بە شیٚوەیەك پشتی کردە داخوازییەکانی ئەو شۆڕشە میللییە، کە پشتییان کردە هەموو



باوەڕیٚکی ئازادیخوازی، تەنانەت دواتریش دژی شۆڕشی فرەنسیی ١٧٨٩ وەستانەوە و هاوکاری ڕژیٚمەکانی ئەورووپایان دەکرد بۆ سەرکردایەتی بزووتنەوەیەکی کۆنەپەرستی لە دژی فەرەنسییەکان و بەرژەوەندی فەرەنسا.

مەلیکی فەرەنسا (بۆربۆن) خۆی و خیٚزانەکەی لە ئینگلتەرا مانەوە، ئینگلتەرا بۆ بەرگری لە خیٚزانی مەلیك، لە شکریٚکی گەورەی پیٚکەو ناوە شەڕی (واترلۆ) ی کرد، لە ئەنجامدا ناپلیۆن دۆڕاندی و دوای شەڕەکە مەلیك لویسی هەژدەهەم دەستەلاٌتی ولاٌتی گرتەوە دەست و ئەم پیاوە ڕاستەوخۆ ئینگلتەرا پاریٚزگاری لیٚ دەکرد.

لە سالٌی ١٧٩٠ دا ئەندامی پەرلەمانی ئینگلستان مۆندریك زۆر بە ئاشکرایی لە کتیٚبیٚکیٚدا، کە بە ناونیشانی (چەند یاداشتیٚك دەربارەی شۆڕشی فەرەنسا) یە، باسی پەیوەندی بۆرژوای ئینگلیزی لە دژی شۆڕشی فەرەنسا دەکات. لە کتیٚبەکەیدا هاتووە : " پیٚویستە هیٚزیٚکی خاچیانە دژی فەرەنسا بکریٚت و تیایدا نەفرەت لە بیروبۆچوونی ڕۆشنگەرەکان بکریٚت ".

لەو ماوەیەدا کۆمەلٌیٚك فەیلەسووف و نووسەر پەیدا بوون، وەکو (لۆك، برستلی، بریکلی، دیڤید، هیوم). ئەم نووسەر و فەیلەسووفانە دوو بەش بوون، بەشیٚکیان هیٚرشیان دەکردە سەر ڕژیٚمی ئەو سەردەمە و بەشەکەی تریشیان پشتگیرییان لیٚدەکرد. دوو بەش بوون، گەشبین و ڕەشبین. لەو ماوەیەدا لە بواری ئەوە هەست دەکەین کۆمەلٌیٚك ڕیٚبازی فەلسەفی و هونەری هاتنە مەیدان. هاوکات لەگەلٌ کۆتایی سەدەی حەڤدەهەمدا شیعرەکانی(جۆن میلتۆن ١٦٠٨ - ١٦٧٤) شاعیری ئینگلیزیی لە ژیٚر ناونیشانی (بەهەشتی ونبوو) دەرکەوت. میلتۆن لە ئەدەبەکەیدا سیمای تازەی کۆمەلٌ و ئەدەبی ئەورووپی دارشت. ئەم نووسەرە ژیانیٚکی ناخۆش ژیاوەو دواتر هەولٌەکانی خۆی بۆ هونەرەکانی ئەدەب تەرخانکرد، هەر لە تەمەنی گەنجیەتیدا دەستی بە شیعر نووسین کرد وسەرەتا شیعریٚکە بە ناوونیشانی (لە دایکبوونی مەسیح)ەوە دانا، دواتر زانکۆی (کامبریدج)ی تەواوکردووە. ئەم نووسەرە تا ڕادەیەکی زۆر کەوتبووە ژیٚر کاریگەری ئایینەوە، لەسالٌی ١٦٦٧دا بەرهەمە بە ناوبانگەکەی (بەهەشتی ونبوو)ی بە (١٠)بەرگ تەواو کرد و بلاٌوی کردەوە، دواتریٚ دوو بەرگی تریشی بۆ زیادکرد و لە سالٌی ١٦٧٤دا تەواو بوو. میلتۆن لە کۆتایی ژیانی بە نابیناییش هەر لەگەلٌ خویٚندنەوە و نووسیندا بوو، تاوەکو لە ١٦٧٤دا کۆچی دوایی کرد. ناوەرۆکی ئەو بەرهەمەی باس لە چیرۆکی ئادەم و حەوا دەکات و بەکارهیٚنانی ڕەمزی شەیتان بە شیٚوەیەکی ئەدەبی بۆتە هەویٚنی بابەتەکەی. دوابەدوای میلتۆن نووسەریٚکی تر بەناوی دانیال دیڤۆ (١٦٦١ - ١٧٣١)ەوە دەرکەوت. دیڤۆ پەیڕەوی ئەو بنەمایەی دەکرد، کە میلتۆن دایڕشتبوو.

پاڵەوانەکەی دیڤۆ (ڕۆبنسۆکرۆز)یە، کە گوزارشت لە کەسایەتییەکی ئینگلیزیی گەشبین بە ڕژێمی نوێ دەکات، بۆیە سەیر دەکەین بڕوای قووڵی بە ئادەمیزاد و ژیان و ڕەنگی ئادەمیزاد هەیە.

(سویفت Swift ١٦٦٧ — ١٧٤٥)، کە یەکێکە لەو نووسەرە ئینگلیزانەی دژی چەوسانەوەی ئیمپریالیزمی بوو، ئینگلستان پەیڕەوی دەکرد. هەروەها لە نووسینەکانیدا ڕەخنەی توندی ئاراستەی دۆق ئەلبۆرۆ کردووە بەرامبەر بە لەناوبردنی میرنیشینەکانی ئەسپانی. ئەو نووسەرە (سویفت)، هەروەکو(رابلێ) ی نووسەری فەڕەنسیی بە شێوەیەکی خەیاڵی و گاڵتەجاڕیی ڕەشبینییەکەوە سەیری توانای ئادەمیزادی دەکرد.

دوا بەدوای ئەو نووسەرانەش (ریچاردسن) پاڵەوانەکانی لەناو خەڵکی سادەو ساکاری میللەت هەڵبژارد، چونکە ئەم جۆرە پاڵەوانانە پێشتر تەنیا لە کۆمیدیا بەرچاو دەخران و لە رۆمانیشدا کەسایەتییەکی لاوەکی بوون.

(سامۆئیل ریچاردسن) (١٦٨٩- ١٧٦١) لە نۆڤەمبەری ساڵی ١٧٤٠دا دوو بەرگی لە رۆمانی (بامیلا) نووسی، کە بریتییە لە کۆمەڵێ نامەی خێزانی لە کچێکی گەنجی جوانەوە بۆ باوك و دایکی، کە یەکەمجارە بڵاو دەبێتەوە بۆ ئەوەی بنەماکانی رەوشتبەرزی و دین لە ناخی گەنجەکان بە هەر دوو رەگەزەوە بچەسپێنێ. کتێبەکەی رەواجی هەبوو، ریچاردسن لە ساڵی ١٧٤١ دا دوو بەرگی دی بۆ زیادکرد بە ناوونیشانی ((بامێلا لە جوانترین حاڵدا))، کە تیایدا باسی رەوشتبەرزی و حیکمەتی ئەو لە دوای شووکردنی دەکات.)[٢] ژیانی ئەو ئافرەتە دەخاتە ڕوو و دەیەوێ بڵێ خەڵکی سادەش خاوەن هەستن و توانای بیرکردنەوەیان هەیە. ئەمە سەرباری ئەوەی ئەو نووسەرە گرنگییەکی زۆری بە لایەنی دەروونیی پاڵەوانەکانی داوە.

---

٢- ول ديورانت، قصة الحضارة، عصر فولتير، ترجمة فؤاد اندراوس و محمد علي ابو درة، القاهرة، ٢٠٠١، ص٢٧٠.





**سامۆئیل ریچاردسن (١٦٨٩- ١٧٦١)**

## دانیال دیڤۆ و بەرهەمەکانی

دانیال دیڤۆ De Foe (١٦٦١ — ١٧٣١ ز)، بە یەکێ لە نووسەرە گەورەکانی ئەدەبی ئینگلیزیی لە قەڵەم دەدرێت. بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٧٠٢ دا وتارێکی گاڵتەجاریی بە ناونیشانی (کورتترین ڕێگا بۆ سزادانی جۆن) نووسی و تیایدا هێرشی کردە سەر قەشەکانی پۆرتیانییەکان و ئینگلیزەکان. بە هۆی ئەم وتارەوە لە لایەن حکوومەتەوە گیراو خرایە بەندیخانەوە. لە ساڵی ١٧٠٣ دا لە بەندیخانە بەرهەمێکی کورتی بە ناوی (سروودێك بۆ

تەختەی ئابڕوو چوون) نووسی و شانازی بە کارەکەیەوە دەکات. چونکە، کە گیرا سێ جاران بردیانە سەر تەختەی ئابڕوچوون. خەڵکی لەندەن بەم وتارەی سەرسام بوون.

لە ساڵی ١٧٠٤ دا لە بەندیخانە ئازادکرا، دوای ئازادبوونی گۆڤاری مانگانەی (Review)ی لە نێوان ساڵانی (١٧٠٤- ١٧١٣)دا بڵاوکردەوە. لە کۆتایی تەمەنیدا زۆر قەرزبار بوو ژیانێکی ناخۆش دەژیا تا لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

**بەرهەمەکانی :**

دانیال دیڤۆ نزیکەی ٢٥٠ بەرهەمی هەمە چەشنەی نووسیوە. لە هەموو بوارەکانی شیعر و پەخشان و رۆمان و دەریاوانی و یاسا و مێژوو و بابەتەکانی دی. دیارترین رۆمانی (ژیانی رۆبنسۆ کرۆزۆ Robinson Crusoe) یە، کە لە ساڵی ١٧١٩ دا نووسیویەتی بەرهەمەکانی تری وەکو (ژیانی کەشتیوانێکی ناسراو)، (یاداشتی سواریك)، رۆمانی (ژنە عاشقێکی بەختەوەر — ١٧٢٤)، رۆمانی (یاداشتەکانی جورج کاریتۆ ١٧٢٤)و (مۆل فلاندەرز - 1722 Moll Flanders) و (رۆکسانا Roxana- ١٧٢٤).

رۆمانەکانی بە شێوازێکی ساکار نووسراون زمانەکەشی سادەیە، بە تایبەتی لە وەسفکردندا، سەرجەم رۆمانەکانی یاداشتی پاڵەوانەکانە، بۆیە چیرۆك و رۆمانەکانی لە منداڵییەوە دەست پێدەکات، پاشان پەروەردەی ژیانی کەسەکان لە ڕۆمانی(روبنسۆ کرۆزۆ)، کە دیارترین ڕۆمانی ئەو نووسەرەیە، بە یەکەم چیرۆکی ریالیيزمی ڕەخنەگرانەی ئەدەبی ئینگلیزیی دادەنرێت و لەو سەردەمەدا گرنگییەکی زۆری پێ درا، چونکە مەسەلەی سەفەرکردن و جوگرافیا بایەخی خۆی هەبوو. لە سەدەی هەژدەهەمدا بۆ زۆربەی زمانەکانی ئەوروپا وەرگێردرا. ڕۆمانەکە بریتییە لە سێ بەش :

**بەشی یەکەمی بریتییە لە ژیانی ڕۆبنسۆ کرۆزۆ.**

**بەشی دووەمی بریتییە لە سەرەڕۆییەکانی کرۆزۆ لە سیبریا و چین.**

**بەشی سێیەمی بریتییە لە هەندێ یاداشتی کرۆزۆ، بە تایبەتی یاداشت و ڕامانە ئایینی و بازرگانیەکانی.**

هەندێ لە مێژوونووسانی ئەدەب دەڵێن ئەم ڕۆمانەی (دیڤۆ) ژیانی خۆیەتی. دەربارەی ئەم ڕۆمانەی خۆی دیڤۆ نووسیویەتی " ڕۆبنسۆن کرۆزۆ زۆر ئازا بوو، بڕوای بە خۆی هەبوو، لە ئەنجامدا بەسەر سروشتدا سەرکەوت ".





**سویفت** Swift ١٦٦٧ — ١٧٤٥[3]

لە پاڵ (دانیال دیڤۆ)دا دەورێکی گرنگی هەیە لەو قۆناغەدا، کە بە قۆناغی سانتمانتالییزم ناسراوە و ئەڵقەیەکە لە نێوان کلاسییزم و ڕۆمانسییزمدا. ئەم نووسەرە ١٦٦٧ لە دایکبووە. باوکی ئێرلەندییەو لە خێزانێکی هەژار هاتۆتە دنیاوە. باوکی خۆی نەدیوە. پاشان کەوتۆتە لای مامی. لە تەمەنی ٢٢ ساڵیدا حەزی بە ژیانی تەنیایی دەکات. پاشان لای لۆردێکی ئینگلیزی بە ناوی (ولیەم) دەبێت و زۆربەی کاتی خۆی لە کتێبخانەی ئەو لۆردە بەسەر دەبات. کچە ناشەرعییەکەی لۆرد، کە ناوی (ئیستر جۆنسۆن) دەبێ دەرسی پێ وتوە و پاشان بووە بە ژنی سویفت.

سویفت کۆمەڵە شیعرێکی لەسەر ئەو کچە نووسیوە بە ناوی(ستێلا Stella)، لە ساڵی ١٧٠٨ دا ئەم شاعیرە زۆر بە توندی دژی سیحر و خورافات و ئەستێرەناسیی نووسی. بۆ ئەوەی ئاشکرا نەبێ لای حکوومەت ناوی خۆی کرد بە (ئیسحاق)، چەند وتارێکی لەسەر پیاوێك نووسی، کە لەو کاتەدا خەریکی سیحر و خورافات بوو لە (لەندەن). پاشان سویفت تێکەڵ بە کاروباری سیاسی بوو، پەیوەندی لەگەڵ (هاری) سەرۆك وەزیراندا باش بوو، تا وای لێهات بوو بە وەزیری بێ وەزارەت و لە باڵەخانەیەکی سادە دا دەژیا. سەرۆك وەزیران ویستی زیاتر بۆ لای خۆی ڕایبکێشێ و

---

٣- دەربارەی ژیان وبەرهەمی سویفت بڕوانە: اطلاعات عمومی سخن، ترجمە و تالیف سعید درودی، چاپ هفتم، چاپخانه مهارت، ١٣٧٩.

پاداشتێکی بۆ نارد، بەڵام سویفت ڕەتی کردەوە. شازادە زانی سویفت جەماوەری زۆر بووە، بۆیە بۆ ئێرلەندا دووریان خستەوە و لەوێ بوو بە سەرۆکی قەشەکانی کڵێسا. لەوێش سویفت ژیانی هەژاری و برسییەتی خەڵکی ئێرلەندای لە کتێبێکدا بەناوی (نامەکانی بەزازێك Drapier Letters - ١٧٢٤) بە ناوێکی خوازراوەوە بڵاوکردەوە. حکوومەت بەم نامانە زۆر دڵتەنگ بوو، تەنانەت پاداشتی تەرخانکرد بۆ ئەو کەسەی نووسەری ئەم نامانە ئاشکرا بکات. هەرچەندە خەڵکی ئێرلەندا دەیانزانی (سویفت)ە، بەڵام ئاشکرایان نەدەکرد. ئەم شاعیرە ئەگەر لە ژیانی خێزانیدا سەرنەکەوتبێ، ئەوا لە بواری ئەدەبدا سەرکەوتنی بەدەست هێناوە. بە تایبەتی ئەو نامانەی بۆ (ستیلا) ی خۆشەویستی نووسیوە، ئەگەرچی ماوەی خۆشەویستییەکەی لەگەڵ (ستیلا) زۆر کورت بووە و نهێنی بووە، لە ساڵی ١٧٢٨ دا (ستێلا) کۆچی دوایی کردووە. مردنەکەی کارەساتێکی گەورە بوو بۆ سویفت و خۆیشی لە ١٧٤٥ دا مرد. لەسەر گۆڕەکەی نووسراوە : " لێرەدا تەرمی جوناسان سویفت نێژراوە، هەموو شەڕی دنیا نەیتوانی دڵەکەی لەت بکات — ئەی ڕێبوار تۆش ئەگەر توانیت لاسایی بکەرەوە ".[٤]

## ئەدەبی فەرەنسیی سەدەی هەژدەهەم

لە ئەنجامی هۆیەکانی دەست بەسەرداگرتن و سەروەریدا کڵۆنیالییزمیی فەرەنسیی و ئینگلیزیی ناکۆك بوون، بەڵام ئینگلیزەکان زیاتر هەلیان بۆ رەخسا، کە خۆیان بە هێز بکەن و لە زۆربەی ئەو ڕووداوانەیش فەرەنسای تێدا تاوانبار دەکرد. لەو شەڕ و ڕووداوانە شەڕی ١٧٠١ — ١٧١٤ بۆ دابەشکردنی میراتی ئیسپانییەکان.

ئەم شەڕوشۆڕانە بووە هۆی ئەوەی بارودۆخی ئابووری فەرەنسا تێکبچێت و گەنجینەی دەوڵەت خاڵی بێت، میللەتیش لەو پەڕی هەژاریدا دەژیا. خەرجییەکانی پاشا و دەست و پێوەندەکانی زۆر لە داهات زیاتر بوو. لەو کاتەدا ئەو قسەیە بڵاوبۆوە، کە دەگێڕنەوە و دەڵێن : ماری دەنتوانێت، کە ژنی لویسی شازدەهەم بوو پێیان وت : میللەت ڕاپەڕیون نانیان نییە، پێی وتن با بسکویت بخۆن.

٤- بۆ ئەم زانیارییانە سوود لەم سەرچاوەیە وەرگیراوە : د.سالم احمد الحمداني، مذاهب الادب الغربي و مظاهرها في الادب العربي الحديث، الموصل، ١٩٨.



ئەگەرچی لەو کاتەدا لە شارەکانی لیون و پاریس و مارسیلیادا بازرگانی لە پێشکەوتن دابوو، بەڵام بە هۆی ئەو باجە زۆرە وای کردبوو چینی ناوەڕاست و سەروویش ناڕازی بوونی خۆیان پیشان بدەن.

گوندەکان بەرەو وێرانی دەڕۆیشتن، تەنیا شۆڕشێکی گەورەی سەرتاسەری دەیتوانی ئەو بارودۆخە بۆ کۆمەڵانی خەڵکی سادە. لەو کاتەدا ڤۆلتێر لە نامەیەکی نوسیوویە : ئەو ڕووداوانەی لە دەوروبەرماندا ڕوو دەدەن نیشانەی چوزەرەی شۆڕشێکن، ئەم شۆڕشەش بێگومان بەرپا دەبێ و ڕووناکی هەموو لایەك دەگرێتەوە.

قۆناغی ڕۆشنگەریی فەرەنسیی بەسەر دوو قۆناغدا دابەش دەبێت :

**یەکەم** : سەرەتای سەدەی هەژدەهەم، هەندێ بەرهەمی ئەدەبی بڵاوکرایەوە، لەوانە تراژیدیای (ئۆدیب). ئەم تراژیدیایە ڕەخنەیەکی توندی ئاڕاستەی کڵێسا کرد، کە بنەمایەکە لە بنەماکانی ڕژێمی دەرەبەگایەتی.

**دووەم** : لەم قۆناغەدا کتێبی (مۆنتسکیۆ) ی یاساناس بەناوی - جەوهەری یاساکان، لە ساڵی ١٧٤٨دا بڵاوکرایەوە. هەروەها نووسەرێکی تر بەناوی (رابلێ) کتێبێکی بە ناونیشانی (مافی گشتی لە ئەوروپا) لە ساڵی ١٧٤٦ بڵاوکرایەوە. هەر لەو سەردەمەدا (دیدرۆ)یش کتێبێکی بڵاوکردەوە. (بۆفۆن) بەرگی یەکەمی کتێبی (مێژووی سروشتی) لە ساڵی ١٧٤٩ بڵاوکردەوە پاشان جان جاك رۆسۆ بە ناونیشانی " چەند بۆچونێك دەربارەی زانست و هونەرەکان " کتێبێکی بڵاوکردەوە.

لە سالی ١٧٥١ دا پرۆژەیەکی گەورە دەستی پێکرد، ئەویش پرۆژەی ئینسکلۆپیدیا Encyclopaedia بوو، کە ژمارەیەکی زۆر لە نووسەران بەشداریان تێدا کرد.

لە ساڵی ١٧٥٦ یشدا کتێبی (ڕەخنە لە مەسیحییەت) بڵاوکرایەوە. ئیتر ئەمانە پێشڕەوی پێشەنگی بیر و بۆچوونی نوێ بوون، هەولیان دەدا بنج و بناوانی ئایدۆلۆژی سەردەمی دەرەبەگایەتی لە بناغەوە هەڵتەکێنن بە توندی هێرشیان کردە سەر ئەو بیر و بۆچوونانە دەربارەی سروشت وکۆمەڵ و دەوڵەت.

کۆمەڵێك هونەرمەند پشتگیری ئەو ڕووناکبیرانەیان کرد، لەوانە شانۆنامەنووس (بۆمارشیە)و مۆزیکزانی گەورە (گریتری).. هتد.

ئەم ڕووناکبیرانە ڕوویان کردە هەموو بوارەکانی زانست و ڕۆشنبیری بێ هیچ جیاوازییەك، هەروەها زۆریش بەوە بەناوبانگ بوون، کە زانیارییەکی زۆریان لە بوارە جیاجیاکاندا هەبوو، پسپۆڕ بوون.

بۆ نموونە ڤۆلتێر شاعیر و مێژوونووس و هونەرمەند و چیرۆکنووس و ڕەخنەگر و ماتماتیك زان بوو. یان (دیدرۆ) شانۆنووس و ڕۆماننووس و ڕەخنەگری مۆسیقا و نیگارکێش بوو.

ئەم ڕووناکبیرانە تێکڕا ئاوڕیان لە پەروەردەکردنی نەوەی نوێ دەدایەوە، دیارترین نووسراو لەم بوارەدا کتێبێکی جان جاك رۆسۆیە بە ناونیشانی (ئیمیل)، کە کتێبێکی پەروەدەییە و گرنگییەکی زۆری بۆ پەروەدەی منداڵ داناوە.[5]

ئەم بەرفراوانییە بووە هۆی ئەوەی ئینسکلۆپیدیا بڵاوبکەنەوە، کە بە ڕووداوێکی فیکریی گەورە لە مێژووی ڕۆشنبیریی مرۆڤایەتی دادەنرێت. (دیدرۆ) توانی هەموو زانیارییەکان سەبارەت بە حکوومەتەکانی ڕابردوو کۆ بکاتەوە و چەند بەرگێکی ئەو ئینسکلۆپیدیایە تا ساڵی ١٧٨٠ بڵاوبکاتەوە، تەنانەت دوو بەشی هەر بۆ پێڕستەکان دەرچوو. خاڵێکی تر سەبارەت بەو ڕووناکبیرانە بێجگە لەوەی چەند بەهرەیەکیان تیا بوو، لە هەمانکاتدا شۆڕشگێڕیش بوون.

ڕژێمی پاشایەتی لە فەڕەنسا لە سەرەتادا بەرەبەرکانێی پڕۆژەی ئینسکلۆپیدیای دەکرد و بۆ ئەم مەبەستەش بە حکوومەت و کلێسا نووسەرێکی گەورەی وەکو (دالامپێر)یان لەو مەیدانە دوورخستەوە، کە هاوڕێی نزیکی دیدرۆ بوو. جان جاك ڕۆسۆ چەند وتارێکی سەبارەت بە مۆسیقا تیایدا بڵاوکردەوە. (مۆنتسکیۆ( وتارێکی بە ناونیشانی (چەشە) لەسەر جوانناسیی (ئیستاتیکا) نووسی، هەروەها چەند نووسەرێکی تر لەسەر زانستەکانی تر وتاریان بڵاوکردەوە.

ئەم نووسەرە شۆڕشگێڕانە باوەڕیان بەوە بوو، کە ڕۆژێك دادێت زانست و دادپەروەری لە فەڕەنسا سەقامگیر بێت. بەم شێوەیە ڕێچکەی زانستییان گرتبوو بۆ گەیشتن بەم ڕۆژە. ئەو گیانە زانستییەی نێو نووسینەکانیشیان دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵەی هیومانیزمەکانی ڕێینسانس و هەروەکو ئەوانیش زۆر ڕاستگۆ بوون و دڵسۆزی خاك و نەتەوەکەی خۆیان بوون. لە خاڵێکدا هەموویان هاوبەش بوون ئەویش هەوڵدان بۆ لەناو بردنی ڕژێمی دەرەبەگایەتی بوو. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ جار ناتەبا و

---

٥- ئەم کتێبەی رۆسۆ بە شێوەیەکی کورت و چڕوپڕ لە لایەن (شاکر فەتاح))ەوە وەرگێڕدراوە، بڕوانە: جان جاك رۆسۆ، ئیمیل، وەرگێڕانی شاکر فتاح، بەغدا، ١٩٨٤. هەروا بڕوانە: فەرمان عەبدوڵلاّ، جان جاك رۆسۆ و منداڵ، گ؛ کاروان، ژ ١٨٣، ل ٨٨-٩٢.



ناکۆکیش بوون، بۆ نموونە ڤۆلتێر سەبارەت بە نامیلکەیەکی ڕۆسۆ نووسیویەتی : فەلسەفەی ڕۆسۆ بریتییە لە پیاوێکی دەرۆزەکەر هەوڵی ئەوە دەدا، کە هەژارەکان دزی لە دەوڵەمەندەکان بکەن. هەروەها (ڕۆسۆ)یش ڕەخنە لە شیعرێکی ڤۆلتێر دەگرێت و دەڵێ: هەموو بۆچوونەکانی میتافیزیقیانەیە ناتوانێ وام لێ بکات، کە ناچار بم گومان بکەم لەوەی کە ڕۆح شتێکی نەبەرد نییە.

چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵ بڕوایان بە شۆڕشێکی بنجی هەبوو ڕژێمی سیاسیی لە کۆمەڵدا هەڵتەکەنێت، بەڵام بۆرژواکان تەنیا و تەنیا ڕیفۆرمیان دەویست، چونکە پەیوەندییەکی بەهێزیان لەگەڵ کۆشکی پاشادا هەبوو.

لە ساڵی ١٧٩١ — ١٧٩٣دا دوو هزر لە فەڕەنسا بەربەرەکانیان دەکرد، مۆنتسکیۆ ڕابەرایەتی ڕاست ڕەوەکانی دەکرد ئەوی تر گروپی یاقوبییەکان بوو لەسەر ڕاسپاردەکانی ڕۆسۆ بنەمای بیری خۆیان داڕشتبوو. لە ڕووی فەلسەفیشەوە، دوو فەلسەفە لە ئارادا بوو، فەلسەفەی ماددی، کە دیدرۆ سەرپەرشتی دەکرد، ئەوەی تریان ئایدیالیستی.

دوای شۆڕشی ١٢ تەمووزی ١٧٨٩ میللەت خەونەکانیان نەهاتەدی هەر بە هەژاری مانەوە وەکو شۆڕشی ئینگلیزیی خێر و بێرەکەی هەر بۆ بۆرژوا بوو.

## هۆیەکانی سەرهەڵدانی ڕۆمانسییزم

دەتوانین هۆیەکانی سەرهەڵدانی ڕۆمانسییزم لەو خاڵانەدا کۆبکەنەوە:

١- بزووتنەوەی رۆشنگەریی لە سەدەی هەژدەهەم لە ئینگلتەرا و پاشان لە ئەڵمانیا و فەڕەنسا و ئەوروپا دا وەکو ڕێخۆشکەرێك وا بوو بۆ شۆڕشی فەڕەنسا ١٧٩٩ و سەرهەڵدانی ڕۆمانسییزم.

٢- لایەنی نێگەتیڤی شۆڕشی فەڕەنسیی لە ئەدەبی فڕەنسییدا ڕەنگییدایەوە و ئەو نەهامەتی و شکستەی ناپلیۆن لە جەنگی (واترلۆ) دا بووە هۆی ئەوەی کار لە دەروونی ڕرۆناکبیر و شاعیرانی سەردەم بکات و بە (نەخۆشیی سەردەم)بناسرێت.

لەو کاتەوە ئەدەبی ڕۆمانسییزم بووە ئەدەبێکی تاکەکەسیی. کتێبی (دانپیانانەکانی کوڕە لاوێکی سەردەم)ی شاعیری ڕۆمانسییزمی فەڕەنسیی (ئەلفرێد دی مۆسییە A. De Musset 1810-1857) نموونەی ئەم جۆرە ڕەنگدانەوەیە.



ئەلفرێد دی مۆسییه A. De Musset 1810-1857

٣- شۆڕشی فەڕەنسی بووە هۆی ئەوەی بە تێڕوانینێکی تازەوە، کە لە کەلەپووری گریك و ڕۆمان و بڵاوبوونەوەی (هەستی نەتەوەیی)یش بووە هۆی ئەوەی کە هەر پێشتر خۆیان لە کۆت و پێوەندی کەلەپووری یۆنانی و ڕۆمانی ڕزگار بکەن.

٤- ڕێبازە فەلسەفیی و کۆمەڵایەتییە نوێیەکانی ئەوروپا لە سەدەی هەژدەهەمدا، کاریگەرییان لەسەر هەڵدانی ڕۆمانسییزمدا هەبوو، بە تایبەتی نووسینەکانی جان جاك ڕۆسۆ، کە بووە ڕێ نیشاندەر و هۆی سەرەکی بۆ سەرهەڵدانی ڕۆمانسییزم و نووسینەکانی (پەیماننامەی کۆمەڵایەتی) هێرشێك بوون بۆ سەر دەرەبەگایەتی. داوای ژیانی دەکرد لە سروشتدا، کە سەربەستی و بەختەوەری و جوانی و قەشەنگی تیا دەردەکەوێت، هەروەها داوای گوزارشتکردن لە (خود)ی دوور لە کۆت و پێوەندی کۆمەڵایەتی دەکرد، هەر ئەوەش بوو پاشان (شیعری لادێ) دەرکەوت، کە باسی پاك و



جوانی و دەروون و پەیوەندی کۆمەڵایەتی بێگەردی ژیانی لادێی دەکرد وەکو(وەرزەکان)ی تۆمسن ١٧٠٣ و (چیاکانی ئەلب) ی هیدلەر ١٧٢٩ و (وەرزەکان) ی لامپێر.

٥- ڕۆسۆ و فەلسەفەکەی کاریگەرییان لە سەرهەڵدان و پەرەپێدانی ڕۆمانسییزمدا لە ئەوروپا هەبوو، بە تایبەتی دوای ئەوەی، کە بووە هۆی دۆزینەوەی شکسپیر و ناساندنی ناوەرۆکی نووسینەکانی لە ئەوروپا. لەم ڕووەوە (ڤۆلتێر) دەورێکی مەزنی هەبوو. بە ڕەخنەگرتن لە شانۆگەرییەکانی شکسپیر و خستنەڕووی لایەنی جوانی و کێشە دەروونی پاڵەوانەکانی وەسفی ڕەوشتی پاڵەوانەکانیدا.

هۆیەکی دی بۆ گەشپێدانی ڕۆمانسییزم دۆزینەوەی ئەدەبی کۆنی وڵاتانی باکووری ئەوروپا و کاریگەری ئەدەبی ئەسکەندەناڤی بوو.

٦- شاعیرانی گۆڕستان و شەو، کە پاشان بە (قوتابخانەی گۆڕستان) ناسراون لە ئەدەبی ئینگلیزییدا، ئەویش بەهۆی ڕەشبینیی بەرامبەر چارەنووسی مرۆڤ لە ژیاندا و ناڕەزاییان بەرامبەر بە مردن و بێ ئاکامی ژیان دەردەبڕی و شاعیر لە بیرەوەری و یادگارییەکانیدا نقووم دەبوو، ڕێگە خۆشکەرێکی دی بوو بۆ هاتنەکایەی ڕێبازی ڕۆمانسییزم لە ئەدەبیاتی ئەوروپیدا.

### خاسیەتەکانی درامای ڕۆمانسیی

١- یەکێ لە خاسیەتەکانی هونەر بە گشتی و دراما بە تایبەتی لای ڕۆمانسییزمەکان سەربەستی بوو، خۆ ڕزگارکردن لە دەستوور و یاسای کلاسییزمەکان. گرینگترین شت لەمبارەیەوە خۆ ڕزگارکردن بوو لە سێ یەکیەتییەکە، کە (شکسپیر) زۆر لە پێش ئەوەی فەرامۆش کرد بوو.

٢- پاڵەوانی تراژیدیا، لای ڕۆمانسییزمەکان لە کۆیلە و پایەدار پێك هاتبوو. تەنانەت هەندێجار ڕووداوەکان وەها خۆ دەنوێنێ، کارەکەر و نۆکەر و کۆیلە دەبنە فەرماندار.

٣- زۆربەی کات ڕۆمانسییزمەکان بۆ دراماکانیان پاڵەوانیان لە چینی ناوەڕاست هەڵدەبژارد و بەزۆریش پاڵەوان بەسەر نەیارەکەیدا سەردەکەوت، واتا بەهاکانی چینی ناوەڕاست بەسەر بەهاکانی چینی ئۆرستۆکراتییەتدا سەردەکەوت.

٤- دراماکان تێکەڵ لە تراژیدیا و کۆمیدیا بوو. بۆیە ڕوخسارەکانی ژیانیان بە جوان و ناشیرینییەوە دەردەبڕی، بۆیە دەتوانین بڵێین زیاتر بابەتیی بوون.

٥- ڕۆمانسییزمەکان (درامای بۆرژوازی)یان هێنایە کایەوەو بە زمانی پەخشانیان دەنووسی و بابەتەکانیان لە ئێستادا وەردەگرت.

٦- ڕۆمانسییزمەکان ڕوویان لە مێژووی هاوچەرخ کردبوو بابەتەکانیان لێ هەڵدەهێنجا و پشتیان لە مێژووی گریکی و لاتینی کردبوو، کە کلاسییزمەکان بابەتەکانیان لەوێ هەڵدەبژارد. ڕابەری ئەو ڕێبازەش (ڤیکتۆر هۆگۆ) بوو، ئەوە بێجگە لەوەی هەندێکیان بابەتەکانیان لە مێژووی نیشتمانیی و نەتەوەییەوە هەڵدەبژارد، بە تایبەتی ئەو نووسەرانەی لە ژێر کاریگەریی(شکسپیر)دا بوون.

٧- ڕۆمانسییزمەکان هەموو توانای خۆیان لە (شیعری ویژدانی)دا بەکاردەهێنا. دەبێ ئەوە بڵێم، سەردەمی ڕۆمانسییزمەکان سەردەمی شانۆ و دراما نەبوو، لەبارەی شانۆگەرییەکانی ئەو ڕۆژگارەوە(ڤان تیگەم) دەڵێ: (ڕەگەزی لیریك هێندە بەسەر ئەو بەرهەمانەدا زاڵە، کە بۆتە هۆی ئەوەی ئەو(شانۆنامانە)بە تەواوی بە کەڵکی ئەوە نەیێن لەسەر تەختەی شانۆ پێشکەش بکرێن.)[6] ، هەروەها (هێرفۆرد)یش پێشتر ئەم مەسەلەیەی وروژاندووە و دەڵێ: (شانۆگەری ژانرێکی ئەدەبییە، کە ڕۆمانسییزم تیایدا ڕووبەڕووی ناکامی و شکست بۆتەوە).[7] ئەم قسانە تەنیا درامای فەڕەنسیی ناگرێتەوە، کە لەوێدا بە پێچەوانەوە دراما پێشکەوتنێکی زۆری بەخۆوە بینیوە، هۆیەکەشی بە پلەی یەکەم بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە لەوێ ڕۆمانسییزمی فەڕەنسیی تا رادەیەکی زۆر لە ڕووبەڕووبوونەوەو دژایەتکردنی کلاسییزمەی نوێدا بوو.[8]

## ڕۆمانسییزم لە ئینگلتەرە

لە بەرهەمەکانی (ڕۆبێرت پرێنس)ەوە دەستپێکرد، پاشان لە شیعرەکانی(وۆردز وۆرس William Wordsworth - 1770-1850) و(کۆلریدج١٧٧٢-١٨٣٤Coleridge)دا بە تەواوی کامڵ بوو و گەشەی کرد. لە دوای ئەوان وتەکانی تۆماس مۆر(کە شاعیرێکی ئیرلەندییە)و بیروباوەڕەکانی سەبارەت بە ئەفسانەیە مەودای بڵاوکردنەوەیان بۆ نەڕەخسا. لە ساڵی ١٨١٠ — ١٨٢٥دا بەرهەمەکانی (بایرۆنGeorgeBYron1788-1824 )و(شیللی percy Shelley 1795-1822 و(کیتس) ڕۆمانسییزمی ئینگلیزییان گەیاندە لوتکە ، لە ڕۆمانیشدا ڕۆمانە مێژووییەکانی (والتەر سکوت) ڕۆڵێکی گرنگی گێڕا.

---

٦- بڕوانە: لیلیان فورست، رمانتیسم، ترجمە: مسعود جعفری، ص٩٠.

٧- سەرچاوەی پێشوو، ل٩٠.

٨- بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە : سەرچاوەی پێشوو، ل٩١.





وۆردز وۆرس William Wordsworth - 1770-1850



GeorgeBYron1788-1824 **بایرۆن**




percy Shelley 1795-1822 **شیللی**

## ڕۆمانسیـیزم لە ئـەڵـمـانیا

یەکـەم هـەنگاوی ڕۆمانـسییزم لـە ئـەڵمانیا بریتـی بـوو لـە بـەرپاکردنی شۆڕشـێك دژی لاساییکردنەوەی نموونەکانی فەڕەنسی و ئیتالّی...  (لیسینگ) هێرشێکی توندی کـردە سـەر ئـەو کلاسییزمانەی، کە لە دەرەوەی ئەو سـنوورەوە هـاتبوون.(کلۆیـستۆك و هێـردەر) بەشـدارییان لـە داهێنانی ئەدەبێکی ئەڵمانی (گێرمەنی) ڕەسەندا کرد، وەسفی سروشت و بە باڵاهەڵدانی سروشـتی ئەڵمانی دەستپێکرد. چوونە نێو باخ و دەروونی هەست و سۆزی مرۆڤ جێگەیەکی بەرزی لە شیعردا گرت. لە پێشدا ڕۆمانسییزم لە بەرگێکی فەلسەفیی و ئەدەبیدا هاتەکایەوە، لەم قۆناغەدا لە نێوان تەسەوف و خەیاڵدا جۆرە تێکەڵاوییەك هەبوو. لەبەر تیشکی ئەم بۆچوونەدا دەتوانین بڵێین لە نێـوان

ساڵانی ١٧٩٠ — ١٨٠٠دا ڕۆمانسییزم لە ئەڵمانیا بوژایەوە. بەڵام ئەوەندەی پێ نەچوو شەپۆلێکی جیاواز لە ڕۆمانسییزمی ئەڵمانی خۆیدا بەسەر واقیعدا سەپاند، ئەویش لە بەرهەمەکانی (برنتنـۆ، ئارینم، ڤۆن کلیت، هۆفمان)و چەند نووسەرێکی تـردا خـۆی دەنوانـد. ئـەم نووسـەرانە کەرەسـەی بەرهەمەکانیان لە داب و نەریتی کۆمەڵایەتی و ڕەگەزەکانی نەتەوایەتی ئەڵمانییەوە هەڵقووڵاوە.

لە ساڵانی (١٨١٠ — ١٨٢٠) دا ڕۆمانسییزمی ئەڵمانیی جوانترین و بەرزترین بەرهەمـەکانی پێشکەشکرد.

## ڕۆمانـسییزم لە فـەڕەنـسا

لە فەڕەنسا لە ئەنجامی شۆڕشی فەڕەنسیی و دروستبوونی ئیمپراتۆریەت گۆڕانێکی گـەورە لـە چەمکە ئەدەبییەکاندا ڕوویدا. کۆمەڵێك ئەدیب و نووسەر بۆ وڵاتەکانی تر کۆچیان کرد، هەندێکیان گۆشەگیرییان هەڵبژارد و لە ژیان دوورکەوتنەوە. بەشێکیان دووچاری نەخۆشـــیـیەك بوون، کە بـە (نەخۆشیی سەردەم)[٩] ناسراوە، لە دەوروبەری سـاڵی ١٨٠٠ دا (شـاتۆبریان - Chateaubriand 1768-1848)و(مەدام دی ستایل) ئەم ڕێبازەیان پێڕەو کرد. کە ئەو کاتـە خـۆی بەسـەر واقیعـی ئەدەبیی و فیکریدا سەپاند بوو، بۆ ئەوەی شان بە شانی پێشکەوتنی سـەردەمەکە و پێداویـستییە شارستانی و دەروونی و عـەقڵی و هونەرییەکاندا بگونجێت. لە کتێبی (بلیمـەتیی مەسـیحییەت)دا شاتۆبریان ڕەخنەیەکی توندی ئاڕاستەی ئیستاتیکیی کلاسـیکیی کـرد، هـەروەها نـاڕەزایی خـۆی دەربارەی سروشتی فۆرمالیزمی ڤۆلتێر دەربـڕی. ئەمـەش بـووە هـۆی ئـەوەی کـە پـەردە لەسـەر جیهانێکی نوێ و ڕەسەندا هەڵبدرێتەوە. ئەگەرچی هەندێ لە مێژوونووسانی ئەدەبی فەڕەنسیی ئەو ماوەیە لـە (١٨٠٠)ەوە تـاوەکو (١٨٢٠)سـاڵی بڵاوکردنـەوەی (ڕامـانی شـیعریی) لامـارتین بـە ماوەی(بەر لە ڕۆمانسیزم) ناودەبەن.

(مەدام دی ستایل Mme de Staél - 1766-1817) ئەوەی ڕوونکردەوە، کە ڕۆمانسییزمی ئەڵمانی ئینگلیزیی هەست و سۆزێکی ڕەسەنی تێدایە و سروشتێکی مرۆڤایەتیی هەیە.

---

٩- بڕوانە : ف. ل. سولنية، الرومنطقية فی الادب الفرنسی، ترجمة؛ احمد دمشقية، بیروت، ١٩٦٠، ص ١١-١٩. هەروەها : الدكتور محمد غلاب، ادباء الرومانتكية الفرنسية، مكتبە نهضە مصر، ص ١-١٩.






(مەدام دی ستایل Mme de Staél - 1766-1817)



(**شاتۆبریان** Chateaubriand - 1768-1848)

پاشان بڵاوبوونەوەی کۆمەڵە شیعری (ڕامانی شیعریی) لامارتین شەقڵی ئەدەبێکی تازەی بەخۆوە گرتبوو. پاشان چەند ناوێکی دیار، وەکو(هۆگۆ Victor Hugo 1802-1885)، ئەلفرێد دی مۆسییە، جۆرج ساند) دەرکەوتن.

ئەم ڕێبازە نوێیە هەموو هونەرێکی ئەدەبیی گرتەوە، وەکو چیرۆك، ڕەخنە، مێژوو، شانۆنامە (دراما)، گەشتنامە. دروشمی سەرەکی نووسەرانی ئەم ڕێبازە ئەدەبییە بریتی بوو لەوەی ، کە ڕۆمانسییزم سەربەستییە لە بواری ئەدەبدا. نووسەرەکان بەرەو وڵاتانی تر سەفەریان کرد، شاتۆبریان ڕووی لە ئینگلستان کرد و لەوێ (بەهەشتی لە دەست چوو) ی (میلتۆن) زۆر سەرنجی ڕاکێشا.



(مەدام دی ستایل)یش ڕووی لە ئەڵمانیا کرد و لەوێ شاکارێکی گەورەی بە ناونیشانی (دەربارەی ئەڵمانیا) نووسیی، تیایدا باسی ڕۆحییەتی ئەدەبی ئەڵمانی دەکات ، کە ڕۆمانسییزم بەسەریدا زاڵە.

## ڕۆمانسییزم لە ئیتاڵیا

لە کاتێکدا، کە ئیتاڵیا لە ڕووی سیاسییەوە پارچە پارچە کرابوو هەروەها بەشێکی خاکی لە لایەن بێگانەوە داگیر کرابوو، ڕۆمانسییزم لە ئیتاڵیا بە ڕاپەڕینێکی نەتەوەیی لە قەڵەم دەدرێت، هەروەها ڕۆمانسییزم بەند بوو بە بیروباوەڕی نیشتمانی و داواکردنی سەربەستی ئەم دیاردەیە لە نووسینەکانی (مەنزمی، لیۆپردی، پرشە) دا خۆی دەنواند. تەوژمی ڕۆمانسییزم لە لای ئەو نووسەرە ئیتاڵییانە بەهێز بوو، داوای سەربەخۆیی وڵاتەکەیان دەکرد. لەبەر ڕۆشنایی ئەم بۆچوونانەدا بۆمان هەیە بڵێین، کە ڕۆمانسییزم بوو بە چەکێکی کاریگەر لە ڕێگەی خەباتیاندا بۆ ڕزگارکردنی نیشتیمان هەروەها بوو بە ئامرازێك بۆ جێبەجێکردنی هیوا و ئاوات و بۆچوونە نەتەوایەتییەکان، لەگەڵ ئەم ڕاستیەدا بەرهەمی ڕۆمانسیی ئیتاڵییەکان نەگەیشتنە ئاستی قووڵی و ڕەسەنی ئەدەبی ئەڵمانی و فەرەنسا. کاتێ ئیتاڵییەکان ئامانجە سیاسییەکانیان بەدی هات، بزووتنەوەی ڕۆمانسییزم ڕووی لە کزی کرد. پاشان چەند ڕێبازێکی ئیستاتیکیی نوێ سەریان هەڵدا.

## ڕۆمانسییزم لە ڕووسیا

نموونە بەرزەکانی ئەدەبیاتی فەرەنسیی لە سەدەی هەژدەهەمدا کارێکی زۆری کردە سەر ئەدەبی ڕووسیی، هەروەها (چایکۆفسکی) لە نووسینەکانیدا کەوتبووە ژێر کارتێکەری شاعیرانی ئینگلیز و ئەڵمان. پاشان (پووشکین)پەیدا بوو، هەوڵیدا ئەدەبیی ڕووسیی لە شاڵاوی ئەو کارتێکردنە ڕزگار بکات. واتە بەربەرەکانی ئەو ڕەگەزانەی دەکرد، کە لە ئەدەبی ڕووسییدا باو بوو، ئەو ڕەگەزانەش بریتی بوون لە چەند قوتابخانە و شەپۆلێکی تێکەڵاو. (پووشکین) هەوڵی دەدا چەند تایبەتییەکی ڕەسەن بۆ ئەدەبەکەی بدۆزێتەوە، ئەوە بوو توانی شتێك دابهێنێ، کە بە ڕۆمانسییزمی ڕووسیی ناسراوە. ئیتر بەرهەمەکانی پوشکین، لیرمەنتۆڤ و هاوڕێکانی بوون بە بنکەیەکی تازە بۆ ئەدەبی ڕووسیی.



**ئەلیکساندەر پووشکین (١٧٩٩- ١٨٢٧)**



## خاسیەتەکانی ڕۆمانسییزم

١- خەیاڵ : ڕەتکردنەوەی واقیع و پەنابردنە بەر خەیاڵ : لە خەیاڵدا چەندین جیهانی جوان و هێمن دەکێشێت، کە هاوکاری و برایەتی و داد و یەکسانی تیایدا بەرقەرارە و لێبوردن هەیە، ئەم بەهایانە لە جیهانی ڕاستەقینە یان واقیعدا بەدی ناکرێت. بۆیە بە ناچارییەوە پەنا وەبەر خەیاڵ دەبەن، کە ئەلتەرناتیڤی واقیعە.

٢- شەو : لە ئەدەبی ڕۆمانسییزمدا وێنەکێشی شەو بە شێوەیەکی بەرفراوان هەستی پێدەکرێ، چونکە شەو هێمنی و ئارامی بەخۆوە گرتووە و لە هەمانکاتدا پیسی و پۆخڵەواتەکان دادەپۆشێ و لەبەرچاوان بزریان دەکات. ئەدیبی ڕۆمانسیی لە شەودا گۆشەگیرە و لەگەڵ دەروونی خۆیدا دەژی و تێدەفکرێ. شەو ڕەشە و ڕەشیش نیشانەی شوومی و ناشیرینی واقیعە.

٣- خۆشەویستی : ئەدیبی ڕۆمانسیی بە شێوەیەکی بەرفراوان لە خۆشەویستی دڵدار و دڵبەر، هاوڕێ و هاوکارێکی دی، دراوسێ و دراوسێیەکی دەدوێ، کە بە شێوەیەکی بێگەرد لە واقیعدا دەگەن، واتا تاوانبارکردنی واقیعی ڕاستەقینە.

٤- شێواندنی لەش ولار : ئەدیبی ڕۆمانسییزم بە چەندین شێوەی جیاواز ئەم مەسەلەیە بەکاردەهێنێت، بەو پێیەی ئەمەش لە ئەنجامی دڵڕەقی واقیعدا کەوتۆتەوە. لە لایەکی تریشەوە بەرجەستەکردنی ناخی مرۆڤ و نیشاندانی ناشیرینی جیهانی ڕاستەقینەیە.

٥- جیهانی دژیەك : هەموو بیرو بیرکردنەوەی خۆیان بۆ ڕوونکردنەوەو نیشاندانی ئەو ناکۆکییە تەرخان دەکەن.

٦- بوونی ئامێر و بووکە سەماکەرە : لە ئەدەبی ڕۆمانسییزمدا ئامێرو بووکە سەماکەرە زۆرە، ئەمەش نیشانەی بێ ئیرادەیی مرۆڤ نیشان دەدات. ناڕەزایی دەربڕینە بەرامبەر پێشێلّ کردنی مرۆڤ. واتا مرۆڤ وەکو ئامێرێك یان وەکو بووکە سەماکەرەیەك خەڵکی تر هەڵدەسوڕێنێ.

٧- ڕۆحانییەت: ڕۆمانسییزمەکان ڕۆحانین، واتە هەموو شتێك بە لای ئەوانەوە ڕۆح یان گیانی تیایە هەتا وەکو شتی ڕەقیش، بەرد، ڕووبار و با، لەگەڵیان دەدوێن و بە قسەیان دێنن.

٨- یاسا: فەزای ئەوە بەخۆیان دەدەن، کە یاسای ژیانیان دۆزیوەتەوە (واتا هەموو شتێ دوو ڕووی لە ژیاندا هەیە)، هێرشیان دەبردە سەر ئەو دەزگا یاساییانەی لە واقیعی ڕاستەقینەدا هەن.

بۆیە سەیر دەکەین گرینگترین خاسیەتەکانی ڕۆمانسییزم لە (ئایدیالییزم — تەم و مژ — داهێنان و نوێخوازی — چاوپێخشاندنەوەی هەموو شتێ — دۆزینەوەی هونەری تازە — وازهێنان لەو مەسەلانەی کە لە سەردەمی کلاسیکییزمەکاندا بایەخیان هەبوو — زیاتر زمانی شیعریان تەقاندەوە — ڕۆمانی مێژوویان پەرەپێدا — بواری دراما بەرامبەر شیعری ویژدانی و ڕۆمانسییزم تەسك بووەوە. لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا، کە ڕۆمانسییزم دەرکەوت هەندێ کەس وا تێدەگەیشتن، کە دژی کلاسییزمە یان پێچەوانەیەتی. ئەمە ڕاست نییە، چونکە هەموو ئەدەبێك لە دژی کلاسییزم بێ مانای وانیە، ڕۆمانسییزمە. بۆیە چەندین چەمك و دەست نیشانکردنی جیاواز لە پێناسەی ڕۆمانسییزمدا دەرکەوت. (هیگڵ) دەڵێ : ئەدەب، دوو ئەدەبە، کلاسییزم ئەو ئەدەبەیە، کە گوزارشت لە بەهاکانی کۆمەڵگای بتپەرستیی دەکات، باشترین نموونەی ئەدەبی گریك و ڕۆمانە. ڕۆمانسییزمیش ئەو ئەدەبەیە، کە گوزارشت لە گیانی مەسیحییەت دەکات، لەگەڵ بڵاوبوونەوەی بە ئەوروپادا، هەندێکی تر دەڵێن : (پەیڕەویکردنی سێ یەکییەتییەکە (الوحدات الثلاث) کلاسییزمە و پەیڕەو نەکردنی ڕۆمانسییزمە).

هەندێکیش سێ ڕێبازە سەرەکییەکە وا دەستنیشان دەکەن:

کلاسیـــیزم

چەمکی یان تێڕوانینی گونجاوی منداڵییە بۆ ژیان.

ڕۆمانسیـــیزم

قۆناغی گەنجیەتی و تین و تاوە.

ڕیـــالییـــزم

قۆناغی پێگەیشتن و کەماڵی عەقڵ و بیرە.

هەندێ کەس ڕۆمانسییزمیش دابەش دەکەنە سەر دوو بەش :

ا — کۆنە پارێز ب — پێشکەوتنخواز

خۆی لە ڕاستیدا هەردووکیان واقیعی بۆرژوازی لە سەرەتای شۆڕشی فەرەنسیدا ڕەت دەکەنەوە. بەڵام ئەوانەی پەیوەندییان بە ڕەگ و ڕیشەی دەرەبەگایەتییەوە هەبوو، خۆزگەیان بە قۆناغی یان سەردەمی پێش شۆڕشی فەرەنسی دەخواست، لە هاوکاری و ئەرکی نیشتمانیی و بوونی پاشا و دەرەبەگی گەورە پارێزگاری هەموانی دەکرد، بەڵام ئەوانەی سەر بە بۆرژوازی



بچووك بوون، شۆڕشی فەرەنسییان ڕەتدەکردەوە، چونکە ڕێزی بەڵێنەکانی خۆی نەگرت لەبەر قەرارکردنی یەکسانی و داد و سەربەستیدا و داوایان دەکرد ئەو بەڵێنانە جێبەجێ بکات. چونکە شۆڕشی فەرەنسی دوای ئەوەی گەیشتە دەسەڵات، تەنیا پارێزگاری لە بەرژەوەندی بۆرژوازی گەورەو سەرمایەداری گەورە دەکرد. واتا دووپاتی چەوساندنەوەی سەرمایەداری دەکردەوە، ئەمەش زۆر لە دەرەبەگایەتی خراپتر بوو. ئەم جۆرەیان پێشکەوتنخواز بوون.

ئەو جیهانەی (ناوەوە) یان خودییەی، کە ڕۆمانسییزمەکان گرنگیان پێدەدا، بە شێوەیەکی واقیعی بەرجەستەیان نەدەکرد، وەکو ئەوەی، کە هەیە، بەڵکو بە شێوەییەکی میتافیزیکیانە، یان بەو شێوەیەی، کە ئەوان خۆیان دەیانبینی، دەیانخستەڕوو.

هەروەها کلاسییزمەکانیش، کە گرنگییان بە مەوزووعییەت دەدا، ئەو مەسەلەیان لە ئەدەبەکەیاندا نەدەخستەڕوو، بەو شێوەیەی کە لە واقیعدا هەیە، بەڵکو وێنەکێشی جیهانیان وادەکرد، کە دنیا بەختەوەرییە و خۆشەویستی و هاوکاری و بەها پیرۆزەکان لەبەر چاوانن، بابەتەکانیان لە ژیانی کۆن وەردەگرت، خۆیان لە وەرگرتنی بابەت لە ژیانی ڕۆژانە و واقیعی خۆیان دوورە پەرێز دەگرت، کە پڕی بوو لە نا یەکسانی و زوڵم و ستەم، بۆیە ئەوانیش میتافیزیکیانە بیریان دەکردەوە و لە شیکردنەوەی بابەتەکانیاندا دەکەوتنە هەڵەوە، بۆیە دەتوانین بڵێین چ ڕۆمانسییزم و چ کلاسییزم لە چارەسەرکردنی بابەتەکاندا میتافیزیکی بوون.

## ڕۆمانسییزم و ڕەخنەی ئەدەبی

ڕێبازی ڕۆمانسییزم تەنیا لە بواری شیعر و چیرۆك و ڕۆمان و هونەری شێوەکاریدا دەرنەکەوت، بەڵکو لە ڕەخنەی ئەدەبی و هونەرییشدا تایبەتمەندی خۆی هەبوو.

**سەرەتایەك بۆ ڕەخنەی ڕۆمانسییزم:**

ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە پەیوەندی نێوان ڕۆمانسییزم و ڕەخنەی ئەدەبییە.

أ. پەیوەندی وشەی ڕۆمانس و ڕۆمانسییزم ئەوەیە هەردووکیان نقوومی خەیاڵن و بە تەنیا بە لاساییکردنەوەی واقیع ناوەستن.

ب. دیارترین ڕەخنەگری ڕۆمانسی شاعیری ئینگلیزی وۆردز وۆرس words worth (١٧٧٠-١٨٥٠ ز) و کولردیج Coleridge (١٧٧٢- ١٨٣٤) وۆردز وۆرت لە کتێبی Lyrical Ballads

أ- زمانی شیعر دەبێ سادەو ڕەوان و ژیانی ڕۆژانەی خەڵك بێت.

ب- شیعر هەڵچونێکی لە خۆوەو خۆڕسکی هەست و سۆزێکی بەکوڵە لە وروژان (emotion) ەوە هەڵدەقوڵێ و شاعیر بە هێمنی و بە پرۆسەیەکی گەڕانەوە (نوستالژیا) پرۆسەیەکی تازەی بۆ ئەنجام دەدات، یان داهێنان و ئەفراندێکی نوێی لێ بەرهەم دێنێت.

کۆلردیج : ئەگەرچی ئەم شاعیرەیش لەسەر هەمان ڕێبازە (ڕۆمانسییزم)، بەڵام لە هەندێ خاڵدا لەگەڵ وۆردز وۆرسدا یەك ناگرێتەوە، لەوانە :

ا – وشەی سادەو ئاسایی و هەست و سۆزی خەڵکی ئاسایی بە تەنیا نابێتە کەرەستەی شیعر بەڵکو هەست و سۆزی شاراوەی دەروونی مرۆڤ و پەی بردن بە قووڵبوونەوەو پێ گەیشتن لە هەڵوێستە گەورەکاندا شیعر دروست دەکات.

ب - هەروەها لەوەشدا پێچەوانەی ئەو بوو، کە وشەکان لە شیعر و پەخشاندا جیاوازیان نییە، بەڵکو هەندێ وتەی جوان و سەرنج ڕاکێش و میتافۆر لە شیعردا دەورێکی جەوهەری دەبینن، بەڵام لە پەخشاندا بەهۆی بارێکی تایبەتییەوە لە بازنەی هونەر دەردەچن.

پ– لە کتێبەکەی خۆیدا biographia literaria زۆر گرنگی بە (خەیاڵی شیعریی) داوەو بە پێوانەی جوانی و مەزنی شیعری دادەنێ. ئەو جیاوازی دەخاتە نێوان بۆچوون و وەهم fancy و خەیاڵ imagination خەیاڵ بەو هێزە ناو دەبات، کە لە دەروونی شاعیردایەو دەتوانێ پەنای بۆ ببات بۆ جیاکردنەوەی شتە دەرك پێکراوەکان و شیکردنەوەیان بۆ ئەفراندێکی تازە، کە بە پێچەوانەوە بۆچوون و وەهم توانای توانەوەو سەرلەنوێ داڕشتنەوەیەکی نوێی نییە، دەبێ ئەوە بزانین، کە خەیاڵی خوڵقێنەر (الخيال الخلاق) لە قەسیدەدا دەتوانێ وابکا شتەکان پێکەوە گرێ بدات و کارلێك بکەن و ئەفراندنی نوێ بەرهەم بێنێ، بە شێوەیەك کە شتەکان یان ماددەکان بە تەنیا و بە پەرش و بڵاوی ئەو مانایە نابەخشن.

ت – لایەنێکی تر جگە لە خەیاڵ ئەویش (یەکیەتی ئۆرگانی organic unity) بەلای کۆلردیجەوە گرنگە. پرۆسەی خەیاڵ بە لای ئەوەو وەکو گەشەکردنی ئۆرگانی یان بایەلۆژی وایە، ئەرکی شاعیر کۆکردنەوەی بەشە پەرش و بڵاوەکان نییە، بەڵام لە ڕێگەی خەیاڵ دووبارە لە بنیادێکی زیندوو و گەشەدار دا دەیخوڵقێنێتەوە هەر بۆیە بەلای کۆلردیجەوە قەسیدەی درێژ هەمووی شیعر نییە، ئەو بەشانەی لە ئەزموونەوە هەڵنەقوڵابن بارن بەسەر شیعرەوە، هەروەها دەڵێ قەسیدەی باش، کە بنیادێکی پتەوی هەیە زۆر قورسە بتوانێ لێی زیاد بکەیت یان لێی



فڕێ بدەیت. لەم ڕووەوە گوتەیەکی ناسراوی هەیە، کە دەڵێ (ئاسانترە بە دەستی خۆمان بەردێك لە ئەهراماتەکان دەربێنین، نەوەکو وشەیەك لە قەسیدە لیریکەکانی شکسپیر دەربێنین بێ ئەوەی بنیادی بنچینەی بڕوخێ یان نەبێ بە قەسیدەیەکی دی.) واتا هێزی قەسیدەو کاریگەری لە هەموو بەشەکانیدا شاراوەتەوە هەروەکو لە بنیادی گشتی قەسیدەکەدایە.

هەروەها لە ڕەخنەگرە ڕۆمانسییزمەکانی ئەو سەردەمە، کە کاریگەرییەکی زۆری بەسەر دروستبوونی رەخنەییەکی پتەو و چەمکێکی تازەی جیاواز لە ڕەخنەی کۆنی کلاسییزمدا هەبوو، شاعیری ئینگلیزی shelley (١٧٩٢ – ١٨٢٢) خاوەنی کتێبی (بەرگریکردن لە شیعر defense of a poetry) بوو. بەلای (شیللی) یەوە حەقیقەت ئەوەیە، کە شاعیر لە ڕێگەی خەیاڵەوە پێی دەگات نەوەکو لە ڕێگەی (لۆجیك)، کە هەروەکو فەیلەسوف بانگەشەی بۆ دەکات.

دەربارەی زمان، (شیللی) جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە شاعیر پێوەندییەکی پتەوی بە زمانەوە هەیەو هەر ئەو دەتوانێ زمان تازە بکاتەوە، وشەکان بوونەوەرێکی جیهانی شیعرن و شیعر بە زیندوویی دەهێڵنەوە. ئەگەر شاعیرەکان وشەکانیان دووبارە نەکردایەوە بە تێپەڕبوونی کات زمان دەبووە ئامرازێکی بێ توانا بۆ دەربڕین لە مەبەستە مرۆڤایەتییە بەنرخەکان. بەڕای ئەو شاعیرەکان، کە یاسا داڕێژەرن، بناغەداری کۆمەڵن، داهێنەری مەدەنییەتن، خوڵقێنەری هونەرەکانی ژیانن، مامۆستای ڕاستەقینەن بۆ نزیك بوونەوە لە جوانی و ڕاستییەکان.

تەنانەت شاعیر بە پێغەمبەر دەچوێنێ، لەوەدا کە تەنیا بەوەند ناوەستێ، کە سەرنجی ئێستا بدات، بەڵکو لە ئێستاوە بۆ داهاتوو دەڕوانێ.

لە بارەی زمانی مۆسیقییەوە یان زمانی کێشدارو جیاوازی لەگەڵ نامۆسیقیدا دەڵێ، زمانی مۆسیقی ئەو زمانەیە، کە دەچێتە ژێر باری سیستمێکی دەنگی و ڕەوتێکی دیار، کە ئەمە زمانی شیعرەو ناشێ شیعر بە بێ ئەو زمانە لە دایك ببێ. یان شیعر بتوانێ واز لە کێش بێنێ. هەر لەسەر ئەو بنچینەشە پێی وایە وەرگێڕانی شیعر بێهوودەییە، بەڵام ئەمە ئەوەش ناگەیەنێ، کە (شیللی) لەگەڵ ئەوەدا نەبێت شاعیر مافی تازەکردنەوەی کێشەکانی نەبێت.

بزووتنەوەی ڕۆمانسییزم لە ئەڵمانیاشدا لە بزووتنەوەی زریان strum and drong دا خۆی دەنوێنێ، بە تایبەتی (گۆتە) بە ڕەخنەگری ڕۆمانسییزمی ئەڵمانی دەژمێردرێ، کە ئەویش وەکو کولردیج پێی وایە دەبێ مەعریفە لەگەڵ هەست و سۆزدا تێکەڵ بکرێ.

هەریەکە لە فەیلەسووف و شاعیر باس لە حەقیقەت دەکەن، بەڵام ئامانجی شاعیر ئەوەیە، کە بە جوانترین شێوە شاکارێکی هونەری لێ بەرهەم بێنی،بۆیە دەبێ ماددەکە بخاتە ژێر ڕکێفی خودی خۆیەوە، بۆیە دەبێ بوترێ " تاکخوازی لە دەربڕیندا بنچینەی هەموو کارێکی هونەری و مەبەستەکەیەتی " واتا شێواز نیشانەیەکە لە نیشانەکانی تاك بۆیە سەرنج دەدەین بەلای ((گۆتە)) وە هێزی ڕاستەقینەی قەسیدە، یان ڕۆمان یان وەسف یان بۆچووندا نییە، بەڵکو لەو هەڵوێستەی یان دەورەی،کە هەموویان پێکەوە دەبینین لە پێش هەموو شتێکەوە واتا (گشت) لە پێش (بەش) وەیە.

دەبێ ئاماژە بەوەش بکەین، کە ڕەخنەکانی ڕەخنەگری فەرەنسی سانت بێڤ (١٨٠٤ – ١٨٦٩)، کە شێوازەکەی ئەو بە (ڕەخنەی شەخسی) ناسراوە، کۆمەڵە وتارەکانی بە ناونیشانی (لێدوانەکانی دووشەمووان)، کە لە نێوان ساڵانی ١٨٢٩ – ١٨٦٩ دا بڵاوی دەکردەوە دیارترین پرەنسیپەکانی ڕەخنەی ڕۆمانسییزمی چەسپاند، ئەم ڕەخنەگرە دەڵێ:

((بە بۆچوونی من ئەدەب لە ئینسان جیا نییە، دەکرێ چێژو زەوق لە بەرهەمێکی ئەدەبی وەرگرم، بەڵام ناکرێ بڕیاری لەسەر بدەم بە بێ ناسینی نووسەرەکەی، وەك ئەوە وایە، کە دارەکە نەناسم بەرەکەیشی ناناسم. هەر بۆیە لە لێکۆڵینەوەی ئەدەبدا بەرەو لێکۆڵینەوەی ئەدیب دەچم ئەمەش بە کارێکی سروشتی دەزانم))، ئەمەش وای لە(سانت بێڤ)کرد بۆ لێکۆڵینەوەی کاری ئەدەبی پشت بە دەروونناسی و کۆمەڵناسی ببەستێ.)[10]

لەو بوارانەی ڕەخنەی ڕۆمانسییزم گرنگییەکی زۆری پێداون ئەمانەن :

**ڕێبازی ڕەخنەی کۆمەڵایەتی:**

ڕەخنەی کۆمەڵایەتی کاریگەریی ئەدەبیات لە سەر کۆمەڵ و هەروا بە پێچەوانەوەشەوە کاریگەریی کۆمەڵ بە سەر ئەدەبیاتەوە دەخرێتە بەر باس، بە واتایەکی تر لەلای لایەنگرانی سەر بەو ڕێبازە ڕەخنەییە قسەیان لەسەر ئەوەیە، هەموو ئەو تەوژم و شێوە بۆچوونانەی کە لە بەرهەمی ئەدەبیاتدا ڕەنگدەدەنەوە هەتاوەکو لە دایك بوون و ئەفراندنی بەرهەمی ئەدەبیش بۆ کۆمەڵ دەگەڕێننەوە.

١٠- بۆ ئەم کورتە وتارە سوود لە چەند سەرچاوەیەك وەرگیراوە دیاریترینیان.



هەڵبەتە بەهرەی شاعیر و نووسەر و چێژو ئارەزووی ئەو بە بەهێزترین هۆکاری بەرهەمهێنانی ئەدەبی دەژمێردرێ، بەڵام لە هەر ڕۆژگارێکدا شاعیر و نووسەر پێوەندی و سەروکار لەگەڵ خوێنەر و داخوازانی بەرهەمەکەی پەیدا دەکات و هەندێ جار ناچار دەبێ بۆ ڕازیکردنی زەوق و سەلیقەی ئەو خەڵکە بە تەواوی زەوق و پەسەندی خۆی پشتگوێ بخات و خواستی خەڵکی بەدیبێنی، شاعیر چۆن دەژیو کێ کڕێی پیشەکەی دەداتێ؟ ئەمە یەکەمین پرسیارێکە کە دەبێ ڕەخنەگر لەو ڕەوشتە ڕەخنەییەی وەڵامی بداتەوە، لێکۆڵینەوە لە پێوەندییەکانی کۆمەڵایەتی وەڵامی ئەو پرسیارە دەداتەوە. سوڵتانەکان بە موستەعمەرەو دەستو پێوەندەکانی ڕۆمانییەکان بەخێر و سەدەقە، ئاغاکان بەدیاری و شتی بەقیمەت بەرگری لەشاعیران دەکەن، ئەم مەسەلەیە خۆی پێوەندیی شاعیر و نووسەر لەگەڵ ژینگەو کۆمەڵەکەیدا دیاری دەکات، ئەمە ئەوە دەردەخات ڕووداو ئاوێنەیەکی کۆمەڵاتییە، بەڵام ئەدەبیات هەروەکو لە پێشوودا ئاماژەمان بۆ کرد هۆکارو بزوێنەری کۆمەڵایەتیشە، هەر بۆیەشە، خەسڵەت و ئاکارو ڕەوشتی هونەرمەند لەگەڵ بارودۆخ و باری ماددی ئەودا دژ دەوەستێتەوە.

شاعیرو نووسەر باری ماددی و کۆمەڵایەتی خۆی پشتگوێ دەخاتو بەپێچەوانەی چێژو خواستی کۆمەڵ دەردی دڵ دەردەبڕێ، لەگەڵ دەوروبەرەکەیدا ناکۆکەو تێدەکۆشێ کە بیگۆڕێت. (ڤۆلتێر) لە داشۆرینە تیژەکانی کە لە دژی پیاوانی ئاینی و ستەمکاراندا دەینووسی هەرگیز چێژو پەسەندی ئەوانی لە بەرچاو نەدەگرت. ناسر خەسرۆ کە بەوپەڕی ڕەقو تووڕەییەوە دین فرۆشانی خوراسان و جیهانخۆرەکانی دەخستە بەر نەشتەری ڕەخنە، گوێی بەوە نەدەدا داخۆ ئەوان ڕازین یان نا.

کاتی کە ئەدەبیات وەکو هۆکارێکی کاریگەر لە دژی بارودۆخی سەردەم کاردەکاتو لەگەڵ بەرژەوەندیی کەس و چینەکاندا ڕووبەڕوو دەبێتەوە، بێگومان دەبێتە مایەی نەفرەت و بێزاریو ئامانجی ڕەخنەی واقیع. لەم ڕووەوە دەبێ ئەوە لەبەرچاو بگیرێ کە ئەدەبیات و کۆمەڵ هەردووکیان لە حاڵەتی گۆڕان و بزاوتنن و کاریگەرییان بە سەر یەکترەوە هەیە. لەم ڕووەوە هەرگیز نابێت چالاکی ئەدەبی لە چالاکی گشتی کۆمەڵ جیابکرێتەوە. هەندێ هونەری ئەدەبی لە رووی ماهییەتەوە زیاتر سروشتێکی کۆمەڵایەتییان هەیە. شیعری حەماس و دینی، زادەی ژیانی کۆمەڵایەتین و بێگومان سروشتی کۆمەڵایەتییان هەیە. ستایش و شیوەنیش خاوەن ئامانجێکی کۆمەڵایەتین و مەبەستیان ئەوەیە کە لەنێوانی چین و توێژە جیاوازەکانی کۆمەڵدا

ڕەواج پەیدابکەن، لێکۆڵینەوەی گۆڕان و پێشکەوتنی شارستانییەتەکانیش کاریگەری ژیانی کۆمەڵایەتی لە چۆنیەتی دەرکەوتنی شیعر و ئەدەبیات پیشاندەدەن، ئەو میللەت و نەتەوانەی کە لە ڕەوتی گۆڕانی ژیانی جووتیارییەوە پێگەیشتوون، شیعر و ئەدەبیاتیشیان لەگەڵ ئەو میللەتانەی کە هێشتا لە قۆناغی شوانکارەیی دان جیاوازی هەیە، هەروەها ئەو میللەتانەی لە قۆناغی بازرگانیدان، لەگەڵ ئەو میللەتانەی لە قۆناغی پێشکەوتوودان وەکو یەك نییە.

لایەنگرانی ڕێبازی (ڕەخنەی کۆمەڵایەتی) کۆمەڵێ هۆکار لە دەرکەوتنی بەرهەمی ئەدەبی و هونەریدا دیاری دەکەن. (تین) ئەو هۆکارانە بە نەژادو دەوروبەرو ڕۆژگار لە قەڵەم دەدات، ئەمە جێگەی گفتوگۆیە. سەرەتا دیدو مەبەست لە نەژاد چییە؟ بریتییە لە کۆمەڵو ئامادەیی و سیفاتی بۆ ماوەیی کە لەگەڵ مرۆڤدا لە دایك دەبن، ئەمانەش زۆربەی کات بەشێوەی میزاج و بنیادی جەستەیی جیاواز لەگەڵ مرۆڤەکاندا دەردەکەون، کەوابێ مرۆڤیش هەروەکو ئەسپ و کۆتر جۆری جیاوازی هەیە. نەژادی ئارییایی کە لە سەرانسەری جیهاندا بڵاوبۆتەوەو لە ماوەی سی سەدەی ڕابردوودا بە چەندین قۆناغی جیاوازی گۆڕان و کامڵبووندا تێپەڕیوە، هەروەها لە زمان و ئاین و داب و نەریتیاندا جۆرە پێکچوونێکی ئاشکرا بەدی دەکرێت. بەڵام (دەوروبەر) کۆمەڵێ چلۆنایەنی سروشتی و جوگرافییە. (ڕاتزل) لە کاریگەری دەوروبەری یان ژینگەی جوگرافیاییدا زێدەڕۆیی دەکاتو بە سەرچاوەو بنچینەی هەموو دژایەتییەکانی نێوان میللەتانی ناودەبات.

(هیگڵ) لەو باوەڕەدایە کە ژینگەی جوگرافی لە پەیدابوونی بیروباوەڕدا هیچ کاریگەرییەکی نییەو سەرزەمینی یۆنانی بە نموونە دێنێتەوەو دەڵێت یۆنانییەکان لە ژینگەی جوگرافیایی یۆناندا بەرهەمی زەوق و هونەرو مەعریفەتی خۆیان گەشەپێدا. لە کاتێکدا لە هەمان ژینگەی جوگرافی، تورکەکان هیچیان لە دەست نەهات.

ئەڵبەتە ئەم بۆچوونەش زێدەڕۆیی تیایە. ژینگەی جوگرافی بەبێ سەرجەم هۆکارەکانی تر کاریگەرییەکی بەرچاوی نییە. بەڵکو تەنیا بەبوونی هەموو هۆکارەکانی تر کاریگەری دەبێت. کەوابێ ژینگەی جوگرافی هەموو هۆکارەکە نییە بەشێکی هۆکارەکەیەو ئەڵبەتە نابێ وابزانرێ کە بە بەشێکی هۆکارەکان، بەرهەم بە دەست بێت. لەگەڵ ئەوەشدا کاریگەری ژینگەی جوگرافی لەزەوقو هونەر و مەعریفەدا ناتوانرێ نکوولی لێ بکرێت. ئەوەی لە ئەدەبی یۆنانیدا



کە لە ژێر کاریگەریی ژینگەی جوگرافی دەریاییدا دێتە بەرهەم، بێگومان ناتوانرێ لە ئەدەبی عەرەبیدا کە لە ژێر کاریگەری ژینگەی جوگرافی وشکانیدایە بێتە بەرهەم.

ئەو لێکچوونو وەسفانەی لە شیعری شاعیرێکی هیندی هەن، بەحوکمی زەروورەت ناتوانرێ لە شیعری شاعیرێکی سویدی یان ڕووسیدا بەدی بکرێت. هەروەکو چۆن بناغەی خانوو قەبر لە هەرێمی ساردو فێنك لەگەڵ هەرێمی وشکانیدا جیاوازی هەیە، بناغەی شیعر و عیرفانیش تیایاندا جودایە. کاریگەریی ڕۆژگار یان سەردەم جێگەی گومان نییە، سەردەم لە سەر نەژادو دەوروبەریش کاریگەری هەیە. هەروەکو چۆن گیا لە هەموو وەرزەکانی ساڵدا وەکو یەك نەشونما ناکات، مرۆڤیش لە هەموو سەردەم و ڕۆژگارێکی مێژوودا بە یەك شێوە گەشەی نەکردووە. هەر سەردەمەو ئەرك و پێویستی خۆی هەبووە، بە هەرحاڵ، ئەو سێ هۆکارە هیچ کامێکیان بە تەنیا کاریگەرییان نییە، بەڵکو کاریگەرییەکە هی هەرسێکیانە پێکەوە. ئەمە سەرباری ئەوەی کە نابێ کاریگەریی ئەو سێ هۆکارە لە سەر یەکتریش پشتگوێ بخرێت، ڕاستە، کە تاك بەرهەمو لە دایکبووی کۆمەڵە، بەڵام لە هەمانکاتدا زۆر جاریش هۆکارو بزوێنەری کۆمەڵیشە.

زەوقو داهێنانی تاك بە حوکمی ئەوەی لە مێژوودا هاتووە، زۆر جاران لە گۆڕانو کامڵبوونی جیهاندا، کە ئەڵبەتە تا ئەندازەیەك بزاوتێکی حەتمی هەیە، کاریگەری خۆی بەخشیوە. توانای داهێنان و ئەفراندنی تاك زۆر لە توانای سەردەم و نەژاد لە هاتنەکایەی کاریگەریی زەوقو هونەردا بەکارترە. سەرەتای لە بەرهەمی زەوقو ئەدەبیاتدا، سۆزو بیرو بۆچوونی تاك زۆر ڕەسەنتر و هونەرمەندانەترەو هەر چەندە بزاوتی تاکخوازی لە شیعردا بەرجەستەتر بێت ئەو شیعرانە ڕەسەنترو داهێنانەترە، جیاوازی نێوان شاعیرانی لاساییکەرەوەو شاعیرانی داهێنەر لەوەدایە کە لاساییکەرەوەکان تەنیا هەست و سۆزی گشتی و هاوبەش و ئاسایی بێگومان ناچیزو بێ نرخ دەردەبڕن بە پێچەوانەی ئەوانەی دی کە هەست و سۆزی فەردی و گۆشەیەك کە شەخسی و ڕەسەنن دەردەبڕن.

ئەمە بێجگە لەوەی کە هەر تاکێك لە ژێر کاریگەری ژینگەی خێزان و پەروەردەی تایبەتی خۆیەتی، بەکورتی ئەو ڕەخنەیەی کە لە میتۆدی ڕەخنەی کۆمەڵایەتی و بە تایبەتی میتۆدی (تین) گیراوە ئەوەیە کە بە تەواوی وجوودی تاکی فەرامۆش کردووە.

## رێبازی ڕەخنەی دەروونی:

هەندێ لە ڕەخنەگرانی دی، لە ڕەخنەی ئەدەبیدا پشت بە خاسیەت و بنەماکانی دەروونناسی دەبەستن. ئەو گروپە ڕەخنەگرانە هەوڵ دەدەن باری دەروونی و عەقڵی شاراوەی شاعیر یان نووسەر دەربڕن، توانای دانان و ئامادەیی پێکهاتەی زەوق و قەریحەی ئەو هەڵسەنگێنن هێزی سۆزو خەیاڵاتی وی دیاری بکەن و ئەو کاریگەرییانەی کە دەوروبەرو کۆمەڵو داب و نەریت لە هاتنەکایەی ئەو بارە دەروونییە بخەنە بەر باس‌و لە ڕێگەیەوە جۆری بیرو بنیادی گیانی‌و زەوقی شاعیر نیشان بدەن. ئەم میتۆدە ڕەخنەییە سەرەتا دەیەوێ لە مەسەلەی ماددەی شیعرو ئەدەب بکۆڵێتەوە، لەو خاڵەدا کە شیعرو ئەدەب وەکو هەموو بەشەکانی هونەر بەر لە هەموو شتێك بریتییە لە هێنانەکایەی دنیایەکی تازە کە ڕۆح‌و دڵی بنیادەم تیادا دەشڵەژێ‌و لە هێنانەکایەو داهێنانی دنیایەکی وەهادا هەموو توانای دەروونی هونەرمەند بەشدار دەبێت، مەسەلەیەکی ئەو تۆیە کە زۆربەی ئەو فەیلەسووف و حەکیمانەی پیرەوی بنەماکانی (کانت) دەکەن، پشتیگری دەکەن. لە نەزەری (کانت) بۆ یەکەم جار ئەو مەسەلەیە بە شێوەیەکی زانستی خستەڕوو کە شیعر و هونەرەکانی دی، بریتین لە جۆرە چالاکییەکانی هەماهەنگ و ڕێکوپێکی تەواوی چالاکییە دەروونییەکان کە بێ هیچ کۆت‌و بەندێکی جیهانی وێنەکێشراو سەرچاوە دەگرێت. لەم ڕووەوە دەتوانرێ بگوترێ کە هونەر لە ڕووی دەروونناسییەوە بریتییە لە ڕێکی‌و هاوسەنگییەك لە نێوانی خەیاڵو هێزی ئیدراك کە لە هەمانکاتدا شتێکی دەرەکیش لەگەڵ ئەم دوو هێزەدا لەبەرچاو گیرابن، کەوابوو هەروەکو دەرکەوت هونەرێکی بە شێوەیەکی گشتی و تایبەتی شیعر و ئەدەب بریتییە لە گونجان‌و هاوسەنگییەکی دەروونی و زەینی کە لە ئەنجامی هۆکاری مەعریفییەوە بە دەست دێت‌و لە بارێکی هەستیدا دەردەکەوێت، وەستان و هەستی مرۆڤ بەرامبەر ئەو هەماهەنگییە بڕیاری (جوانناسی) لێدەکەوێتەوەو هەر ئەو بڕیاردانەشە کە پرەنسیپی لەززەت لە بینینی هونەرە جوانەکان و سەرچاوەی ڕەخنەو هاوسەنگی هونەریی و ئەدەبی دیاری دەکات. بەم شێوەیە، شیعر و ئەدەبیش هەروەکو هونەرەکانی دی دیاردەیەکی دەروونین، لە لایەکی کەوە کە شاعیر یان نووسەر کە داهێنان دەکات لەلایەکی ترەوە کە خوێنەر دڵخۆش دەکات. چونکە لەڕووی پێوەندی یان لایەنی شاعیر و نووسەرەوە شیعر و ئەدەب دەستکردنی خەیاڵێکی داهێنەرانەیەو بە بەرهەمی ئیلهامی هونەری و جەزبەی زەوقی دەژمێردرێت. ئەمە ئەو



مەسەلانە لە وتەی دەروونناسەکاندا دەردەکەوێت‌و ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە شیعر و ئەدەبیات جگە لە دیاردەیەکی دەروونی هیچی تر نییە، بەڵام لە رووی لایەنی پەیوندیدار بە خوێنەر، شیعرو ئەدەبیات بزوێنەوی دەروونییە کە لە مرۆڤدا دەبێتە هۆی لەززەت و غەم و کاری تێدەکات‌و دەیوروژێنێ هەندێ جار وادەکات کە ئیرادەو کارێك ئەنجام بدات، ئەو مەسەلانەیش دیسانەوە کاری دەروونناسەکانەو بەو پێیەش شیعر و ئەدەبیات مەسەلەیەکی دەروونناسییە.

لە شیعری شاعیرێکدا دەتوانرێت کە سۆز و ئەندێشەی ئەو دیاری بکرێت؟ بزوێنەری ئەو یان لە ئەندێشەو ئیلهامی خۆیدا چ شتێك کاری تێکردووە؟ زۆربەی کات سیفات و باری دەروونی سەردەمی خۆی و هاوچەرخەکانی دەتوانرێ بە سەر ئەودا دیاری بکرێت. بە کورتی شیعری هەر شاعیرێکی ناسراو خاسیەت و تایبەتمەندیی خۆی هەیە یان بەدەستەواژەیەکی تر بە دەروونناسی ئەو لە قەڵەم دەدرێت، بە هەمان شێوە ڕەخنەش، لە دیدی لێکۆڵەرێك کە لە باری دەروونی دەکۆڵێتەوە بە دەروونناسی ئەو یان هەڵسەنگاندنی ئەو دەردەخات هەر لەبەر ئەو خاڵەشە کە ڕەخنەی دەروونناسی لە هەموو بەشەکانی تری ڕەخنەو جۆرەکانی تر بە گرنگترو قووڵتر دادەنرێت.[11]

## رێبازی ڕەخنەی مێژوویی:

ڕەخنەی مێژوویی شێوەیەکی یان میتۆدێکی ڕەخنەیی باوەو بەلای ئەو ڕەخنەگرانەوە ڕووداوی مێژوویی بەسە بۆ سەرنجدان‌و دەرخستنی چۆنیەتی و نرخ و بەهای بەرهەمی ئەدەب. لە ڕاستیدا ڕەخنەی مێژوویی بە هۆکارێك بۆ لێکۆڵینەوە لە مێژووی ئەدەب دادەنرێت. ئەڵبەتە مێژووی ئەدەب، لەو ڕووەو کە ناساندنی بارودۆخی کۆمەڵایەتی هەر میللەتێکە گرنگییەکی زۆری هەیە، بەڵام ڕەخنەو لێکۆڵینەوەی ئەدەبیات ناتوانێت و ناشێت

١١- بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ڕەخنەی دەروونی، بڕوانە:

سامی الدروبی، علم النفس والادب (معرفة الانسان بين بحوث علم النفس و بصيرة الاديب والفنان)، القاهرە؛ ١٩٧١.

د.عزالدين اسماعيل، التفسير النفسي للادب، مەجید عەبدولرەحمان، ڕەخنەی دەروونی، گ؛ نووسەری نوێ، ژ ٢، ئایاری ١٩٩٨، ل ٨٣-٩٠.

بە تەنیا بە میتۆدی مێژوویی ئەنجام بدرێت. لایەنی جوانی هونەریی کە لە بەرهەمێکی ئەدەبیدا سەرنجی رەخنەگر بەلای خۆیدا رادەکێشتی بە تەنیا رەوتی مێژوویی ئەو بەرهەمە نییە.

شیعر و بەرهەمێکی ئەدەبی (بێ ناو) کە دڵڕفێنو هەست بزوێن بێت، با سەردەمو زەمانی نووسەرەکەیشی دیار نەبێت دەتوانرێت بخرێتە بەر باری سەرنجەوە، زۆر پەرستگاو کۆشك و تەلاری کۆنی جوان لە کاتێکدا ناوی دروستکەرو مێژووەکانیشیان نازانین کەچی چێژو لەززەت لە جوانییان دەبینین.

کەوابێ لە تێگەیشتنی شیعر و ئەدەبیشدا وەکو هەموو بەرهەمێکی جوان رەخنەی مێژوویی هەرچەند بە سوودو پێویستیش بێت، ناتوانێ ئەو بەرهەمە دەوڵەمەند بکات یان بە تەنیا هیچی بۆ بکرێت، ئەمە جگە لەوەی کە ئەو کەسانەی هەوڵیانداوە لە رووی مێژووییەوە رەخنە لە بەرهەمی شاعیران و نووسەران بگرنو لێی بکۆڵنەوە، لە راستیدا هەمیشە بە پێچەوانەی خواستی خۆیان زیاتر هیچیان نەکردووەو کە لەسەر ژیانی نووسەرو شاعیران پەردە لەسەر کاریگەری و هەست و سۆزی ئەوان لابدەن، ئەو سۆزو کاریگەرییانەی کە راستەوخۆ دەبنە هاتنەکایەی بەرهەمی شاعیرانو نووسەران، نووسەرانی مێژووی ئەدەب ئەگەر ئەو شاعیرو هونەرمەندەی باسی دەکەن پەسەندی بکەنو خۆشیان بوێ، ژیانو بارودۆخی ئەو بە شێوەیەك باس دەکەن کە کەوتۆتە ژێر کاریگەریی هەستو بۆچوونی پاكو رەسەنو بەرزەوە، خۆ ئەگەر رقیشیان لێ بێت پێوەندیی ژیانی ئەو یان رەنگدانەوەی ژیانی دی لە بەرهەمەکانیدا بە شێوەیەکی ناهەمواری بێ بایەخو رەونەق دەردەخەن.

بە کورتی رەخنەی مێژوویی لە چەندین شێوەدا خۆ دەنوێنێ. هەندێ جار هەوڵدەدات لە نێوانی ژیانی شاعیرو بە بەرهەمەکەیدا جۆرە پێوەندییەکی رۆنان ئامێز بدۆزێتەوە. لەو حاڵەتەدا بابەتو قارەمانی داستانی رووداوەکە شاعیر خۆیەتیو لەدەربڕی سەرگوزشتەی ژیانی خۆی زیاتر شتێکی تر نییە. هەندێ جاریش هەوڵدەدەن کە بەرهەمی شاعیر وەکو ئاوێنەیەك نیشان بدەن کە رووداوو بەسەرهاتی مێژوویی بۆتە هەوێنی بەرهەمەکە، لە راستیدا ئەم جۆرە رەخنەیە تەنیا هەوڵدانێکە بۆ دۆزینەوەی پێوەندیی نێوان دوو گوتەکە کەمو زۆر پێوەندییان پێکەوە هەیە، بە هەرحاڵ رەخنەی مێژوویی لەگەڵ ئەو هەموو رەخنەو



نارەزاییەی کە لەسەریەتی، رێبازێکە وەکو هەموو رێبازەکانی دی سوودی خۆی هەیە ئەگینا بێ سوودی کەم و کورتی هەیە.

لە رەخنەی مێژووییدا وەکو مێژوو لێکۆڵینەوە لە راستی و دروستیی بەڵگەکان یەکەمین هەنگاوە. بەکورتی، مێژووی ئەدەب ئامانج و ئاکامی رەخنەی مێژووییەو لە هەمانکاتدا پێشەکیو ئامرازی دەستی ئەوە، چونکە هەمیشە لێکۆڵینەوەو بڕیاری مێژووی ئەدەب بۆ لێکۆڵینەوەی دەقی تازە بە سوودو کاریگەرەو لە هەمانکاتدا لێکۆڵینەوەی دەقەکان بۆ بڕیاردانو لێکۆڵینەوەی مێژوویی ئەدەب رەخنەیە لە رابردوو، کەچی رەخنەی ئەدەبی بە تەنیا پێوەندی بە هاوچەرخەکانە. ئەم بۆچوونە راست نییە.

جیاوازیی راستەقینە لە نێوان رەخنەو مێژوویی ئەدەب لەوەدایە، کە مێژووی ئەدەب وەکو هەر جۆرە مێژوویەکی دی تەنیا دەبێ لە رێگەی رەخنەی بەڵگەنامەو دیدارو دانپیانانەوە لە دەقی ئەدەبی بکۆڵێتەوە، بەڵام (رەخنە) جگە لەو شێوازانە دەتوانێ لە شێوازی تر، بۆ نموونە لە رێگەی رێبازی رەوشتی کۆمەڵایەتی، دەروونناسی و هونەریی بۆ کاری خۆی سوود وەرگرێ. بە هەرحاڵ رەخنەی مێژوویی یەکێ لە رێبازە کاریگەرو بە سوودەکانی رەخنەی ئەدەبییەو ئەڵبەتە رەخنەگر بۆ ئەوەی بە شارەزاییەوە کاری خۆی بکات، دەتوانێ وەکو رێبازەکانی دی سوود لەبەکاربردنی ئەو رێبازەش وەرگرێ و پشتگوێی نەخات.[١٢]

١٢- ئەم رێبازە رەخنەییانەم لەم کتێبە وەرگێڕاوە: د.عبدالحسین زرین کوب، جستجو اصول و روشها و مباحث نقادی با بررسی در تاریخ نقد و نقادان، چاپ ششم، تهران، ١٣٧٨، ص٦٦-٩٨.

**بەراوردێک لە نێوانی کلاسییزم و ڕۆمانسییزمدا**

**کـلاســـیـــزم:**

١ — بنەماکانی لەسەر عەقڵە.

٢ — ڕوونی تیایە.

٣ — ئامادەنەبوونی کەسیەتی ئەدیب.

٤ — جەختکردن لەسەر بنەماکانی ماددی.

٥ — گرنگیدان بە دەستوور.

٦ — خۆبەستنەوە بە یاسا و قانوون.

٧ — خۆدانە پاڵ ڕژێمی دەسەڵاتدار.

٨ — قبووڵ کردنی واقیع.

٩ — ڕازی بوون و ئاسوودەیی لە ژیاندا.

١٠ — کەسیەتییەکی ئارامە.

١١- واقیعییە.

١٢ — (بابەتی) یان دەخستە پێش (خودی). پەیدابوونی مرۆڤ و ژینگەیان بەیەکەوە دەبەستەوە، بەڵام بێ ئەوەی بزانن، کە چ شتێك خودییە. واتا هەڵەکەیان لەوەدا بوو (مرۆڤ پەیوەستە بە داب و نەریتی پێش خۆی) بۆیە پاڵەوان هەمیشە ئیرادەی خۆی لێ زەوتکرابوو.

١٣- دەڵێن یاساکان دانراون بۆ چاککردنی مافی مرۆڤ.

**ڕۆمـانـسـیـزم:**

١ — لەسەر سۆزە.

٢ — تەم و مژی تیایە.

٣ — ئامادەبوونێکی تەواوی کەسیەتی ئەدیب و ڕزگارکردنی.

٤ — جەختکردن لەسەر وشەی مەعنەوی.

٥ — ڕەتکردنەوەی دەستوور.

٦ — یاخیبوون لە یاسا و قانون.



٧ — نارەزایی دەربڕین بەرامبەر بە ڕژێم.

٨ — ڕەتکردنەوەی واقیع.

٩ — یاخیبوون لە خوێنیدا قوولێپ دەداو بێزاری لە واقیع.

١٠ — کەسیەتییەکی ڕاڕاو نیگەرانە.

١١ — خەیاڵییە (شتەکان لێڵن و بەرجەستە نین)، حەزدەکەن بە خەیاڵ بگەنە ئامانج و ئاواتی خۆیان، بەڵام لە پاشەڕۆژیشدا تێدەگەن، کە گەیشتن بە ئامانج دوورە، بۆیە ڕەشبینی و ئازار و گریان دەبێتە پیشەیان.

١٢ — ڕۆمانسییزمەکان بە پێچەوانەوە دەیانوت. واتە هەموو شتێك لە دروستکردنی مرۆڤ خۆیەتی. ئەگەر باوەڕی بە. شتێ بێ دەیگۆڕێ هەموو کاتێك دەتوانێ ڕووبەڕووی یاسا کۆنەکان ببێتەوەو بیانگۆڕێ.

باوەڕیان بەهێزی لەبن نەهاتووی مرۆڤ هەبوو. یاساکانی سروشتیان پشتگوێ خستبوو، ئەمەش ئەنجامەکەی خراپ بەسەریاندا شکایەوە.

١٣- دەڵێن دەزگا یاساییەکان بەرپرسیارن لە نەهامەتی مرۆڤ.

**نموونەی شیعریی رۆمانسیی:**

## بادەی عەشق

شیعری : رۆبێرت براونینك

گوتم ئازیزم، ئێستا گوڵی عەشقم وا هەڵوەری
ئێستا، کە عەشق سوودێکی بۆ من نەبوو، لە دەست چووم
ئێستا، تەنیا بۆ ناکامی پێم ناوەتە شانۆی ژیانەوە
رێم بدە با ساتێ سەرمەستی بم بە یادی عەشقی شووم

❊ ❊ ❊

دڵبەرم، گوڵێکی جوانی بەهاریی لەبەردەمی خۆی دانا بوو
خەندەلێوێکی گاڵتەی بۆ کرد، وەڵامی دایەوە :
نەخێر! شەرابی عەشقی ئەو کەسە بنۆشە
دەڵی بۆ خەباتی ژیان تێکۆشە

❊ ❊ ❊

گوتم بگرە، ئەم دڵەی تەنگ و پەشۆکاوم بە تۆ دەسپێرم
بیکەرە تان و پۆی لەرزانەی ئاهەنگی ئەم عەشقەمان،
بە ئاوازی ئومێد بیجۆشێنە
پەڵە هەوری غەم لە ئاسمانی ژینم وە دوورخە و شکۆفەی
بەختیاریم، لە جێی گوڵی غەم بپشکوێنە.

❊ ❊ ❊



**دوو پارچە پەخشانی رۆمانسیی**

**بەرهەمی: ڤیکتۆر هۆگۆ**



**ڤیکتۆر هۆگۆ**

**ئێستاکە..**

ئێستا کە لێوم خستۆتە سەر جامی بادەی بوونی تۆوە، ئێستا، کە روخساری رەنگ پەڕیوی خۆم لە نێو دەستە پڕ ئەڤینەکانی تۆوە دەبینم و ئێستا کە بۆنی عەتری دڵئەنگیزی گیانی تۆ لە نێو سێبەرە شاراوەکاندا دەکەم، ئێستا کە یادی قسەکانی تۆ دەکەمەوە و کە چەندان رازە نهێنییەکانت گوێدا دەچرپاندم، ئێستا کە جارێ گریان و جارێ خەندە دەخەیتە سەر چاوو لێوی منەوە، ئێستا کە سەر ماڵەکەم بە تیشکی پرشنگی تۆوە رووناك بۆتەوە، ئێستا کە پەڕەی گوڵی تۆ کەوتۆتە کانیاوی ژینی منەوە، ئێستا کە چڵێ لە لقە گوڵی تۆ کەوتۆتە کانیاوی ژینی منەوە، ئێستا دەتوانم بە ساڵانی رابردووی تەمەن بڵێم :

رابووره دیسان رابووره، ئیدی من ترسی پیریم نییە، بۆ خۆت تێپەڕە و گوڵە سیسەکان پەروەردەکە، من لە باخچەی ژیان گوڵێکم هەیە، هیچ کەس شایانی قرتاندنی ئەو گوڵە نییە. هەنووکە دەتوانم بە سالآتی تەمەن بڵێم:

هەرچەند دەتوانن باڵەکانی خۆتان لەو جامەی و کە من شەو و رۆژ مەی خۆشەویستی و شیرینی پێدەنۆشم، هەڵسوون. چونکە دڵنیام چەندە باڵتانی تێهەڵسوون دڵپێکی لێ ناچۆڕێنن. ئەگەر ئێوەش خۆڵەمێشێکی زۆرتان هەیە بۆ گڕ کوژێنەوە و ئەوا من گڕێکی زۆر مەزنترم لە خۆڵەمێشی ئێوە هەیە، ئەگەریش ئێوە فەرامۆشیی دەکەن بە هاوڕێی خۆتان و ئەوا من لە نێو دڵدا عەشقێکی بەهێزترم لە فەرامۆشیی ئێوە حەشارداوە.

## گوڵی بەهاران

ئێستاکە گوڵە بەهارییەکان لە نێو چەمەنزارەکاندا بۆ لای خۆیان بانگمان دەکەن : وەرن، وەرن رۆحی خۆتان لەگەڵ سەفای گوندە بچکۆڵانەکان، لەگەڵ سەوزی جەنگەڵەکان و سێبەرە دڵگیرەکانی گوڵ و گەڵاکان، لەگەڵ شەوانی مانگە شەوی کەنار جۆگەلە ماندووەکاندا، لەگەڵ ئەو کوێرە رێیانەی رێبواران بەرەو جادە دەبا و لەگەڵ شنەی بەهاری گوڵاوی، لەگەڵ ئاسۆی دوور و کە عاشق ئاسا لێوی خستۆتە سەر پێکی پەڵە شینەکانی ئاسمان و ماچە دەکا، رابێنن.

وەرن تا چاوتان بە ئەستێرە شەرمنەکان بکەوێ و کە چۆن لەو دیو ئەو هەموو گڵۆپ و پەردانەی بە رووی زەمیندا دراوە و سەرەتاتکێ دەکەن. تا چاوتان بەو خوناو و زەمزەمەی نێو چڵ و گەڵای درەختەکان بکرێتەوەو قرچەی نیوەڕۆیان جووتیارەکان و سێبەرەکان و شەپۆلەکانی دەریا و سوزایی چەمەن و دەرکەوتنی سروشت ببینن، کە چۆن هەموو دەستیان لە نێو دەستی یەك ناوە، گوڵێکی جوان بگرن بە دەستەوەو شکۆفەی عەشقی دڵتان بپشکوێنن.[13]

١٣- بڕوانە: شور عشق و جوانی، ترجمه و تدوین منوچهر شکرانی، ص١٢٤- ١٢٥.



## رۆمانسییزم لە ئەدەبی کوردیدا

کە باس لە دەرکەوتن و بڵاوبوونەوەی رێبازی رۆمانسییزم لە ئەدەبی کوردیدا دەکرێ راستەوخۆ بە تازەبوونەوەی ئەدەبی کوردیی دەبەسترێتەوە، بەو پێیەی هەرچی ئەدەبی کوردی پێش رۆمانسییزم هەیە دەچێتە خانەی ئەدەبیی کلاسییزمی کوردییەوە.[14]

بێگومان ئەمەش ئەم بۆچوونەش بە راست دەگەڕێتەوە، ئەو کەش و هەوای یاخی بوون و تازەگەریی و گۆڕانەی رۆمانسییزم لە هەناوی خۆیدا هەڵیگرتووە، دەتوانین بە تازەگەرییەوە پەیوەستی بکەین. سەرەتای سەدەی بیستەم بە هۆی ئەو گۆڕانکارییانەی بەسەر بارودۆخی رۆژهەڵات و دەوڵەتی عوسمانی و دواتر لە ئاکامی جەنگی یەکەمی جیهانی بەسەر ناوچەکەدا هات، لە باری ئەدەبی و رۆشنبیرییشەوە ئەو گۆڕاناکارییانە دەرکەوتن و دەبوو هونەر و ئەدەبیاتێکی تازەش بێتە کایەوە، کە دەربڕی ئەو بارودۆخە تازەیە بێت و لەگەڵ رەوتی تازەی سەردەمەکەدا بگونجێت. لە ساڵی ١٩٠٨ بە دواوە جۆرە سەربەستییەکی تازە و بێ سانسۆریی لە تورکیادا هاتە کایەوە، دروستبوونی کۆڕو کۆمەڵی ئەدەبی و رووکردنە رۆژئاوا و وەرگێرانی بەرهەمی نووسەرانی ئینگلیزیی و فەرەنسیی تازەگەریی و جموجۆڵێکی تازەی خستە ئەدەبیاتی تورکییەوە و دواتر لە ئەدەبیاتی میللەتانی ناوچەکەدا رەنگیدایەوە و لە ئەدەبیاتی کوردییشدا خۆی نواند. کەوابێ هۆکارەکانی تازەبوونەوەی ئەدەبیاتی کوردی دەتوانین بڵێین ئەمانەن:

١- تازەبوونەوەی ئەدەبیاتی تورکیی لە رێگەی هەندێ تەوژمی و گۆڤاری ئەدەبیی تازەوە، وەکو (سەروەتی فنون)و (ئودەبای فەجری ئاتی) و هەندێ نووسەری بە توانای وەکو تۆفیق فیکرەت و نامیق کەمال و جەلال ساهیر و عەبدولحەق حامیدو عومەر سەیفەدین و محمد عاکف ئارسۆو...هتد.

١٤- هەندێ بۆچوونی وا هەن، کە ماوەی ئەدەبیاتی کوردی لە سەرەتاوە تا وەکو سەرەتای سەدەی بیستەم بە ئەدەبیاتی کۆن ناو دەبەن، گوایا ناشێ ناوی کلاسییزمی لێبنرێ، چونکە زۆر خاڵی جیاواز لە نێوانی کلاسییزمی کوردی، کە کاریگەری شارستانییەتی و ژیاریی ئیسلامی و رۆژهەڵاتی بەسەرەوەیە. بڕوانە:د.کامل بصیر، وێژەی کوردی و رەخنەسازی، بەغدا، ل٨١-٩٨. هەروەها : د.نەجم ئەڵوەنی، ئایا راستە کلاسیك لە مێژووی ئەدەبی کوردی سەری هەڵنەداوە؟!، گ کاروان، ژ ١٨٥، ٢٠٠٤، ل٧٨ — ٨٢.

هەروا: ئیدریس عەبدوللا مستەفا، قۆناغی پێش رۆمانسیزمی شیعری کوردی (١٨٥١- ١٩٢١) لێکۆڵینەوەیەکی رەخنەیی مێژووییە، هەولێر ٢٠٠٦، ل ٣٦- ٥٦.

هەروا : نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد، کورتە باسێکی مێژوویی قوتابخانەی کلاسییزم، بلاۆکراوەی نێرگز، چاپی دووەم،بەغدا، ١٩٨٥، ل٥٥-٨٤.

٢- گەڕانەوەی هەندێ نووسەری کورد، کە ساڵەها بوو لە تورکیای عوسمانیی دەژیان و لەوێ سوودیان لە ئەزموونیی نوێخوازی و ژیانی ئەدەبی ئەوێ وەرگرتبوو، وەکو پیرەمێرد(١٨٦٧- ١٩٥٠) و زێوەر(١٨٧٥- ١٩٤٨)...هتد بە تایبەتی پیرەمێرد لە هەموویان زیاتر بەو تازەگەرییە کاریگەر بوو و باشتر لە گیانی ئەو نوێخوازییە تێگەیشتبوو و پێوەندی لەگەڵ نووسەرە تورکەکانی ئەوێ زۆرتر بووە، بۆیە لەگەڵ گەڕانەوەیدا بە نووسینی درامای هونەریی تازە لەسەر بنچینەی فۆلکلۆر و کەلەپووری میللی و بەکارهێنانی کێشی پەنجە و بەکارهێنانی زمانێکی کوردی دوور لە وشەی بێگانە..ئەمانە هەموو لە سیماکانی تازەبوونەوەی ئەدەبیاتی کوردیی (پیرەمێرد)ن. ئەمە سەرباری ئەوەی هەندێ لە شاعیر و نووسەرانی ناوەوەی کوردستانیش لە ڕێگەی خوێندنەوەی بەرهەمی تورکی و فارسییەوە ئاگاداری تازەبوونەوەی ئەدەبیاتی ناوچەکە بوون، وەکو ئەورەحمان بەگی بابان و شێخ نووری(١٨٩٦ - ١٩٥٨) و گۆران(١٩٠٤- ١٩٦٢) و ڕەشید نەجیب و....هتد.

٣- بارودۆخی سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتی کوردیی دوای بڕانەوەی جەنگی یەکەمی جیهانی و هۆشیاری کۆمەڵی کوردەواری، لە ڕێگەی داواکرنی مافی چارەی خۆنووسین و شۆڕش و هاتنە ناوەوەی کورد لە پەیماننامەی سیڤەر(١٩٢٠) و لۆزان(١٩٢٣) و...، ئەم بارودۆخە پڕ لە جموجۆڵە یارمەتیدەر بوو، بۆ گۆڕانی زەمینەی بیر و ڕۆشنبیریی کوردیی. دواتر هاتنی ئینگلیزەکان بۆ عێراق و کوردستان و هاندانی ئەوان بۆ دوورکەوتنەوە لە زمان وکلتووری عەرەبی و فارسیی و تورکیی و بڵاو کردنەوەی ڕۆژنامە و هاندانی نووسەرانی کورد بۆ خوێندەواری و چوونە بەر خوێندن و بەکارهێنانی زمانی کوردی و فەرهەنگی گوندەکان، ئەمەش کاریگەریی خۆی لەسەر باری ئەدەبیدا هەبوو. لەم ڕووەوە(د.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ) زمانی شیعری کوردی بەپێی قۆناغەکان بەسەر پێنج قۆناغدا دابەش دەکات.[15]

بەم شێوەیە سەرەتاکانی ڕۆمانسییزم لە شیعرەکانی پیرەمێرد و شێخ نووریدا دەرکەوت و دواتر گۆران بووە یەکێ لە دیارترین شاعیری ئەو ڕێبازە. دیارە دەبێ ئاگایشمان لەوە هەبێت، کە پێشتر سیما و شەقڵی ڕۆمانسییزم لە شیعری کوردیی شێوە گۆران (هەورامی)دا دەرکەوتووە، بە تایبەتی

---

١٥- بڕوانە: دوکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، ئەدەبیاتی نوێی کوردی، هەولێر،١٩٩٠، ل ٢٧ - ٢٨.



کاریگەریی مەولەوی و خانای قوبادی و بێسارانی لەسەر شاعیرانی وەکو پیرەمێرد و گۆران بە ئاسانی هەستی پێدەکرێت.[16]

لە بارەی نوێکردنەوەی شیعری کوردی لەم قۆناغەدا، (د.مارف خەزنەدار) سیماکانی نوێکردنەوەکە لەم خاڵانەدا دەبینێت :

١- لەگەڵ بەردەوامی بەحری عەرووز کێشی (پەنجە، کەرت، بڕگە، سیلاب) لە شیعری کوردیدا پەیدا بوو.

٢- یەکێتی قافیە لە شیعری کوردیدا شاعیری بە دەستوورێکی سەخت بەند کردبوو. دیاردەیێك بوو پێویستی بەوە دەکرد شاعیر توانایێکی تەکنیکی بەهێزی هەبێ لە شیعر دانان و شارەزاییێکی تەواوی لە شیعری کلاسیکی کۆندا هەبێ. لە شیعری نوێدا یەکییێتی قافیە رووخێنرا و کەوتە ئازادییەوە.

٣- لە شیعری نوێدا خەیاڵ و هەست و دەرك کردن یەکییێتییەکە پێوەندیی لۆجیکی لە نێوان دێڕە شیعرەکاندا بەهێز دەکا، لە لایێکی دیکەشەوە هەموو دێڕە شیعرێك بەردەوام و روونکەرەوە و تەواوکەرەوەی مانای دێڕی پێشتر دەبێ.

٤- زمانی شیعر لە وشەی بێگانە دوور دەخرێتەوە، وشەی تازەی کوردی دروست دەکرێ، یا دەدۆزرێتەوە، بە شێوەیێکی فراوان لێکسیکۆنی کوردی و تەعبیری کوردی خۆماڵی لە شیعری کوردیدا بەکار دەهێنرێ.[17]

---

١٦- بۆ کاریگەریی مەولەوی لەسەر پیرەمێرد و گۆران و دیلان، بڕوانە : د.دلشاد عەلی، دیاردەی کاریگەری مەولەوی لەسەر شاعیرانی کرمانجی خوارو (پیرەمێرد، گۆران، دیلان)، گ؛ زانکۆی سلێمانی، ژ٥،٢٠٠٠، ل ٥٣- ٨٥.

١٧- بڕوانە : دوکتۆر مارف خەزنەدار و مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی پێنجەم، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٥، ل ٢٨.

**نموونەی شیعری رۆمانسییزمی کوردی**

چاوەڕوانی بێهوودە[18]

شیعری : ئەحمەد هەردی

هەموو رۆژێ لەبەر ســـــەیری بتی ئـەو بـەژن و بالآیـــە
لەسەر رێیدا ئەوەستم من هـەتاکـــــو ئاوی پێم دایـــــە !

بە دووچاوێ کــە شــەوقی چــــــاوەڕوانی ئەیتـروکــــــێنێ
بەدوو چاوێ کـە سـرڕی قـوولی لاوێتی و ئـــــــەدرکــــــێنێ

سەرنجی رێ ئەدەم، رێگا، هەموو شێوەی ئەوی تیایـــــــــە
وەکــــــو دنیا لـەنـاو جــــوانی ئـەوا توابێتەوە،... وایـــــە

شـــــــــنەی با باسی جوانی ئەو، بە گوێی مندا ئەچرپێنێ
هـەمـــــــوو دەرکەوتنی شـــــۆخێ، دلی من دا ئەخورپێنێ

بەلام خـورپەی تــــــــەواوی دلّ لەگـــــەلّ هــەنگاوی ئەودایە
کە سەرتا پا لە ئاوازی بەهەشـــــــــــتی خـــــــواوە.. پەیدایە

بەلێ! کاتێ(کە ئەو دەرکەوت، ئیتر من بێ ســــــــــەروشوێنم)
بەتیشکی خۆری جوانیی ئەو، بەجارێ قولپ ئەدا خوێنم

وەکو چۆن نەو نەمامێ، گەردەلوول ئەیبات و ئـــــــەیهێنێ
لەشـــــــــم مـــوچـرکی دلـــــداری، وەها ناخی ئــــــــەبزوێنێ !

ئـــەگــەرچی وەك خــەیالی من عــەبا دەوری لەشــــــــــی داوە
لـە ئــــەنـــــــــدام و لـەش و لاری بـلـنــد و رێکی...ئـــــــــالاوە

بــــەلام کــاتــێ با چمــــکی عــەبـاکــەی لا ئـــەدا، تـــــــــاوێ
ئـەرێژێ پـــــوزی نـایــابی، لە ســـــیحری خوایی، لافاوێ

سلێمانی / ١٩٥١

---

١٨- ئەحمەد هەردی، رازی تەنیایی، چاپی دووەم، هەولێر، ١٩٨٤، ل٧٧-٧٨.

یەكێك لە كێشەكانی لێكۆڵینەوی ڕێبازی ڕیالیزم، كە بەر لە هەموو شتێك ڕووبەڕووی لێكۆڵەر دەبێتەوە، زۆری ژمارەی جۆرو ڕووگەكانییەتی. تەنانەت هەندێ كەس زیاتر لە سی (٣٠) جۆریان لێ دەستنیشان كردووە [19] ئەمە سەرباری ئەوەی زۆرجار لێكۆڵەر تووشی تێكەڵاوی كێشەی سنووری هەردوو ڕێبازی ڕیالیزم[20] و ناتوراليزم دەبێتەوە.

## ریالیزمی رەخنەگرانە

ڕیالیزم وەكو زاراوەیەك بەر لەوەی ئەدەب و ڕەخنەی ئەدەبیدا دەركەوێت، لە نێو فەلسەفەدا بڵاوبووەوە[21] زۆربەی لێكۆڵەرەوەكان پێ لەسەر ئەوە دادەگرن، كە (شانفیلۆری) بە ڕابەری ئەو ڕێبازە لە قەڵەم دەدرێت و لە بواری ئەدەبییشدا بەو واتایە دێت، كە هەموو بابەتێكی فیكری چارەسەرییەكی بابەتییانەی كێشەكانی ژیانی مرۆڤ بكات، ئەم چارەسەرییە وێنەكێشەییەكی ورد و قووڵ و لەباری وای تیابێت، نووسەر خۆی لە دەرەوەی بابەتدا بدۆزێتەوە. لێرەوە كێشەیەكی تریش ڕووبەڕوومان دەبێتەوە ئەویش ئەوەیە، كە ریالیزم بەو مانایە مێژوویەكی درێژو كۆن و داهاتوویشی دەبێت، هەر لە هەقایەتی فۆلكلۆری و چیرۆكەكانی بەر ئاگردان بەڕای نووسەران هەموویان كەم و زۆرخۆیان لە بەشێكی ئەو پێناسەیەدا دەدۆزنەوە. لە بیروبۆچوونی ئەدەبیی ڕیالیزمدا هەستێكی گەورە بەدی دەكرێت، بۆ دەستنیشانكردنی تەنگ و چەڵەمەكانی كۆمەڵ و دۆزینەوەی ڕێگە چارەی شیاو بۆیان.

ئەدیب و ڕەخنەگرە ئەڵمانییەكان هەر زوو لە ساڵی (١٧٩٨)ەوە ئەو زاراوەیان لە بواری ئەدەبی ڕۆمانسیدا بەكارهێناوە، و پاشان بەناو نووسەرانی تردا بڵاوبووەوە، بەڵام لەسەردەمی (شانفیلۆری) چیرۆكنووسیی گەورەی فەرەنسیی (١٨٥٧) دا بە شێوەیەكی تایبەتی جێگیر بوو،

١٩-: دیمین كرانت، الواقعیة، ترجمة عبدالواحد لؤلؤة، ص ١١ – ١٣. بغداد ١٩٨٠. هەروەها : د.عبدالمنعم تلیمة، مقدمة فی نظریة الادب، ص ١٩١.

٢٠- ڕیالیزم لە زمانی لاتینی دا بە واتای (شتی هەست پێ كراو) دێت. بڕوانە: الدكتور سالم احمد الحمدانی، مذاهب الادب الغربی و مظاهرها فی الادب العربی الحدیث، الموصل، ١٩٨٩، ص ١٥٦.

٢١- كانت و شیلینگ بەكاریان هێناوە، لە جیاكردنەوەی میتافیزیك و ڕیالیزم دا.



بە تایبەتیش لەو كاتەدا، كە كۆمەڵە وتارێكی خۆی لە بەرگێكدا بە ناونیشانی (ڕیالیزم) بڵاوكردەوە و پاشان گۆڤارێكیشی بە هەمان ناو دەركرد.

(ڕیالیزم) لە ڕێگەی چەند ئەدیب و ڕەخنەگرێكی فەڕەنسییەوە بووە ڕێبازێكی ئەدەبی دەوڵەمەندی ئەورووپی، بە تایبەتی " ستاندال (١٧٨٣ – ١٨٤٢) و بلزاك Honoré de Balzac1799-1850 و فلۆبێر(١٨٢١ – ١٨٨٠) و مۆپاسان و ڕەخنەگرەكانی وەكو سانت بۆڤ و تین Tainو كۆنت ". بە تایبەتی ئەو پێشەكییەی بلزاك Honoré de Balzac 1799-1850 لەگەڵ (كۆمیدیای مرۆڤایەتی)دا بڵاوی كردەوە، بووە بەیاننامەی ئەو ڕێبازە.

ئەم ڕێبازە لە ئەدەبیاتی رووسیی سەدەی نۆزدەهەمدا لە بەرهەمی ((نیكۆلای كەرامزن(١٧٦٦ – ١٨٢٦) بە ڕۆمانەكانی (لیزای لات و ناتالیا)و (كچانی بۆیەر) ڕۆمانی بە رووسیا ناساند، لە هەمانكاتیشدا ئەو ئەدگارانەی، كە ئەدەبی چیرۆكیی رووسیی پێناسرا وەك : ریالیزمی رەخنەیی و كارێكیش، كە پەیوەست بێت بە بەها ڕۆحی و ئایینییەكان ئەوا بۆ یەكەمجار لە كارەكانی مایكل لێرمەنتۆڤ ١٨١٤ – ١٨٤١ دا بە دیاركەوت. ڕۆمانی (پاڵەوانی سەردەمی ئێمە) پێشەنگی ڕۆمانی سایكۆلۆژیی رووسییە. (نیكۆڵای گۆگۆل ١٨٠٩ – ١٨٥٢) لە (گیانە مردووەكان)دا توانج و پلار دەگرێتە داب و نەریتی لادێ و دەبێتە ڕابەری بزووتنەوەی ئەدەبی چیرۆك. دیستۆڤسكی (١٨٢١ – ١٨٨١) لە ڕۆمانەكانی (گەمژە)، (تاوان و سزا)[22]، (برایانی كارامازۆڤ)[23]دووپاتی بەرزی و ڕاستەقینەیی گیان دەكاتەوە. لیۆ تۆلستۆی (١٨٠٨ – ١٩١٠) دوو ڕۆمانی یەكجار مەزنی هێنایە بەرهەم (جەنگ و ئاشتی) و (ئانا كارنینا)[24]و كە شۆڕشێكی بەرپا كرد لە گیانی رووسیدا و لە هەمانكاتیشدا لە سروشت و گەردوون و كۆمەڵگا و مرۆڤدا.))[25]، هەروەها بەرهەمەكانی نووسەری بە ناوبانگ (چیخۆڤ

٢٢- لە بارەی ئەم ڕۆمانە بڕوانە: پەیامی كافكا، وەرگێڕانی؛ هیمدادی حوسێن، سلێمانی،٢٠٠٠، ل ٦٥-٧٠.

٢٣- سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٩- ٦٥.

٢٤- سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٣- ٤٨.

٢٥- بڕوانە: حەیات سەعید عەبدولكەریم، نۆڤلێت لە ئەدەبی كوردیدا ١٩٧٠ -٢٠٠٠، نامەی ماستەر، زانكۆی سەحەدین،٢٠٠٥،ل ١١- ١٢.

١٨٦٠ - ١٩٠٤) له چیرۆك و دراما‌دا بـه لووتكه‌یـه‌كی ئـه‌و ڕێبـازه لـه قه‌ڵـه‌م ده‌درێـت.[٢٦] ((برنادشۆ شانۆنامه‌نووسی ناوداری ئێرله‌ندی لـه‌م باره‌یـه‌وه ئـه‌ڵێ: لـه‌نێو (شانۆنامه‌نووسـانی گه‌وره‌و ناوداری ئه‌وروپا دا و له دوای ئیبسن و چیخۆف له پـاڵ تۆڵـستۆی و تۆرگینێـف، وه‌ك ئه‌سـتێره‌یه‌كی پڕشـكۆ ئه‌دره‌وشـێته‌وه (ئـه‌وه‌ی بایـه‌خێكی تایبـه‌تی به‌خـشیوه‌ته چـیخۆڤ و به‌رجه‌سـته‌تر لـه شانۆنامه‌نووسـه‌كانی تـری كـردووه، ڕوانینـی قـووڵی سـه‌باره‌ت بـه دنیـای ده‌وروبه‌ری، هه‌ست كردن به لێك هه‌ڵوه‌شانه‌وه‌ی چاره هه‌ڵنه‌گری كۆمه‌ڵگای كۆن و هاتنه ئارای كۆمه‌ڵگایی نوێیه..))[٢٧]

ئه‌و هۆكارانه‌ی ده‌ورێكی باڵایان له هاتنه‌كایه‌ی ڕێبازی ڕیالیيزمـدا هـه‌بوو، پێـشكه‌وتنی زانستیی و فه‌لسه‌فیی له‌و سه‌رده‌مه‌دا، به تایبه‌تی له بواری زانستی بۆماوه‌یی (الوراثـة)دا، كه زۆر بۆچوونی كۆمه‌ڵایه‌تی و فیكریی و هونـه‌ریی گـۆڕی. هـه‌روه‌ها هاتنه‌كایـه‌و پێـشكه‌وتنی فه‌لسـه‌فه‌ی (پـۆزه‌تیڤیزم)[٢٨] و (ئه‌زموونگـه‌رایی) و (ماتریـالیزمی). هـه‌روه‌ها ڕۆمانسییزمه‌كانیش به شێوه‌یه‌كی به‌رفراوان ڕوویان له خه‌یاڵ كردبوو. كه وای لـه خـه‌ڵك كـرد لێیان دووركه‌ونه‌وه.

## خاسیه‌ته‌كانی ڕیالیيزم

١ — به تێڕوانینێكی گشتی و هه‌مه‌لایه‌نی له ژیانی مـرۆڤ ده‌ڕوانێـت، واتـا هـه‌ردوو لایـه‌نی خودی و بابه‌تی له‌به‌رچاو ده‌گرت به چاك و خراپییه‌وه.

٢ — به بۆ چوونی ڕێبازی ڕیالیيزم مرۆڤ وه‌كو بوونه‌وه‌رێكی خودی سه‌یر ناكات، بـه‌ڵكو وه‌كـو بوونه‌وه‌رێكی داگیركه‌ر له ژیان و كۆمه‌ڵ سه‌یر ده‌كات.

٣ — ژینگه و بارودۆخی كۆمه‌ڵایه‌تی و ده‌وروبه‌ر كار له دیارده‌كانی ژیانی ڕۆژانه‌ی تاكه كه‌س ده‌كات و جۆری په‌یوه‌ندییه‌كانی له‌گه‌ڵ ده‌وروبه‌ر دیار ده‌كات.

---

٢٦- ده‌رباره‌ی چیخۆف بڕوانه: پلاتۆنۆڤه شێت، وه‌رگێڕانی؛ هیمدادی حوسێن، سلێمانی،٢٠٠١.

٢٧- هوشه‌نگ حسامی، چپخۆفی شانۆنامه‌نووس و(باخی ئاڵوباڵو)، وه‌رگێڕانی پێـشه‌نگ، گ؛ پێـشه‌نگ، ژ ٩، پاییزی ١٣٨٤، ل ١٢٨.

٢٨- پۆزه‌تیڤیزم واتا ئه‌و شێوازه بیركرنه‌وه‌یه‌یه، كه له لێكۆڵینه‌وه‌دا پشت به‌و دیاره ماتریالییانه ده‌به‌ستێت، كه له واقیعدا هه‌ن، به واتایه‌كی دی دژی بۆچوونه میتافیزیكییه‌كانه.



٤ — ڕێبازی ڕیالیيزم پاڵه‌وان وا ده‌رده‌خات، كـه لـه سـه‌ره‌تادا تـا كۆتـایی ورده ورده گه‌شـه ده‌كات و ده‌رده‌كه‌وێت، نه‌ك وه‌كو ڕێبازه‌كانی كلاسییزم و ڕۆمانسییزم پاڵه‌وانی ئاماده‌كراو پێشكه‌ش بكات.

٥ — ئه‌و جیهانه‌ی ئه‌دیبی ڕیالیيزم باسی ده‌كات بوونی بابه‌تیی هه‌یه و له كرۆكی ئه‌و بوونـه ده‌كۆڵێته‌وه و كاردانه‌وه‌ی به‌سه‌ر ده‌وروبه‌ردا ده‌رده‌خات، نه‌ك به شێوه‌یه‌كی خه‌یاڵی دوور له واقیع.

٦ — لای ئه‌دیبه‌كانی سه‌ر به ڕیالیيزمی ڕه‌خنه‌گرانه مه‌به‌ست لـه هونـه‌ره و شـته‌كان خۆیـان ده‌رباره‌ی خۆیان ده‌دوێن و ته‌نیا كارێكی هونه‌ری به جێ دێڵێ و پاشان ئه‌و به‌رهه‌مه خـۆی خۆیدا له خزمه‌تی سیاسه‌ت و كۆمه‌ڵدا ده‌دۆزێته‌وه یان نا.

٧ — ڕه‌گه‌زی سه‌ره‌كی ئه‌ده‌ب به لای ڕیالیيزمه‌كانه‌وه په‌خشان بوو، به تایبه‌تی هونه‌ری ڕۆمان له سه‌رووی هه‌موو هونه‌ره‌كانی تره‌وه بوو. ئه‌وه‌نده گرنگییان به شیعر نه‌ده‌دا، به‌ڵكو زیاتر چیرۆك و شانۆگه‌رییان ده‌نووسی.

٨ — ئه‌گه‌رچی ڕیـالیيزمی ڕه‌خنه‌گرانـه بابه‌تـه‌كانی لـه نـاخی ژیـانی چـینه‌كانی كۆمه‌ڵـه‌وه وه‌رده‌گرێ، به‌ڵام هاوكات بابه‌تی میتافیزیكی و مێژووییشیان فه‌رامۆش نه‌كردبوو.

٩ — فره بابه‌تی لای ڕیالیزمییه‌كان له ئه‌نجامی ئه‌وه‌وه بوو، كه له هه‌موو چینه‌كانی كۆمه‌ڵـدا شاره‌زابن و بیانخه‌نه ڕوو، بۆیه پاڵه‌وانه‌كان هه‌مه چه‌شنه بوون.

١٠ — له ڕووی ڕوخسارییشه‌وه، به تایبـه‌تی لـه زمانـدا نووسـه‌رانی ڕیـالیيزم هـه‌وڵیان ده‌دا زمانێكی پاراو و ڕه‌وان به‌كاربهێنن، بۆ ئه‌وه‌ی به ڕوون و ئاشكرایی گوزارشـت لـه واقیـع بكه‌ن. بۆ ئه‌م مه‌به‌سته‌یش جوانترین شێواز و ده‌سـته‌واژه‌ی دوور لـه دوانـده‌ری و شـێوازی هه‌ڵچوویان به‌كارده‌هێنا. چونكه ئیستاتیكای جوانی له ئیستاتیكای شـێوه یـان ڕوخسـار جیا نه‌ده‌بووه‌وه.

# له رابه‌رانی ریالییزم

## چـــــــــیخـۆف

(ته‌نیا ره‌نگدانه‌وی ڕاستییه‌کانی ژیانی مرۆڤ ده‌توانرێ ناوی هونه‌ری لێ بنرێت، به‌بێ مـرۆڤ و دوور له‌ به‌رژه‌وه‌ندییه‌کانی ئه‌و هیچ هونه‌رێك بووبی نییه‌. هونـه‌ر ئاوازێکـه‌ بـۆ مرۆڤایـه‌تی وتراوه‌. هه‌رچه‌مێکه‌ مرۆڤایـه‌تی بـه‌ره‌و پێـشه‌وه‌ ده‌بـات. ڕه‌نگدانـه‌وه‌ی ڕاسـتییه‌کانی ژیـانی کۆمه‌ڵایه‌تی خه‌ڵکه‌، که‌ هونه‌رمه‌ند تیایدا ده‌ژیت.) ئه‌م چه‌ند وشه‌یه‌ که‌ تا ڕاده‌یه‌ك پێناسـه‌ی هونه‌ری ریالییزمی سه‌ده‌ی نۆزده‌یه‌مه‌ له‌ به‌رهه‌می نووسه‌رێکی مه‌زنی وا خۆ ده‌نوێنێ، کـه‌وا لێره‌دا چه‌ند چیرۆکێکی به‌و په‌رشی و وردییه‌وه‌ ته‌رجه‌مه‌ کراوه‌.

هه‌رچه‌نده‌، که‌ نووسه‌ر ئه‌و کاته‌ی، که‌ شۆڕش له‌ وڵاتی پان و به‌رینی ئه‌ودا روویدا، ئه‌و له‌ ژیاندا نـه‌مابوو و ئـه‌و شـتانه‌ی ئـه‌و باسـی لێـده‌کردن دوای شـۆڕش لـه‌ به‌رنامـه‌ی هونـه‌ری هونه‌رمه‌ندانی رووسیدا جێگه‌ی خۆیان کرده‌وه‌. چیخۆف هونه‌رمه‌ندێك بوو پێش زه‌مه‌نی خۆی که‌وتبوو. نووسه‌رو ره‌خنه‌گره‌ مه‌زنه‌کانی وه‌کو(گۆگۆل)و(بیلینسکی) ساڵه‌ها بوو زه‌مینه‌ی ئـه‌و جۆره‌ هونه‌ره‌یان (هونه‌ر بۆ خه‌ڵك و به‌زمانی خه‌ڵك و بۆ به‌ره‌و پێشه‌وه‌ بردنی خه‌ڵك) ره‌خـساند بوو.(بیلینسکی) له‌ نامه‌یه‌کدا بۆ گۆگۆڵی نووسیوه‌، به‌م شێوه‌یه‌ ڕێنمایی کردووه‌: (ژیـان بـه‌و شێوه‌یه‌ی، که‌ له‌ ده‌وروبه‌رته‌ بنوێنه‌ و هه‌رگیز مه‌یرازێنه‌وه‌. دووباره‌ دروستی مه‌که‌ره‌وه‌. ژیـان له‌سه‌ر شێوه‌ی ڕاسته‌قانی خۆی نیشان بده‌و له‌ کلاوڕۆژنه‌ی چاوی خـه‌ڵکی زینـدووه‌وه‌ بڕوانـه‌، نه‌وه‌ك له‌ پشت چاویلکه‌ی ڕه‌ش و تاریکه‌وه‌.) هـه‌روه‌ها نووسـیویه‌تی: (گـه‌وره‌ترین خواسـت و ئامـانجی ئـه‌ده‌بیات خزمـه‌تکردنی کۆمه‌ڵـه‌، هونـه‌ر به‌تـه‌نیا پێناسـه‌ی ژیـان نیـه‌، بـه‌ڵکو لێکۆڵینه‌وه‌و دادوه‌ری کردنی کۆمه‌ڵه‌. هونه‌ر ده‌بێ له‌ مه‌به‌ستی شادی و کـات و به‌سـه‌ر بـردن خۆی به‌دووره‌ په‌رێز بگرێت. ده‌بێ ئاگاداری کۆمه‌ڵ بێـت و هـه‌ر بـه‌ تـه‌نیا خـۆی بـۆ شـیعرو چیرۆکی ئه‌ڤیندارانه‌و بیرو ڕای به‌زه‌یی‌ئامێز ته‌رخان نه‌کات. هونه‌ر ده‌بـێ ده‌ربـڕی هۆشـیاری و بێداری میلله‌ت یان میله‌تانی جۆراوجۆر له‌ قوناغی جوداوازی مێـژوویی بێـت.) بـه‌م شـێوه‌یه‌ به‌هۆی چیخۆف و گۆگۆڵ و بیلینسکی و نووسه‌رانی دیکه‌وه‌ بوو هونه‌ری ریالییزم له‌ رووسـیادا هاته‌کایه‌وه‌.



چیخۆف ئه‌وه‌نده‌ بڕوای به‌ ده‌ره‌نجامی کاری خۆی و هاوکارانی هه‌بوو، ته‌نانه‌ت له‌ شانۆنامه‌ به‌ ناوبانگه‌که‌یدا (باخی ئالوبالو) به‌ تێڕوانینێکی واقیعبینانه‌وه‌ پێـشبینی شۆڕشـی ئاینـده‌ی کردووه‌ و له‌سه‌ر زاری (ترۆفیمۆف) وه‌وه‌، که‌ گه‌نجێکی رۆشنبیره‌، ده‌ڵێت:

(هه‌مـوو روسیا باخی ئێمه‌یه‌، سه‌رزه‌مینی رووسیا فراوان و جوانه‌، هه‌زاران جێگه‌ی جـوانی تێدایه‌. ئاناپترۆڤنه‌ ئێسته‌ تێفکره‌، باب و باپیر و ئه‌ژدادت خودانی ئه‌م جێیه‌ بوون، تۆ بڕوانـه‌ هه‌ر ئالوبالویه‌کی ئه‌م باخه‌ په‌لکه‌کانی، ڕه‌گ و ڕیـشه‌ی هـه‌ر دره‌ختێکـی وه‌ك بنیـاده‌م بـۆت ده‌ڕوانێ، ئه‌وه‌ تۆ گوێت لـه‌ ده‌نگیـان نییـه‌؟ ئـاه‌ به‌ڕاسـتی جوانـه‌، هـه‌ر ئێواره‌یـه‌ك، هـه‌ر شه‌وێك،که‌ به‌ نێو ئه‌م باخه‌دا تێده‌په‌ڕم قه‌دی ئه‌و پیره‌دارانه‌ ده‌دره‌وشێنه‌وه‌ و داره‌کان وه‌ك بڵێی له‌ خه‌وی خۆیاندا رووداوه‌کانی سه‌د دووسه‌د ساڵ له‌مه‌وبه‌ر ده‌بینین، ده‌ڵێـی گیانـه‌ شـه‌که‌ت و ماندووه‌کان بۆ دیداریان هاتوون. له‌وه‌ زیاتر چی بڵێم؟).

هه‌روه‌ها له‌کۆتایی په‌رده‌ی دووهه‌می هه‌مان شانۆنامه‌دا دیسان له‌ سه‌ر زاری ترۆفیمۆف به‌ ئاشکراو شادمانییه‌کی تایبه‌ت له‌ نزیك بوونه‌وه‌ی ئه‌و رۆژه‌دا پێشبینی ده‌کات و ده‌ڵێت: ((کـه‌ زستان دێت برسیم، نه‌خۆشم، نیگه‌رانم، هه‌ژارو ده‌ست کورتم، وه‌ك ده‌رۆزه‌که‌رێکی نێـو کۆڵانـان هه‌ر جێگه‌یه‌کی حه‌زم لێبێت ده‌ڕۆم، جێ نییه‌ پێی تێنه‌خه‌م، به‌ڵام به‌هه‌موو ده‌مێك به‌شه‌و بـه‌ ڕۆژ، ئومێدی ئاینده‌ له‌ ناخمدا گه‌وره‌ ده‌بێت. من پێشبینی ڕۆژانی خۆشـبه‌ختی و به‌ختـه‌وه‌ری ده‌که‌م، به‌ڕاستی ئێسته‌ هه‌ستی پێده‌که‌م، به‌خته‌وه‌ری گه‌یشته‌ ئێره‌، وا ڕۆژژگـاری به‌ختـه‌وه‌ری نێزیکتر و نێزیکتر ده‌بێته‌وه‌، ته‌نانه‌ت وا گوێم له‌ ترپه‌ی پێیـه‌تی، تـۆ بڵـێ ئـه‌و ڕۆژه‌ به‌چـاوی خۆمان نه‌بینین؟ ئه‌دی نابێ ئاشنای بـین؟ جـا سـوودی چـییه‌ ئه‌گـه‌ر ئـه‌و ڕۆژه‌ نـه‌بینین و بـۆ خه‌ڵکانی تر بێت...)

به‌رنامه‌ و پلانی (چیخۆف) به‌م شێوه‌یه‌ بوو. چیخۆف هه‌ستی به‌ ترپه‌ی دڵـی کۆمه‌ڵه‌کـه‌ی ده‌کردو هاوڵاتییه‌کی دڵسۆز و میهره‌بان و فیداکاری خه‌ڵکی وڵاته‌که‌ی خۆی بوو. به‌ فرمێسکی چاو و به‌ بزه‌ی لێو به‌دبه‌ختی و گونـاه‌ و ناهـه‌مواری و ناهه‌مواریـیـه‌کانی خـه‌ڵکی وڵاته‌کـه‌ی نیشات ده‌دات و بـه‌ په‌ژاره‌یـه‌کی خـودان ئـاوازێکی گاڵته‌جارانـه‌ خه‌فـه‌ت و ئه‌فـسووسی بـۆ ناڕه‌وایی و نه‌نگی و نابه‌جێیه‌کانی کۆمه‌ڵه‌که‌ی ده‌خوارد.

* * *

ئانتوان پاڤلۆڤیچ چیخۆف لە وەلامی نامەیەکدا، کە بۆ دکتۆر (رۆسۆلیمێف)ی هاوپۆلی پێشووی خۆی لە کۆلێژی پزیشکی ڕەوانە کردووە، نووسیویەتی : (من ئانتوان چیخۆف لە حەڤدەی تەمووزی ساڵی ١٨٦٠ لە (تاگانڕۆك) لە دایك بووم. یەکەم جار لە قوتابخانەی یۆنانی (کلێسای ئیمپراتۆر قوستەنتەنین) دەستم بە خوێندن کرد. پاشان لە قوتابخانەی (گرامار) ی (تاگانڕۆك) درێژەم بە خوێندندا. لە ساڵی ١٨٧٩ دا چوومە زانکۆی مۆسکۆ. لە کۆلێژی پزیشکی خۆم ناونووس کرد، ئەو کاتە بیر و ڕایەکی خراپم دەرهەق بە کۆلیج هەبوو. بیرم نییە نازانم بۆچی کۆلێجی پزیشکیم هەڵبژارد، بەڵام باش بوو، دوایی لە هەڵبژاردنەکەمدا پەشیمان نەبوومەوە.

لە ساڵی یەکەمی کۆلیجدا بۆ گۆڤاری هەفتانە و ڕۆژنامەکان دەستم بە نووسین کرد،. کاتێکیش کە کۆلێجم تەواو کرد نووسین بووە پیشەم. لە ساڵی ١٨٨٨دا خەڵاتی (پۆشکین) م پێبەخشرا، لە ساڵی ١٨٩٠دا بەرەو دوورگەی (ساخالین) بەڕێ کەوتم بۆ ئەوەی کتێبێك لە بارەی بەندکراو و دوور خراوەکانی ڕێژێمی تزاری بنووسم.)

لە ژیانی ئەدەبی بیست ساڵەمدا بێجگە لە چەندین ڕاپۆرتی یاسایی، یادداشت، وتاری ڕۆژانەی بلاوکراوە لە ڕۆژنامەکاندا، کە ئێستە دۆزینەوە و کۆکردنەوەیان کارێکی دژوارە، زیاتر لە سێ سەد چیرۆك و ئەفسانەم نووسیووە و بە چاپ گەیاندووە. هەروەها شانۆنامەشم بۆ سەر تەختەی شانۆ ئامادەکردووە.

بێگومان خوێندنم لە کۆلێجی پزیشکیدا کاریگەرییەکی زۆری بە سەر نووسینە ئەدەبیەکانمدا هەیە، شارەزایی و چاوکراوەییم لە پزیشکیدا زیاتر هێزی بینینمی بە هێزی کردو زانیاری منی لە بەرانبەر بە جیهان و خەڵك دەولەمەندتر کرد.بایەخی ڕاستەقینەی ئەو زانستەو کاریگەرییەکەی لە بەرهەمە ئەدەبیەکانمدا ئەوە تەنیا دکتۆرێك دەتوانێ بە چاکی دەرکی پێبکا و تیێ بگات. سەرەڕای ئەوەش کاریگەری ڕاستەقینەی زانستی پزیشکی لە بەرهەمەکانمدا بە شێوەیەك بووە، کە لە زۆر هەڵە و کەم و کورتی بە دووری خستمەوە. ئاشنایی من لەگەڵ زانستە سروشتییەکان و میتۆدو ڕێبازی زانستی هەمیشەیی منی خستۆتە سەر ڕێگەیەکی لۆجێکی و من تا ئەوەندەی لە توانامدا بووە هەولم داوە، کە ڕێبازی زانستی لەبەر بگرم و ئەگەر توانای ئەوەش نەبووبێ، کە چاودێری و پەیڕەوی زانستی بکرێت ئەوا لە نووسینی ئەو تەرزە وتارەدا چاوپۆشیم کردووە.



دەبێت ئەوەش بڵێم و ڕێگە بە خۆم بدەم، کە داهێنانی هونەریی هەمیشەو بە بەردەوامی لەگەڵ ڕێبازی زانستیدا ناگونجێت، بۆ نموونە مەحاڵە، کە لە سەر تەختەی شانۆ مردنی کەسێکی ژەهر خواردوو بەو شێوەی، کە لە واقیعدا ڕوودەدات نیشان بدرێت، بەڵام دەتوانرێت بە لەبەرچاو گرتنی ڕێبازی زانستی ئەم دیمەنە زیاتر لە ڕاستی نزیك بخرێتەوە، چونکە خوێنەر یان بینەر لە کاتێکدا سوور دەزانێ دیمەنەکە ڕاستەقینە نییە، ئەوە تێ بگات، کە لەگەڵ نووسەرێکی شارەزادا ڕووبەڕوو بۆتەوە. من ئەفسانەنووسێکی فانتازی نیم، کە لە بەرانبەر زانستدا ڕێبازێکی دژ بە زانست لەبەر بگرم و زانست ڕەت بکەمەوە...)

یەکەمین بەرهەمی بلاوکراوەی چیخۆف لە ڕۆژنامەی گاڵتەجاڕیی (ئیسترۆکۆزا)دا بلاوکرایەوە. لە ماوەی ئەو حەوت ساڵەی، کە لە کۆلێجی پزیشکیدا خەریکی خوێندن بوو، چوار سەد بەرهەمی جیاوازی لە چیرۆك و ڕۆمان و یادداشت و وتارو بەرهەمی تر بلاوکردۆتەوە. دیارترینیان لەوانە: دکتۆری بێ نەخۆش، پیاوێکی ماندوو، براکەم.

چیخۆف لە ساڵی ١٨٨٤ دا دیبلۆمی لە کۆلێجی پزیشکی وەرگرت و لە زستانی ساڵی دواتر بۆ یەکەم جار بە خوێن رشایەوە. هاوینی ئەو ساڵە بۆ ئیسراحەت رووی لە (بابکینۆ) کرد و لەوێ لەگەڵ (ساڤرین) بەرێوەبەری ڕۆژنامەی ناسراوی پترسبۆرگ ئاشنا بوو. نامەکانی چیخۆف بۆ ساڤرین دیارن و پاشان ئەو کەسە بووە هۆی بلاوکەرەوەی زۆربەی بەرهەمەکانی چیخۆف.

لە ساڵی ١٨٨٦دا یەکەمین شانۆنامەی خۆی بە ناونیشانی (ئاوازی قو) بلاوکردەوە،کە شانۆنامەیەکی یەك پەردەییە. لە ساڵی ١٨٨٧دا بەرەو باشووری رووسیا سەفەری کرد، کاریگەری ئەو سەفەرە لە بەرهەمی (ئیستپ)دا ئاشکرا دیارە. بەرهەمە دیارەکانی چیخۆف لەو ساڵەدا بریتین لە (کازیوە)، کە کۆمەڵە چیرۆکێکە و (ئیڤانۆڤ)، کە شانۆیەکی چوار پەردەییەو لە شاری مۆسکۆ و پترسبۆرگدا پێشکەش کراوە. لە ساڵی ١٨٨٨ دا لەگەڵ چەند دۆستێکی خۆی، کە (ساڤرین) یشیان لەگەڵدا بوو بەرەو (کریما) ڕۆیشتن و لەوێ چیرۆکە بەناوبانگەکانی (ئیستپ)، (ڕۆشناییەکان)، (جەژنی لە دایکبوون) (زەنگەکان) ی نووسی و چیرۆکێکی شانۆییشی بەناوی (کەڵەشێر) لەیەك پەردەدا ئامادەکرد، لە ساڵی ١٨٨٨دا خەلاتی پۆشکین، کە (٥٠٠٠) رۆبل بوو لەلایەن ئەکادیمیایی زانستەکانی ئیمپراتۆری پێبەخشرا و ساڵی دواتریش بووە ئەندام لە کۆمەڵەی دۆستدارانی (ئەدەبیاتی رووسی)و لە هەمان

ساڵیشدا نمایشی (دێوی جەنگ) ی لە چوار پەردەدا نووسی. هەروەها چیرۆکێکی شانۆیی بەناونیشانی (خوازبێنی) لەیەك پەردەدا نووسی و چیرۆکی (ئەفسانەیەکی هیلاك کەر لەدەفتەری یاداشتی پیرەمێرێکدا) نووسی.

لە ساڵی ١٨٩٠دا لە ڕێگەی (سێبریا) وە بەرەو دوورگەی (ساخالین) سەفەری کرد و لەوێ خەریکی کاروباری خەمەنگیزی دوورخراوەکانی حکوومەتی تزاری بوو، ئاواتی گەورەی ئەو سەفەرە دوور و درێژە و گەڕانەوەی لەسەفەری ڕێگەی (سەنگاپوورە، هیندستان، سیلان و کەنەدا و سوید)بووە هۆی ئەوەی بەتەواوی پێ بخاتە جیهانی ئەدەبەوە و بەرهەمە گرنگەکانی (دێوەکان) و (سەرانسەری سێبیریا) و (گوسیف) لەدایکبوون. لە کۆتایی ئەو سەفەرەدا بوو هەستی بەهەناسە تەنگی و دڵەکوتێ کردن، بەسەختی تووشی کۆکە هات خۆیشی نووسیویەتی: (نازانم ئەمە یانی چی؟).

لە ساڵی ١٨٩١دا (هەڵاتووەکانی ساخالین) و (دوئێل)و (ژنان)ی نووسی و بەرەو ئەورووپای ڕۆژاوا سەفەری کرد، لە ساڵی ١٨٩٢دا بەرەو ئەیالەتی (نوگورد) کەوتە ڕێ تا یارمەتی و کۆمەکی بۆ دەست کورتەکانی ئەو ناوچەیە کۆ بکاتەوە و سازمانێك بۆ یارمەتی دانیان پێکەوە بنێ و خۆشی لە موسکۆوە بەرەو گوندی (ملیخۆف) ڕۆیشت و لەگەڵ نەخۆشییەکەیدا کەوتە ململانێ، کە تازە کاری تێدەکرد، بەرهەمەکانی ئەو ساڵەی بریتین لە چیرۆکەکانی: ژووری ژمارە شەش، گوللە، هاوسەر، لە تاراوگە، هاوسێکان.

لە ساڵی ١٨٩٣ دا نووسیویەتی: (زۆر بەخراپی دەکۆکم. دڵم خراپ لێ دەدا. تووشی نەخۆشی خراپ هەرسکردن هاتووم و سەرم ژان دەکات..) لە هەمان ساڵیشدا (چیرۆکی پیاوێکی نەناس) و یادداشتەکانی سەفەری بۆ سێبریای لە ژێر ناوی (دوورگەی ساخالین) بڵاوکردەوە، ساڵی دواتر لە دەفتەری یادداشتەکانیدا نووسیویەتی: (لەبەر ئەو هەموو کۆکە کۆکە دڵم تەنگ بووە، بەتایبەتی دەمەو بەیانیان خەریکە لە بەر کۆکە بخنکێم. بەڵام ئەوەندە بە لامەوە گرنگ نییە) دختۆرەکان رایانسپاردم بەرەو (کریما) یان باشووری فەڕەنسا سەفەر بکات. لەو ساڵانە و سالانی دواتر بوو، ئەم بەرهەمانەی خوارەوە بە قەڵەمی چیخۆف نووسراون: (ماڵی یامزانین) و شانۆنامەی (شەهێنی دەریا) و داستانی پایەبەرزی (سی ساڵ) و کورتەچیرۆکەکانی (تاوان) و(ئاریادانا)و (ژن).



هەروەها لە ساڵی ١٨٩٧دا بوو لەسەر ئەرکی خۆی قوتابخانەی لە چەند گوندێکی رووسیا و گوندی (ملیخۆف) دا کردەوە، لە پێناوی ئاسوودەیی جووتیارانی ناوچەکەدا زۆر خۆی ماندوو کردو چیرۆکەکانی (ژیانی من) و (موژیکەکان) و (لەعەرەبانەدا) و (لە وێستگەیەکی ناوەخۆدا) ی نووسی. لە ئاخر و ئۆخری ئەو ساڵەدا بوو لە کاتی نان خواردنی نیوەڕۆدا لەگەڵ (ساڤرین) دا لە یەکێ لە چێشتخانەکانی مۆسکۆدا کۆکەیەکی زۆری کرد و خوێنی هەڵێنایەوە، گەیاندیانە نەخۆشخانە و پزیشکەکان پێیان راگەیاند، کە تووشی نەخۆشی (سیل) هاتووە و هانیاندا بەرەو باشووری فەڕەنسا سەفەر بکات. لە فەڕەنسا بەهۆی پێوەندی مەسەلەی (دریفۆس) کەوتە بەر نەفرەت. لە هەمان ساڵدا١٨٩٨ باوکی کۆچی دوایی کردو چیخۆف پارچە زەوییەکی لە یالتا (کریمە) کڕی و خانوویەکی لێ دروست کردو لەو ساڵەدا(چیرۆکەکانی پیاوێك لە پێستەدا) و (یۆنج) و(کرێچی)و (مێرد) و(مامان)ی نووسی و پاشترێ ١٨٩٩ چیرۆکەکانی (خانم و سەگە بەرەڵڵاکە) ی و (لەراڤین) ی نووسی.

لە ساڵی ١٩٩٠دا بۆ ئەندامێتی ئەکادیمیایی زانستەکان لە پیترسبۆرگ هەڵبژێردرا و شانۆنامەی (سێ خوشك) ی هەر لەو ساڵەدا دانا. لەو ساڵەڕا میزاج و باری تەندروستی ڕۆژ بەڕۆژ روو لە خراپی بوو. لە ساڵی ١٩٠١ دا لەگەڵ ئەستێرەی هونەری مۆسکۆ (ئۆلگا کنێپەر) زەماوەندی کردو لەو ساڵەوە تا ساڵی ١٩٠٤ ئیتر توانای ئەوەی نەما لە تەختەی خۆی دابەزێت و لەگەڵ ژنەکەی روویان لە هاوینەهەوارێکی ئەڵمانی لە (بادن ڤایلەر) کردو لەوێ لە تەمەنی چل و چوار ساڵیدا، لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٠٤ دا ماڵاوایی لە دونیا کردو تەرمەکەیان هێنایەوە مۆسکۆ و لە گۆرستانی کلێسای (نۆدڤیشی) نێژرا.)[٢٩]

٢٩- نووسەری ئەم وتارە، دکتۆر سیمن دانشوەر، ژنێکی شارەزا و پسپۆرە لە ئەدەبیاتی رووسی و خۆیشی رۆمانووسێکی چاکەو رۆمانی (سوشون) یەکێکە لە ڕۆمانە سەرکەوتوەکانی. ئەم ئافرەتە خێزانی یەکێك لە ڕابەرانی چیرۆکی فارسییە لە ئێراندا، کە ئەویش جەلال ئال ئەحمەدە، دکتۆر سیمین دانشوەر ئەم نووسینەی وەك پێشەکییەك بۆ ئەو چەند چیرۆکەی چیخۆف نووسیوە کە تەرجەمەی زمانی فارسی کردووە بە ناونیشانی (دشمنان) لە تاران لە ساڵی١٩٧٣دا بڵاوی کردۆتەوە.

## نیکراسۆڤ

بەرهەمە شیعرییەکانی نیکراسۆڤ پلەو و پایەکی بەرزی لە ئەدەبی رووسییدا هەیەو ئاوێنەیەکی روونی جوولانەوەی رزگاریخوازانەی گەلی رووسییە، هەروەها نیکراسۆڤ توانی دووبارە شیعری رووسیی بگەیێنێتەوە لوتکە، کە ماوەیەکی زۆر بوو ئەو پایەی خۆی بە مردنی پۆشکین و لێرمانتۆڤ لە دەست دابوو. نیکراسۆڤ بە درێژایی ژیانی ئەدیبێکی پێشکەوتنخوازو رۆژنامەنووس و تێکۆشەر و رۆشنبیرێکی مرۆڤانە بوو. نیکۆلای ئەلیکیفیتس نکراسۆڤ لە (١٠) ی رەشەمەی ساڵی ١٨٢١ لە هەرێمی بۆلسکی لە دایك بووە. تەمەنی منداڵی لە کەنار رووباری ڤۆلگا بەسەر بردووە، گیانی نقوومی جوانی دیمەنی دێیەکەی باوکی بووە، کە قۆمیسەرێکی خانەنشین بوو و خاوەنی دێیەکە بوو. ئەو ژیانە تاڵ و ناخۆشەی جووتیاران سایەی رژێمی کۆیلەیەتی بەسەریان دەبرد، ببوونە کوڵێ خەم و پەژارە بەلای نیکراسۆڤەوە. باوکی شاعیریش نموونەیەکی زیندووی گیانی دەرەبەگایەتی ئەو سەردەمە بوو، کە زۆر بە رەقی لەگەڵ جووتیاراندا بێتەوە، بە هیچی سەیر نەدەکردن تەنها ئەوە نەبێ ئادەمیزادن، هەتا زۆر جار لە کوڕەکەی خۆی، شاعیری دوا رۆژی. دەدا، کە بیدیتایە لەگەڵ منداڵی جووتیارەکان یاری دەکا. هەروەها لەگەڵ ژنەکەی زۆر ناتەبا بوون و هەردەم مەست بوو وکۆمەڵێکی وەك خۆیشی لە دەوری خۆی کۆکردبۆوە. تاکە هاورێی منداڵیی نیکراسۆڤ یەلنا ئەندرییڤتای دایکی بوو، کە زۆر جاران بەرپەچی باوکی شاعیری دەدایەوەو دەیوست کوڕەکەیان لە بارێکی دەروونی ئالۆزودا نەبێت. شاعیر بیرەوەرییەکانی دایکی بە خۆشەویستترین و شیرینترین یادگارو بیرەوەری رۆژانی منداڵی دەزانیێ، کە بەخەیاڵی دابێت. زۆرجاران خەیاڵی بۆ لای دوورخراوەکانی سێبیریا هەڵدەفڕی، کە مردن چاوەڕوانیان بوو، هەروا بیری لە هەژارەکان و گۆرانییە خەمناکەکانیان دەکردەوە، کاتێ بە کەشتییەکانیان بەنێو رووباردا تێدەپەرین. زۆرجارانیش بە تەنێ دەچوو لە شوێنێکی بەرزی کەنار دەریا دادەنیشت و لەو دیمەنە کاریگەرانەی سروشت ورد دەبووەوە. نیکراسۆڤ لە ساڵی ١٨٣٢دا لە یارۆسلافل رێگای قوتابخانەی گرتە بەر. هەر لە منالێییەوە ئارەزوویی ئەدەبی هەبوو حەزی بە لەبەرکردنی شیعر دەکرد. کە ساڵی ١٨٣٨ هات باوکی بڕیاری دا بیخاتە قوتابخانەی سوپایی لە پێتەربۆرگ. نکراسۆڤ لە کوچەو کۆلانەکانی ئەو شارە گەورەیە ژیانی کۆمەلآیەتی هەژارەکانی بە چاوی خۆی دیت وبەتەواوی خووی دایە ئەدەب و وازی لە قوتابخانەی سوپایی هێنا. بەم کارەی باوکی لێی تووڕەبوو وهەموو یارمەتییەکی ماددی لێ بڕی. نیکراسۆڤ دوای ئەوەی برسییەتی شالآوی بۆ هێنا، ناچار دەستی بە کارکردن کرد. دوای هەوڵدانێکی زۆر توانی لە ساڵی ١٨٤٨دا



یەکەمین دیوانی شیعریی خۆی بەناوی ((خەونەکان و دەنگەکان)) پێشکەش بکات، بەلآم ئەم دیوانەی هیچ سەرکەوتنێکی بەخۆیەوە نەبینی، چونکە زۆر بە ئاشکرا لە چاو شاعیرەکانی پێش خۆی کرد بووەوە، وەکو جۆکۆفیسکی و لێرمانتۆڤ و هیدی، گیانێکی رۆمانسییانە بەناوەڕۆکی بەرهەمەکانییەوە دیار بوو، بۆیە بیلینسکی زۆر بەتوندی هێرشی بردە سەر، شاعیریش بە ناچاری بە کتێبخانەکاندا دەگەڕا دیوانەکەی خۆی دەکڕیەوە و دەیسووتاندن، بەلآم ئەمە هیچ نەیتوانی لەهەوڵدان و توانای نیکراسۆڤ کەم بکاتەوە، بەڵکو هەر بەردەوام بوو لەسەر ئەو رێگەیەی، کە لە دەروونی خۆیەوە نەخشەی بۆ کێشابوو. لەپاڵ ئەوەشدا کە لە (رۆژنامەی ئەدەبی) کاریشی دەکرد بۆ وەدەست هێنانی پاروویێ نان. بەرهەمە بەرزەکانی گۆگۆل و گوتارە بەهێزەکانی بیلینسکی لە سەرەتای سالآنی چلەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا زیاتر بناغە و بنچینەکانی (ریالییزم)یان



نیکراسۆڤ

له ئەدەبی رووسییدا پتەوتر کرد. لەو ماوەیەدا کۆمەڵێ ئەدیبی رووسیی پێشکەوتنخواز لە دەوری بلینسکی کۆببوونەوە، کە نیکراسۆڤیش یەکێك بوو لەوان. بلینسکی ئامۆژگاری ئەو ئەدیبانەی دەکرد، کە وێنەی ژیان بە شێوەیەکی راست و دروست، خۆی چۆنە وای دەربخەن، با تاڵ و ناشیرنیش بێ. لە ساڵی (١٨٤١) ەوە پەیوەندی نێوان نیکراسۆڤ و بیلینسکی زیاتر پتەوتر بوو بەتایبەتی ئامۆژگارییەکان و سەرنجەکانی دوایی بیلینسکی کارێکی گەورەی کردە سەر پێشکەوتن و چەسپاندنی رێبازی دیموکراتی شۆرشگێری و راپەرین دژی رژێم و خۆشەویستی گەل و بەرگری لێکردن، هەموو ئەمانە بوونە دواتربوونە هەوێنی بەرهەمەکانی نیکراسۆڤ. هەروەها وای لێکرد، کە گرنگییەکی زێتر بە ئەدەبی مرۆڤایەتی بدا. لە ساڵی (١٨٤٦) ەوە نکراسۆڤ دەرکردنی گۆڤاری (هاوچەرخ)ی پێشکەوتن خوازی گرتە ئەستۆی خۆی و نووسەرە هەرە دیارەکانی رووسیی لەدەوری خۆی کۆکردەوە. وەکو نووسەری رووسیی پێشکەوتنخواز — تشرنشیفیسکی، دۆبرالیۆڤ و گانترشیرۆڤ و ئستروڤسکی و سالیتکۆڤ — شیدرین و تۆلستۆی.. هتد. ئەم گۆڤارە بە درێژایی دەرچوونی هەڵگری بیری شۆرشگێری ئەدەبی بەرگریی میللەت بوو.

نیکراسۆڤ لە هەڵوێستەکانیدا مەبدەئی و راستگۆبوو. قسەو قسەلۆك هیچ کاری نەدەکردە سەر هەڵوێستە فیکرییەکانی. بەبۆنەی دەرچوونی رۆمانەکەی تۆرگینیڤ (لە هێلانەدا)، دۆبرالیوڤ وتارێکی جوانی بە ناوی ((کەی رۆژی راستەقینە دێت) نووسی، کە تیایدا رەخنەی لە چەند رایەکی تۆرگینێڤ گرتبوو لە رۆمانەکەیدا خستبوویە روو، بە تایبەتی لە وێنەکێشانی پاڵەوانی رۆمانەکەی — بلگاریا — کە بابێ بەم شێوەیە بێ، چونکێ ژیانی سیاسیی لە رووسیا دا زۆری وەك ئەنیسارۆڤ — پاڵەوانی رۆمانی لە هێلانەدا — ی خوڵقاندووە. بەمە تۆرگینێڤ لە وتارەکەو خاوەنەکەی تووڕەبوو، هەڵسا چووە لای نیکراسۆڤ وئەو داوەرییان بکات: هەرچەندە نیکراسۆڤ لەگەڵ تۆرگینێڤدا زۆر یەکتریان خۆشدەویست، بەڵام لایەنگیری (دۆبرالیوڤ)ی کردوو هەڵوێستەکەی ئەوی پێ راست بوو. گۆڤاری (هاوچەرخ) لە بارودۆخێکی ناهەمواردا دەژیا، جگە لەوەی دارودەستەی رژێمی قەیسەری تەنگی پێ هەڵچنیبوو. هەروەها دەستەی بەرێوەبەری گۆڤارەکەو لە سەرووی هەموویانەوە تووشی گەلێ چەرمەسەری بوو. لەوانە بەند کردنی تشرشیڤسکی و مردنی دۆبرالیوڤ و دەرچوونی تۆرگینێڤ و تۆلستۆی و ئەوانی دی. سەرباری ئەو تەنگ و چەڵەمانەش گۆڤاری (هاوچەرخ) زۆرترین ژمارەی لێ دەفرۆشرا، ئەوەش



بەڵگەی ئەوەیە، ئەم گۆڤارە زۆر لە دڵی خەڵك جێگای خۆی کردبۆوە. زۆر جاران تووشی بەرهەڵستی رژێمی قەیسەری دەبۆوە، بەڵام لە بڵاوکردنەوەی رێبازە پێشکەوتنخوازەکەی و بیرورا ئازادیخوازانەکەی و ئەدەبە مرۆڤاتییەکەی هەر بەردەوام بوو تا لە ساڵی ١٨٦٨ رژێمی قەیسەری بۆ یەکجارەکی بڕیاری داخستنیدا. چەك چاوی نیکراسۆڤی نەدەترساند. بەدرێژایی بیست ساڵ مەشخەڵی رۆژنامەی شۆڕشگێریی هەڵگرت و لە ساڵی ١٨٦٨ دا خاوەندارییەتی گۆڤاری (بیرەوەرییەکانی نیشتمانیی)ی گرتە ئەستۆو لە بڵاوکردنەوەی فیکرە شۆڕشگێڕییەکەی بەردەوام بوو. دووبارە زۆر بەخێرایی کۆمەڵێ نووسەری پێشکەوتنخوازی لە دەرور کۆبووەوە، لە سەرووی هەموویانەوە سالتیکۆڤ — شیدرین، بەڵام لەبواری شیعردا شیعرەکانی نیکراسۆڤ لە چلەکان و پەنجاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا وێنەیەکی راستەقینەی هەموو گێرمەو کێشەکانی واقیعی هاوچەرخ بوو، رەنگدانەوەیەکی تەواوی ئازارو ئامانجەکانی گەلی رووسیی بوو. گەل یان میللەت هەوێنی سەرەکی بەرهەمە ئەدەبییەکانی نیکراسۆڤ بوو. لە هۆنراوەی (لەرێگادا) چارەسەری تەنگ و چەڵەمەکانی ئافرەتی رووسیی دەکات، کە چۆن پیاوە دەربەگەکان دەستیان بەسەردا گرتوون، بۆ هیچ نا تەنها بۆ زیرەکییەکەیان و ئاقڵییەکەیان و چاکییەکەیان. لە هۆنراوەی (راوە سەگ) دا گاڵتە بە ئاغا زۆردارو دەبەنگەکان دەکات، لە میانەی هۆنراوەکەیدا سەیر دەکەین هیوا لە دڵی ستەم لێکراوان بەهێز دەکات. لە هۆنراوەی(چەند کۆپلەیەك لە تێبینییەکانی ئیلۆنت گارانسکی)یشدا ئاوازی تۆڵەسەندنەوە لە چەوسێنەرەکان بە گوێی جووتیاراندا دەچرپێنێ. هەروا لە هۆنراوەی (ئارام) دا باسی کارەساتەکانی جەنگی قەرم دەکاو وێنەی ئەو پەژارەو ماڵ وێرانییەی لە ئەنجامی ئەو شەڕەوە بەسەر گەلدا هاتووە، دەکێشێ. بەڵام شیعرەکانی ساڵانی شەستی (٦٠) نیکراسۆڤ سیمای پاڵەوانێکی شۆڕشگێڕەو ئامادەیە بۆ خەبات کردن لە پێناوی گەل و نیشتمانەکەی. وەکو : (یادی دۆبرالیۆڤ) و (تشرنشیڤسکی)، (بەبۆنەی کۆچی دوایی ستیڤشینکو) ئەو هەڵخەڵەتاندنەی رژێمی قەیسەری ساڵی ١٨٦١ پێی هەڵسا هیچ کاری نەکردە سەر شۆڕشگێڕ دیمکراتییەکان. لەم بارەیەوە نیکراسۆڤ دەڵێ :

(ئایا ئەمە سەربەستی راستە قینەیە؟ نەخێر هەڵخەلەتاندێکی ئاشکرایەو گاڵتەکردنە بە جووتیار)[30] هەروەها نیکراسۆڤ هەرهەمان ئەو بابەتەی لە هۆنراوەی (هێلی ئاسنین)یشدا پەنجەی بۆ راکێشاوەو گوتویەتی جووتیاری رووسیی هەر بە رووخسار لە بەندییەتییەکەی

٣٠- ل. ف. باتیلییڤ — بیرەوەرییەکان — مۆسکۆ ١٩٥٨، لا ٤٧٦ (بەزمانی رووسی).

رزگاری بووە و بەرەبەرە دەگۆڕێ و دەبێتە کرێکارێکی رەنجدەر بۆ بۆرژاواکانی رووسی و ئەوانیش بە ناشیرینترین شێوە دەیان چەوسێننەوە. هەر لەم هۆنراوەیەدا نیکراسۆڤ خێرو شەر، چاکەو خراپە، رەنجدەرو بۆرژاوا رووبەرووی یەکدی دەکاتەوەو جەخت لە سەر ئەوەش دەکاتەوە، کە دروستکەری راستەقینەی ئەم هێلی ئاسنینە کرێکارێکی رووسییە نەك بۆرژاواکان، کە غارەغارییان بەدوای قازانجدا. نکراسۆڤ زۆر بە راستگۆیی وێنەی واقیعەکەی کێشاوە. ئازارو ژانەکانی بە ئاشکرایی لە نووسینەکانیدا خۆیان دەنوێنن، کە باسی هۆشیاربوونەوەی کرێکاری رووسی لە مەسەلەی چارەنووسی خۆی دەکا. شیعرەکانی نکراسۆڤ لە سالآنی حەفتادا بە دەوری هەڵسان و خۆپێشاندانی دیسەمبەرییەکاندا دەسووڕێتەوە. لە هۆنراوەی (باپیرە) دا وێنەی یەکێك لەو خۆپێشاندەرانە دەکێشێ، کە پاش ئەوەی پیر دەبێ جا دادەنیشێ باسی خۆپێشاندانەکەو دوورخرانەوەیان بۆ سیبریا دەکا و هێشتا گیانی شۆڕشگێڕیەتی تێدا ماوەو سوورە لەسەر خەبات بۆ رزگاری گەل و دابینکردنی خۆشی بۆی. هەروەها لە هۆنراوەی (ئافرەتی رووسی) کەسیەتی دوو ئافرەتی رووسی دەخاتە روو کە ئەوپەری هەوڵ و خەباتیان داوەو سوورن لە سەر بیروباوەرکەیان: ترۆبیتسکایاو فۆڵکۆنسکایا لەبەر ئەوەی بەشداری خۆپیشاندانیان کردبوو لەگەڵ مێردەکانیان دوورخرابوونەوە. لەو دوو هۆنراوەی سەرەوەدا نکراسۆڤ بە ئانجامی بەرزکردنەوەی وورەی گەل و بۆ ئەوەی ئەو بزووتنەوە شۆڕشگێڕیانە سۆزی خەڵك بجووڵێنێ لە ماوەی نیچوان ١٨٦٠- ١٨٧٠ دا بۆیە زیاتر لە هۆنراوەکانیدا گرنگی بەو بابەتە دابوو. لە ساڵی ١٨٧٧ دا نکراسۆڤ گەورەترین وبەرزترین داستانی خستەروو بەناوی (ژیانی بۆ کێ خۆشە لە رووسیا ؟)، کە تیایدا گەیشتە لووتکە داهێنانی شیعری ئەم داستانە چواردە ساڵی خایاند لە ژیانی شاعیرو هەر کە کۆتایی پێ هێنا دوا هەناسی ژیانیشدا.

سەیر دەکەین لەو داستانەدا پیاوی ئایینی و فەرمانبەری گەورەو وەزیر هەموویان پێکەوە بەشدارن لە دزینی رەنجی کرێکاری رووسی. هەروەها سەیر دەکەین لە داستانەکەدا لە پاڵ ئەو کەسانەی سەرەوەدا پاڵەوانی داستانەکە نموونەی جووتیاری ئازاو چاك و دڵسۆزن، بەلآم کۆت وبەندیان لە پێدایە:

(تۆ باوەرداری
تۆ بە پیت و بەرداری.
تۆ بە هێزی



بەلآم — ئەی باوەڕداری رووسی
جەستە بە ستراوی)

داستانێك مشتومڕە کە لە نێوان حەوت جووتیار (پاڵەوانانی داستانەکە)دایە دەربارەی ژیانی واقیعی خۆیان دەدوێن دوایی هەموو لە سەر ئەوە رێکدەکەون گشت رووسییە بگەڕێن و بزانن کێ بێ ژیانی خۆش بێ. دوای گەڕان و سووڕانێکی زۆر لەسەر ئەوە رێکدەکەون، گەلێك رژێمی قەیسەری فەرمانڕەوایی بکا، ئاغاو دەرەبەگ میرکوڕ بن و بۆرژوا چاوبرسییەکان خەڵك بچەوسێنێتەوەو پیاوانی کەنیسە کلکیان لەگەڵ میریی کردبێتە یەك هەرگیز نازانن خۆشی مانای چییە، هەرچی خەڵکی رۆشنبیرو چاکیش هەیە لە رووسییە لە تویێی زام و ئازاردا دەناڵێنن. نکراسۆڤ لەو داستانەیدا هەموو کارەساتەکانی ژیانی گەلی رووسیی خستۆتە روو، چ لە پێش رەتکردنەوەی یاسای کۆیلەتی لە ساڵی ١٨٦١ و چ لە دوای یاساکە بێ، هەروەها دووپاتی باوەڕی بە هێزی بەرامبەر هێزی گەل و داهاتوویەکی نزیکی پرشنگدار لە سایەی هێزی شۆرشگێڕی گەل، دەکاتەوە. بۆ ئەم مەبەستەش — گریشای لاوی هەڵبژاردووە، کە نموونەی شۆرشگێڕێکی نوێیە.

لە ساڵی ١٨٧٧دا نکراسۆڤ کۆمەڵە شیعرێکی بلآوکردەوە بە ناونیشانی (گۆرانییەکانی دوایی)، کە تیایدا داوای خۆشەویستی گەل و دڵسۆزی بۆ ولآت دەکا، لەوانە :

(هەڵسەوە ئەی ستەم لێکراوی رازی
سەیری ولآتەکەت کە...
سەرفراز و سەربەست و دڵخۆشبە)

هەروەها نکراسۆڤ لە یەکێ لە نامەکانی بۆ تۆلستۆی رۆڵی ئەدیبی پێشکەوتنخوازی — شۆڕشگێڕی دیاری کردووەو نووسیویەتی :

(رۆڵی ئەدیب بەر لە هەموو شتێك وەك رۆڵی مامۆستایە وایە، کە تا بتوانێ پشتگیری و بەرگری لە ستەم لێکراوان و بێ دەرتانان بکات)

لە هەشتی خاکە لێوەی ساڵی ١٨٧٨ دا نکراسۆڤ ماڵئاوایی لە جیهان کردو سامانێکی نەمری ئەدەبی و چەپکێ بیرەوەری نیشتمانی لە دوای خۆیدا بەجێ هێشت.

نکراسۆڤ دەڵێ :

جەژنی ژیان و سالآنی لاویم

من لە کۆششی سەختا بەسەر برد
هەر شاعیرێکی ئازاد بخواش بووم
هیچ ڕێگەیەکی ترم قەت نەگرت)

نموونەیەکی دی لە شیعری نکراسۆڤ :
(بە بۆنەی کۆچی دوایی دۆبرالیۆڤ)
ئەی خاکی رووسیا بگری و شانازیش بکە
چونکێ تۆ لەوەتەی ئاسمانت لە دیارە
رۆڵەی وات بە خۆتەوە نەدیوە، تا ئێستاش
خاکت پێشوازی رۆڵەیەکی وای نەکردووە
مێشکی واگەنجینەیەکی دەوڵەمەند بێ
دەروونی واپڕ لە سروودی پیرۆد بێ
نموونەیەکی دی :
دوژمنی کێوی و نەزانی بێ شومار
ئازارت خزمەتێکی پیرۆزت بکا
جگە لە وەنە بێ فێری
باوەرو دادو دڵسۆزبیت دەکا.[31]

٣١- ئەم وتارەم لەم سەرچاوانە وەرگێڕاوەو ئامادە کردووە:
١- مدخل الى الادب الروسى فى القرن التاسع عشر، تأليف د. حياة شرارة و د. محمد يونس، الطبعة الاولى، ١٩٧٨، ص ١٧٨ — ١٩٤.
٢- جلة الثقافة، العدد الثانى، السنة الثانية، شباط ١٩٧٢، مقال : نيكولاى نكراسؤف الشاعر الديمقراطى الثورى، الكسى سوركوف، ترجمة شاكر نورى، ص ٦٧ — ٨١.
٣- گۆڤاری نووسەری کورد ژمارە ٧، خوولی دووەم، تەمووزی ١٩٨١، وتاری : هەندێ رەخنەی لای ئێمە و دەردی بە یەك چاو بۆ بابەت روانین، ئەنوەر قادر محەمەد، ل ٤٧ — ٧٤.



## ریالیزم و ژانری رۆمان

یەکێك لەو بابەتانەی، کە ریالیزمەکان گرنگییەگی تایبەتییان پێدەدا رۆمان بوو. ئەگەر جاران یان پێشتر رۆمانسییزمەکان شیعری لیریك بە لایانەوە ژانری یەکەم بوو، کە زیاتر لەبار بوو بۆ دەربڕینی هەست و سۆز و خەمەکان، بەڵام بە لای ریالیزمەکانەوە رۆمان دەیتوانی ئەو هەموو کێشەو ململانێ و جیاوازی بۆچوون و ئایدیۆلۆژیاو پێشکەوتنی فەلسەفییە دەربڕێت، کە لەو رۆژگارەدا هاتبوونە مەیدان. بۆ ئەم مەبەستە دەرکەوتن و گەشەسەندنی رۆمانی ریالیزمی رووسیی لە سەدەی نۆزدەهەمدا بە نموونە وەردەگرین :

**قۆناغی یەکەم:**

رۆمانی ریالیزمی نوێ لە رووسیا لە سەدەی رابردوودا لە (١٨٣٠ — ١٨٤٠)ەوە دەست پێدەکات و بە سێ نموونەی رۆمانی پێشەنگ، کە ئەمانەن : ((یەفگینی ئۆنیگن)ی پۆشکین، و (پاڵەوانی سەردەم) ی لێرمەنتۆڤ و (گیانە مردووکان) گۆگۆل. لە کۆتایی چلەکانەوە تا کۆتایی سەدەی رابردوو رۆمانی رووسیی قۆناغێکی گرنگی لە قۆناغەکانی گەشەسەندنی بە خۆوە بینی، کە تیایدا گەیشتە چلەپۆپەی گەشەسەندن.



**لێرمەنتۆڤ**

بۆ ئەوەی بە چاکی لە قۆناغە جیاجیاکانی رۆمانی رووسیی لە ماوەی سالانی پەنجاوە تا کۆتایی سەدەی رابردوو بگەین ناچارین بۆ واقیعی کۆمەلایەتیی هاوچەرخ بگەڕێینەوە، چونکە رۆمانی رووسیی بە بەردەوامی هاوڕێی دلسۆزی واقیع بووە لە گۆڕان و پێشکەوتنیدا، پالەوان، ناوەڕۆك و شێوازە هونەرییەکەی لەگەل گۆڕانی سەردەمە مێژووییە جیاوازەکان و ئەو پەیامەی، کە بەرامبەر بە ئەدەب لە ئەستۆیدا بووە بە تەواوی گەیاندویەتی جێ. کۆتایی چلەکان تا کۆتایی پەنجاکان بە قۆناغی یەکەمی پێشکەوتنی یەکەمی پێشکەوتنی رۆمان دادەنرێت، ئەمەش لەئەنجامی تێکشکانی یان بەزینی دیسەمبەرییەکانەوە بووە، (هەوەلین قۆناغی خەباتی میللی لە رووسیادا)، ئەو بەزینەی، کە بووە هۆی تەقینەوەی تەنگ و چەلەمەی رژێمی دەربەگایەتی بەگزادەی دەسەلاتدارو زیادبوونی رادەی نیگەرانی دژایەتییە کۆمەلایەتەییەکان و رێگا خۆشکردن بۆ قۆناغێکی نۆی لە خەباتی میللی لە رووسیا، ئەو قۆناغەش قۆناغی شۆڕشگێرە دیموکراتییەکان بوو لە رۆلەکانی چینی ناوەڕاستدا، هەر چەندە رۆمان لەو ماوەیەدا پێش هونەرە پەخشانییەکانی تر کەوت، بەلام سنووری نێوان رۆمان و چیرۆك بەتایبەتی لەو ماوەیدا سەقامگیر نەبوو. رۆمان پەیوەندییەکی توند و تۆلی بەچیرۆکەوە هەبوو و هەندێجار لە پێکهاتەکانی ناوەوەیدا خاسیەتەکانی ئەو هونەرەی هەلگرتبوو، کە فەزلێکی زۆریی بەسەر رۆمانەوە هەبوو لە ئامەدەکردنی زۆر پالەوان و شێواز و ناوەرۆکدا، هەر وەکو پێشتر باسمان کرد. رۆمان ناوەڕۆکی خۆی لە ماددەی ئەو واقیعە نوێیە هەلدەهێنجا، لە پەنجاکاندا لەرادەی بۆچوون و بیرکردنەوەی گەنجی رۆشنبیرو هۆشیاردا تێپەری، کە مۆرکی شکستیان یان بەزینیان لەگەل خۆیاندا هەلگرتبوو، سەیر دەکەین نقوومی گومان و نائومێدییەکی زۆر ببوون، ئەو گەنجانەش سەرباری شکست هێنان ئاوات و هەولی نیشتمانییان بەرەو گۆران هەلگرتبوو، لە بەر ئەوە کەوتبوونە بیرکردنەوەیەکی قوول بۆ گەڕان بەدوای دەربازگەیەك لە کێشەکانی کۆمەل. زۆر لەو گەنجانە ئالای بیری شۆڕشگێریی نوێیان هەلکرد بوو، ئەویش بیری دیموکراسیی بوو، کە بیری بەگزادەی لیبرالی دووربخاتەوە، هەندێکیشیان بیری سۆشیالیستی تۆباوییان لە مێشکدا چەسپی بوو، کە لەو سەردەمەدا بە شێوەیەکی فراوان بلاو ببۆوە، کەچی بە دواداگەڕان و ئاواتی پالەوان لە کۆتاییدا رووبەڕووی واقیع دەبوونەوە، لە میانەی ئەو رووبەرووبوونەوەدا رۆماننووسەکان کێشەی رژێمی کۆمەلایەتی ئەوکاتەیان دەربڕیوە و پرەنسیپەکانی ئەو رژێمەیان رەتکردۆتەوە، ئەو رەتکردنەوەش پەیوەستە بە هێلێکی نادیدەی ژیانی گەل، کە رۆمانی



پەنجاکان گرنگییەکی زۆری پێدەدا. رۆماننووسەکان وێنەی کۆمەلانی گشتیی رۆلەکانی گەلیان دەکێشا، وێنەی خەلکی لادێ و هەژارانی شار، رۆماننووسەکان دەچوونە ناخی ماناکانی ناوەوەی ژیانی خەلی ساکارو بە وردی هەست و کەرامەت و وریابوونەوەی تازەیانیان پیشاندەدا. لە دیاترین رۆماننووسەکانی ئەو سەردەمە. کە روویان لە وێنەکێشانی ژیان و چارەنووسی گەنجە رۆشنبیرەکان کرد، رۆماننووسی مەزن (تۆرگینێڤ) بوو، هەروا (گیرتسین) لە رۆمانەکەیدا (کێ گوناهبارە- ١٨٤١) کە تیایدا هێرشی بردۆتە سەر رژێمی کۆیلەیەتی و ئەو پەیوەندییانەی لە ئەنجامی ئەو رژێمەدا دروست بوون و بوونە هۆی لە ناوچوونی ژیانی پالەوانەکانی، هەروەها رۆمانەکەی تری، (زەمەنی بەسەرچوو و بیروباوەڕەکان - ١٨٥٢-١٨٦٨)، کە بە مێژوویەکی نووسراوەی ژیانی کۆمەلایەتی و خەباتی سیاسیی دادەنرێت لە رووسیا و ئەوروپا لە ماوەی بزووتنەوەی دیسەمبرییەکان تا کۆمۆنەی پاریس. هەروەها (گۆنتشارۆف) لە هەردوو رۆمانەکەیدا(چیرۆکێکی ئاسایی — ١٨٢٠) و (ئابلۆمۆف — ١٨٥٩)، کە وێنەیەکی روونی رۆمانسیەی ئەوانی گرتووەو بە شێوەیەك، کە تیایدا وای پیشان داوە هیچ هێزوپڕست و کارێکی تیا بە سەر نییە، جگە لە سستی و بێ تاوانی نەبێت، بەلام ئەو رۆماننووسانەی روویان کردە وێنەکێشانی ژیانی جووتیاران لە سەرووی هەموویانەوە (گریگۆریفتش) بوو، کە ژیانی رۆژانەی جووتیارەکان و ململانێی توندوتیژی رۆژانەیان و لادێیی هاوچەرخیانی کردە ناوەرۆکی ئەو رۆمانەی خۆی، (رێگا کشتوکالییەکان -١٨٥٢) و (راوچییەکان) ١٨٥٣) و (رەوەندەکان — ١٨٥٥)، بەلام رۆماننووسی مەزن دیستۆیڤسکی، کە رۆمانەکانی دەخەینە روو لە سەرووی ئەو نووسەرانەوەیە، کە رووی لە وەسفکردنی ژیانی هەژارانی شار کردووە. رۆمانی پەنجاکان پشتی بە شێوازە باوەکانی پێش خۆی بەستبوو، لە هەمان کاتدا بە شێوەیەکی پێشکەوتوو و نوێتر لە پێش خۆی دەرکەوت، رۆمانی پەنجاکان هەروەکو رۆمانەکانی پێش ئەو ماوەیە پەیوەندییەکی پتەوی بە بزووتنەوەی رزگاریخوازی میللی و تۆمارکردنی روخساری نوێنەرانی ئەو بزووتنەوەیەوە هەبوو، فەزلیش هەر هەمووی بۆ (بلوشکین)ە، کە لە پێش هەموویانەوە ئەو وێنەیەی گرتووە. بە شێوەیەکی گشتی ئەو رۆمانەی (بلوشکین) کاریگەرییەکی زۆری کردە سەر رۆماننووسەکانی دوای خۆی. رێبازە هونەرییە گشتییەکەی (بلوشکین)یان وەرگرت، هەروەها بابەتی چارەنووسی درامی ئافرەتی روسیشیان هەر لەوەوە وەرگرت، کە لەلای بلوشکین لە وێنەی (تاتیانا)دا دەردەکەوێت و پاشان لە چلەکان

و پەنجاکاندا بووە بابەتی سەرەکی و بە تایبەتی لە ڕۆمانی(جیرتسین) دا دەرکەوت، هەروەها ڕۆمانی پەنجاکان (شیکردنەوەیەکی دەروونی) قووڵیان بە میرات لە ڕۆمانەکانی لێرمانتۆڤ بۆ مایەوە، کە هەر ئەمەش بوو پاشان بووە یەکێ لە خاسیەتە دیارەکانی ڕۆمانی ڕووسیی، بە تایبەتیش لە ڕۆمانەکانی تۆڵستۆیدا دەرکەوت. ڕۆمانی پەنجاکان سوودی لەلایەنی تراژیدی ڕۆمانەکانی (گۆگۆڵ)یشەوە وەرگرت، کە پاشان لەلای (دیستۆڤسکی و کیرتسین و سالیتکۆف شیدرین)ەوە بووە سروشتێکی دیارو ئاشکرا، وەك لە ڕۆمانەکانی(گۆگۆڵ)ەوە سوودیان لە وێنەی شیکردنەوەی فراوانی ژیانی جەماوەرو وێنەی چینە جیاوازەکانی ڕووسیا بینی. ئەگەرچی ئەو شێوازە داشۆرینەی لە نووسینەکانی (گۆگۆڵ)دایە بە کەڵکی ڕۆمانی پەنجاکان نەهات، چونکە ڕۆمان لەو ماوەیەدا ڕووی لە وێنەکێشانی هەمە چەشنەی لایەنەکانی ژیانی ڕۆژانەو لێکۆڵینەوەی جۆرەها بیروباوەڕی ئەو سەردەمە کرد. ئەم وێنەکێشانەی، کە پێویستی بە چەند شێوەیەکی جیاوازی نووسینی زۆر هێمنتر لە شێوە نووسینەکانی گۆگۆڵ هەبوو. ڕۆمانی پەنجاکان جەخت لەسەر پێشکەوتنی ڕۆمان بەرەو سەردەمێکی نوێ دەکاتەوە، کە تیایدا ڕۆمان لەژێر تیشکی لێکۆڵینەوەو دۆزینەوە نوێیەکان ڕووەو چەندین ڕێبازی جیاواز لە پێناو بنیادێکی هونەری هەوڵیدەدا، کە هاوسەنگی و گونجانێك بخاتە نێوان چیرۆکی هونەری و گەڕان بەدوای شێوازی داستانی و هۆیەکانی وێنەکێشان بۆ بنیادی وێنەیەکی تەواوی ژیان و هەستی پاڵەوانەکان. هەروەها لە ڕۆمانی پەنجاکاندا شێوەیەکی تازەی ژیانی پالەوان دەرکەوت، ئەویش کوڕی چینی ناوەڕاست، سەرباز و جووتیار بوو، هورووەها وێنەیەکی تازەی ئافرەتی خاوەن هۆشیاری کۆمەڵایەتی وریاو سەربەخۆ دەرکەوت، هەروەها ڕۆماننووسەکان گرنگییەکی تایبەتیان بە ژیانی ناوەوەی پاڵەوان و دیالێکتیکی ڕۆحدا.

### قۆناغی دووەم:

ئەو قۆناغە لە شەستەکان و حەفتاکانی ئەو سەردەمەوە دەست پێدەکات، کە بڕیاری ریفۆرمی کشتوکاڵی لە (١٨٩١) ەوە دەرچوو. لە ماوەی ١٨٥٩ -١٨٦١ داو لە کەش و هەوایەکی پڕ لە شۆڕشگێڕانەدا خۆیان بۆ ئەو ریفۆرمە ئامادەکرد، بەڵام ئەو ریفۆرمەی لەلایەن ڕژێمی بەگزادەی دەستەڵاتدارەوە ئەنجامدرا، هەروەکو وا ناسرا بوون، هەرچەندە جووتیاری ڕووسیی لە کۆیلەیەتی ڕزگارکرد، بەڵام هەر لەسەر باری چەوسانەوە و ستەملێکراوەیی مایەوە.



ئەمەش کاریگەری لەسەر گەشەکردنی تێکەلاو کردنی باری شۆڕشگێڕی نوێی دژ بە بیری لیبرالی هەبوو، کە لەسەرووی هەموویانەوە جوولانەوەی شۆڕشگێڕی دیموکراسیی بوو، کە دروشمی شۆڕشی جووتیارانی لە پێناو گۆڕانی کۆمەڵایەتی هەڵگرتبوو بۆ ڕووسیا، هەموو ئەو دەسکەوتانە کاریگەرییان بەسەر ڕۆمانەوە هەبوو، زۆر بیری نوێ و بابەتی نوێ و شێوازی نوێیان بۆ وێنەکێشانی ژیانی میللی هێنایە کایەوە. زۆر ڕۆمان دەربارەی (خەڵکی نوێ)، ئەوانەی کە سەرکردایەتی ژیانی فیکریی و سیاسیی نوێیان دەکرد، ئەوانەی کە مەرج نەبوو لە چینی بەگزادەدا بن لەسەردەمی پێشترێ دەستیان بەسەر بیری پێشکەوتنخوازدا گرتبوو، نووسرا، پاڵەوانە نوێیەکانی چینی ناوەڕاست هەڵگری بیری سۆسیالیستی شۆڕشگێڕی بوون و بیروباوەڕی مادديان لەبەر گرتبوو لە چالاکی کۆمەڵایەتی یان زانستیدا کاریان لە پێناو بەختەوەری کۆمەڵ دەکرد زۆر بە پەرۆشەوە بۆ ئەوەی لایەنگر بۆ خۆیان پەیدا بکەن، بەڵام گەڕانی ئەو خەڵکانە زۆربەی کات چیرۆکێکی درامی لێدەکەوتەوە، ڕۆمننووسەکان لە وەسفکردنی پاڵەوانە نوێیەکاندا بوون بە دوو دەستەوە : دەستەییێکیان وێنەی پرۆسەی گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی و فیکریی کەسییەتی پاڵەوانیان دەکێشاو وەسفی ژیان و بارودۆخی دەوروبەریان دەکرد، دەستەییێکی دیکەیان بە پلەی یەکەم گرنگیان بە لێدوان لەو کێشە کۆمەڵایەتییانە دەدا، کە خزمەتی پاڵەوانیان دەکرد، بۆ ئەوەی لە ڕۆمانەکەدا وەکو کەسییەتییەکی کامڵ دەرکەوێت. هەندێ جاریش ڕۆماننووسەکان هەموو ئەو بابەتانەیان لەیەك ڕۆماندا تێکەڵاو دەکرد. دیارترین کەس لەو ڕۆماننووسانە (تۆرگینێڤ)ە، وەکو پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، هەروا تشرنیشفسکی ڕۆماننووس لە هەردوو ڕۆمانەکەیدا(چی بکەین— ١٩٥٧، (سەرەتا— ١٩٦٦ — ١٩٧١)، ئەو دوو ڕۆمانەی، کە شێوازی شۆڕشگێڕیی سۆسیالیستی پێ بنیات نان. هەروەها ڕۆمان لەو سەردەمەدا بە شێوەیەکی تایبەتی ڕووی لە کێشەکانی میللەت کرد، کە فیکرو گەڕانی ڕۆماننووسەکانی بەخۆوە خەریك کرد، هەروەها ڕۆماننووسەکان گرنگییان بەوێنەکێشانی پرۆسەی شکاندنی بنەما کۆنەکانی واقیع داو ڕوویان لە دۆینەوەی ئەلتەرناتیڤی تر کرد بۆی و لە ڕۆمانەکانیاندا گوزارشتیان لە پێویستی گۆڕانی لە ڕەگ و ریشەوە کرد بۆ ژیان و مرۆڤ. لە دیارترین ڕۆماننووسەکانی ئەو سەردەمە (تۆلستۆی و دیستۆیڤسکی) ن، کە هەندێ لە بەرهەمەکانیان شی دەکەینەوە، هەروەها سەرباری ئەو بابەتانە تێکشکاندنی شێوە تەقلیدییەکانی ژیان لەو سەردەمەدا و سەرەتای دەرکەوتنی تازە

بووە هۆی دەرکەوتنی شێوەیەکی تازەی ڕۆمان، کە پەیوەست بێ بەژیانی هاوچەرخەوە و گۆڕینەوەی کەلتوور، هەروەها ئەو ڕۆمانانە دەرکەوتن، کە قۆناغی پەڕینەوەی مێژوویی ڕووسیایان دەردەبڕی و هەوڵی نزیکبوونەوەی بەگزادەکان لەگەڵ ئەو پاڵەوانەی بە ئارەزووی خۆی ژینگەی تایبەتی خۆی بە جێ دێڵێ و پاڵەوانی میللی یاخی و شۆڕشگێر، بەهۆی ئاڵۆزی و درامی هەموو ئەو بابەتانەی لە واقیعدا ڕوویان دەدا سەیر دەکەین ڕۆمانی ڕووسیی لەو سەردەمەدا زۆر درامی بوو.

### قۆناغی سێیەم:

ئەو قۆناغە لە هەشتاکان و نەوەدەکانەوە دەست پێ دەکات، ماوەی بەر لە شۆڕشی ١٩٠٥ دەگرێتەوە لەو ماوەیەدا پێوەندی سەرمایەداری پێشکەوتنێکی زۆری لە ڕووسیادا بەخۆوە بینی، کە ئەمەش بووە هۆی چالاکی بەگوڕخستنی جووڵانەوەی کرێکاری و بڵاوبوونەوەی بیری سۆسیالیستی لە نێوان چینەکانی ڕۆشنبیر و کرێکاراندا، هەروەها هۆکارێکیش بوو لە پشت بزووتنەوەی بووژانەوەی گشتی، کە لەو ماوەیەدا لە ئەدەبدا ڕەنگیدایەوە. شتی نوێ لە ڕۆمانی ئەو ماوەیەدا و دەرکەوتنی بابەتی پێوەندی نێوان تاك و کۆمەڵ بوو، تەنانەت بووە ئامانجی سەرەکی بۆ ئەو ڕۆماننووسانەی، کە گرنگییان بە ڕۆشنکردنەوەی وێنەی ڕۆحی مرۆڤی ڕووسیی لەو ماوە ئینتیقالییە دەدا، لە سەرووی هەموو ئەو ڕۆماننووسانەوە نووسەری مەزن تۆڵستۆی بوو، لە ڕۆمانی (زیندووبوونەوە)دا هەروەها ڕۆماننووسەکانی وەکو (سالتیکۆڤ شیدرین و گرین میخائیلۆڤسکی و مامین سێبریاك) یش ڕوویان لەم بابەتە کرد. هەروەها لەو ماوەیەدا جۆرە کەسیەتییەکی نوێ دەرکەوت، کە لە سەرتاپای ژیان و چارەنووسی خۆی دژبە ڕژێمی دەسەڵاتدار نارازی بوو، ئەو کەسییەتییە نوێیەش لە ڕۆمانەکانی گۆرکی (فاماگۆردییێڤ) ١٨٩٧ — ١٨٩٩ و (سێ برادەرەکە) ١٩٠٠ — ١٩٠١ دەرکەوتن.

### تەکنیکی هونەری لە ڕۆمانی (ئاناکارنینا)ی تۆڵستۆی

ڕۆمانی (ئاناکارنینا) ی تۆڵستۆی پایەیەکی بەرزو گرنگی لە کەلەپووری ڕۆمانی کلاسیکیی ڕووسیدا هەیە، لە چنینەکەیدا ڕەگەزەکانی ڕۆمانی کۆمەڵایەتی و دەروونی پێکەوە گرێ داوە، لەم ڕووەوە وتەکانی ڕەخنەگرو مامۆستای ئەدەبی ڕووسیی بەناوبانگ خرابتشنکۆ بەنموونە



دێنینەوە، کە دەڵێت : (سروشتی جوانی ئاناکارنینا لەوە دایە، کە ڕۆمانەکە کۆمەڵێ ڕەگەزی دیاری ئەوتۆی هەیە، کە وایکردووە چەند شێوەیەکی تازە لە بەرهەمی ڕۆماندا بهێنێتە کایە. بەر لە هەموو شتێك ڕەگەزەکانی (دەستنیشانکردنی ڕۆمانی خێزانداری) تیا بەدی دەکرێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشەوە (ئاناکارنینا) تەنها ڕۆمانێکی خێزانداری نییە، بەڵکو لە هەمانکاتدا ڕۆمانێکی کۆمەڵایەتی دەروونییە، نووسەر چیرۆکی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی زۆر چاکی بە وێنەکێشانی چالاکییە کۆمەڵایەتییە ئاڵۆزەکانەوە پەیوەست کردووە).

تۆڵستۆی لە ڕۆمانەکەیدا توانیویەتی لە میانەی ناوەڕۆکدا وێنەیەکی تەواوی ئەو واقعیە هاوچەرخە بکێشێت، کە بەشەکانی لە ماددەی ژیانی ئاساییەوە هەڵێنجاوە بێ ئەوەی پەنا بباتە بەر بەکارهێنانی ڕەگەزی وروژاندن، سەیر دەکەین وێنەی ژیانی کێشاوە بەهەموو دانیشتوانە جۆر بە جۆرەکانییەوە، هەروەها سەیر دەکەین وێنەی تابلۆیەکی فراوانی دنیای گوندو جووتیارانی کێشاوە. تۆڵستۆی تەنها بە وەسفی ئەو چینانە نەوەستاوە، کە جیهانی ناوەوەو هەست و بیریانی ئاشکرا کردووە، بەڵکو وەسفی ڕوخساری دەرەوە و جۆری خووئاکاریشیانی لە ژیاندا کردووە، بۆ نموونە، چینی ئۆرستۆکراتی لێدوانیان دەربارەی دەبەنگیی ناوەوەیان، ژیانیان، گومناوی و سستی و بێهوودەیی بەرامبەر بەگەل پێوە دیارە، بەڵام جووتیارەکان هێمای کارکردن و ڕەنج کێشانن ولە گفتوگۆکانیاندا ڕۆحێکی میللی و سادەو بێ گەردو ڕاستگۆییان پێوە دیارە، زمانی کەسەکان یان پاڵەوانەکانیش زۆر یارمەتی ئەوەمان دەدەن لە دەستنیشانکردنی باری کۆمەڵایەتیان تێ بگەین زمانی نیوە ڕووسیی و نیوە فەرەنسیی، کە ئۆرستوکراتییە بەگزادەکان لە ڕووسیادا قسەیان پێ دەکرد، جیاوازە لەو زمانە سادەو ڕەوانەی گەل، کەرەستەکانی سادەن و هەندێ جار نەزانینی خاوەنەکی و قسەنەزانی پیشان دەدات. هەر هەموو کەسەکان، بە چاوپۆشی کردن لە ڕیزبەندیی کۆمەڵایەتییان، وەك نوێنەری سەردەمی خۆیان و ئەو ڕۆژگارە خۆ دەنوێنن. زمانی هەر کەسایەتییەکیش بەجیا زۆر یارمەتیمان دەدات بۆ تێگەیشتن لە هەندێ خاسیەتی خووئاکاریدا. لە گفتوگۆی (ئانا) دا لە ڕادەی سۆزو سادەیی ئەو پاڵەوانە تێدەگەین. لە لێدوانی (کارنین)ی مێردیدا هەست بە کەسایەتی کۆنە پارێزی ساردیی دەکەین، لە لێدوانی (فرۆنسکی) دا نموونەیەکی ئۆرستۆکراتی هەڵخەڵەتاو بە ڕواڵەت ئاشکرا دەبێت، کە دەیەوێ ئۆرستۆکراتییەتی خۆی لە لێدوان و ڕووخساریشدا بپارێزێ.

له پاڵ لێدوانی کەسایەتیدا، تۆلستۆی زۆر هۆکاری یارمەتیدەری تری بۆ ئاشکراکردنی مەوداکانی پاڵەوان بەکارهێناوە، لەوانەیش خۆدواندنی ناوەوە، کە یەکێك لە خاسیەتەکانی دیمەنی ڕۆمانووسین لەلای تۆلستۆی ئەوەیە، کە کەسەکانی هەردەم لە شێوەی خاوەن توانایەکدا دەردەکەن لە هەستی بە هێزو بیرکردنەوەی قووڵیاندا. ئەمەش بە تایبەتی لە کەسییەتی (ئانا) و (لیڤین) دا دەردەکەوێت، لە میانەی وردبوونەوە و موناجاتیاندا تا رادەیەکی زۆر کەسایەتیان بە دیار دەکەوێت. هەروا بە کەسایەتییەکانی تریشمان ئاشنا دەکات. لە میانەی وردبوونەوەکانی (ئانا)دا زۆر لە سیفاتەکانی کەسایەتی مێردەکەی و کەسانەی دەوروبەریمان بۆ روون دەبێتەوە، لە میانەی رامانەکانی (لیڤین)یشدا زۆر خاسیەتی بیرکردنەوەو میزاج و ئارەزووی نوێنەرانی دەرەبەگایەتی خۆ دەردەخات. مەزنی تۆڵستۆی لەوەدا دەردەکەوێ، کە توانییەتی زۆر بە وردی بەناخی پاڵەوانەکانیدا شۆڕ بێتەوە وەهەست وسۆز و مەینەتەکانیان، لە ساتە جیاوازەکانی ژیانیان ئاشکرا بکات، یەك کەسایەتی بە پێی جیاوازی هەلوێست و بارودۆخەکە دەگۆڕێ، بۆ نموونە ئێمە بەچەندین روخساری جیاوازی پاڵەوانەکەی (ئانا) ئاشنا دەکات، کە بەپێی گۆڕانی باری دەروونی وبارودۆخەکەی دەگۆڕێ، (ئانا) جارێکیان وەکو مرۆڤێکی بەختەوەر دەردەکەوێ و خاوەنی خۆشەویستییە، هەندێ جاریش وەکو مرۆڤێکی ویژدان بەئازار دەردەکەوێ و پەژارە باڵی بەسەردا کێشاوە، جاری وایش هەیە وەکو مرۆڤێکی شووم دەردەکەوێ و بە جیابوونەوەی لە کوڕەکەی ئاگری تێ بەردەبێ و هەندێ جاریش بێزارە لە ژیان و چارەنووسی خۆی، هەمموو ئەو روخسارانەی (ئانا) لە لاپەرەکانی ڕۆمانەکەدا یەك بەدوای یەك دەردەکەون بۆ ئەوەی لە ئەنجامدا وێنەیەکی زۆر وردی هەست و بارودۆخی ئاڵۆزو دژبەیەکی پاڵەوانەکەیمان بۆ روون بکاتەوە. تۆڵستۆی بارودۆخی پاڵوانەکانیمان بە ئابوورییەکی بێ ژیان لە شێوازی وەسفی کردووە، دەماخاتە نێو ژیانی ئەوانەوە بێ ئەوەی پێشتر هیچ پێشەکییەکمان بداتێ.

ڕۆمانی (ئاناکارنینا) بەسادەیی و هەمەلایەنی و وێنەگرتنی ژیان و هەستی وردی پاڵەوانەکانی بە راستگۆیی و قووڵییەوە سەرنجی هەمووانی راکێشاوە. خوێنەر هەمان ئەو شتانەی لە ژیانی رۆژانەی ئاسایی خۆی و ئەو شتانەی لە هۆشیدا مەزنەدەی کردوون دەربارەی



خەڵك و سروشتیان لەو ڕۆمانەدا بەدییان دەکات [٣٢]. هەروا بەرێکەوت نییە، کە (ئانا کارنینا) ی پاڵەوانی نووسەر هەمیشە لە دەروونمان نزیکە و هێشتا کار لە ویژدانمان دەکات، ئەگەرچی دەیان ساڵ لەنێوان جیهانی ئێمەو (ئانا) دایە.

چیرۆکی (ئانا) هەوڵدانی مرۆڤە لە پێناو گەیشتن بە بەختەوەری، (بە چاوپۆشی کردن لە ناوەڕۆکەی). تراژیدیای (ئانا) تراژیدیای مرۆڤە، کە هۆکارەکانی بارودۆخ و چارەنووس و نەریتەکانی کۆمەڵ دژی وەستاون.

### تەکنیکی هونەری لە ڕۆمانی (برایانی کارامازۆڤ) دا

ڕۆمانی (برایانی کارامازۆڤ) بە ڕۆمانێکی خاوەن ناوەڕۆکێکی کۆمەڵایەتی دەروونی و لە هەمانکاتدا فەلسەفییش دادەنرێت، ئەمە سەربارەی ئەوەی چەندان خاسیەتی ستایل دەنوێنێ، کە پێوەندی بە ڕۆمانی پۆلیسییەوە دەکات. هەرچەندە بابەتی سەرەکی رووداو بەدوای یەك لە رەگەزە جەوهەرییەکاندا دەردەکەوێ، بەلام ڕۆمانەکە تێکەڵە لە نێوان وێنە گرتنێکی ریالیستانەی دەستنیشانکراوی واقیع و ئاکارو رووداو و گفتۆگۆیەکی فیکری قووڵ دەربارەی گرنگترین کێشەکانی سەردەم، ئەو تێکەڵاوییە، کە زۆر بە ئاسایی و گونجاوی لە نێو ڕۆمانەکەدا هاتووە و دووره لە هەموو نەگونجانێك، چونکە پاڵەوانەکانی ڕۆمانەکە گفتوگۆکانیان دەربارەی ئەو بابەت و فەلسەفانەیە، کە بە شێوەیەکی ئەبستراکت دەردەکەون، ئەوانیش بەم هۆیەوە لە دەرگای ئەو بابەت و کێشە زیندوانە دەدەن، کە (بوون) یان نابوود دەکات.

(گرۆسمان) ی رەخنەگر دەربارەی خاسیەتی ڕۆمانی دیستۆیڤسکی نووسیویەتی و دەڵێت:

(لەم ڕۆمانەی دیستۆیڤیسکیدا (بیر) بە خاڵی دەست پێکردن دادەنرێت. بەلام بیری ئەبستراکتی سەر بە رێبازی فەلسەفیی، ئەمەش وەکو ئەو خەڵکە وایە، کە رووداوە جۆربە جۆرو ئاڵۆزو تێکەڵەکانی ناوەرۆکی بەدەوردا دەسورێتەوە. بەلام سەرەرۆیی تێکەڵ هێزو گوڕی جووڵەو گرنگیپێدانی دەرەوە بە هێڵی بەرزبوونەوەی ڕۆمانەکە دەدات، کە ئەمەش لێرەدا بە شێوەیەکی گشتی، لە ئەنجامی ئەو بارودۆخە رووتەی، کە هەموو چێرۆکەکەی گرتۆتەوە پێویستە.

٣٢- هەندێ بۆچوونی رەخنەیی هەیە، کە گوایا ڕۆمانەکانی تۆڵستۆی ژیاننامەی خۆیەتی، بەلام هەندێ نووسەری تر ئەمەیان رەتکردۆتەوە، کە ئەمەیان لە راستییەوە نزیکترە. هەروەکو: بوریس بورسوف، الواقعیە الیوم و ابدا، ١٩٧٤، ص ٢٩٦.



**دیستۆیڤیسکی**

نهێنی گشتی لەم ڕۆمانەی دیستۆیڤیسکی لەوەدایە، کە هەوڵ دەدات لەپاڵ سەرنج ڕاکێشان و خستنە نیگەرانییەکی بێزارکەری خوێنەردا بۆ لاپەرە فەلسەفییەکان، سەرەڕۆییەکی دڵخۆشکەر لە شێوەدا دەنوێنێ.

لەبەر ئەوەی (بیر) خاڵی دەست پێکردنی ئەم ڕۆمانەی دیستۆیڤیسکییە، سەیر دەکەین ڕۆمانەکە پڕلە دیالۆگە، دیالەگە کانیش سروشتێکی فەلسەفیانەیان هەیەو ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی لەمیانەی ئەمەدا تابلۆیەکی مەزن و ئالۆزی جەنگی بیروباوەڕە دژ بەیەکەکان بنوێنێ. دیالۆگ لەم ڕۆمانەدا سروشتێکی درامیانەی هەیەو کاریگەرییەکی بەهێزی هەیەو بە ڕێگەیەکی ئۆر گانییەوە تێکەڵ بەبابەت دەبێت و بەرەگەزێکی پێویست دادەنێت بۆی.



ڕووداوەکانی ڕۆمانی (برایانی کارامازۆف) لە ماوەیەکی زەمەنی کورت و چڕدا ڕوودەدەن، ئەگەرچی ڕۆمانەکە پاڵەوانی زۆر تیایە پەل و پۆی بۆ زۆر بابەت ڕادەکێشێ، ئەم خاسیەتەش لە نێوان گشت ڕۆمانەکانی دیستۆیڤیسکیدا بەدی دەکرێت. ڕووداوەکان لەم ڕۆمانەدا بۆ سێ ماوە زەمەنی، کە هەریەکەیان بەماوەیەکی ئێجگار کەم لەوەی تر جیادەبێتەوە هەریەکەیان لەو ماوانەدا پڕە لە ڕووداوی زۆر نیگەران، جیا دەبێتەوە. وێنەکێشانی پاڵەوانەکانی ڕۆمانی (برایانی کارامازۆف) لە قۆناغی جووڵانەوەی ناوەوە گەشەسەندنی بیرو دەروونی دایە.

(هەندێ لە کەسەکان — وەك ئیڤان قەشە زوسیما — وەك خەلکێکی خاوەن بیروباوەڕ دەردەکەون.) دیستۆیڤیسکی لە وەسفی کەسایەتیەکاندا گرنگییەکی زۆری بە وێنەکێشانی پرۆسێسی ئەو وەرچەرخانانە داوە، کە بەهۆی کارتێکردنی بارودۆخی دەرەوەو هۆکارە ناوەکییەکان لە بیر و هۆشی کەسەکاندا ڕوودەدەن، هەروەك ئەوەی لە دیمیتری کارامازۆڤ و ئیلیۆشا کارامازۆڤدا ڕوودەدات، ئەگەرچی ئەو پێشکەوتن و وەرچەرخانە فیکرییەی لەلای کەسانی ڕۆمانەکە ڕوودەدەن لەسەر خۆ وێنەیان کێشراوە، بەڵکو بە شێوەیەکی شکاوەو خێرا دەردەکەون. لە پاڵ ئەو وەسفە سەر بە خۆیەی، کە نووسەر بۆ پاڵەوانی کردووە. سەیر دەکەین کەسانی ڕۆمانەکە لە میانەی لێدوان لە خۆیان و ئازارو ژانەکانیاندا ئاشکرا دەبن، هەر بۆیە ئەم ڕۆمانە لە چنینەکەیدا پڕە لە دانپێدانانی خودی و دیالۆگ.

دیستۆیڤیسکی لەم ڕۆمانەدا خۆی ئامادەیە، خۆی دەوری گێڕەرەوە دەبینێ، لە پێشەکی ڕۆمانەکەدا ئەوە دەردەخات، کە کەسانی خێزانی کارامازۆڤ یەکە بە یەکە دەناسێ و زانیارییەکی تەواوی لەبارەیانەوە هەیە، هەروەها بەهەمان شێوە زۆر لە کەسەکانی تری ناو ڕۆمانەکە، کە نووسەر دەربارەی شتە وردەکانی ژیانیان دەدوێ وەك بڵێی لە نزیکیانەوە دەژیت. لەگەڵ ئەوەشدا دیستۆیڤیسکی هەندێ جار دەوری گێڕەرەوەکە بە یەکێ لە کەسەکان دەدات، بۆ ئەوەی کەسەکە خۆی ئەو ڕووداوانە بگێڕێتەوە، کەبینیونی یان ئاگای لێیانە، بەڵام ڕۆڵی (گێڕەرەوە) قووڵترە، هەموو شتێك بە تەرازووی ڕەوشتی خۆی دەکێشێ، هەندێ جار دەست بە ئامۆژگاری و ڕێنمایی وادەکات، کە لە بابەتە سەرەکییەکە دوور دەکەوێتەوە.

هەڵوێستی دیستۆیڤیسکی بەرامبەر بە کەسەکان و بیروڕا جۆربەجۆرەکان ئاشکرا دیارە، نەوەکو هەروەکو هەندێ لە ڕەخنەگرەکان، کەوا دەزانن کەسانی ناو ڕۆمانەکە لە جووڵانەوەو قسەکرنیاندا خاوەنی سەربەخۆیی خۆیانن.

نووسەر خۆی تێکەڵ نەکردووە، بۆ ئەوەی هەڵوێستی خۆی بەرامبەریان دەرنەخات. بۆ نموونە (باختین) ی رەخنەگر، کە یەکێکە لە لێکۆڵەرەوەی بەرهەمەکانی دیستۆیڤیسکی ئاماژەی بۆ ئەو کردووە، کە (خاسیەتی پێکهاتنی رۆمانی برایانی کارازۆڤ) شاراوەیە لە نێوان ئەو هەموو دەنگە سەربەخۆیەی، کە هەریەکە خاوەن سەربەخۆییەکی بێ هاوتایان جیاواز لە بۆچوونی نووسەر، وتەکانیان هەروەك بڵێی لەرێگەی نووسەرەوە ببیسین).

لە سیما دیارەکانی بنیادی رۆمانی (برایانی کارامازۆڤ) دا نەغمەیەکی دووبارە بووە یان تاکە یەك بیر لە بەشە جیاوازەکانی ناو رۆمانەکەدا هەیە، بەلآم بەشێوەو مەغزاو مانایەکی تازەوە. ئەمەش هەل بۆ بەراوردکردن لە نێوان ئەو بیرو را فەلسەفییە جیاوازو راڤەرکردنە جۆربە جۆرانەی بەرانبەر بابەتەکە یان بیرەکە لە ئارادایە دەرەخسێنێت، هەروا لە هەمانکاتدا هەندێ رەمزییەت بۆ پێکهاتی رۆمانەکە زیاد دەکات. ئەوا بۆ ئەمە نموونەیەك دێنینەوە :

(بوونی خودا) بە یەکێ لە گرنگترین ئەو بابەتانە دەژمێردرێت، کە ئەم رۆمانە بۆی چووە. وەکو پێشتریش روونمان کردەوە دیستۆیڤیسکی دوو رێبازی دژیەکی بەرامبەر ئەم بابەتە وەدەرخستووە. رێبازێك، کە رەفزی دین و بوونی خودا دەکات، ئیڤان کارامازۆڤ بڕوای پێیەتی، رێبازێکی تریان جەخت لەسەر بوونی مەملەکەتی خودا دەکات و (زوسیما) ی رەبەن بڕوای پێیەتی. دیستۆیڤیسکی لە زۆر شوێنی رۆمانەکەدا لە زۆر گۆشەی جیاوازەوە گفتوگۆو راڤەی ئەو بابەتەی کردووە. لە یەکێ لە بەشەکاندا سەیر دەکەین نووسەر تێڕوانینەکانی ئیڤان بەرامبەر بە ئازارو فرمێسکی منداڵان بە نموونە دێنێتەوە، ئەو ئازارەی کە لەگەڵ بوونی دادپەروەری ئاسماندا هیچ پاکانەیەکی بۆ ناکرێت. بەلآم لە بابەتێکی ترو بە شێوەیەکی نادیار کە لەسەر ئەو رایە دەکات، ئەویش لەمیانەی یەکێ لەو چیرۆکانەی، کە (زوسیما) ی رەبەن دەیانگێڕێتەوەو پشت بە دەقەکانی ئینجیل دەبەستێت، ئەو چیرۆکەی باسی ئەوە دەکات، کە خوا جارێکیان ویستی هێزی باوەڕی بەندەی دڵسۆزی خۆی (ئەیوب) تاقی بکاتەوە، (ئیبلیس) ی بۆناردوو لەو بەهێزی کرد، (ئیبلیس) لە مێگەلەکەی (ئەیوب) ی دا، رۆڵەکانی لەناو بردوو سامانی تەفرو توناکرد هەموو کارەساتەکانی بەیەکجار بۆ نارد...

(ئەیوب) یش هیچی نەکرد، نوشتایەوە سەر زەوی سوجدەی بۆ خوابرد. خوا جارێکی تربەختەوەری بۆ ئەیوب رەوانە کردەوەو سامانی نوێ و رۆڵەی دیکەی پێ بەخشییەوە، بەلآم ئایا مرۆڤ دەتوانێت لە میحنەتدا بژیت و دوایی بەختەوەربێت ؟



دیستۆیڤیسکی لە کاتی گێڕانەوەکەی رەبەندا ئەو پرسیارە دەخاتە روو، ئایا نوح دوای منداڵەکانی هەوەڵی لێ بزربوو و نەگەڕانەوە توانی منداڵە تازەکانی خۆشبوێ ؟ شێخ بە دڵنیاییەوە وەلآم دەداتەوە، کە (دەشێ)، چونکە دادپەروەری ئاسمان هەمووان دەگرێتەوە. خەڵکی بە گشتی لە بەرامبەر خودا و لە بەرامبەر هەمووواندا گوناهکارن، بۆیە بەلایەوە گرنگ نییە کێ لەو خەڵکە تووشی ئازار دەبێ ئایا شایانی ئەوەیە یان نا ؟ چونکە ئازار بۆ هەموو بنیادەمێك پێویستە تاوەکو خۆی پاك بکاتەوەو لە هەڵەی خۆی و خەڵکی دی پژێوان ببێتەوە.

بەم ئازارە خودا بڕوای مرۆڤ تاقی دەکاتەوەو پاشان مرۆڤ مافی ئەوەی نییە لەسەر زەویدا بیر لە تۆڵەسەندنەوەو بەرهەڵستیکردن بکاتەوە دژی بێ عەدالەتی، چەنکە حەقیقەتی خودایی لەسەرووی هەموانەوەیە....

## تەکنیکی هونەری لە رۆمانی (تاوان و سزا) ی دیستۆیڤیسکی دا

رۆمانی (تاوان و سزا) بە یەکەم رۆمانی کۆمەلآیەتی فەلسەفی دیستۆیڤیسکی لە قەڵەم دەدرێت، چونکە وێنەگرتنی واقیعی ژیانی کەسەکان لە رۆمانەکەدا لە وەسفکردنی باسە فەلسەفی و رەوشتییەکان جیایە. (تاوان و سزا) یش وەك رۆمانەکانی تری دیستۆیڤیسکی خاوەن خاسیەتێکی دیارو بەرچاوە، ئەو خاسیەتەیش شێوە درامییەکەیەتی.

رووداوەکانی ناو ئەم رۆمانە بە دینامیکیەتی رووداوەکان و دڵەراوەکێیان و ئەو ئاوو هەوا لێڵەی رووداوەکانی، کە لە زەمەنێکی دیاریکراو و شوێنێکی دیاریکراو روودەدات، بەناوبانگە. نووسەر سەرەتای رۆمانەکەی بە ژیانی گوزەشتەی پاڵەوانەکەی و رابردووی تاوانەکە دەست پێ نەکردووە، بەڵکو بەخێرایی خوێنەر دەخاتە نێو رووداوە گرنگەکانی رۆمانەکە و لە خاڵی سەرەکی رۆمانەکە نزیکی دەخاتەوە، سەیر دەکەین دوای گێڕانەوەیەکی خێرای رووداوەکانی رۆژی پێش تاوانەکە، یەکسەر دوای ئەوە وەسفی رووداوەکانی تاوانەکە خۆی دەکات، کە تان وپۆی رۆمانەکەیە. وەکو پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد (تاوان و سزا) دابەش دەبێت بۆ دوو بەش :

بەشێکی بچووك، تیایدا وەسفی راپەڕاندنی تاوانەکەی کردووە، بەشێکی گەورەتر تیایدا وەسفی سزای پاڵەوانەکەی کردووە، ئەو بەشەیە، کە شیکردنەوەیەکی دەروونیی قووڵی بە خۆوە گرتووە، خاسیەتی تراژیدیی پاڵەوانەکە تیایدا زاڵە لە ئەنجامی ئەو تاوانەی پێی هەڵساوە و ئەو بابەتەی، کە چاوەڕێی بڕیارێك دەکات بۆ ئەوەی چارەنووسی داهاتوو و بوونی دەستنیشان

بکات، لە هەموو بارێکیشدا وا دەردەکەوێت ئەو چارەنووسە تاریك و شوومە. دیستۆیڤیسکی لە رۆمانەکەدا وەك بینەرێك دەردەکەوێت، کە هەموو شتێ دەژنەڤێ و لەباری سەرنجی پاڵەوانەکانی ورد دەبێتەوە وبە چاوی ئەوانەوە لە دنیا رادەمێنێ، هەندێ جار لەبارەی پاڵەوانی سەرەکی بە راناوی بزر دەدوێ، هەندێ جاری دیکەش دەنگی نووسەر و پاڵەوان یەك دەگرنەوەو تێکەڵ یەکدەبن، هەندێ جاریش وەها دەردەکەوێت، کە پاڵەوانەکە خۆی سەبارەت بەو شتانەی روو دەدەن بۆ نووسەر دەدوێ. دیستۆیڤیسکی لە باری سەرنجی چاودێرێکی دەرەوە وەسفی رووداوەکان ناکات، کە پێوەندییەکی ناراستەو خۆی بە رووداوەکانەوە نەبێت، بەڵکو بەسەر رووداوەکاندا تێ دەپەرێت لە میانەی ئەوەی پاڵەوانی سەرەکییەکەی وەریدەگرێت و لەگەڵ باری دەروونیی ناوەوەیدا دەگونجێت، بۆیە خێرایی و سستی رووداوەکان بە گوێرەی حاڵەتی پاڵەوانەکە دەگۆڕێت. سەیر دەکەین هەندێ جار رووداوەکان لەسەرەخۆ روو دەدەن، هەر وەك لەو دیمەنەی لە کوشتنی پیرێژنەکەدا روودەدات.. هەروەها ئەو ساتانەی وەسفی موعاناتی دەروونیی دەکات، هەندێ جاریش دەبینین لە زۆر دیمەندا بە پێش زەمەنی رووداوەکان دەکەوێت، بە تایبەتی ئەوانەی وەسفی چاوپێکەوتنی راسکۆلینکۆڤ لەگەڵ کەسانی تردا دەکات. وەسفی شوێن و کەسەکان لای دێستۆیڤیسکی دەورێکی سەربەخۆ نابینن، بەڵکو بە بەشێك لە رووداو و ناوەڕۆکدا دادەنرێت، بۆ نموونە وەسفی نووسەر بۆ ژوورە غەمگینەکەی راسکۆلینکۆڤ یان ئەو مەیخانەیەی لە سەرەتای رۆمانەکەدا راسکۆلینکۆڤ لەگەڵ (مارمیلادۆڤ)ی باوکی سۆنیادا بە یەك دەگەن. ناتوانرێ وەسفی ئەو شوێنانە بە شتێکی سەربەخۆ دابنرێت، بەڵکو دەورێکی یارمەتیدەر لە ئاشکرا کردنی وێنەی ئەو جیهانە مادییەی دەوروبەری پاڵەواندا دەگێڕێ، کە کانگەی نەفرەت و ژەهراوی بوونە، بەڵام بۆ وەسفی کەسایەتی، ئەو وەسفەیان بۆ تێگەیشتن لە سروشت و سیفاتەکانی زۆر یارمەتیمان دەدات. لەوانەش وەسفی لیزاڤینا (هەژارەکە)، خوشکی دایەنەکە، نووسەر لە میانەی وەرگرتنی قسەی ئەو قوتابییەی لە مەیخانەکەوە لە نزیك راسکۆلینکۆڤ دانیشتووە دەربارەی دایەنەکە لە گەڵ ئەفسەرەکە دەدوێ، بەم شێوەیە وەسفی دەکات :

**(شەو و رۆژ لە ماڵەوە ئیشی دەکرد، خەریکی جل شۆرین بوو، ئیشی دەکرد، جگە لەوەی جلیشی دەدرووی و دەیفرۆشتەوە، هەتا بە پارە عەرزیشی دەسرپییەوە و پارەی خڕ دەکردەوە، هەموویشی لە دەستی خوشکەکەی (دایەنەکە) دەکرد، زاتی ئەوەی نەدەکرد هیچ بڕیارێك**



**بدات، وەکو فرۆشتنی شتێك یان هەر کارێکی دی بەبێ پرسی پیرێژن... رووخساری لیزاڤینا جوان بوو، چاوەکانیشی زۆر جوان بوون، بە بەڵگەی ئەوەی سەرنجی زۆر کەسی رکێشابوو.. هێمن و نەرم ونیان بوو، مل کەچ بوو لە هەموو شتێك دا مل کەچ بوو).**

ئەو وەسفە لە ناو بیرەوەرییەکانی راسکۆلینکۆڤدا جێگیر ببوو کاتێ، کە دەیویست لیزاڤینا بکوژێت، پاشانیش لە ئازاری کوشتنی (لیزاڤینا) ی هەژارادا ئەمەی بیر دەکەوێتەوە، کە بەبێ ئاگاییەوە لە مێشکیدا وێنەی چەوساوەیی و ستەملێکراوی لەگەڵ (سۆنیا)دا یەکدەگرنەوە. بۆ (راسکۆلینکۆڤ)یش، نووسەر نەهاتووە وەسفی هەموو ژیان و بارودۆخ و بیرباوەڕ و هەستی ئەومان بۆ بکات، بەڵکو بەرەبەرە لەناو رۆمانەکەدا زانیارییمان دەربارەی باردۆخی ژیان و بیرو باوەڕو هەست و سۆزەکانی ئەو دەداتێ، بۆ نموونە بۆ (بیر)ی راسکۆلینکۆڤ — وەکو بینیمان — لە سەرەتادا بە شێوەیەکی روون بۆ خوێنەر دەرناکەوێت، هەروەها بیروباوەڕە جیاوازەکانی پاڵەوان، کە لە کاتی دوانی لەگەڵ پشکنەردا دەربارەی وتارەکەی و هەتاوەکو لە قسەکانی لەگەڵ سۆنیادا راستەوخۆ مەوداکانی (بیر)ەکەی روون ناکاتەوە، بەڵکو چەند زیاترو زیاتر لە جیهانی بیروباوەڕەکانی راسکۆلینکۆڤ وسۆزە نائارامەکانی وردبینەوە مەوداکان بەرەبەرەو زیاتر دەردەکەون، بۆیە بیروباوەڕەکانی راسکۆلینکوڤ لە سیستەمێکی وەهادا دەردەکەون، کە گوێ بە لۆجیك و زنجیرەی یەك لە دوای یەك نادات، بەڵکو دەرکەوتن و دەرنەکەوتنی پەیوەستە بە حاڵەتی دەروونیی و سروشتیی ئەو کەسەی بۆی دەدوێت.. [٣٣]

33 : ئەم وتارانە لە بارەی رۆمانی رووسیی و تەکنیکی هونەری رۆمانەکانی دیستۆیڤیسکی و تۆلستۆی لەم سەرچاوەیەوە وەرمگێڕاون: د: مکارم الغمری، الروایه الروسیه فی القرن التاسع العشر سلسله عالم المعرفه الکویتیه (٤٠)، کویت، ١٩٨١.

## ریالییزمی سۆشیالیست

ئەگەر چی زۆربەی نووسەران بڕیار لەسەر ئەوە دەدەن، کە ئەم ڕێبازە ئەدەبییە لەگەڵ ڕۆمانی (دایك)ی (ماکسیم گۆرکی ١٨٦٨ — ١٩٣٦) یەوە دەستپێدەکات و لە باوەشی شۆڕشی ئۆکتۆبەری ڕووسییدا لە دایکبوو. ئەم ڕێبازە لە کارە ئەدەبی و شاکارەکانی نووسەرانی لۆرکای ئیسپانی و برێختی ئەڵمانی و ئەراگۆنی فەڕەنسی و نازم حیکمەتی تورکی و پاپلۆ نیرۆدای چیلیدا بەدی دەکرێت، واتا لە نووسینی غەیری نووسەرانی ڕووسیشدا، واتا دەتوانیین بڵێین، سەرەتا و دەروازەی ریالییزمی سۆشیالیست، ریالییزمی ڕەخنەگرانەیە، بەرلەوەی مارکسییزم بە ئەوروپا دا بڵاوبێتەوە.



**ماکسیم گۆرکی ١٨٦٨ — ١٩٣٦**



لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا چەندین ئەدیب و نووسەری بە توانا دەرکەوتن، کە بەرهەمەکانیان ڕەخنەیەکی توند و تیژ بوو لە دژی چینی بۆرژوا، تیایدا ڕۆحی شۆڕشگێڕییان تیا بەدی دەکرا بۆ گۆڕینی بارودۆخەکە و بۆ یەکەمجار جەماوەریان بۆ پاڵەوانی بەرهەمەکانیان هەڵبژارد، پاشان مارکسییزم لە ڕووسیادا خۆی چەسپاند و ڕەنگ و ڕوویەکی زانستی بەم ڕێبازە بەخشی و سەودای بیرکردنەوەی ڕووەو ئاسۆیەکی گەش و ڕووناك بۆ ئایندە برد. لە کاتێکدا ڕیالییزم خۆی لەگەڵ مارکسییزمدادا گونجاند، کە چینی پرۆلیتاریا بووە هێزێکی کاریگەر، لەوساوە ڕیالییزم بە حیزب و دەوڵەتەوە پەیوەستکرا، ئەدیب و نووسەرانیش ئەو ڕێبازەیان بە کاملترین ڕێبازی ئەدەبی لە بواری ئەدەب و هونەردا لە قەڵەمدا...

ئەگەر پێشتر ڕێبازی ڕیالییزمی ڕەخنەگرانە تەنیا لە ڕووی مێژووییەوە سەیری کۆمەڵی دەکرد و ڕەخنەی لێ دەگرت بێ ئەوەی داوای گۆڕین و یاخیبوون بکات، ئەوا ئەم ڕێبازە تازەیە ژیانی لە بەردەوامییەکی هەمیشەییدا دەدا و هەوڵی گۆڕینی دەدا.

ئەم ڕێبازە ئەدەبییەش وەنەبێ هەروەکو ڕێبازەکانی تر بە تەواوی نووسەرانی بۆ لای خۆی کێش نەکرد و جیاوازی بیرورا لەم بارەیەوەش هەبوو... هەندێ لە نووسەران بە تەواوی خۆیان پێوەست کرد بوو هەموو ڕێبازێکی تۆیان ڕەت دەکردەوەو بە تاك ڕای خۆیان و بەس..

هەندێ نووسەری تریش زۆر بە توندی ڕێبازی ڕیالییزمی سۆشیالیشتییان ڕەتکردەوە، چونکە ئەم جۆرە خۆبەستنەوە و کۆت و پێوەندە دەبێتە هۆی ئەوەی نووسەر هەموو سەربەستییەکی خۆی لە دەست بدات.

هەندێکی تر هەڵوێستێکی مام ناوەندیان هەبوو، کە باس لە واقیع بکرێت و بە جەوهەری بیری مرۆڤایەتی گەشەی پێ بدرێ و پەرەی پێ بدرێ، بەڵام بێ ئەوەی توند ڕەوی تیا بنوێنرێ و سەربەستی نووسەر پێ شێل نەکرێ و لایەنی سلبییەکانیش بەسەریا ڕەت بن.

هەروەها ئەم ڕێبازە لە ڕووی فەلسەفیشەوە جیاوازی هەیە لە ڕیالییزمی ڕەخنەگرانە، چونکە ڕیالییزمی ڕەخنەگرانە بە تێڕوانینێکی ڕەشبینانەوە بۆ ژیان دەڕوانێ، بە پێچەوانەوە ڕیالییزمی سۆشیالیست بە تێڕوانینێکی گەشبینانەوە لە ژیان دەڕوانێ و لە بوونی خێر و خۆشی و نائومێد نییە، چ لە لای تاکەکەس چ لە لای کۆمەڵ، بۆ ئەم مەبەستەش فەلسەفەی مارکسییزمی کردۆتە بناغە بۆ کێشە و ململانێی چینەکانی کۆمەڵ.

کەوا بێ ڕیالیزمی سۆشیالیست ڕێبازێکی هونەرییە، وێنەکێشی واقیع دەکات بە شێوەیەکی ڕاستگۆیانە لە مەودایەکی مێژوویی سنووردار‌دا، کە تیایدا پەروەردەی چینی زەحمەتکێش بە پەروەردەیەکی شۆڕشگێڕانەو سۆشیالیستی دەکات.

ئەم ڕێبازە هەمیشە وێنەکێشی خێر و چاکە لە کۆمەڵدا دەکات و هەوڵ دەدات داد و دادپەروەری بۆ هەموو چینەکانی دابین بکات و بەدوای سەرچاوەکانی ماف و جوانیدا دەگەڕێ. بۆ بەدیهێنانی مەرامەکانی خۆی هونەر دەکاتە داردەستێك، یان هونەر لە نێوان هۆ و مەبەستدا تێکەڵ دەکات. مەبەست مرۆڤ و بەختەوەرییەتی، هۆیەکیشە بۆ چێژ بەخشین بۆ خودی خۆی یان جوانیی بۆ خودی خۆی.

ئەم ڕێبازە لە هەوڵی ئەوەدایە، کە بینای کۆمەڵ بکاتەوە لەبەر ڕۆشنایی ئەوەی، کە دەبێ ئەدیب لە خزمەتی کۆمەڵدا بێت، نەك لە واقیع ڕابکات و لە بەرهەمی ئەدەبییشدا دەبێ ناوەڕۆکێکی بەرزی هەبێ و تیایدا مرۆڤ وەکو هێزێکی کاریگەر، کە ڕێڕەوی مێژوو دەگۆڕێت، پێشان بدرێت.

لە ڕووی ژانرە ئەدەبییەکانیشەوە ڕۆمانی مێژوویی و شانۆگەریی دەوری باڵایان دەبینی، لە ڕۆمانەکاندا شۆڕشە جووتیارییەکان و کرێکارییەکان و خەباتی جەماوەر بۆ سەربەستی بە پلەی یەکەم دەهات. لە شانۆگەرییشدا رابەرایەتی (برێخت)ی ئەڵمانی لەم بوارەدا لەبەرچاوانە و (درامای داستانیی) داهێنا.

ڕەخنەی ئەدەبییش (ڕەخنەی بابەتیی)بە خۆوە دی، کە تیایدا ڕەخنەگرەکانی سەر بەم ڕێبازە ڕەخنەکانیان تەنها بۆ کەسێکی دیاریکراو نەبوو، بەڵکو چینێکی دەگرتەوە، کە لە ڕێ لایداوە، یان بە واتایەکی تر رەخنەکانیان بێلایەن نەبوو، بەڵکو شیکردنەوەو بڕیاردان بوو لەسەر جەوهەری ماتریالیزمی دیالێتیکی مارکس لە پێوەندیی نێوان مرۆڤ و مێژوو. دیارترین شاعیر و وێنەکێش و درامانووسییان (مایکۆفسکی) بوو.



**نموونەی بەرهەمی ریالیزمی سۆشیالیست:**

## هاوکێشەی خۆشەویستی ١ + ١ = ١

**چیرۆکی: فۆهۆ یز ینگ**

دوای ئەوەی لە کۆمەڵێ ئەزموون و تاقیکردنەوە سەرکەوتم بوومە یەکێ لەو خوێندکارانەی ناوم بۆ زانکۆ لەبەشی بیرکاریدا دەرچوو، ئەو بەشەی، کە باوکم تیدا مامۆستا بوو، لەسەرەتادا وەك هەر خوێندکارێکی نوێ پێویست بوو چەند تاقیکردنەوەیەك بکەین. لەئەنجامی یەکێ لەو تاقیکردنەوانەدا بۆ یەکەمجار هەستم بە خۆشەویستی کرد، جا راست بێ یان نا نازانم. تاقیکردنەوەکە لەوانەی بیرکاری بوو، کاتێ پرسیارەکانی تاقیکردنەوەم وەرگرت سەرەتا بە چاوخشانێکی خێرا سەیرم کرد دوایی دەستم بە وەڵامدانەوە کرد. پرسیارەکانی یەکەمو دووەم بەڕاستی زۆر ئاسان بوون، ئەوەی سێیەم هەرچەندە بە ئەنقەست ڕێگەی خستنەرووەکەی بەهەڵە دایاننابوو هەر بۆ هەڵخەتاندنی قوتابیان بوو، بەڵام هەرقورس نەبوو، ئەوەی چوارەمیش هەروەك هی سێیەم وابوو، واتا پرسیاری سێیەم و چوارەم لە ئاستێکی بەرزدا بوون، پرسیارەکانی سەرەوە کۆتاییان پێهات، تەنها دوو پرسیارە ئیختیارییەکەم مابوو سەیری کاتژمێرەکەم کرد هێشتا کاتژێرێکمان (سەعاتێکمان)ماوە، وتم ئەو ماوەی ماوەتەوە یەکێك لە پرسیارە ئیختیارییەکان وەڵام دەدەمەوە، بەڵام کامیان؟! بەڕاستی زۆرگران بوون لەئاست زانیاری منەوە زۆر بەرزتربوون. زۆر بیرم لێکردنەوەو زۆریان پێوە ماندوو بووم، دوای تەماشام کرد بیست دەقیقەی ماوە بڕیارمدا وازیان لێبهێنم، چونکە تازە مەحاڵە بگەمە ئەنجامەکانیان ئەمە لەلایەك‌و لەلایەکی تریشەوە خۆ لە نمرەکانی دوایش ناژمێررێن. هەڵسام کاغەزی وەڵامدانەوەکانم دایە دەست مامۆستاکە، سەیرم کرلە هۆڵی تاقیکردنەوەکەدا تەنها حەوت خوێندکار لە دەوروپشتم ماوە. دوای دوو رۆژ مامۆستا (یتشن)، مامۆستا بیرکاری هاتە پۆلەکەمان، چووە جێگاکەی خۆی، پێدەکەنی وا دیار بوو خۆشحاڵ بوو بەو ئەنجامانەی، کە خوێندکاران لە تاقیکردنەوەکەدا وە دەستیان هێنابوو. دەستی بە باسەکەی کرد، پێشەکی وتی: پیرۆزباییتان لێ دەکەم.

دوایی وتی: زۆربەتان وەڵامەکانتان ڕاستە.. کەستان نەکەوتووەوە حەوتتان گەیشتوونەتە وەڵامی ڕاستو تەواو.

هەمووومان پێکەنین، هەواڵێکی خۆشبوو بۆ هەموومان هەریەکەی پیرۆزبایی لەوەی دییان دەکرد جا نیشانەی بۆ کردین، کە بێدەنگ بین، لە سەر قسەکانی بەردەوام بوو.... (دوو پرسیاری ئیختیاری تێدا بوو هەتا رادەیەك قورس بوون، بڕوامان وابوو زۆربەتان تیایدا دەرنەچنو نەگەن بە وەڵامی ڕاست، بەڵام شەش خوێندکار گەیشتوونەتە وەڵامی نزیك لە ڕاستییەکەی تەنها یەکێك نەبێ هەموو پرسیارەکانی بەڕاستو رەوانی وەڵام داوەتەوە هەتا پرسیارە ئیختیارییەکانیشی بەڕاستی وەڵام داوەتەوە..)). هەرکە وای وت لە پۆلەکەدا بوو بە هەرا، خوێندکاران زیاتر ڕۆشناییان خستە سەرباسەکە بۆ ئەوەی ئەنجامەکانی خۆیانیان بۆ دەرکەوێ. وا دیاربوو ((یتشن)) چاوەڕێی کەمبوونەوەی هەرایەکەی دەکرد، دوایی بە دەنگێکی بەرز وتی: ((بەڕاستی زۆر دڵخۆشم، کە یەکێکتان هەموو پرسیارەکانی وەڵامداوەتەوەو نمرەی تەواویشی لێ وەدەست هێناوە) بوو بە چپەچپی خوێندکاران و هەریەکە لەوەی دی دەپرسی دەبێ کێ بێ؟ یەکێك لە خوێندکارەکان بە دەنگێکی زۆر بەرز بەشێوەیەك لە ژوورەکە دەنگی دایەوە پرسی: ((کێیە مامۆستا؟)) مامۆستا وتی: ((زیانغ کای؟))ە.
هەموومان بێدەنگ بووینو تەماشای (زیانغ کای)مان کرد، ڕەنگی سوور هەڵگەڕا بوو، لە شەرما سەری خۆی شۆڕ کردبووەوە : نێوچەوانی ئارەقەی کرد بوو، دوایی بێ ئەوەی ئاگای لەخۆ بمێنێ بەلادا هاتو کەوت. ئێستا (زیانغ کای)م هاتۆتەوە یاد، کە چۆن هەموو بەیانییەك بەتەنها لە پۆلەکە دادەنیشتو زۆر بە وردییەوە دەیڕوانییە کتێبەکانی یان بە تەنیا لە ژێرداربییەکانی سەر دەریا دادەنیشتو خۆی بەنووسینەوە خەریك دەکرد، ئێستا وا دەزانم لەبەر چی ئەو کوڕە لاوازە، لەسەرخۆیە، لە تاقیکردنەوەی بیرکاری هەموو پرسیارەکانی بەڕاستی وەڵامدا بووەوە. لە پڕ هەستم بە ڕێزلێنانێکی زۆر کرد بۆی، لەوانەیە ئەویش وەك من لە خێزانێکی رۆشنبیرەوە هاتبێ. چاکەتێکی شینی کاڵی لەبەرابوو هیچ رەنگی پێوە نەمابوو، بەڵام ئەمە شتێکی ئەو تۆ نەبوو، چونکە گەنجەکان لەم ڕۆژانە زۆر بایەخ بەجلو بەرگ نادەن.
دوای چەند رۆژێك گەڕامەوە ماڵ، باوکم بینی، دەستەگوڵێکی پێ بوو بەپەلە بەرەو رووی چووم، دەستە گوڵەکەم لێوەرگرت، وتی :



(رونغ وەرە لەگەڵما)، دوایی چووە دەرەوە دەستەیەکی دی بێنێ. دەستە گوڵەکەم لەسەر ڕۆخی پەنجەرەکە دانا، کاتێ ڕووم وەرچەخاند بچمە دەرەوە تەماشام کرد کۆمەڵێ کتێبی بەرگ شین لەسەر مێزەکە دانرابوون. سەیرم کرد کتێبەکانی زانکۆن ئەوەی سەرەوەیانم هەڵگرت و چاوێکم پێداخشان، باوکم هاتەوە ژوورەوە هەر کەبینی وا کتێبەکان دەخوێنمەوە هاتە لام وەستاو هێندێ قسەی بۆ کردم تا زیاتر هانم بدا، بۆیە وتی : ((بەردەوام بە لە خوێندنەوەیان، ئەو شتانەی تیایەتی بەچاکی وەریان بگرە، چونکە ئەمانە کتێبەکانی زانکۆن پێش دوو مانگ لەمەوبەر داوام کردبوو لە دەرەوە بۆیان هێنام، جا کاتێ خوێندتەوە ئەوکاتە تێدەگەی، کە خوێندکارەکانمان لەچاو خوێندکارانی بێگانە چەندە دواکەوتووترن.) ئای سەیرە! ئەی ئەو پرسیارە نەبوو کە لە تاقیکردنەوەی بیرکاری هاتبوو؟! (یەك بەخۆم هاوارم کرد وەکو بڵێی کیشوەرێکی ترم دۆزیبێتەوە) ئاهێکی هەڵکیشاو بە شەرمەوە کتێبەکەی داخست وتی: (نەء)، دوای نەختێ بێدەنگی ئەمجا وتی: (پێویستە هەولێکی ئیجگار زۆربدەیت! خۆشترین قسە چییە! گرنگترین کارێك چییە! ئەم ڕۆمایە بەرۆژێك دروست نەکراوە، هەروەها ناتوانین شەوێك تا دەمەوە بەیان گشت ئارەزووەکانمان بەدەست بێنین.) باشە تۆ ئاستی من باش دەزانی من ناتوانم لەگەڵ قوتابییە بێگانەکان قسەبکەم، چۆن لەگەڵ ئەوان بەراوردم دەکەیت. (بەخێریی چوومە دەرەوە قاپێ خواردن بێنم، باوکم لای پەنجەرەکە وەستابوو بەنێونیگایەك سەیرێکی کردم، بەڵام هەرچاوەکانی لای من بوو نەك بەخەیاڵ...جگەرەکەش وردە وردە لەنێوان پەنجەکانیا دەبوو بە سوتوو، دووبارە وتی: کاتێ بیر لە ژیانی ڕابردووت بکەیتەوە هیچ سوودێك نابینی (دوایی بە دەنگێکی قووڵەوە وتی: (ئەی گەلی لاوان ئێستا کێشەکە لەوەدایە ئێمە چۆن بتوانین ئەو کاتەی ڕۆیشتووە ئەوەی لە کیسمان چووە بخەینەوە دەست). قسەکانی خستمیە بیرکردنەوەیەکی قوڵ یەکسەر بیرم بۆ لای زیانغ کای هەڵفڕی، کە یەکێکە لە نەوەی نوێمان ئەی وا نییە؟)). بۆ پرسیارەکانی لە بیرم گەڕام، بەڵام هیچ وەڵامێکم نەدۆزییەوە. باوکم وتی: ((باشە دوایی لەم بارەیەوە قسەی لێ دەکەین)). لە پڕ سەری باسەکەی گۆڕی و وتی رونغ هەندێ هاوڕێ دێنە میوانیمان دەتوانی بۆ سبەی بەیانی هەندێ خواردنمان بۆ بکڕی.

(ئارەزوو دەکەن دووبارە چێشتتان بۆ لێ بنێم؟) وادیار بوو رازی نەبوو، بیانووی پێ دەگرتم، وتم : (بۆ؟ ئەو چێشتەی پێشان لێم دەنا چۆن بوو ؟)، سەیرێکی کرم و وتی: ((ئەمجارەیان تۆ چێشتەکە لێمەنێ، تەنها ئیشەکان ڕێکبخە، یارمەتی چێشت لێنەرەکە بدە،

بەڵام کاتێ میوانەکان هاتن زۆر بە جوانی چێشتەکە ئامادە بکەن)). ((چێشت لێنەر))و میوان هانم بدەن بۆئیش کردن ! بێگومان شتی وەها ناشێ، چۆن ((یتشن))یش لەگەڵ زانا بەناوبانگەکانی بیرکاری دێتە میوانیمان؟!

بەیانی زوو چوومە بازاڕ، زەمبیلەیەکی پڕ لە میوەو گۆشتی مریشك و پارچەیەکی گەورەی گۆشتی بەرازم هێنایەوە. هەرکە بە ژوورکەوتم زمانم گیرا، هیچ قسەم بۆ نەکرا، چونکە میوانەکانم مامۆستایە بەناوبانگەکانی بیرکاری نەبوون و هەروەها کەسایەتییە میللییەکانیش نەبوون، بەڵکو حەوت قوتابی هاوڕێ و هاوپۆلم بوون کە لە بیرکاری نمرەی بەرزیان وەدەست هێنابوو. بێگومان (زیانغ کای)یش یەکێك بوو لەوان. گوێم لە دەنگی باوکم بوو قسەی بۆ دەکردن، منیش چوومە ژووری دانیشتن وتم ((هەرگیز بڕوام نەدەکرد ئێوە لێرە ببینم)) یەکێکیان بە گاڵتەیەکەوە وتی: ((ئێستا مەبەستتە بچینە دەرەوە)). وتم: هەروەکو باوکم ئاگاداری کردبوومەوە، کە چێشت لێنەرێکی سەیر دێت بۆ میوانیمان !

((- چی؟ چێشت لێنەرێك دێت چێشتەکەمان بۆئامادە دەکات ؟)). هەواڵەکەی من بە ئەوان هەرگیز نەدەگونجا، لەبەر ئەوە یەکێکیان هەڵسایەوە ڕووی لە باوکم کردو وتی:) ئەی مامۆستای بەڕێزمان ئەوە...) بەڵام پێش ئەوەی قسەکانی تەواو بکات باوکم بەخێرایی قسەکانی پێ بڕی و وتی:) فەرموو دانیشە(. دوایی جگەرەکەی کوژاندەوە دەستی بەقسەکانی کرد: وەکو پێم وتن پێش ئەوەی پیرۆزباییتان لێبکەم لەوەی، کە لەبیرکاریدا زۆرباش بوون، بەڕاستی پرسیارەکانی تاقیکردنەوە زۆر قورس بوون، ئەوەتا لەم کتێبانەی زانکۆن، ئەمەی وت و پەنجەی بۆ کتێبەکانی سەر مێزەکە درێژکرد، سەیرمان کرد (زیانغ کای) وا زۆر بەپەرۆشەوە دەیان خوێنێتەوە. (دوو پرسیارە ئیختیارییەکەش بەئەنقەست هێنابوومانەوە هەرچەندە هەندێ لەمامۆستایان ڕازی نەبوو لە هێنانەوەی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەنجامەکانتان هەتا ئێستاش جێگای سەرسووڕمانە هەتاوەکو سەرۆکی بەش‌و لایەنە لێپرسراوەکانیش زۆر بایەخیان بەم لایەنە داوە: ئێمەش وا لێرەدا بەم بۆنەیەوە ئاهەنگێکی بچووك ساز دەکەین‌و داوا لە زیانغ کای چێشتلێنەریش دەکەین چێشتەکەمان بۆ ئامادە بکات. باوکم ئەمەی وت و پەنجەی بۆ لای زیانغ کای درێژکرد، کەتا ئەو کات  لە خوێندنەوەی کتێبەکان بەردەوام بوو. وتم: ((ئەوە؟)) ئەلبەتە هەر دەبێ گاڵتەبێ، چایەکم بۆ باوکم تێکردو پێم وت ((بێگومان گاڵتە دەکەی))! نەخێر رۆنغ گاڵتە نییە گوێم لێ بگرە با ئاگاداری شتێکت بکەمەوە، زیانغ کای پێش ئەوەی



بێتە زانکۆ چێشتلێنەر بووە لە یەکێ لەچێشتخانەکان،  وەکو گوێشم لێبووە چێشتلێنەرێکی ئازابووە، سەیری (زیانغ کای)م کرد خۆ ئەمە تاکو ئێستا هەروا کتێبەکان دەخوێنێتەوە بێ ئەوەی وا دەرخا لە دەوروپشتی چ باسە، هەڵسام بەرەو ڕووی چووم کتێبەکەم لەدەستی راستاندو بەروانکەیەکی سپیم دایە دەستی‌و لەپێشیدا چەمامەوە پێم وت ((فەرموو کاك زیانغ کای ئێستاش نۆرەی تۆیە)). هەموویان دایانە قاقای پێکەنین، بەڵام زیانغ کای وا دیاربوو شەرمی کرد لەبەر ئەوەی لە خوێندنەوەی کتێبەکەمان کرد، بەتایبەتی ئەو کاتە زۆر بە وردی سەرنجی لێ دەدا ناچار هەڵسایەوەو بەروانکەکەی لە کەمەری توند کرد ئینجا لەگەڵی چوومە ژووری چێشتلێنان. دوایی بەپێی ئامۆژگاری و سەرپەرشتیکردنی زیانغ کای ماڵم پاك کردەوەو پیازو قاڵچکو قاڵەکەییم شۆردەوە، بەڵام زیانغ کای بەخۆی ماسییەکەو گۆشت بەرازەکەی پارچە پارچەکرد، دەنگی قاپ و قاچاغ و شوڕەی ئاوی دەست شۆرەکە لە ژووری چێشت لێنان بەرز بووەوە. دواتر سەوزەواتەکەشم پاك کردەوە، لێم پرسی ئەگەر شتێکی تر ماوە تا بیکەم. (باشە چۆن خیارەکە پاك بکەم، پارچە پارچەی بچووك بێت یان درێژ ؟). وتی: (تکایە لەسەر شێوەی سێ گۆشە بێت).

- چی؟ لە سەر شێوەی سێگۆشە؟! بەداخەوە نازانم، چۆن وا پاك دەکرێ؟.خیارەکەی لێ وەرگرتم‌و فێری کردم، کە چۆنی پاك بکەم.  بەڕاستی لە هەموو شتێکدا زیرەکە هیچم بۆ نەکرا تەنها پرسیاری لێبکەم :

- بەڕاستی ئیشی چێشتلێنەریت کردووە؟.

- (بەڵێ دوای ئەوەی قوتابخانەی ناوەندیم بەجێ هێشت بێ گومان خۆت دەزانی ئەم رۆژانە چۆن بوون).

- (کەواتە تۆ لەوکاتە لە لادێ کارت دەکرد، وا نییە؟) سەرێکی بۆ لەقاندم، بەڵام هیچ وەڵامم نەبیست. دوایی لێی نزیك بوومەوە بەدەنگێکی بەرزو ناڕێك لێم پرسی:

- (باوکت چ کارەیە؟). سەری بەرزکردەوە و سەیرێکی کردم وتی: باوکم شوفێری لۆری بوو، دایکیشم خەریکی ژنی ماڵەوە بوو، بەڵام مردن بە زۆریی بۆ خۆی بردییەوە، دوایی ئەوە بە ماوەیەکی کەم باوکیشم کۆچی دوایی کرد، جا لای خوشکە گەورەکەم مامەوە، پەروەردەی کردم وشەونخونی بەدیارمەوەکێشا، لەسەرەتادا زۆر دەترسام بیرێکی غەمگین و ناخۆشم

بەخەیاڵدا دەهات، بەڵام دوایی هێزم داوە بەرخۆم بۆ ئەوەی زیاتر شارەزای ژیان ببم، لێیپم پرسی:

- کەواتە تۆ بێجگە لەخوشکت کەسی ترت نییە؟.

- بەڵێ ئەویش کرێکارە لە کارگەی چنین و سێ منداڵی هەیە.

- باشە بۆوا خۆت ماندوو دەکەیتو هەوڵ و کۆششی زۆر دەدەیت لە ئیش کردن، لە خوێندن...؟.

- ((لەوانەیە هەر بەهۆی ئەو ئاگرە داگیرساوەبێت)) ئەمەی وتو سەری غازەکەی بە دەنکە شقارتەیەك داگیرساند، گڕێگی شینی لێ هەڵسا ((بێگومان ئەو ئاگرە نا، بەڵکو ئەو ئاگرەی کۆمەڵێ قوتابی تەمبەڵ و نەزان لە قوتابخانە دایان گیرساند، کە لەلایەن کۆنەپەرستو بەکرێ گیراوەکانەوە هاندرابوون بۆ ئەم مەبەستە، دروشمەکەیان بەرزکردبووەوە و تیایدا نووسیبوویان : ((چەند زانیاریت زیاد بێت ئەوندە زیاتر دواکەوتوویت)). هەر چۆنێك بێت ئەو ئاگرە گڕێکی گەورەی بەردایە دەروونم، لەبەرئەوە بڕیارمدا هەرچەند بتوانم هەوڵ دەدەم لە بییکردنەوە، لەخوێندن، لەکارو سوود لەهەموو دەقیقەیەکی ڕابردوو وداهاتووم وەرگرم. وتم :

- بۆچی بیرکاریت وەها خۆش دەوێت، کارت تێ دەکات ؟. کەمێ ئاوی لە مەنجەڵی سەر ئاگرەکە کرد، ڕۆنەکەی ناوی‌و ماددەکە تێکەڵ بەیەك بوون، بووە قرچە قرچ، ئەمجا، وتی((من هەر لەمنداڵییەوە بیرکاریم خۆشدەوێت دووایش وەکو خۆت دەزانی لەخوێندنەوەی بیرکاریدا مرۆڤ پێویستی بە هیچ شتێك نابێ، تەنها قەڵەمێکی ڕەساس‌و چەند پەڕەیەك وە ئەگەر ئەمەشی دەست نەکەوت دەتوانێ بەدار لەسەر زەوی بنووسێ، من خۆم وامکردووە. بەئاهێکەوە وتم: ((من زۆر سەرم لە تۆ سووڕماوە زیانغ کای دوایی دەستم بۆ درێژ کرد، پێم وت: ((دەمەوی ببمە قوتابی تۆ)). وتی : ((چۆن؟! دەتەوێ ببیتە چێشت لێنەرێکی چاك؟)).

- ((ئاه، نەء دەمەوێ بیرکاریم فێرکەیت)). دوای ئەوەی نەختی بێدەنگ بوو ئەمجا وتی:

- ((بەڵام تۆ، بۆ لەباوکت ناپرسی، بەڕاستی شایەنی پرسیارکردنە)).

- بەڵام خۆت دەزانی مامۆستای زانکۆیە و هەموو کاتێك سەرقاڵی کاروباری زانکۆیە، کاتێکی ئەوتۆی نیە تا لەگەڵمدا بەمێنێتەوەو بۆم باس بکات، دوایش حەز دەکەم لەسەر دەستی تۆوە فێرببم.



ئەمجارەیان ئەو دەستی بۆ لام درێژکرد و وتی: ((دەی، باشە)). بەڕاستی باوکم ئاگاداری هەموو شتێکی شاراوەیە، پێشتر ئاگاداری کردمەوە، کە چێشتلێنان هیچ سوودێك نادا بۆ من، بۆیە هانی دام بۆ خوێندنەکەم، هەموو توانایەکمی تێدا خەرج بکەم. بوومە قوتابی زیانغ کای، زۆر بەدڵسۆزییەوە بۆی باس دەکردم و تێی دەگەیاندم بەبێ وەستان، بەبێ پشوو، هەرگیز داوای لێ نەدەکردم بگەڕێتەوە بۆ ماڵ تاوەکو هەموو ئەو پرسیارانەی داوای لێ کردبووم شیکاریان بکەم کۆتایی نەهاتبایە، کاتێ شتێکیشم نە دەزانی پەست دەبوو، هەرگیز پەلەی لە وەڵامدانەوەکانم نە دەکرد، ئەگەر زۆریشی بخایاندبایە، کاتێکیش بیزانیایە هەر نایزانم، ئەمجا بۆ خۆی خاڵە بنچینەییەکانی بۆ روون دەکردمەوە تاوەکو بە خۆم ئەنجامەکانی دەربێنم، بەڵام چی، مێشکم پڕ دەبوو، گێژ دەبووم، هیچم بۆ نەدەکرا، تەنها بنووسم ((ئەو پرسیارە وەڵامی نییە)) جا کەوام دەنووسی پەرەکەی لێ فڕێ دەدام و سەرێکی بۆ دەلەقاند، بە سەیر کردنێکی ساردی ماندووییەوە سەیری دەکردم ئینجا خۆی یارمەتی دەدام لە شیکارکردنی. ئەو جارانە خۆم وەك منالێك دەهاتە بەرچاو، کە سووچێکی قەڵەمەکەم گرتووە وا بەشداری لە شیکارکردنی ئەو پرسیارە قورسەدا دەکەم. کاتێکیش سەیری بکردایە وادەتوانم هەندێك لە پرسیارەکان شیکار بکەم، زیاتر هانی دەدام، بەڵام لە پڕێکەوە، کە ئاگاداری کاتەکە دەبووەوە و دەیزانی دواکەوتووە لە گەڕانەوەی بۆ ماڵ لێم نزیك دەبووەوەو بە زەردەخەنەیێکەوە بەجێی دەهێشتم دەڕۆیشت. جاری وا هەبوو سەعاتێك زیاتر خەریکی پرسیارێك دەبووم دوایی لە پڕێکدا دەگەیشتمە ئەنجامەکەی، بەشانازی‌و سەربەرزییەوە دەیڕوانییە شیکارەکەم‌و دەیوت ((وا مەزانە هەر تۆ دەتوانی شیکاری بکەی)) دوایی، کە دەیزانی زۆر ماندووبوومەو سەیرێکی کاغەزەکەی دەکرد زەردەخەنەیێکی گەرم ڕووی دادەگرت، ئەمجا ڕێگایەکی باشتری دەدۆزییەوە وبۆی باس دەکردم‌و بەچاکی تێی دەگەیاندم دوایی لەسەر منیشەوە دەیچەسپاند دەبووایە منیش بەهەمان ڕێگا شیکاریان بکەم، جا نازانم، نە بە هۆی ئەو ئارەزووەوە بوو، کە بەدەست شیکارکردنی پرسیارەکەوە دەمبینی نە بە هۆی خۆشییەوە بوو، کە توانیم شیکاری بکەم بە نەرمییەکەوە دەمگوت : (( بەخوا تۆ هەموو شتێ دەزانی !))

تا پاییز بوومە یەکێ لە خوێندکارە زیرەکەکانی پۆلەکەمان. ڕۆژێك کزە بایەکی فێنکی دەهات، زەویش بەگەڵا زەردە وەریوەکانەوە داپۆشرابوو، چاکەتێکم لەبەرابوو زۆر هەستم بە گەرمی دەکرد، بەڵام زیانغ کای هەروەکو جاران چاکەتە شینە کاڵەکەی لە بەرابوو، کە

ماوەیەکی زۆری بەسەردا تێپەری بوو. کاتێ زستان هات بە قاپوتێکی خوری گرانبەها خۆم دادەپۆشت، بەڵام زیانغ کای هەروەك جاران بە چاکەتە شینە کاڵەکەیەوە بەو ساردوسەرمایە بە تەنیا لەپۆلەکە دادەنیشت و دەیخوێند. هەستم بە دڵ گوشران وسۆز دەکرد بۆی، نەمدەزانی چۆن یارمەتی بدەم یان لانی کەم لەم بارەیەوە قسەیەکی لەگەڵ بکەم، بەڵام ئەو رێگەی نەدەدام بە درێژایی رۆژ لەیەك شت دەدواین ئەویش بیرکاری بوو. رۆژێك لە گەڕانەوەمان بۆ بەشی ناوخۆیی بەدەم رێگاوە قسەمان دەکرد، لەوانەیە بۆ جاری دووەم بێت بێجگە لە بیرکاری: باسی شتێکی ترمان کرد بێت، دەمزانی، کاتی خۆی ئەو کرێیەی لە ئیشکردنی لە چێشتخانە دەستی دەکەوت دەیدا خوشکەکەی بۆ ئەوەی ژیانی خوشکەکەیو منداڵەکانی پێ دابین بکات، بەڵام ئێستا خوشکەکەی یارمەتی ئەو دەدات، لەگەڵ ئەوەش ئەوەی لە خوشکەکەی و زانکۆ وەریدەگرێ پارەیەکی زۆر کەمە، بۆ پڕکردنەوەی پێویستییە گشتییەکان نەبێ بەشی هیچی تری ناکات،بەڵام ئەو زۆری پێ ڕازییە، هەتا جارێکیان پێی وتم:

((من زۆر رازیم و داوای لەوە زیاتر ناکەم و نامەوێ قەرزاری خوشکم یان هیچ کەسێکی تربم))، کاتێ گوێم لێ بوو کە وای وت ئاهێکی بەسۆزم بۆ هەڵکێشا و پێم وت:

((- وا دیارە خوشکەکەت زۆر خۆش دەوێت ؟)).

((- بێگومان هەموو شتێکە لە لام))

نەختێك بێدەنگ بوو دوایی وتی:

((- ئاه، نەء)) بەردەوام بوو لە قسەکانی بە بێبیرکردنەوە، وتی: ((نەء تەنها ئەو نا، هەندێ هاوڕێم هەیە خۆشم دەوێن، وەك خۆشەویستی برا بۆ برا خوشك بۆ خوشك)).

دەریا چەند هەنگاوێك لێمانەوە دوور بوو، وەك ئاوێنەیەکی ڕوونی پرشنگدار وێنەی ئەم ئاسمانە بێگەردەی دەنواند. لە پڕێکا بە هەموو ئازاییەکمەوە لێم پرسی:

((- هیچ هاوکێشەیەك  هەیە بۆ خۆشەویستی ؟))

((- چی؟ هاوکێشە بۆ خۆشەویستی؟))، پرسیارەکەمی دووبارە کردەوەو هەمدیسان دووبارەی کردەوە، وەك ئاوێکی مەنگی لێهات، پێش ئەوەی بە دڵنیایی و ڕاست و ڕەوانییەوە وەڵامم بداتەوە کەمێك بیری کردەوە جا وتی:

((- ئەگەر هاوکێشەیێك هەبێ بۆ خۆشەویستی بێگومان هەردەبێ وابێ   ١ + ١ = ١)).

بەسەر سوڕمانەوە وتم :((مانای چییە؟))



((-  شتەکە زۆر ئاسانە  ١ + ١ ئەوە دوو خۆشەویستەکەن کە یەکسانە بە(١)، ئەو یەکەی، کە منالێکی نموونەیی دەبێت لە نێوانیاندا دروست دەبێت. کەواتە بەهەردووکیان یەکیان بەرهەم هێنا.)). بەسەیرکردنێکی بە ماناوە سەیری کردم. ئەوشتەی کە وتی بیرم لێ کردەوە، جا پیرۆزباییم لێ کرد بەڕاستی قسەکانی گەرماییەکی زۆریان بەدڵم بەخشی. لە پڕێکا رووی تێکردم بە منگەمنگەوە وتی: ((شتێك هەیە دەتوانم داوات لێبکەم ؟)). مووچڕکێکم بە دڵداهات، بەجارێ شێوام، هەرچەندە خۆ بەهێمنییەکەوە وتم: ((فەرموو)).

((- دەتوانی ئەو کتێبانەم بۆ بێنی، کە باوکت ماوەییێك لەمەوە پێش لە دەرەوە بۆی هاتبوو؟ هەندێکیشم لە ماڵەکەتان لێخوێندەوە)). دوایی لە قسەکانی بەردەوام بوو : ((وەکو دەزانی تەنها دوو کۆمەڵە لەم جۆرە کتێبانە هەیە، یەکێکیان لای باوکتەو ئەوەی دییان لە کتێبخانەی زانکۆیە، هەتا ئێستا چەند جار چوومەتە لای چاودێری کتێبخانە، کە یەکێ لەو کتیبانەم بداتێ، بەڵام سوودی نەبوو)).

((-  باشە لێرە چاوەڕێم بکە))، بەخێرایی چوومەوە ماڵەوە لە کتێبەکان گەڕام، تەماشام کرد لە نێو جانتایەکدا دانراون، هەڵمگرتنو پارچە کاغەزێکیشم هێناو نووسیم ((زۆر بەداخەوە، کاتێکی ئەو تۆم نییە، کە چاکەتێکی خوریت بۆ بچنم لە سەرما بتپارێزێ، ئەوە هێندێ پارەم بۆ داناوی، هیوام وایە چاکەتێکی باشی بۆ خۆت پێ بکڕی)). پارەو پارچە کاغەزەکەم خستە نێو بەرگی یەکێ لە کتێبەکان و گەڕامەوە لای، تەماشام کرد لە هەمان جێگا وەستاوە، کە تیایدا جێم هێشتبوو، کتێبەکانم دایە دەستی، هەر ئەو کاتە خەریك بوو بەشی یەکەمی بخوێنێتەوە:

((- بۆ وا بەپەلە، کە گەڕایتەوە ژوورەکەی خۆت بە ئارەزووی خۆت بیخوێنەوە)). ئەمەم وت و دەستم بۆ درێژکرد خوا حافیزم لەگەڵ کردو زۆر بەخێراییەوە لەچاو ون بوو. ئێستاو ئەو کاتەش ئەو شتەی من چاوەڕێ بووم، کە وەڵامێکم بداتەوە یان هەر بەلایەنی کەمەوە بەرپەرچی کارەکەم بداتەوە، ئەو شتە ڕووی نەداو نەدا. هەروەکو جاران کۆنە چاکەتە کاڵەکەی دەکردە بەری بێئەوەی زۆر یان کەم باسی پارەو کاغەزەکە بکات. ئێوارە هەروەکو جاران بە کڕو بێ دەنگی بە رێگادا دەڕۆیشتین، سەرم شۆڕکردبووەوە هەر وەکو بڵێی هیچ لەم بارەیەوە نازانم. لە پۆل دانیشتبووم بەپرسیارێکەوە خەریك بووم، بێ ئەوەی ئاگاداری دەورو پشتم بم چ باسە لەناکاو گوێم لەدەنگی مامۆستا بوو بانگی کردم و داوای لێ کردم بەخێرایی بگەڕێمەوە بۆ

ماڵ، باوکم زۆر بە پەلەیەو چاوەڕێم دەکا. بەخێرایی گەڕامەوە بۆ ماڵ سەیرم کرد دەرگاکە لەسەر گازەرەی پشتەو ناو ماڵەکەش هەموو بە کتێبو کاغەز داپۆشراوە. هەر پێم نایە ژوورەوە بەپەلە پرسیاری کرد: ((کوا کتێبەکانی ناو ئەم جانتایە، لە کوێن؟))

((- کامە کتێب؟))

((- کتێبەکانی بیرکاری، لەگەڵ خۆم دەیانبەم بۆ ئەو کۆنگرەی لە پەکین دەربارەی ڕێبازی خوێندن دەبەسترێ)).

((- ئای ئەوان !)) شێوام قسەم بۆ نەکرا ((من...)).

((- لە کوێن ؟)).

((- لە پۆل جێم هێشتوون)) بۆ یەکەمجار درۆم لەگەڵ کرد، بێ ئەوەی تێ بگەم مەسەلە چییە. بە گومانەوە وتی:

((- دە باشە هەر ئێستا بە خێرایی بڕۆ بۆمی بێنەوە، لە هەموو زانکۆکەدا تەنها دوو کۆمەڵە لەم کتێبانە هەیە، یەکێکیان لای منە و ئەوەی تریان لە کتێبخانەی زانکۆیە)).

بە خێرایی چوومە دەرەوە هەتا گەیشتمە پۆل زۆر ماندووبووم، چوومە ژوورەوە سەیرم کرد زیانغ کای هەروەکو جاران خۆی بە کتێبەکانی باوکمەوە خەریك کرد بوو زۆر شەرمم کرد، نەمزانی چون پێی بڵێم، دوایی بەشەرمەوە وتم:

((- زۆر بە داخەوەم، کە داوای کتێبەکانت لێ دەکەمەوە، هەر ئێستا بۆم بێنەوە)). بە شێواوی و سەرسوڕماوییەوە وتی: ((بۆچی؟)).

((- باوکم دەڕوا بۆ ئامادەبوون لەو کۆنگرەیەی لە پەکین دەبەسترێت دەربارەی بڕیاردراوەکانی زانکۆ جا ئەو کتێبانەش لەگەڵ خۆی دەبات بۆ ئەوەی بیکاتە بەڵگە بۆ خستنە ڕووی ئاراکانییەوە.)). زۆر ڕەخنەی لێ گرتم، لەبەر ئەوەی ئاگادارم نەکردبووەوە، کە ئێستا لێی وەردەگرمەوە.

((-باشە)). کتێبەکەی داخست و دایەوە دەستم، منیش بە خەمگینییەوە پێم وت : ((نائومێد مەبە، دوای ئەوەی باوکم لە پەکین گەڕایەوە دووبارە بۆت دێنمەوە)). دوایی ڕووم وەرچەرخاند بڕۆم بە دڵنیاییەوە وتی:

((- چاوەڕێم بکە، منیش دێم لەگەڵتا، بۆ ئەوەی داوای لێ بووردن لە باوکت بکەم، بە ڕاستی سەرزەنشتەکە کەوتۆتە سەر من)). ویستم لەگەڵم نەیێت، بەڵام ڕازی نەبوو،



هەرهات. کاتێ گەیشتینە ماڵ داوام لێ کرد لە بەردەم قاپییەکە چاوەڕێم بکا، کە وە ژوور کەوتم باوکم لە ژوورەکە دەهات و دەچوو، بە پەرۆشەوە چاوەڕێی منی دەکرد. هەر کە چاوی پێم کەوت بێ ئەوەی بهێڵێ هیچ بڵێم، یەکسەر کتێبەکانی لە دەست سەندم (زیانغ کای) یش لە دوامەوە وەستابوو بە باوکمی وت :

((- پرۆفیسۆر تشاو زۆر بە داخەوەم، ئەمەش هەڵەی من بوو. نەك هەڵەی رۆنغ)).

((- چی؟)). باوکم لەو کاتەدا زۆر سەری سووڕما، کە چاوی بە زیانغ کای کەوت، وتی :

((- کەواتە زیانغ کای کتێبەکان لای تۆ بوون ؟))

((- بەڵێ)).

((- بەچاکی خوێندتەوە؟)).

((- تا ڕادەیەك)).

((- زۆرباشە، فەرموو دانیشە)). پارچە کاغەزێکی دەرهێناو هێندی شتی نووسی، جا کتوپڕ هەڵسا و وتی:

((- راسپاردەیەکم بۆ چاودێری کتێبخانەکە نووسیووە بۆ ئەوەی بتوانی ئەو کۆمەڵەیەی دی، کە لەوێیە وەریبگری)). دوایی وتی ((- بەڵام نەءوا ئاسانترە من خۆم وەریبگرم، ها ئەو کتێبانەت با لابێ، من کۆمەڵەکەی دیان وەردەگرم)).

((- ئای..نەخێر)).

((- لەوانەیە تۆ لەمن زیاتر پێویستت پێی بێت، من ئێستا وا دەڕۆم کۆمەڵەکەی تریان وەردەگرم)).، کە کتێبەکانی دایەوە دەست زیانغ کای، لە پڕێکا پارچە کاغەزەکەو پارەکان کەوتنە خوارەوە، کە لە نێوان لاپەڕەکانی یەکێ لە کتێبەکانی دامنابوون. دەمو چاوم سوور هەڵگەڕا، لە ناخەوە هەستم بە شەرمێکی زۆرکرد، ئەو بێ ئەقڵییەی، خۆ هەتاکو ئێستاش من لە یادم نەبوو. باوکم پارەکانو پارچە کاغەزەکەی لەمەوپێش تێبینییەکانم بۆ زیانغ کای تیا نووسیبوو هەڵگرتەوەو خوێندیەوە، سەیرێکی کردم و ڕووی لە زیانغ کای کردەوەو لێی — پرسی:

((- کەواتە تۆ تەنها بەرگی یەکەمت خوێندۆتەوە؟ سەیری بەرگەکانی ترت نەکردووە؟)).

((- نەخێر وام نەکردووە، بۆ هەڵەیێکم کردووە؟)).

((- بێگومان نە، بەڵام ئەمە بۆ تۆیە لەوانەیە چاوت پێ نەکەوتبێ)) ئەمەی گوت‌و پارەکان و پارچە کاغەزەکەی خستەوە نێو کتێبەکان.

((- زیانغ کای ئەو شتەی دەمەوێ نازانم چۆنی دەربڕم، گوێم لێ بگرە زیانغ کای، لە بارەی ڕاستی و کرداری چاکەوەش کتێب بخوێنەوە، هەر یەکەی کاریگەری خۆی هەیە، پێویستە کاتێکی زۆرتر بۆ ژیان تەرخان بکەی لەوەی بۆ کتێب تەرخانی دەکەی)). زۆر بەشەرمەوە هەڵسام بە نەرمە راکردنێك چوومەوە ژوورەکەم، ئیدی نازانم ئەوان چەند مانەوەو کەی زیانغ کای ڕۆیشتبوو. پاش ڕۆیشتنی زیانغ کای باوکم هاتە ژوورەکەمەوە، لە شەرمانا سەرم خزاندبووە سەرینەکەمەوە. پێی نەوتم، کە چی پێی وتبوو، هەر ئەوەندە وتی: ((- ئەی کچی جرپن))، کە چووە دەرەوە هەڵسامەوە دانیشتم باشە خۆ من بەخۆشم نازانم چیم کرد. دوای کەمێك باوکم گەڕایەوە ژوورەکەم دەستێ جلی بەدەستەوە بوو، وتی :

((- ئەم دەستە جلە بدە بە زیانغ کای، دەزانم ژیانی زۆر ناخۆش‌و گرانە، بەڵام بەڕاستی دەبووایە من زووتر بیرم لەمەبکردایەوە...)). بەیانی زوو چووم بۆ زانکۆ، دەستە جلەکەشم بەدەستەوەبوو، سوڕ دەمزانی ئێستا وا زیانغ کای بە تەنیا لە پۆلەکە دانیشتووە هەروەك جاران خەرێکی خوێندنەوەیە، جا بێگومان لەوێ بوو دەیخوێند، بەڵام سەیرە! ئەمجارەیان بۆ وا حەپەساوەو لێوەکانی وشك هەڵاتوون، کتێبی بیرکاریشی بە دەستەوە نییە، سەیرم کرد پارچە کاغەزەکەی تێبینییەکانم تیادا نووسیبوو لەگەڵ پارەکانی لە نێو کتێبەکان دامنابوون ئەمانەی بەدەستەوەن. وادیار بوو یەکەمجارە تووشی کێشەیەکی وا مرۆڤانە ببوو. جلەکانم دایێ وپێم وت:

((- فەرموو ئەمانە بۆ تۆن)).

((- بۆ من ؟))، هەڵسایەوە سەر پێ، لە ڕووم وردبووەوە وەکو بڵێی یەکەمجارە دەمبینێ، چاوەکانم داخست و زۆر بە سەرخۆمدا شکامەوە، شێوام هیچ قسەم بۆ نەکرا، تەنها ئەوە نەبێ وتم: ((هەوا خەریکە سارد دەبێ...)). زۆر بە هێمنییەوە، وتی :

((- بەڵێ ڕاستە)).

((- باوکم وێڕای ڕێزو سڵاوی بۆت، داوای لێکردم، کە ئەم جلانەت بۆ بێنم)).

((- بەڕاستی پیاوێکی پاکە، بەڵام جلەکانی وەرناگرم‌و داوای لێبووردنی لێدەکەم)).

بەتووڕەیەوە بە روویدا تەقیمەوە :



((- ناتوانی وەری نەگری، من وامدەزانی تۆ ڕاستی بەڵام وانییە)). بەرەو رووم هات و باوەشی بۆ کردمەوە، هەستم بەدەستە لەرزۆکەکەی کرد لەسەر پشتم داینا، گەرمایی دەستەکانی وردەوردە بەناخمدا شۆڕ دەبووەوە، لێوەکانیشی توند لەسەر لێوم دانا، ئەمجا لەسەرخۆ گوتم: ((هەرگیز هاوکێشەی خۆشەویستی لە یاد ناکەم...، کە لەوە پێش بۆت باس کردەبووم)). بەهێواشی لەنێو پەنجەکانی هاتمە دەرەوە، بەرەو ماڵەوە رام کرد. دوای دوو رۆژنامەیەکەم لە (زیانغ کای)ەوە پێی گەیشت تیایدا نووسیبووی: ((ئێستا دەزانم ژیان چییە. وەکو جارێك باوکت پێی وتم : بیرکاری هەموو شتێك نییە لە ژیان، ژیان زۆر دەوڵەمەندە، ئەوەتا خۆشەویستی تیایە، بەڵام ئێمە ناتوانین خۆشەویستی لەسەرووی هەموویانەوە دابنێین هەرچەندە زۆر گرنگیش بێت، ئێمە لە خەڵکی تر دواکەتووترین، پێویستە لە سەرمان بە دڵسۆزییەوە کارەکانمان ئەنجام بدەین، پەرەیان پێبدەین، بۆ ئەوەی ئەو کاتەی لە کیسمان چووە دەستی بخەینەوە. من دەمەوێ ئەو (١)ەکە بم، کە بیرکاری لەسەر دەڕواو پێڕەوی دەکات‌و شتی نوێی پێی دەدۆزێتەوە، بەڵام (١)ەکە دی پێویستەتۆ بیت، تۆ، کە خۆشەویستیت پێ بەخشیم، بەمەوە هاوکێشەی خۆشەویستییەکەمان رێك‌و دروست دەبێت ١ + ١ = ١.[٣٤]

## ریالییزمی سیحری (جادوویی)

ئەم ناوە، ریالیزمی سیحری پەیوەندی زۆرتری بەو دەقە ئەدەبییانەوە هەیە، کە لە روانگەی تێکەڵکردن و بەکارهێنان و رەنگدانەوەی ئەفسانەو داب و نەرێت و کلتووری نەتەوەیی دەبێتە ماکێکی سەرەکی لە بنیادی داهێنانە ئەدەبیدا. بۆیە هەندێ کەس وادەزانن کە ئەم شێوازە یان تەوژمە ئەدەبییە تایبەتە بە دەقی ئەدەبی نووسەرانی ریالییزمی ئەمریکای لاتین یان ئەو نووسەرانەی بە زمانەکانی ئیسپانیایی و پۆرتوگالی لە ئەمریکای باشوور دەنووسن، بە تایبەتییش لەگەڵ وەرگرتنی خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبی لە لایەن نووسەری کۆڵۆمبی گابرێل گارسیا مارکیز لە ساڵی ١٩٨٢، ئەم شێوازە نووسینە زیاتر کەوتە بەر دیدە و قەڵەمی رەخنەگرە ئەورووپییەکان و لێیان

---

٣٤- ئەم چیرۆکە لە نووسینی کچە نووسەری چینی: (فوهو یزینغ)ە.لەم سەرچاوەیەوە وەرمگێڕاوە: مجلە الاقلام، العدد ١٢، ١٩٨١.

کۆڵیبیەوە. ژمارەیەکی زۆر لەو نووسەرانە وەکو خۆرخێ لویس بۆرخیس[٣٥] و مێگل ئەستووریاس و ئەلیخۆ کاربینتینی و ماریۆ فاگارس لیوسا و کارلۆس ڤۆینتسی و رافائیل شیربیس و خوان رۆلفۆ و....لە وڵاتەکانی ئەرژەنتین وکوبا و مەکسیك و کۆلۆمبیا و چیللی و ئەسپانیا و...نووسەران بە تێکەڵکردنی راپۆرتی رۆژنامەوانی راستەوخۆ لە ژیانی خەڵك و هەقایەت و خەون و سەربووردەی باپیرەو دنیای جەنجاڵی هیندییە سوورەکانی ناوچەکە، بە درێژەدان بە خەیاڵە بێسنوورەکانی (دۆن کیخۆتە)ی سێرڤانتس ئەو نووسەرانە شانازی بە ژیاریی و شارستانییەتی خۆیانەوە دەکەن و شاکاری ئەدەبی خۆیان درێژە پێدەدەن. مارکیز لە پێشەکی کۆمەڵە چیرۆکێکی خۆی بە ناوونیشانی (سەفەرێکی خۆش، جەنابی سەرکۆمار و چەند چیرۆکێکی تر)دا دەڵێ : (دوازدە چیرۆکی ئەم کتێبە لە ماوەی هەژدە ساڵی رابردوودا نووسراون. پێنج چیرۆکی ئەم کۆمەڵەیە، پێش ئەوەی بەم شێوەیەی ئێستاکەیان دەرکەون، بە شێوەی وتاری رۆژنامەوانی یان فیلمنامە بوون و یەکێکیان وەکو زنجیرەی تەلەفزیۆنی بەرهەم هێنرا بوو، پازدەساڵ لەمەوبەر لە دیدارێك لەگەڵ یەکێ لە دۆستان باسی چیرۆکێکم کرد و ئەو نووسییەوە و چاپی کرد، ئێستاکێ من ئەو چیرۆکە لەسەر هەمان ئەو نوسخەیەی وی دەنووسمەوە. ئەوە ئەزموونێکی داهێنەرانەو سەیرە و روونکردنەوەی پێویستە بەتایبەتی بۆ ئەو گەنجانەی، کە دەیانەوێ بە پیری ببنە نووسەر، دەبێ بزانن، کە کاری نووسین تا چ ئەندازەیەك نابەدڵییە و پێویستی بە ماندووبوون و بەردەوامی هەیە.

بیرۆکەی یەکەم داستانیان لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٠دا بە بیرمدا هات و ئەنجامی خەوێکی زۆر روون و ئاشکرابوو، کە دوای پێنج ساڵ ژیان لە بارسلۆن بینی بووم.)[٣٦]، ئەم وتانەی مارکیز ئەوە دووپات دەکاتەوە، کە خەون سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی چیرۆك و رۆمانەکانییەتی، ئەمە بێجگە لەوەی ئەم و نووسەرانی تری ئەمریکای لاتین هەروەکو لە وتاری وەرگرتنی خەڵاتی نۆبڵدا ئاماژەی

٣٥- خۆرخێ لویس بۆرخیس Jarg Luis Borges خەڵکی ئەرژەنتینە و نووسەرێکی زۆر دیاری ئەو مەیدانەیە، سەرەتا بە شیعر بە بەرهەمی (خوێن گەرمی بۆینس ئایرێس) لە ساڵی ١٩٢٣ دا دەستی پیکردووە، لە چیرۆکیشدا، (خەیالات) و(خاوەندکار) و(ئاوێنە ئێشکگرەگان ) وچەندین بەرهەمی تر. بڕوانە: خۆرخێ لویس بۆرخیس، وەرگێڕانی محەمەد کاکەیی، گ؛ کاروان، ژ ١٣٨، ١٩٩٩، ل ٥٥- ٥٨.

٣٦- گابریل گارسیا مارکز، سفر خوش، اقای رئیس جمهور، ترجمه احمد گلشیری چاپ دوم، انتشارات نگاه، تهران، ١٣٧٧، ص ١٣٣- ١٣٤.



بۆ کرد، هەوڵدەدەن تەنیایی و ژیانی بێکاری و خەیاڵە بەرزە فڕەکانی خۆیان بە ئەورووپا بناسێنن و لەو (سەد ساڵ گۆشەگیری)[٣٧]یە بێنە دەرەوە.[٣٨]

ریالیزمی سیحری یان جادوویی تەنیا پەیوەست بە ناوچەی کارییبییەوە نییە، بەڵکو لە جیهانی سێیەم و بەتایبەتی لە ولاچتانی رۆژهەڵات وباشووری رۆژهەڵاتی ئاسیایش زۆر بە هەرمێنە و لە وڵاتانی چین و ڤێتنام و کەمبۆدیا و تایلاند و بۆرما و تەنانەت لای هیندییەکانیش شێوازێکی سەرەکی نووسینە بۆ زیندووکردنەوەو گەشەپێدانی ژانرە ئەدەبییەکان و دەرخستنی کولتووری نەتەوەیی خۆیان، ئەم دیاردەیەش بێگومان بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی و باری کشتوکاڵی و پێشنەکەوتنی مەدەنی و پیشەسازی ئەو وڵاتانە دەگەڕێتەوە، ئەوە بێجگە لەوەی لەو ناوچانەدا ئایین و مەزهەب زۆر بە توندی رەگی داکوتاوە و مەڵبەندی بیرو باوەڕ و ئەفسانەو ئایینزاکانە. هەوڵی شانۆکارانی ئەم ناوچەیە دیار و بەرچاوە و بۆ ئەم مەبەستە شانۆیان هەڵبژاردووە، (شانۆی نەو) لە ژاپۆن نموونەیەکی ئەم هەوڵانەیە.

سەبارەت بە بڵاوبوونەوەی ریالیزمی سیحری لە ئەمریکای لاتین، کارلۆس ڤۆینتۆس دەڵێ:

**(ئەلیخۆ کاربنتینی کوبایی یەکەمین داهێنەری ریالیزمی سیحرییە، دوای گابرێل گارسیا مارکیزی کۆلۆمبی دێت و ئەم شێوازە دەگەیەنێتە لووتکە بە جۆرێك ئەوانەی ویستیان لاسایی بکەنەوە مایەپووچ دەرچوون و نەگەیشتنە هیچ ئامانجێکی سەرنجڕاکێش. بە بڕوای من دوای ئەلیخۆ کاربنتینی و گابرێل مارکیز ئیدی بواری قسەکردن لە ریالیزمی سیحریی نامێنێ، بەڵام سەبارەت بە خودی ریالیزم، من مانایەکی ئەسپانیانەی پێ دەبەخشم، واتا هەمان مانا، کە (سێرڤانتس) لە شاکاری (دۆن کیشۆت)دا بە ریالیزمی بەخشی، ئەمە واتای ئەوەیە، کە کاری هونەرمەند رەنگانەوەی واقیع نییە، هونەرمەند لە کارەکەیدا واقیع دادەمەزرێنێ و خەلقی دەکات، ئایا ئێوە کارەکتەرێك دەناسن لە (دۆن کیشۆت) واقیعیتر بێ و لەو زیندووتر و هەمیشەییتر بێ.)**[٣٩]

٣٧- ناوی رۆمانێکە مارکیزە، هەروا رۆمانەکانی تری : پاییزی پەتریارك، کۆلۆنێل کەسی نییە نامەی بۆ بنووسێ،...

٣٨- بۆ دەقی وتارەکەی بڕوانە: تەنیایی ئەمریکای لاتین، وەرگێڕانی: دلشاد خۆشناو، گ؛ رامان، ژ٤٣، ٢٠٠٠، ل١٥٤ — ١٥٧.

٣٩- حسونە االمصباحی، ریالیزمی سیحریی نەوەی پاش مارکیز، وەرگێڕانی؛ ئازاد صبحی، گ؛ کاروان، ژ ١٥٤، ٢٠٠١، ل ٤٢.

## ریالیزمی سیحریی و دراما

دیاره بێگومان ڕەنگدانەوەی ڕیالیزمی سیحری هەر بەتەنیا پەیوەندی بە ئەمریکای لاتینەوە نییە، بەڵکو ڕەگ و ڕیشەی قووڵی لە نەتەوەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیاوە هەیە، کە مەڵبەندی ئەفسانەو ئایینزاکانە. لێرەدا باسی شانۆ و ڕەوتی مێژوویی دراما لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا بە نموونە وەردەگرین.

(ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا نیشتمانی ژمارەیەکی بێ سنووری چالاکییە شانۆییەکانە، بەداخەوەش دەڵێم لەگەڵ ئەوەشەوە تا ئێستا زۆربەی گەلانی جیهان شتێکی ئەوتۆ دەربارەی ئەو جووڵانەوە شانۆییەیان نازانین، کەس نازانێ ژمارەی ئەو تیپە شانۆییانەی بەبەردەوامی چالاکییەکانیان لە ڕانگۆن و فنۆم پنەو سەنگافورەو جاکارتاو گەلێ ناوچەی دی پێشکەش دەکەن چەندن. هەر بەمەزندە لەوانەیە نزیکەی هەزار تیپی ناسراوو دان پیانراو و سێ ئەوەندەش زیاتر تیپە ئارەزوومەندەکانی شانۆ پرۆڤە دەکەن‌و نزیکەی ١٥٠ ملیۆن بینەر لە ساڵێکا ئامادەی بینینی شانۆگەرییەکان دەبن. زۆربەی دراماکانیش فیکرەکەیان لە ئەفسانە و کەلەپووری میللییەوە وەرگیراوەو بەهەستو سۆزێکی تایبەتی دەخرێنە ڕوو و بە شێوەیەك ڕەنگدانەوەیەکی تەواوی باری کۆمەڵایەتی‌و ژیانی ئەو هەرێمانەن. هەروا ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا لەرووی جوگرافییەوە سەر بە ناوچەی هێڵی ئیستیوائییە گەرمەکانەو کێڵگەکانی مۆز و برنج و بێستان و گوێزی هیندی دەوری داوە بۆتە دینامیکییەتی ئەو ژیانەیان و لە دراماکانیاندا بەئاشکرا دیارە هەروا لەرووی مێژووی شارستانییەتەوە بەدرێژایی مێژوو باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا لەژێردەستی بێگانەبووە و چەوساوەتەوە ناڵەی دەروونی خۆیان بۆژانو ئازارەکانیان کردۆتە هەوێنی چەندین شانۆگەری. هەروا لەلایەکی دیکەوە هاتنی چەند ڕەگەزێکی جیاواز بۆ ناوچەکە لە ئیسپانی‌و پورتوگالی و هۆڵەندی و فەرەنسی‌و بریتانی و ئەمریکی هەموو ئەمانە بوونە هۆی هاتنە ناوەوەی ڕەگەزی نوێ بۆ ناو دراماکانیان و کارتێکردنی لەسەر ڕێبازو قوتابخانە دراماییەکاندا.

دواجار دەڵێم تێگەیشتنی ڕاستەقینەی دراما لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا (چ لەرووی ڕوخساری هونەرییەوە چ لەرووەکانی دیکەوە) کارێکی ئاسان نییە و پێویستی بە خۆماندووکردنێکی زۆر هەیە. شیکردنەوەی ڕەگەزەکانی درامی لەو ناوچانە کارێکی فرە



قورسە، چونکە زۆربەی دراماکانیان بەزمان و دیالێکتەکانی ناوخۆیی نووسراوەو زۆر کەم نەبێ وەرنەگێڕدراون، وا لێرەدا چەند سیمایەکی دەستنیشان دەکەین..

**یەکەم** : زۆربەی دراماکان درێژن و لە چەند پەردەیێك پێك هاتوون، وەك ئەوەی جۆرێکیان هەیە بەناوی(Lakon Bassac) لە پەنجا دیمەن پێك هاتووە، یان جۆرێکی دیکەیان هەیە بە (Cai Luong)ناسراوە لە حەفت هەشت پەردە پێك هاتووە، واتە خالی سەرەکی ئەوەیە ژمارەی پەردەو پاڵەوانو ڕووداوەکە لە ساڵانێکی زۆر پێك دێ. تەنها دراماکانی ڤێتنامی بەناوی (kich) و هەندێ درامای فلیپینی نەبێ بەرئەم دەستوور و یاسایە ناکەون.

**دووەم:** زۆربەی دەستوورەکانی درامای ڕۆژئاواییان بەسەردا ناچەسپێ: نە تراژیدیاو نە کۆمیدیاو نە میلۆدراما، ئەوەی زۆر جێگای سەرسووڕمانە، تراژیدیا لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا هەرنەناسراوە. کۆتایی هاتنی ژیانی مرۆڤ بە شێوەیەکی تراژیدی فیکرەیەکە زۆر لە شارستانییەتی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا بەدوورە. لەم ڕووەوەش دیسان دەبێت جۆری درامای(Cai Loung)ی لێ دەربهێنن، چونکە ئەم جۆرە تێکەڵە لە ڕەگەزی کۆمیدی‌و میلۆدرامی بە شێوەیەکی ئاسایی بابەتەکە دەخاتە ڕوو.

**سێیەم:** دراماکان لەبەر ئەوەی بۆ فێرکردنن، لایەنی خێرو شەڕ تیایاندا چەسپاوە، هەر دەبێ لایەنی خێر بەسەر شەڕدا زاڵ بێ‌و پاڵەوانەکان ڕۆڵی سەرەکی ئامۆژگاری کردنی دەگێڕن، لەبەر ئەوەش ئامانجی سەرەکی فێرکردنە دەبێ خێر بەسەر شەڕدا سەرکەوێ‌و کۆتایی دراماکان بەدڵخۆشی کۆتایی بێت. ئێستا ئەو پرسیارە دێتە پێشەوە، ئاخۆ پاڵەوانەکە دەبێ چۆن بێ؟ بە شێوەیەکی گشتی لاسایی خووڕەوشتو داب و نەریتی کۆمەڵ دەکاتەوە. یەکێ لەنووسەرو دەرهێنەرە ڤێتنامییەکان وتی: جەماوەر دەیەوێ ئاخیرو ئاقیبەتی شەڕو سەرکەوتنی خێرببینێ.

**چوارەم:** بەزۆری‌و بە شێوەیەکی دووبارەکراوە سواو، ئێستا کەوتینە ناو کەسایەتییە مێژووییە ناسراوەکان. لەم جۆرە درامایانەدا پاشایە گەوەرکان هەر دەمێننەوە، تەنها پیاوانی ئایینی و خواوەندەکان نەبێ دەرناکەون. ئەگەر هێشتا بێینە پێشەوە سەیر دەکەین لە دراماکاندا چەمکی ئەرستۆکراتی هەردەمێنێ، بەڵام نەك بە شێوەیەکی تەواو. لە درامای (Untung Suropati) هەموو ڕژێمی ئەرستۆکراتی ڕووبەڕووی هێرشی گەل دەبێتەوە. بێگومان ئەم جۆرە درامایانەش دوو جیهان پێکەوە دەبەستنەوە، جیهانی بەگزادەکانو جیهانی

گشتی(کۆمەڵانی خەڵك). دواجار ئەو دراما هاوچەرخانەن، کە بە( Ludruk. Kick Kelprak Cai Luong،) ناسراون. لەم جۆرە درامایانەدا کەسایەتییەکان لە: رۆڵەکانی شار لە چینی ناوەڕاست و جووتیار و کرێکاران پێك دێ. ئەو درامایانە چارەسەری کۆمەڵی ئێستا دەکاو خواوەندەکانی تیا نییە، ئەگەریش تیابێت دەرناکەوێت، لەناوەڕۆکی زۆربەی ئەو درامایانەی ئێستا یا بلێین هاوچەرخانە پیاوە ئاینییەکان بەهۆی ئەو پەیوەندییە بەتینەیان لەگەڵ سیحردا گاڵتەیان پێ دەکرێ. هەروا جیهانی شاو پاشاکانیش فەرامۆشکراوە، ئەگەرچی لە هەندێ ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا هەتا ئێستاش هەرماوە....

**مالیزیا:** گەلی مالیزی زۆر نیشانەی هاوبەشی لەگەڵ زۆربەی گەلانی رۆژهەڵاتی ئاسیادا هەیە، بۆ ماوەیەکی زۆریش لەژێرکارتێکردنی شارستانییەتی هیندۆسیدا بووە. کەچی هەموو گەلانی هاوسێی مالیزیا لەرووی هونەرییەوە لەگەڵ ئەودا جیاوازن. هەتا یەکێ لە رەخنەگرەکان دەڵێ: شارستانییەتی و هونەری مالیزیا وەرگیراوە، ئەو قسەیە بەگوێرەی درامایش راستە. یەکێ لە دراما باوەکانی مالیزیا.

(Wayon Kulit)یە، کە لە(جاوە)وە وەریان گرتووە هەر چۆنێك بێ ئەمڕۆ لە مالیزیادا سێ جۆرە دراما خەیاڵ تاریك هەیە:Wayang Siam، Wayang Melayu، Wayang Djawa، ئەو دوو جۆرەی یەکەمیان راستەوخۆ لەدرامای جاوەیی وەرگیراوە. دوای بڵاوبوونەوەی ئیسلامەتی لە مالیزیادا درامای ئیسلامی پێشکەش دەکرا، وەك: میرحەمزە. ئەوەی سێیەمیشیان بەرهەمی کارێکی مێژووییەو لە شێوازێکی تایبەتی وەرگیراوە. پاشان جۆری(Bangsawan)ە،کە بەجۆرێکی میللیو بڵاو دادەنرێ لە هونەری مالیزی، پەرەی سەند. هەرلە ساڵەکانی(١٩٢٠)ەوە تا جەنگی دووەمی جیهانی ئەم جۆرە لە گەشەکردندا بوو. رۆژی ئەمڕۆش چەند تیپێکی چالاك لە کارکردنی خۆیان لەم رووەوە بەردەوامن.

**بۆرما:** سەمای ئایینی و رۆحی لە بۆرما مێژوویێکی درێژی هەیە، ئەو سەمایانەش بۆ پیاوە ئایینییەکانی بە(Nat)ناسرابوون (سەماکەرە رۆحییەکان)و ئەو درامایانەشی پێشکەش دەکران پێیان دەوتن (شانۆگەری رۆحی)، ئەمە لە کۆندا شێوەی ئەو درامایانەی ئەمڕۆ بە( Nat pwe) یان (پێشاندانی رۆحی) ناسراون، لەراستدا پاشماوەی ئەوکاتەن، دوایی هاتنی بەریتانیا لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم جووڵانەوەی درامی بەتەواوی پەکی کەوت. دراماکانی بۆرمایی بە زۆری لەسە زاری ئاژەڵانەوە بەرهەمەکانیان پێشکەش دەکەنو بەزۆری بۆ منداڵانە. دوای



ئەوەش وردە وردە بەرەو پێشکەوتن چوونو گەڕان بەدوای نهێنییە چرپوپرەکانی ژیان بە ئاشکرایی لە دراماکان خۆی دەنواند، بەڵام لەگەڵ ئەوەشەوە نەیانتوانیوە تا ئێستاش خۆیان لە داوی رابردوو راپسکێنن، هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ نە گۆڕانی بیری جەماوەر بەرامبەر بە دیاردەکانی پێشوو. هەرچۆنێك بێ، ئەمڕۆ بەهۆی گەڕان و سوڕان و سود وەرگرتن لە درامای جیهانی و نەشونماکردنی چرۆی بیری جەماوەری شانۆیی لە جاران چاکترن.

**ڤێتنام:** کۆنترین شێوەی درامی لە ڤێتنام (hatcheo)ە، لە تیۆرە دراميیەکاندا دەڵێ: ئەم جۆرە درامایە لەسەما و گۆرانی میللییەوە پەرەی سەندووە، کە جووتیارەکان لە کاتی دروێنەو بۆنەکانی دیدا وتوویانە، دوایی پەری سەندو بوو بە رەخنەیەکی کۆمەڵایەتی وەك ئەمڕۆ کە باوە. هەروا جۆرێکی دیکەیان هەیە، بەناوی (Hat boi) ئۆپێرایەکە لە هەموو ڤێتنامدا باوەو لە ئۆپێرای چینییەوە وەرگیراوە. ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە ئەوەیە وشەی Hat واتا گۆرانی چڕین و وشەی (Bboi) واتا دەستنیشان دەکات. لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا یەکەم شانۆ لە کۆشکی ئیمپراتۆر(Luong Cai) (١٨٠٢-١٨٢٠) بۆ ئەم جۆرە ئۆپێرایە دروستکراو هەتا ساڵی ١٩٤٥ یش هەر بەردەوام بوو، بەڵام لە سەدەی بیستەمدا ئەم جۆرە ئۆپێرایە بە خێرایی لە بیرچووەوەو تیپەکانیش پارەو پوولیان نەدراییێو هەموویان رووبەڕووی شاڵاوی دوژمنانەی ئەمریکا بوونەوە، بە ئەرکی سەرشانی خۆیان هەڵسان: ئەویش بەرگریکردن لەخاكو سەربەخۆیی وڵاتەکەیان بوو. ساڵانی بیستی ئەم سەدەیە دوو جۆر درامای سەرەکی هاتە ناوەوە: ئەوانیش(Tuong tau،Cai1uong)بوون کە بە لای زۆربەی زۆری رەخنەگرەکانەوە هەنگاوێکە بۆ خۆرزگارکردن لەکۆتو بەندی پێشوو و شکاندنی رێچکەی دراماکانی کۆن. هەر لە ڤێتنام جۆرێکی تر هەیە بەناوی (Kich) ناسراوە و بنەچەکانی دەگەڕێتەوە سەر شانۆی فەڕەنسی. هاندانی ئەم جۆرە درامایەش بەئاشکرا دیارە لەلایەن ئیستعماری فەڕەنسییەوە بووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشەوە ئەمڕۆ بە تەواوی ناوی لەبیر چۆتەوەو ئەمڕۆ کۆمەڵی تیپ دراماکانیان پێشکەش دەکەنو هەریەکەیان لە سەعاتێکو دووان زیاترنو کۆمەڵی گۆرانیبێژی میللیو تیپی مۆسیقای جاز بەشداری دەکەن. چەندین تەنگوچەڵەمەی ژیانی ئەمڕۆی مرۆڤو کاری مرۆڤایەتیو نەخۆشییە کۆمەڵایەتییەکان بوونەتە هەوێنی چەندین درامای ئەمڕۆی ڤێتنام.)[٤٠]

٤٠- ئەم باسەم لەم سەرچاوانەوە ئامادە کردووە:

## ریالییزم لە ئەدەبی کوردیدا

هەروەکو لە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد ڕێبازی ریالییزم بۆ ئەوە لە دایکبوو کە ژیان بۆ ژیان بنووسێتەوە ئەمە بەو واتەیە نییە، کە هونەرمەند کەسێکی لاساییکەرەوە بێت، بەڵکو ریالییزم باوەڕی بە داهێنان و ئەفراندن هەیە.

ئەو هەموو ڕووداو و کارەسات و بەرخودانەی لە ژیانی سیاسیی میللەتی کورد لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا هاتەکایەوە بووە کەرەسەیێکی بە پێز بۆ شاعیر و چیرۆکنووس و شانۆنووس...هتد، کە هەوڵبدەن لە ڕوانگەو بینینی خۆیاندا چی وەکو خۆی لای هەندێکیان یان ئەوەتا هەندێکیان ئەو بابەتانەیان تێکەڵ بە خەیاڵ و فانتازیا دەکردو ئومێدی ئاییندەیەکی جوانتر و گەشتر لە بەرهەمەکانیاندا ڕەنگی دەدایەوە، ئەگەرچی ڕەگو ریشەی ریالییزم بەو واتایەی، کە نووسەر یان هونەرمەند بەرهەمەکەی پەیامداری تیا بێت یان بە واتایەکی دی ڕەنگدانەوەی ئێش و ئازارەکانی زۆرینەی کۆمەڵ بێت لە زۆر زووەوە لە تێکستی ئەدەبی و بەتایبەتی شیعری شاعیرانی کلاسییزمی کوردیدا بەدی دەکرێت، لە چوارینەکانی(باباتاهیری هەمەدانی ٩٣٥ — ١٠٢٧ ؟)یەوە تاوەکو شیعرەکانی حاجی قادری کۆیی (١٨١٥ - ١٨٩٧) و شاعیرانی سەرەتای سەدەی بیستەم لای زۆر شاعیر ڕەگ و ریشەی ریالییزم بەدی دەکرێت، بەڵام وەکو ڕێبازێکی ئەدەبیی و هونەریی تەواو بە پێوانەی ڕێبازە ئەدەبییەکانی ڕۆژئاوا لە ڕووی کات و شوێنەوە ناشێ بیانخەینە چوارچێوەی ئەو ڕێبازە.

سەرکەوتنی بەرەی سۆسیالییزم لە جەنگی دووەمی جیهانیدا و بڵاوبوونەوەی پرەنسیپەکانی یەکسانی و برایەتی و دادپەروەری بە شێوەیەکی گشتیی لە جیهان و لای میللەتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و میللەتانی ژێر دەست بە تایبەتی زۆرتر ڕێبازی ریالییزمی بڵاو کردەوە و چەسپاند. لای چیرۆکنووسانی وەکو جەمیل صائب(١٨٨٧- ١٩٥١) لە چیرۆکی (لە خەوما)[٤١] و عەلائەدین سەجادی[٤٢] و ئیبراهیم ئەحمەد(بلە)(١٩١٥- ٢٠٠٣)[٤٣]و حەسەنی قزلجی لە (پێکەنینی

- ملحق الثقافة الأجنبية، المسرح في جنوب شرقي آسيا، أيلول ١٩٨٢.
- مجلة الثقافة الأجنبية، ملحق خاص بمسرحية الفصل الواحد. المسرح الفيتنامي، تشرين الثاني ١٩٨٣،ص١١٨-١٢٠.

٤١- جەمیل صائب، لە خەوما، چاپکردنی د. ئیحسان فوئاد، بەغدا، ١٩٧٥.

٤٢- علاءالدین سجادی، هەمیشە بەهار، چ المعارف، بەغدا،١٩٦٠.



گەدا)[٤٤]... هەروەها لە شیعری شاعیرانی وەکو: (گۆران و بێکەس و دیلان و کامەران و کاکەی فەلاح و ع.ح. ب و....)دا بەرهەمی داهێنەرانەی لێکەوتەوە.

## ریالییزم و شیعری کوردی

بەشێکی زۆری ئەو شاعیرانەی، کە پێشتر سەر بە ڕێبازی ڕۆمانسییزم بوون و لە تازەکردنەوەی شیعری کوردیی سەرەتای سەدەی بیستەمدا چی بە لاساییکردنەوەی شیعری نوێی تورکی و چی ئەوانەی بە سوود وەرگرتن لە کەلەپووری کوردیی و کێش و وێنەی شیعری و فەرهەنگی گوندەکان و بە تایبەتیی کاریگەریی شاعیرانی ناوچەی هەورامان شیعریی کوردییان بەرەو تازە بوونەوە برد دواتر پێویستیی ژیانی سیاسیی وکۆمەڵایەتیی کۆمەڵی کوردەواری وایکرد، کە ڕوو لەو مەیدانە بکەن و ببنە نموونەی شیعری ریالییزمی کوردی. بابەتەکانی خۆپێشاندان و نارەزایی جەماوەری دژ بە حکوومەتی پاشایەتی و بۆنە نەتەوەییەکانی وەکو جەژنی نەورۆز و کردنەوەی قوتابخانەو هاندانی کچان بۆ خوێندەواری و ڕووبەڕوو بوونەوەی ڕژێمی دەرەبەگایەتی و سیاسەتی ئینگلیز لە عێراق و کوردستاندا و خەباتی هاوبەشیی میللەتان بۆ رزگاریی، هەموو ئەمانەو گەلێکی تر لە بەرهەکاندا ڕەنگیان داوەتەوە. سەبارەت بە ڕەنگدانەوەی ریالییزمی سۆشیالیست لەشیعری کوردیدا د.عیزەدین مستەفا ڕەسول دەڵێ:

(ئەدەبیاتی ریالیستی کوردی لە پاش جەنگی دووەمی جیهان وەك قوتابخانەیەکی خاوەن نیشان و تایبەتێتی خۆی ئەوتۆ جێگیر بوو کە شادامارەکانی بەسترابن بە ژیانی گەلی کورد و سامانی نەتەوەیی کورد و ڕەگەزە ریالیستییەکانییەوە وپشت بە تەجروبەی ئەدەبیاتی ریالیستی نەتەوەکانی ترەوە ببەستێت. ڕوخساری ڕەخنەگرانەی ئەم ئەدەبیاتە ڕەخنە لە دواکەوتوویی ژیانی گەلی کورد دەگرێت و گاڵتەی پێدەکات و پاڵ بە گەلەوە دەنێت، کە ئەو دواکەوتووییە چارەسەر بکات، پیرەمێرد و ئەحمەد موختار جاف و زێوەر و موفتی و بێکەس نوێنەری دیاری ئەم ڕێبازەن، گەلێك لە نووسەرانی گەلاوێژ و کامەران و عەلادین سوجادی بەرەو پێش بەری ئەون وهۆی نزیککردنەوەی مەبەسی ئەو و مەبەسەکانی قوتابخانەی ریالییزمی سۆشیالیستین، سەلام و"جگەرخوێن "یش ئەڵقەی بەیەك گەیاندنی مەبەسی شیعری

٤٣- ابراهیم احمد، کوێرەوەری، چ النجاح، بەغدا، ١٩٥٩.

٤٤- حسن قزلجی، پێکەنینی گەدا، بەغدا، ١٩٧٢.

ریالیزمی رەخنەگرانەو ریالیزمی سۆشیالیستین. رەگی ریالیزمی سۆشیالیستی لەگەڵ بڵاوبوونەوەی بیرو باوەڕی پێشکوتخوازانەی شۆڕشگێڕی، زانستیدا بە تایبەتی لە کوردستانی عێراقدا لە ساڵانی جەنگی دووەمی جیهان و دوای ئەو جەنگەدا کەوتە ڕواندن. نووسینەکانی عەبدولواحید نووری (ع.و.نوری - ١٩٠٤-١٩٤٤ ز)، کە بەشێکن لە ئەدەبیاتی سیاسی، باشترین سەرەتای ئەدەبیاتی ریالیزمی سۆشیالیستین. هەردی — لە پلەی یەکەمی شیعرەکانیدا و ع.ح.ب.) و کاکەی فەللاح و دلزار و دیلان و قەدری جان و مارف بەرزنجەیی و کەسانی تر، بەو ڕێبازەدا ڕۆیشتن و پاش ئەوە ناوەرۆکی شیعر لە لای گۆران بەرەو پێشەوە چوو و وردە وردە چووە ریزی ریالیزمی سۆشیالیستییەوە بە ناوەرۆك و رووخساری تازەی خۆی و بوو بە رابەری ئەم قوتابخانەیەو بەرزترین لوتکەی پێگەیشتن و بەرەو پێشچوونی خۆی.)[45]

ئێمە پێمان وایە بوونی ئەدەبیاتێکی سۆشیالیستی پێوەندی بە گۆڕانی کۆمەڵەوە لە قۆناغی سەرمایدارییەوە بۆ قۆناغی سۆشیالیستی و باڵادەستی چینی پرۆلیتاریا و بەدەستەوەگرتنی هۆیەکاتی بەرهەمهێنانەوە هەیە، کە جارێ کۆمەڵی کوردەواری و زۆربەی میللەتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست پێی نەگەیشتوون، ئەگەر هەندێجار نموونەی وەها لە ئەدەبیاتی کوردییشدا بەرچاو دەکەون، کە باسی برایەتی و یەکسانی و دادپەروەی و خەباتی هاوبەشی میللەتان و خەباتی چینی جووتیار بەرامبەر بە دەرەبەگ و کرێکار دەکەن، ئەمە پێوەندی بە ژیانی کۆمەڵ و رەنگدانەوەی سەردەمێکی دیاریکراوی کۆمەڵی کوردەوارییەوە هەیە و ئەمە خەسڵەتێکی زۆربەی کۆمەڵەکانە و شەقڵێکی مرۆڤایەتی هەیە.

لە ئەدەبیاتی کوردی کوردستانی ئێراندا، بە تایبەتی لەگەڵ دامەزرانی کۆماری دیموکراتی کوردستان لە٢٢/١/ ١٩٤٦ بە هۆی پاڵپشتی یەکیەتی سۆڤیەتی جاران لەو کۆمارەو سەرکەوتنی بەرەی سۆسیالیستی لە جەنگی دووەمی جیهاندا هەندێ نموونەی شیعری لای هێمن و هەژار و حەقیقی و خاڵە مین لە رۆژنامەوانیی ئەو رۆژگارەدا بەرچاو دەکەون.[46]

---

٤٥- د. عزالدین مصطفی رسول، ریالیزمی سۆشیالیستی و ئەدەبیاتی کوردی، گ: رۆشنبیری نوێ، ژ ١١٣، ١٩٨٧، ل٦٢.

٤٦- بۆ ئەو نموونە شیعرییانە بڕوانە:

د.هیمدادی حوسێن، رۆژنامەنووسیی کوردی سەردەمی کۆماری دێمۆکراتی کوردستان ١٩٤٢- ١٩٤٧، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی،٢٠٠١، ل ٢٢٥ — ٢٨٤.



## نموونەی شیعری ریالییزم لە ئەدەبی کوردیدا :

### نالەی بێکار

شیعری :گۆران[47]

تا هێزی بزووتن لە لەشما بەگوڕ بوو،
من کوڕ بووم بۆ ئاغا و ئاغا باوکی کوڕ بوو،
لە (ماندوو نەبوون)ی سەرایشم واق وڕبوو،
عەماری لە بەری تەقەلام پڕ- پڕ بوو...

((نامە خوا !)) و ((ئافەرین !)) سەری لێ شێوانم،
دڵسۆزی بۆ ئاغا ئەوەندەی ڕەتانم :
تا رادەی ئەوپەڕی شەکەتیی گەیانم !
پەکم کەوت.. نەخۆشی لەشی تێك شکانم !

نەخۆشی ناو جێ بووم : بێ شۆربا، بێ دەرمان،
بۆ زمان تەڕکردن ((نەختێك ئاو !)) ئەمناڵان،
بەرگوێم کەوت باوکی کوڕ (نەك ئێستا هی جاران !)
قیڕاندی : بۆ نایبەن فڕێیدەن لە کۆڵان !

ئەو دەستەی لە کۆڵان گەیشتە فریای من
دەستێ بو بە تۆز و عارەقی ئیش چڵکن،
زۆر دوور بوو لەو دەستەی خاوێنە وەك هیی ژن،
پارووی چەور ئەگلێنێ بێ رەنجی ئیش کردن!

---

٤٧- سەرجەمی بەرهەمی گۆران، بەرگی یەکەم، دیوانی گۆران، محمدی مەلا کەریم کۆی کردۆتەوەو ئامادەی کردووە و پەراوێزی بۆ نووسوە، بەغدا،١٩٨٠، ل ١٩٩ -٢٠١.

ئەو دەستە چڵکنەی دوو لێوەی تەڕ کردم،
دڵۆپی فرمێسکی کونە سەر رووی زەردم،
بە قووتی دەمی خۆی رایگرتم نەمردم:
رەنجبەر بوو ونۆکەر بوو، هاوپیشەم، هاو دەردم!

تا رۆژی کەوتنم گەشتە شەش و حەوت،
ژوور سەری بەرنەدام هاودەردی بێ سروەت،
بە زەبری دڵسۆزی ئەوندەم نزیك كەوت:
پەتاکەم تووشی بوو لە لاما ئەویش خەوت!

وا ئێستا ئەو کەوتوو، من لە جێ هەڵساوم،
کوناو کون ئەگێڕم لەشی تێك شکاوم،
لە فرمان ئەپرسێ : زمانم، گوێم، چاوم..
بۆ قووتی رۆژی خۆم، هیی هاوڕێی داماوم!

فرمانێك..قەی ناکا قورسیش بێ بە شانم،
لە ژێریا لێك دەرچێ گشت جومگەی ئێسقانم،
هەر تیا بێ چەن فلسێك، هیچ نەبێ بتوانم:
نان بکڕم بۆ خۆم و، بۆ هاوڕێی نیو گیانم!

فرمانێ، ئەی کۆمەڵ ! فرمانێ..فرمانێ..
بۆ دەردی بێکاری چارەیەك، دەرمانێ،
زۆر شەرمە لە چەرخی بیستەما ئینسانێ
بێ ئیش بێ وسکی خۆی هەڵ لووشێ بۆ نانێ!..



## ریالییزم و چیرۆکی کوردی

چیرۆکی (لەخەوما)[٤٨] بە شێوەی ریالییزمی رەخنەگرانە (الواقعیە الانتقادیة) ناوەرۆکەکەی دەخاتەڕوو کابرای (خەوبینەر) شارەکەی بەجێ دەهێڵێ و روو لە شارێکی دی دەکات بۆ کاسبی و کارکردن، بەڵام لە رێگا یان لە سنووری شارەکەی دی تووشی چەرمەسەری و گیروگرفتی خۆی دەبێ، هەروەها لایەنێکی دیکەشمان بۆ دەخاتە ڕوو ئەویش بڵاوبوونەوەی دزی و جەردەیی و بەرتیل وەرگرتنە، کە لە سایەی حوکمی شێخ مەحموودەوە بەناو کۆمەڵدا بڵاوبوونەتەوە. ناوەرۆکی چیرۆکەکە مەسەلەیەکی سیاسییەو مەبەستی نووسەرەکەی تاوانبارکردنی حوکمی شێخ مەحموودی نەمرە، لەڕووی بنیات و تەکنیکی هونەریشەوە چیرۆکەکە (ئەگەرچی تەواویش نەکراوە) هەست بەیەك لەدوای یەکی رووداوەکان و زمانی هونەری چیرۆکنووسین و گێڕانەوەی ئاسایی دەکرێت، دوو پاڵەوانی سەرەکی لە چیرۆکەکەدا بەدی دەکرێت، کابرای خەوبین و دەستەڵاتدار، کە خۆی لە کەسایەتی نووسەر خۆی و شێخ مەحموودا دەبینێتەوە نووسەر چەندین دیمەنی عاجباتی دێنێتەوە :

(بۆ خەلەتانـدن وچەواشەکردنی خەڵك هەڵی بەستووە، ئەوەش هەر بۆ ئەوەی ئەوە بسەلمێنێ،کە دەستەڵاداریێتی شێخ مەحموود ناڕەوابووەو دەبوایە بڕوخێ)[٤٩] تەکنیکی چیرۆکەکە لە چەند روانگەیەکەوە تیشکی دەخەینە سەر، دیالۆگ، وەکو تەکنیکێکی کۆنی چیرۆك بەدی دەکری، ئەگەرچی نیشانەی تایبەتی وەکو (-) ی بۆ دانەنراوە، بەڵام خوێنەر دەزانێ وەکو (لە خانچییەکەم پرسی وتم ئەم شیوەن و گریانە چیە ؟ وتی ئەوە هیچێکی وا نییە. ل ٣٥). مەنەلۆگ، بەهەمان شێوەی دیالۆگ بەدی دەکرێ وەکو : (منیش لە دڵی خۆما وتم ئیشی ئێرە وادیارە هەمووی عبارەتە لە خەڵك روتاندنەوەو شتی باش وبەقیمەتی ئەم و ئەو زەوتکردن و بەبەرتیل هەتیو و مەتیوەو لەسەر ئیشی زل و گەورە دانان... ل ٤٧) وەسفی سروشت، سیمایەکی دیکەی چیرۆکەکەیە لە پێناو زیاتر قووڵ بوونەوە بەرووداو و کاریگەری لەسەر

٤٨- جەمیل صائب، لە خەوما، پێشەکی جەمال بابان، بەغدا، ١٩٧٥.

٤٩- جەمشید حەیدەری، چەند سەرنجێکی رەخنەیی دەربارەی چیرۆکی لە خەوما جەمیل صائب، پاشکۆی عێراق، ژ١٠، کانونی یەکەمی ١٩٧٧، ل٦.

دەروونی پاڵەواندا، وەکو: (دنیا لە پاش نیوەڕۆ بە هەورو هەڵلا، کزە بایەکی زۆر ساردی ئەهات، جار جار برووسکەو چەخماخەی ئەدا پاش عەسر تنۆکە تنۆکە دایکردە باران ل٣١) یان لە وەسفی خانەکەدا بۆ یەکەمجار گەیشتنیێ بە وشەو رستەی کورت کە یەکێ لەو سیما دیارەکانی زمانی پەخشان ئامێزی چیرۆکنووسەکەیە دەڵێیت : "

**بەهەرحاڵێك گەیشتنە خانەکەو دەرگاکایان لێ کردینەوە و چووینە ژوورەوە سەرما قوڕ، دڵۆپە، بێ ئاگری. (ل ٣٥).**

دابەش بوونی پاڵەوانەکانی لەسەر تۆپۆگرافیای نەخشەی رووداوەکانی چیرۆکەکە یەکسانە تەنها کابرای خەوبینەر (گێڕەرەوە) ی لێ دەردەچێ دەنا ئەوانی دی بێ ناون و کەم دەردەکەون یان هەر بۆ جارێ دەردەکەون کە ئەوەش لە زەین و بیری خۆێنەردا بۆ ماوەیەکی زۆر نامێننەوە شوێن، جێگیرە و زیاتر ژووری بەندکردنی کابرای خەوبینەرەو بە شێوەیەکی عەفەوی جێگەکان دەگۆڕێن و مامەڵەیەکی سادەو پێداویستی رووداو و کەسەکان فرەزی ناکات و وەکو رەهەندێکی جوانی نیشان نەدراوە.

زەمەن لە چیرۆکەکەدا، دەکرێ لە سێ زەمەنی جیاوازەوە بڕوانین زەمەنی دەق ئەو زەمەنەی کە چیرۆکنووس چیرۆکەکەی تێدا نووسیووە، زەمەنی خەونەکە کە زەمەنێکی دیاریکراو و کورتە کە رەنگە لە چەند سەعاتێك تێنەپەڕێ هەروا زەمەنی فیزیکی یان زەمەنی واقیع یان مێژوو کە پێی رووداوە مێژووییەکان دەبێ ماوەی حوکمی شێخ مەحموود بگرێتەوە ١٩١٨-١٩٢٤ بەهەردوو جارەکەوە.

دەتوانین بیری سەرەکی لەم خاڵانەدا دیاری بکەین:

**١- رەخنە لە حکوومەتی شێخ مەحموود و دارو دەستەکەی.**

**٢- ریاکاری مەلا و پیاوانی ئایینی.**

**٣- سادەیی و بێ ئاگایی خەڵك و جیاوازی بیروبۆچوونی بێ بنەمای سیاسیان.**

ناونیشانی چیرۆکەکە (لەخەوما) ناونیشانێکی سادەو یەکسەر زەینی خوێنەر بۆ جیهانی خەون و فانتازیاو دوور لە واقیع و حەقیقەت دەبات، کە دەکرا ناونیشانێکی قووڵتری بۆ هەڵبژاردبا ئەگەر چی خوێنەر لە ناوەڕاستی چیرۆکەکەدا تووشی جۆرێك لەسەر سووڕمان دەکات و لەگەڵ ناونیشانەکەی دژیەك دەکەوێتەوە کاتێ دەڵێت : **(ئەمە چی بوو من دیم من لە کوێم ئەمە خەونە یان نا ؟ بۆیە هەردوو چاوی خۆم گلۆفت وتم، بەڵکو ئەگەر خەوە خەبەرم**



**بێتەوە کەچی روانیم هەموو شتێك هەر لە جێگەی خۆیەتی و ئەم جانەوەرانە هەرلە بەرچاومن، ل٧٥)** لایەنێکی دیکەش لە بنیادی چیرۆکەکە (غەفلەت) ە کەئەو حاڵەتەیە چیرۆکنووس بەهەڵە دوولایەنی دژیەك یان باسی شتێك دەکات کەلەگەڵ بابەتی پێشوو راست شتێك ناکەوێتەوەو جۆرێکە لە بێ ئاگایی و نەست داو تانو بۆی چیرۆکەکە لاواز دەکات. لە ئاخروئۆخری پاییزیدا باری سروشت بەم شێوەیە نابێت هەروەکو پاڵەوان (کابرای خەوبینەر) دەڵێت: **(شەویش کردبووی بەسایقە کزەبایەکی ساردی دەهات عەرزەکە بەستبووی، تەقەتەقی سەهۆڵەکە سەرمایەکی وایە تف هەڵدەی دەیبەستێ!. ل٧٣).**

دوابە دوای (لەخەوما) چیرۆکی (مەسەلەی ویژدان) ی [50] ئەحمەد موختار جاف دێت ئەم چیرۆکە بە داخەوە درەنگ بڵاوکرایەوەو بۆ سەردەمی خۆی کاریگەرییەکی نەبوو ئەحمەد موختار جاف، کە وەکو شاعێرێکی نەتەوەییش ناسراوە بەرهەمەکانی رووبەڕووبوونەوەیەکی توندی کۆمەڵەو هاندانیانە بۆ عیلم و عیرفان و خوێندەواری و رەخنەی لە کاری ناهەمواری ئاغاو دەرەبەگا و رژێمی سەردەمەکەی گرتووە. چیرۆکی (مەسەلەی ویژدان، یان چۆن بووم بە خانەدان) نموونەی چیرۆکێکی سەرکەوتووە پاڵەوانی چیرۆکەکە (زۆراب) بە وردی لەلایەن نوسەرەوە رادەی خوێندەواری و باری دەروونی و باری کۆمەڵایەتی و ئابووری دەست نیشانکراوە بێ باوك و دایك گەورە بووە، کە لەو هەموو دزی وبەرتیل وەرگرتنەی لە کۆمەڵەکەیدا بینیووە، ئەگەرچی ئەو لە سەرەتادا خۆی لێ بەدوورگرتووەو ویستویەتی لە رێگەی شەرعییەوە نانی بژێوی خۆی پەیدا بکات، بەڵام بۆی دەرکەوت ئەگەر ئەویش وەکو ئەوان دەست بداتە بەرتیل و دزی زوو بەزوویی ژیانی دەگۆڕێت، ئەمانەشی لە کاتێکدا بۆ دەرکەوت کەبەتاوانی خەت ناخۆشی ئاخنرایە زیندانەوە، پاشان بە عەریزە نووسێکی چاك ناوبانگی دەرکرد بەبەرتیل و پاشان گەورە بوو و بوو بە سەرۆك قەزا، لێرەدا لەگەڵ رای (د. عبداللە الدباغ) یەك دەگرمەوە، کە پێی وایە زمان زانین و رادەی خوێندەواری و شارەزایی ئەحمەد موختار جاف لە زمان و ئەدەبیاتی بێگانە یارمەتیدەری بوون ئەم جۆرە چیرۆکەش لە ئەدەبی ئەوروپی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەمدا زۆر باوەو بە (روایات الشگار) و (روایات التکوین) ناسراوە.[51]

٥٠- ئەحمەد موختار جاف، مەسەلەی ویژدان، پێشەکی و لێکۆڵینەوە دکتۆر احسان فوئاد، بەغدا، ١٩٧٠.

٥١- عبداللة الدباغ، نظرة جدیدة علی روایة "مسالة الضمیر" جریدة العراق، العدد ٢٤٧٥، ٢٥- ٦- ١٩٨٧.

شێوەو تەکنیکی هونەری چیرۆکەکە زمانێکی پاراو و وردبینی نووسەری تیا دەردەکەوێت لەبەیەکەوە گرێدانی زنجیرەی رووداوەکان و دانانی ناو بۆ پاڵەوانەکان و دیالۆگی نێوان پاڵەوانەکان و دانانی نیشانەی (-) بۆ سەرەتای دەستپێکردنی دیالۆگی پاڵەوان و رەگەزی هاندان و سەرەتا و گرێ بە شێوەیەکی سادە رێزکردنی رووداوەکان بەپێی روودانیان لە واقیعدا ئەمەش زۆر باوەو بنەچەکەی بۆ هەقایەتی فۆلکلۆری دەگەڕێتەوە "[٥٢] هەنگاوێك بێینە پێشەوە چیرۆکەکانی پیرەمێرد (١٨٦٧- ١٩٥٠ز) دێت ئەو چیرۆکانەی پیرەمێرد زۆریان رووداوەی مێژووین یان لە فۆلکلۆری کوردییەوە وەریگرتوون. ئەو کارەی پیرەمێرد رەنگە کارتێکەری ئەدەبی تورکی بێت کە ئەو سەردەمە لە ئەستەمبۆڵ بووە ئەو تەرزە چیرۆکە فۆلکلۆرییانەو داڕشتنەوەیان بە شێوەیەکی هونەریی بەرز باو بووە[٥٣] ئەمە هاندەرێك بوو سەرباری ئەوەی هەر لەو سەردەمەشدا وەکو رۆژنامەنووسێك ویستوویەتی بەشداری لە بەرەو پێشەوەبردنی هونەری چیرۆکیش بکات، کە ئەو کاتە لەناو ئەدەبی کوردیدا هێگجار دەگمەن بوو، لە پاڵ ئەوەشدا هەر لەو ساڵانەدا لەسەرەتای سییەکانی ئەم سەدەیەدا "قوتابخانەی دیمەشقی"[٥٤] لە ئەدەبی کوردیدا لە رێگەی دەرکردنی گۆڤاری "هاوار" لەلایەن بنەماڵەی بەدرخانییەکانەوە بە پەرۆشەوە گرنگی یان بە بلاوکردنەوەو بەرەو پێشەوەبردنی چیرۆکی کوردی دەداو پاشان "ئەم چیرۆکە بلاوکراوانەی گۆڤاری هاوار لە قۆناغی یەکەمیدا "١٩٣٢- ١٩٣٥" کاریگەرێتییەکی بەزەبریان هەبووە بەسەر نووسەرە کوردە گەنجەکانی ئەو سەردەمەی کوردستانی عێراق لەوانە شاکر فەتاح، حوسێن حوزنی، ئیبراهیم ئەحمەد، عەلائەدین سەجادی، واتە بەسەربووژانەوەو پەرەسەندنی چیرۆکی هونەریی کوردیی لە کوردستانی عێراقدا لە ماوەی ساڵانی ١٩٣٩-

٥٢- شجاع مسلم دغيم العانی، البناءالفنی فی الرواية العربية في العراق، (رسالة ماجستير) جامعة بغداد ١٩٨٧، ص١٠٦.

٥٣- چیرۆك و رۆمانەکانی (احمد مدحت افندی ١٨٤٤- ١٩١٣ ز) رۆمانەکانی نامیق کەمال (١٨٤٠- ١٨٨٨ ز) رەجانی زادە ئەکرەم بەگ (١٨٤٧ — ١٩١٤ ز) لەو تەرزە چیرۆك و رۆمانەن بڕوانە:
اکمل الدین احسان: نشاة القصة فی الادب الترکی، مجلة القصة العدد العشرون، س٢، ص٩٣- ٩٩.

٥٤- ئەم ناوە لەلایەن لێکۆڵەرەوەی فەرەنسی (رۆژەلیسکۆ)وە بەکارهاتووە، بڕوانە، فەرهاد پیربباڵ، چیرۆکەکانی گۆڤاری هاوار، گ؛ مامۆستای کورد،ژ (١١- ١٢) ل ٧٤.



١٩٤٩"[٥٥] بێجگە لە ئەدەبیاتی تورکی ئەدەبیاتی فارسیش کاریگەری لەسەربەهرەی پەخشان و چیرۆکنووسی (پیرەمێرد) دا هەبوو بەتایبەتی داڕشتنەوەی چیرۆکە میللی و فۆلکلۆری و مێژووییەکان کە وەکو قۆناغی یەکەمی چیرۆکی فارسیش باوی بووە، لەم بارەیەوە (پیرەمێرد) خۆی ئەو راستییەمان بۆ روون دەکاتەوە (غەزەتەی کۆهستان کە لە تەهرانی پایتەختی ئێران دەردەچێ تا ئێستا نەمدیبوو ئەم چەندانە کە چاوم پێکەوت یا بڵێم چاوم پێ روون بووەوە چونکە من مەفتوونی زبانی فارسیم و کاتێ لە ئەستەمبۆڵ بووم گەلێ خزمەتی غەزەتەی (شمس)م دەکرد کە سەید حسەینی ئێرانی خاوەندی بوو ئەو سەردەمە کە رۆژنامەی (شفق سرخ- و مجله فرهنگ) لە تاران دەردەچوو هەمیشە من لە ئەستەمولەوە مەقالەو شیعرم بۆ دەناردن بە ئیمزای سلێمانی توفیق یاخود س. ت)[٥٦]

لە چیرۆکە دیارەکانی پیرەمێرد، چیرۆکی (دوانزە سواری مەریوان) ە، کە پیرەمێرد بە شێوەیەکی ورد و زمانێکی پاراو دایڕشتۆتەوە ناوەرۆکی چیرۆکەکە بریتییە لە بەرەنگاری دوانزە سواری کورد بەرامبەر لەشکرێکی گەورەی عەجەم کەبەنیازی ئەوەبوون بەسەرمیرنیشینی باباندا بدەن و لەناوی ببەن کەلەو سەردەمەدا (ئەحمەد پاشا) حوکمڕانی کردووە.

لە ئەنجامی بڕیارێکی سەیری کوێخای بەکراوا و خورماڵ بۆ راوە بەراز بەگشتی دەچنە راوە بەرازو هاوکاری خەڵکی ناوچەکە دەکەن سەرەتا ئەحمەد پاشا دوو دڵ دەبێ لە بەرەنگاربوونەوە بەڵام دوایی بەپێی دابونەریتی کوردەواری و میللی ئەمە بەخەوش دەزانێ و دەنێرێ بەدوای سوارچاکی ئازاو دلێرداو ئاکامەکەیشی بەسەرکەوتنی دوانزە سوارەکە لە مەریواندا کۆتایی دێ و داستانێکی پڕ لە سەرووی بۆ نەتەوەکەیان تۆمار دەکەن.

سیمای ئەم جۆرە چیرۆکە میللییانە لە چەند خالێکدا خۆ دەنوێنێ. کە دەکرێ بە رووخساری ئەم چیرۆکەو چیرۆکی لەم بابەتە لە قەڵەم بدرێ.

(رێکەوت)یەکێکە لەو سیمایانە، کە بەرێکەوت ئەو رۆژەی خەڵکەکە بۆ راوەبەراز و چوو بوون، ئەو رۆژە ئۆردەی ئێران هێرشی هێنابوو.

٥٥- سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩.

٥٦- پیرەمێرد، سەداییێکی ئاشنا، رۆژنامەی ژین، ژ ٨٥٥ س٢٠ پێنج شەممە ١٦ کانونی دووەمی ١٩٤٧.

(پاڵەوان) لەم جۆرە چیرۆکانەدا بە هێلێکی درامی هەڵکشاودا تێناپەڕێ، بەڵکو پاڵەوان هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی سیفەتێکی رەهای هەیە، یان خێرەوەمەند چاکەیان شەڕخوازەو ناگۆڕێت و هەمیشە کۆتایی و سەرکەوتنیش بۆ پاڵەوانی چاکەخوازە، بە شێوەیەك بەخت و شانس لە بەرژەوەندی پاڵەوانەکەیە، جا گرنگ نییە لە بنیادی رووداو دەرچوون تا ئەوپەڕی زێدەرۆیی و گرێنەدان بە زنجیرەی کات و گۆڕانی شوێنەکان بۆ گەیاندنی مەبەست.

وەکو غەفلەت بەسەر(پیرەمێرد)دا تێپەڕیووە، کە ژمارەی پاڵەوانەکان لە چیرۆکەکەدا چواردەن. کەچی ناونیشانی چیرۆکەکە ئەوە دەردەخات کە ژمارەیان دوازدە کەس بوونە، یان رەنگە چیرۆکنووس وەکو ئیزافەیەکی خۆی بۆ سەر چیرۆکە میللییەکەی ئەو کارەی ئەنجام دابێت.

تەکنیکی چیرۆکەکانیش بە گشتی لەو قۆناغەدا تا وەکو بڵاوبوونەوەی کورتە چیرۆکەکانی گۆڤاری (گەلاوێژ) راپۆرتنووسی و فەرامۆشکردنی رووخسار بووە لە پێناو گەیاندنی ناوەرۆکێکی روون و ئاشکرا ئەویش خۆی لە چەند باسێکی کۆمەڵایەتی وەکو مەسەلەی قومار و دزی و سەرخۆشی و سیفەتی ئازایی کوردو میوانپەروەری و هەندێ لایەنی ئایینی بۆ چارەکردنی گرێی کۆمەڵایەتی و سەربەستی ژندا دەنوێنێ ناونیشانی چیرۆکەکان هەر خۆیان ئەو راستییە دەردەخەن و ناوەرۆکی چیرۆکەکان بەدەستەوە دەدەن [57].

بە کورتی دەتونین بڵێین، ناوەڕۆکی چیرۆکەکان بە شێوەی ریالییزمی رەخنەگرانە کێشە کۆمەڵایەتییەکان دەخاتەڕوو و لە ڕووی ناوەرۆکەوە زۆربەی چیرۆکەکان لە کەلەپوورو مێژووەوە وەرگێڕاون بەتایبەتی چیرۆکەکانی پیرەمێرد لەژێر کاریگەری ئەدیب و چیرۆکنووسەکانی تورکی، کە لە کاتی ژیان بەسەربردنی لە ئەستەمبۆڵدا سوودی لێ بینیون. لە ڕووی تەکنیکیشەوە زنجیرەی رووداوەکان و دانانی ناو بۆ پاڵەوانەکان و دیالۆگ و رەگەزی هاندان و سەرەتاو لوتکەو کۆتایی (موپاسان) ی هەستی پێ دەکرێت ئەگەرچی بە شێوەیەکی سادەش بێت.

هەر لە سەرەتای ساڵی (١٩٣٥)ەوە وەزعی سیاسی ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو خراپی بوو، تەقینەوەی جەنگی دووەمی جیهانی، باری جیهانی بەجارێك شێواند، ئاسیای ناوەڕاستیش کە بەشێکی جیهانە، هەمان ئەو بارەی بە خۆیەوە دی. لەگەڵ بینەو بەردەی ئەم جەنگە زۆر لە

---

٥٧- ه/ کردەوەی دەروێش، گ؛ یادگاری لاوان/ بەغدا، ١٩٣٣.

- ؟ هەرچی دەکەی دوامینی رەچاوکە گ، روناکی،ژ١ ١٩٣٦/٤/٢٥.



گەلانی ژێردەستەو چەوساوە بە هەلیان زانی و لە کیس خۆیانیان نەدا مافی ڕەوای خۆیان وەرگرت.

گەلی کوردیش لە عێراق جموجۆڵێکی سیاسی کەوتە ناو و چەند بەرەو حزبێك دامەزران کە هەموویان ئامانجیان ڕزگارکردنی کوردستان بوو. ئەو بارە سیاسییە بە شێوەیەکی زەق لە نووسینی نووسەرانی ئەو سەردەمەدا ڕەنگی داوەتەوە. جا کە چیرۆکیش لایەنی گەورەی ئەدەبی دابڕیوەو بە تایبەتی کە ئەو کاتە بایەخی پێدەدرا. لە دەرخستنی ئەو بارە درێخی نەکردووە. بەدەرکەوتنی گۆڤاری گەلاوێژ لە ساڵی (١٩٣٩) زیاتر ئەم هەوڵ و تێکۆشانەیان برەوی سەند هەر لەگەڵ دەرکەوتنی یەکەم ژمارەی گۆڤارەکە بەشێکی تایبەتیان تەرخانکرد بۆ چیرۆکی خۆماڵی و چیرۆکی وەرگێردراو.

گۆڤاری گەلاوێژ نەبەردانە پەردەی لەڕووی ئیمپرالییزم و نۆکەرانی هەڵماڵیوە و دەردە کۆمەڵایەتییەکانی خستۆتە ڕوو. لە چیرۆکنووسانی گەلاوێژ بلەو عەلائەدین سجادی و شاکر فتاح و نووری، سەلامی شاعیر پیرەمێرد و فازیل محەمەد عیرفان و کۆمەڵێکی ترمان بەرچاو دەکەون، بەڵام ئەوانەی زیاتر چیرۆکەکانیان بڵاوکردبێتەوە شاکر فتاح و عەلائەدین سەجادی و بلە — ن.

شاکر فەتاح، هاتووە کۆمەڵێ چیرۆکی بڵاوکردۆتەوە لەوانە (مدیربەگ) و (بووك و خەسو) و(دەس پاکی) و (سەرێکی هەیە هەزار سەودا) و کۆمەڵێ چیرۆکی دی. بە شێوەیەکی گشتی لە چیرۆکەکانیدا هەندێ کەموکوڕی کۆمەڵی دەرخستووە، بەڵام ئەو لە ڕوانگەی ئایینییەوە بۆیان دەڕوانێ و لەسەر هێزی چاکەو خراپە چارەیان بۆ دەدۆزێتەوە.

هەروەها بۆ یەکەمجار لەم قۆناغەدا چیرۆك بۆ منداڵان کەوتە ڕووو پەندو ئامۆژگاری و باسی پەروەردەیی لە چیرۆکەکانیدا خرایە ڕوو، هەروەها باسی کێشەی نێوان بووك و خەسووی کردووەو ڕەخنەی ئەوەی لە کۆمەڵ گرتووە کە بە زوویی ژن دێنن و هەڵپەی ژنهێنانیانەو هەروەها ئەوەی دەرخستووە،کە ئایین ڕێگەی لە زانیاری گرتووە. لەڕووی تەکنیکیشەوە زۆر بەهێز نییەو شێوەیەکی سادەو ساکاری وەرگرتووەو زیاتر بایەخی بەناوەڕۆك داوە لە مەرج و جەوهەری هونەری. یەکێ لە چیرۆکنووسە دیارەکانی تری ئەو سەردەمە عەلائەدین سەجادی — یە کە کۆمەڵێ چیرۆکی لە گۆڤاری گەلاوێژدا بڵاوکردۆتەوە، لەوانە (ڕاوەژێژك) و (سیوەنگ و مام ڕێوی) و (شایەکەی رەشەی خەجەلاو) و (لە پێناوی ئافرەتا) و کۆمەڵێ چیرۆکی دی .

به شێوەیەکی گشتی چیرۆکەکانی ئەم چیرۆکنووسەمان زیاتر چەوساندنەوەی جووتیاری کورد دەردەخات بە دەست دەرەبەگەکانەوە. جگە لەوەی هەندێ چیرۆکیشی بۆ منداڵان نووسیوە تێیدا پەندو ئامۆژگارییان دەکات و بەسەرهاتی سەیرو سەمەرەیان بۆ دەگێڕێتەوە.

هەروەها زۆر بە ڕێکوپێکی باسی ئەوەشی کردووە کاتێ، کە ئاغاو دەرەبەگەکان ئیشێکیان بە جووتیاران بێت یان هەڵبژاردن بێت بە زمانێکی لووس و بەچاکی ڕەفتاریان لەگەڵدا دەکەن و بەشداری زەماوەندو تازیەیان دەبن. زیاتر ئەم لایەنەی لە چیرۆکی (شاییەکەی ڕەشەی خەجەلاو) دا بەرچاو خستووە. هەروەها باسی دڵدارییەکی بێگەردو پاکی کردووە ئەوەشی ڕوونکردۆتەوە، کە زۆرجار بەهۆی بەشوودانی ئافرەتێکەوە ناکۆکی دەکەوێتە نێوان کەسانی خێزانێکەوەو شەڕو کوشتار دێتە گۆڕێ. وەك لە چیرۆکی (لە پێناوی ئافرەتا) بۆمان دەردەکەوێ کە کۆمەڵێك کەس دەکوژرێن و ژیانی ئافرەتەکەش بە شێوەیەکی تراژیدی کۆتایی دێت. هەروەها لێرەدا دەبێت پەنجە بۆ ڕۆڵی (باوکی شەرعی چیرۆکی سیاسیی کوردی) ڕابکێشین، ئەویش ئیبراهیم ئەحمەد(بلە)یە. چیرۆکنووس بەو پەڕی زیرەکییەوە هاتووە ڕووداوەکان و پاڵەوانی چیرۆکەکانی لە ژینگەی کوردەوارییەوە وەرگرتووەو بە شێوەیەکی خۆماڵی دایڕشتوون.

ناوەڕۆکی چیرۆکەکانیش وەك کامێرایەك وێنەی ئەو بارە سیاسییە و کارە نابەجێ و کەمانەی ڕژێمی کێشاوە. هەروەها جیاوازی چینایەتی کۆمەڵی کوردەواری دەرخستووە.. بۆ ڕاستی ئەم قسەیەشمان چیرۆکەکانی (کوێرەوەری) و (خازێ) و (کەرەلۆتی) و ڕۆمانی (ژانی گەل) بەڵگەن، هەرچەندە ڕۆمانی (ژانی گەل لە ساڵی **١٩٧٣**) بڵاوکرایەوە، بەڵام خۆی لە ساڵی **١٩٥٦**دا دانووسراوە.

هەروەها نابێ ڕۆڵی گۆڤاری (دەنگی گێتی تازە) ش فەرامۆش بکەین لە خزمەتکردنی چیرۆکی کوردی لەم سەردەمەدا، هەرچەند گۆڤارێك بوو لە لایەن باڵیۆزخانەی بەریتانیا لە بەغدا دەردەچوو بۆ بڵاوکردنەوەی پروپاگەندەی خۆیان، بەڵام لەسەر ڕووی لاپەڕەکاندا زۆربەی ژمارەکانی بەشێکی تایبەت بۆ زمان و ئەدەبی کوردی تێدا بەرچاو دەکەوێت، بەتایبەتی چیرۆك،کە چەند چیرۆکنووسێك لە ڕێگای ئەو گۆڤارەوە چیرۆکەکانیان بڵاودەکردەوە وەك : حوسێن حوزنی موکریانی و دڵسۆز(تاهیر ئەحمەد حەوێزی)و ئیحسان مستەفا و فایەق زێوەرو



مەلا عەبدوڵا سەعیدو (ح) ناوێك و هەندێکی تر، بەڵام ئەوانەی، کە زۆر چیرۆکەکانیان بڵاوکردبێتەوە حوسێن حوزنی موکریانی بە پلەی یەکەم و دڵسۆز بە پلەی دووەم دێت.

دوای شۆڕشی (١٤ی تەمووزی **١٩٥٨**)، بڵاوبوونەوەی هەژاری و دواکەوتوویی، لە ئەنجامی ئەو بارە سیاسییەی پێشوو. لە چیرۆکەکانی (حسنۆك)، (نانی سیلاوی)، (هەژاری ئادەمیزاد)، (ئەمەیە بەشمان)، (پەنجا فلس)، (ژیانی هەژاری)، (دز نیم) و گەلێ چیرۆکی دیکەدا ڕەنگی داوەتەوە. هەروەها چیرۆکنووسەکان زۆر بایەخیان بە لایەنێکی کۆمەڵایەتی داوە، ئەویش چەوساندنەوەی ئافرەتە لە سایەی ڕژێمی دەرەبەگایەتی، کە چۆن ئەو خەڵکەیان چەوساندۆتەوەو دەستیان بەسەر زەوی زارو ماڵی جووتیاراندا دەگرت، ئاوا دەستیشیان بۆ نامووسیان درێژ دەکردو کچەکانیان لە کوڕەکانیان یان لە پیاوەکانیان بەزۆری مارە دەکرد. چیرۆکەکان (سزا)، (گوڵچین) و (ژن هێنان بەزۆرە ملی) نموونەی ئەم بابەتەن. یان خۆشەویستی پاك و بێگەردی ئافرەتی کوردیان نیشانداوە بەرامبەر بە خۆشەویستەکەی،کە چۆن گیانیان لە پێناو یەکتردا بەختکردووەو زۆربەی جار فوویان لە چرای ژیانیان کردووەو بە شێوەیەکی تراژیدی کۆتاییان بە ژیانیان هێناوە، وەك لە چیرۆکەکانی (چای شیرین)، (بریا نەهاتیتایەوە) و (شاری خامۆشان) و گەلێ چیرۆکی تردا بۆمان دەردەکەوێت. یان قارەمانی و پاڵەوانییەتی ئافرەتی کوردیان پیشانداوە، کە چۆن بەشداری براکانیان کردووە لە ڕێگای خەباتی دوورو درێژی نەتەوەکەیاندا کە چۆن بەرانبەر بە ئیستعمار بێگانە نەبەردانە جەنگاون و بەشانازییەوە ناوی خۆیان بۆ هەزاران نەوەی داهاتوو لە لاپەڕەی مێژوودا تۆمار کردووە. چیرۆکەکانی (بووکە شوشە) و (ڤیان) ی دەستگیرانی عەوداڵ بەگی و چیرۆکی(شەهیدانی قەڵای دمدم) و (پرشنگ) ی پاڵەوانی (چۆن لەبیرم بچێتەوە)، بەڵگەی ئەم ڕاستییەن. هەروەها باسی شیربایی و کچ بە زۆر بە شوودانیان بە کارێکی ناڕەوا زانیوەو بە ناپەسەندییان داوەتە قەڵەم، بۆیە هاتوون بە هەستی جوان و تەعبیری ڕێکوپێك و وشەی ڕازاوە واقیعیان بە هونەر بەستۆتەوەو قوڵی نووسین ئەو دیمانەیان لێ هەڵماڵیوە، وەك لە چیرۆکەکانی (دوا پێکەنین) و (ژن هێنان بەزۆرە ملێ) و هەروەها گەلێ چیرۆکی دیدا دەردەکەوێت.

یەکێ لەو دیاردە هەرە گرنگەکانی تری چیرۆکی کوردی لەو سەردەمەدا، بۆ یەکەمجار هاتە پێشەوە کێشەیەکی وا بۆ ناو قاڵبی چیرۆکی کوردی، ئەویش چیرۆکی کرێکارانە بوو، کە دەڵێم چیرۆکی کرێکارانە، مەبەستم پێوەندی بە ژیانی کرێکاری کوردەوە، چ لە پێوەندییەکانی خێزان

و چ لە کارکردن و کرێ وەرگرتنیان واتە بە کورتی پاڵەوانی چیرۆکەکانی کرێکاری ڕەش و ڕووت و چەوساوەی کوردن و ڕۆڵی سەرەکی لە چیرۆکەکانیدا دەگێڕن، لە چیرۆکەکانی (کارمان ئەوێت) ی محەمەد مەولود — مەم — و چیرۆکی (ئەمەیە بەشمان) ی د. کاوس قەفتان و (دز نیم) ی سەلاح ئەحمەد و هەروەها لە گەلێ چیرۆکی تر بەرچاو دەکەون. هەروەها لەم ماوەیەدا کۆمەڵی چ چیرۆکی سیاسی ڕووتیش نووسراون. دواتر و تا ئەمڕۆش چیرۆکی کوردی بە شێوەیەکی واقیعبینانەوە مامەڵە لەگەڵ ڕووداو و کێشەکانی سەردەمدا دەکات.

## ریالییزم و رۆمانی کوردی

سەرەتای رۆمانی کوردی لە بەرهەمەکەی (ئەحمەد موختار جاف)ەوە بە ناونیشانی (مەسەلەی ویژان یان چۆن بووم بە خانەدان)دەست پێدەکات، بە واتایەکی دیکە لە کۆتایی بیستەکانی سەدەی بیستەمو لە (١٩٢٧) دا رۆشنفکرێکی وەك ئەحمەد موختار جاف کە پەروەردەی خوێندنەوەی بەرهەمە رۆژئاواییەکان بووەو بەزمانی ئینگلیزی ئاشنا بووە، کاریگەری بڵاوبوونەوەی رۆمانی تورکی نوێو بەتایبەتی (نامیق کەمال)، کە لە ١٩٢١ دا لە لایەن ر (مەعروف رەسافی) شاعیر لە رۆژنامەی (الحوادث) زەمینەی بڵاوکردنەوەی ئەو ژانرە ئەدەبییەی خۆشکرد، هاوکات لەگەڵ ئەوەدا لە ١٩٢٧ – ١٩٢٨ (ئەحمەد موختار جاف)یش، کە ئاشنایەتی لەگەڵ زمانە ئەوروپییەکان بەتایبەتی ئینگلیزیو فەڕەنسی هەبووە رۆمانی (چۆن بووم بەخانەدانو مەسەلەی ویژدان)ی نووسیوە، ئەم خاڵە سەرنجمان بۆ ئەوە رادەکێشێ ئەو رۆژەی کۆمەڵی کوردەواری، کە ئاگایان لە رووداوە ئەدەبییەکانی سەردەمی خۆیان بووە، پەرۆشی نووسینی رۆمان بوون، سەردەمی شیعر کە سەردەمی کۆمەڵگەی خێڵەکیو دنیایی کۆمەڵێکی رۆژهەڵاتی بێئاگای دەنوواند، رێگای لەبەردەم ئەو ژانرە خۆشکرد، کە نووسینو دەرکەوتنی رۆمان خاڵی وەرچەرخانێکی تازەی لەبەردەم کلتوور نوواند، کە ناکرێ بەهەند هەڵنەگیرێ یان دەکرێ لەو گۆشەنیگایەوە بڕوانینە ئەو دەرکەوتنەی رۆمان کە بۆ دوای جەنگی جیهانی یەکەم، واتە دوای روخانی بیری تورکچییێتی دەوڵەتی عوسمانلی، کە کۆسپو لەمپەر بووە لە بەردەم زەینو هۆشیکراوە، بەڵام گەر وەکو مێژوو سەرنجی لێ بدەین، ئەوا بێگومان رۆمانی (شڤانێ کورد)ی عەرەبی شەمۆ و (پێشمەرگە)ی رەحیمی قازیو (ژانی گەل)ی برایم



ئەحمەدو (نازدار یان کچی لادێ)ی حەمە عەلی کوردی.. هتد، نموونەی بەرجەستەی رۆمانی کوردیی قۆناغی یەکەمن.

سەبارەت بە ئاستی رۆمانی کوردی بەرامبەر بە رۆمانەکانی جیهان، ئێمە دەبێ پەیوەندی کۆمەڵایەتیو بونیادی پێشکەوتنی چینەکانو بەرهەم هێنانو کلتوورو مەزهەب لەبەرچاو بگرین، ئەوا هەموو دەزانین مێژووی (فیکر لە رۆژهەڵاتو رۆژئاوا بە دوو ئاراستەی جیاوازدا تێپەڕ بوون، بەو مانایەی (رۆمان)یش وەکو چڵێکی ئەو کلتوورە پانو پۆڕە بە ئاستی جیاوازدا تێپەڕیووە، کۆمەڵی رۆژئاوایی لە سەدەکانی شازدەوە (رێنیسانس)و دواتر چینی بۆرژوا لە رێگای شۆڕشی پیشەسازی و تەکنەلۆژی و فەلسەفە و بیری عەلمانیدا رێگای بۆ سەفەرو گەڕانو چاوکرانەوەی تاکی ئەوروپی خۆشکرد، بیر لە خودی خۆی بکاتەوە، بۆیە زەحمەتە رۆمانی کوردی لەگەڵ رۆمانی رۆماننووسە بەناوبانگەکانی خۆرئاوا بەراورد بکەین، خۆ ئەگەر مەبەست ئەوە بێ کورد تا چەند سوودی لە تەکنیكو داهێنانی ئەوان دیبێو کاریگەری کلتووری ئەوان چەندێك بووە؟ بێگومان ئێمە لە رێگەی ئەوانەوە فێری ئەو قاڵبو تەکنیكو وردەکارییانەی هونەرەکە بووین، ئەوەش، کە هەندێ کەس بە عەیبی دابنێ! عەیب نییە، لە نووکی پێمانەوە تا تەوقی سەرمان لەکاڵاو لە ماشێنو کەرەسەکانی نووسینمانەوە هەمووی دەسکردی ئەوانە، ئەگەر هەندێك بۆچوونی دژ هەبێو پێی وابێ سەرچاوەی ئێمە حیکایەتو داستانی کوردەوارییە دەشێ یەکێ لە سەرچاوەکانی بەدەست هێنانی زانیاری بێ، بەڵام پێم وا نییە ئەمە هەموو شتێك بێت، بۆیە رۆمانی کوردی دەشێ لە چوارچێوەی قۆناغی مێژوویی خۆیەوە هەڵبسەنگێنینو لە چاو بیری رۆژهەڵاتەوە تێی بڕوانین، کەچی لە رۆمانی عەرەبی و فارسی و تورکی.. کەمتر نییە.

بۆ شاکاریش لە رۆمانی کوردیدا پێم وایە ئەمە مەسەلەیەکی رێژەییە، جوانناسیی بەنموونە لە دیدو بۆچوونی ساحێب نەزەرانو خاوەن ئایدۆلۆژیا جوداکان هەریەکەو پێوانەی خۆیان سەبارەت بە ناوەڕۆك، خۆ رووخساریشی هەروەتر نموونەی رۆمانی جوانو سەرکەوتوومان زۆرە، محەمەد موکریو عەبدوللا سەڕاج و نافیع ئاکرەیی و سەلاح عومەر و کاکەمەم بۆتانیو حوسێن عارفو حسام بەرزنجی و شێرزاد حەسەنو بەختیار عەلی و زۆرن زەحمەتە بتوانین ئەوە دیاری بکەین. ناوەڕۆکی رۆمانەکان دەربڕی خەم و مەینەتییەکانی نەتەوەیی و ژێردەستەیی و خەباتی رزگاریخوازی میللەتی کورد بە درێژایە مێژوو دەنوێنن، (ژانی گەل)ی برایم ئەحمەد

و(پێشمەرگە)ی ڕەحیمی قازی و نۆڤلێتەکانی (زڕەی زنجیر)ی مستەفا ساڵح کەریم و (شار) و (هێلانە)ی حسین عارف و (هەرەس) و (سەگوەڕ) و (تۆڵە) و (ئەژدیها)ی محەمەد مەکری و(هەڵکشان بەرەوە لووتکە)و (کیاکسار)ی عەبدوڵلا سەراج نموونەی ئەم بۆچوونەمانن. لە نواندنی باری کۆمەڵایەتی و ناهەمواری و دەرد و مەینەتییەکانی چینی جووتیار و هەژاری کورد بە دەست سیستمی دەرەبەگایەتی وداب و نەریتە ئایینی و کۆمەڵایەتییەکانەوە ڕۆمانەکانی (مەسەلەی ویژدان یان چۆن بووم بە خانەدان)ی ئەحمەد موختار جاف و (نازدار یان کچی لادێ)ی محەمەد عەلی کوردی و نۆڤلێتەکانی (خانزاد)ی جەمال بابان و (جوان)ی مەحموود ئەحمەد (ئازاد) و(زەلیل)ی حسام الدین بەرزنجی و (ماڵئاوا گوڵی خەم)ی هیمداد حوسێن و (حەسار و سەگەکانی باوکم)ی شێرزاد حەسەن و(گولستان و شەڤ)ی حەسەن سلێڤانی نموونەن. هەندێ لەو ڕۆمان و نۆڤلێتانە ناوەڕۆکێکی هونەری و یاریکردن بە وشە و بە سوود وەرگرتن لە تەکنیکی نوێی گێڕانەوەی ڕۆمانی نوێی فەرەنسیی و مامەڵەکردن لەگەڵ مێژووی نەتەوەیی و تەوزیفکردنی کەلەپوور بە شێوەیەکی هونەری کاریان کردووە و لە ناوەڕۆکیشدا بێهوودەیی یان ڕامان و وردبوونەوەی مرۆڤ بەرامبەر بە چارەنووسیی شوومی خۆی و بێگانەیی و غوربەت و نامۆبوون بە خود سیمای ئەو بەرهەمانەیان پێکهێناوە، وەکو: (درز)ی کاکەمەم بۆتانی و (سۆناتای ڕۆح)ی سەراج و(ژنانی ئاو)ی جەبارجەمال غەریب و (تاریکستانی لم)ی صلاح عومەرو (کەمتیار)ی کەریم دەشتی... [58]

## ریالیزم و درامای کوردی

دوا بە دوای خستنەڕووی ڕەوتی شانۆیی لای میللەتانی دراوسێی کورد و بە حوکمی بارودۆخی جوگرافی کوردستان و دابەشبوونی خاکی کوردستان بە سەر عێراق و ئێران و سوریا و تورکیا دا بێگومان بزاڤی شانۆیی لای ئەو میللەتانە کاریگەری بەسەر پانتایی ڕۆشەنبیری کوردی بە گشتی و شانۆییش لە گەڵیدا دیارە. هەروەکو لە پێشەوە روونکرایەوە، یەکێ لە بنیاتنەرانی شانۆی فارسی لە ئێران شانۆکاری کوردی کوردستانی ئێرانە بە ناوی (میر سیف

58- بۆ ناوەڕۆکی ریالیزم لە ڕۆمانی کوردیی هاوچەرخدا بڕوانە: د. عادل مەجید گەرمیانی، ریالیزم لە ڕۆمانی کوردی هاوچەرخ لە عێراقدا، (نامەی ماستەر)، زانکۆی بەغدا، کۆلێجی پەروەدەی ئیبن روشد، ١٩٩٦. ابراهیم قادر محەمەد، ڕۆمانی کوردی لە عێراقدا، (نامەی ماستەر)، کۆلێژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٩٣.



الدین کرمانشاهی)، لە عێراقدا نمایشەکانی (بشارە واکیم) و تیپی نمایشی میسری و تیپەکانی بەغدا کاریگەرییەکی روون بەرچاوی لە ڕەوتی شانۆی کوردی لە کوردستانی عێراقدا هەیە، لە تورکیایش لە ڕێگەی ئەدەبی تورکی، بە تایبەتی لە دوای سەردەمی (تنظیمات) و شۆڕشی (تورکە لاوەکان)ەوە هەلێکی لە بار بۆ هاتنە کایەی یەکەم دەقی شانۆی کوردی لە لایەن نووسەر و ڕۆژنامەنووس و شانۆنووسی کوردی تورکیا عەبدولڕەحیم ڕەحیم هەکاری بە ناوی(مەمی ئالان)[59] هاتەکایەوە، لە هەمانکاتدا لە ڕێگەی حاجی تۆفیق بەگ (پیرەمێرد)ی شاعیرەوە ئەو کاتە لە ئەستەمبۆڵ لە ژێر کاریگەری ڕەوتی ئەدەبی (سەروەتی فنون) و شانۆنامەنووسەکانی ئەو کاتە دابوو، ئەم خولیاو حەزە پاشان پاڵی بە (پیرەمێرد)ەو نا لە دوای گەڕانەوەی بۆ سلێمانی لە دوای یەکەمین جەنگی جیهانی زۆر بە پەرۆشەوە روو لە کەلەپوورو سامانی نەتەوەیی خۆی بکاو بیکاتە کانگەیەکی ڕوون و گەش بۆ داهێنانە ئەدەبییەکانی خۆی لە نووسینی شانۆنامەی مێژووی و فۆلکلۆری، کە ئەدیب و شانۆنامە نووسەکانی تورکیای سەردەمی (تنضیمات) پێوەی ناسرابوون.

یەکێ لە سیما دیارەکانی ئەدەبی تورکی بە ماوەیەك بەر لە چوونی (پیرەمێرد) بۆ ئەستەمبۆڵ و تا چەند ساڵێکیش، کە ئەو لەوێ بوو، ئەوە بووە، کە (چیرۆکە میللییەکانی چیرۆکنووس و ڕۆژنامەنووسیی تورکی ئەحمەد مەدحەت ئەفەندی (١٨٤٤-١٩١٢) و ڕۆمانەکانی هەمان نووسەر، کە ڕاستەوخۆ سوودی لە مێژوو و کەلەپووری نەتەوەکەی وەرگرتبوو و بە زمانێکی سادەی جەماوەریی دەینووسی، جۆرێ لە خەیاڵ و ڕۆمانسییەتیشی پێوە دیار بوو، پاشانیش ڕێبازی نەتەوەیی، کە لە ئەدەبی تورکیدا بە (ئەدەبی نەتەوەیی)بە ناوبانگەو (ضیاء گوك ئالب (١٨٧٥-١٩٢٤) و عمر سیف الدین (١٨٨٤ -١٩٢٠) و فوئاد کۆپرلو (١٨٩٠-١٩٦٦) ئەم نووسەرانە (بەدوای بابەتی نوێ لە وڵاتدا دەگەڕان، و بە تایبەتی لە ناو خەڵکی دەشتەکیدا) بڵاوکراونەتەوە.[60]

59- دەربارەی ئەم شانۆگەرییە بۆ یەکەم جار دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد باسی کردووە، بڕوانە د٠کمال مەزهەر ئەحمەد، تێگەیشتنی راستی و شوێنی لە رۆژنامەنووسی کوردیدا، ل٩٥، تێکستی ئەو شانۆگەرییەو لێکۆلینەوەیەك دەربارەی نووسەر و شانۆنامەکە لە لایەن فەرهاد پیرباڵ بڵاوکراوەتەوە، بڕوانە: گ؛ هیوا، ژ٦، ١٩٩٣، ل ٦٧-٧٣ ٠

٦٠- مختارات من شعر الترکی،ترجمة فاضل جتکر، ١٩٩٥، ص٦ ٠

تا ئێستا سەرەتای نووسینی شانۆی کوردی وەکو (تێکست)، تێکستەکەی نووسەری کوردی تورکیا (ع. رەحمی)یە، کە لە گۆڤاری (ژین) لە ساڵی ١٩١٩دا بەناوی(مەمی ئالان) لە ئەستەمبۆڵ بڵاوکراوەتەوە. [61]

ناوەڕۆکی ئەم شانۆنامەیە هیچ پەیوەندییەکی بە چیرۆکی فۆلکلۆریی (مەمی ئالان) یان (مەم وزین)ەکەی (ئەحمەدی خانی)یەوە نییە، بەڵکو ڕەنگە لاکردنەوەیەك بێت بۆ هەڵبژاردنی ئەو ناونیشانە وەکو بەشێك لە کەلەپووری میللی کوردی، کە ئەو ڕۆژگارە لە (١٩١١) بەدواوە ئەدەبی نەتەوەیی و کەلەپوور و مێژووی نەتەوەیی ببووە بەشێك لە سیماکانی ئەدەبی ئەو ڕۆژگارە، هەروەها لە خوێندنەوەی ئەو شانۆنامەیەدا بۆمان دەردەکەوێت، بیری یەکیەتی ئیسلامی، کە لە دوای ڕاگەیاندنی دەستووری دووەمی عوسمانی لە ١٩٠٨ لە لایەن شاعیر و نووسەری تورك محمد عاکف ئارسۆ (١٨٧٣-١٩٣٩)سەرپەرشتی دەکراو کاریگەری بەسەر (ع. رەحمی)یەوە هەبووە، بۆیە پاڵەوانی شانۆنامەکە (مەم)، بووك (خەزال)بەجێ دەهێڵێ ودەچێتە غەزا لە دژی گاوران و بە ئەرکێکی سەرشانی خۆی دەزانێ، هەروەها نووسەر هەر لە سەرەتای شانۆنامەکەیش دا نووسیویەتی :

**(تیاترۆیا کوردان فەزیلەتا کوردان نۆشی ددەت)**، کە پەیوەستی نووسەر لەو سەردەمەدا بە مەسەلەی ڕەوشت پێشان دەدات، کە لە هەردوو تێڕوانینی مەزهەبی و نەتەوەیی یەوەیە.

کەسەکانی شانۆنامەکە ، بەم شێوەیە ڕیزکراون :

**مەمێ ئالان**

**لەوەند-هەڤاڵی مەمۆ، خولامی میر**

**چاڤڕەش –دایکا مەمۆ**

**خەزال- ژنا مەمۆ**

لە ڕووی بنەماکانی (پیەس) یشەوە، رادەیەکی زۆر سەرکەوتووەو بە قەڵەمی شارەزایەکی خاسیەتە هونەرییەکانی شانۆنامە نووسراوە، ئەو گفتوگۆو ناکۆکی و یەکیەتی کات و شوێن و بابەتەی لە درامای تراژیدیدا پێویستە و دراوەتە پاڵ (ئەرستۆ)وە بە ئاسانی هەستی پێ

٦١- دەربارەی ژیان و کەسایەتی ئەو نووسەرە، بڕوانە: د. فەرهاد پیربال، ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژ٨٢٩، س٣، یەك شەممە ٦/١١/١٩٩٥، ل٦ .



دەکرێ. ئەمەش ڕەنگە دەر ئەنجامی تەوژم و ڕێبازە ئەدەبییەکانی ڕۆژئاوا، بە تایبەتی فەرەنسە بێت، کە لەو ڕۆژگارەدا لە ناو ئەدەبیاتی تورکیدا پەرەی دەسەند.

**لە کوردستانی عێراقدا**، هێشتا بە تەواوی ساغ نەبۆتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵ و ماندووبوونی بێ وچان لە لایەن نووسەران و دڵسۆزانی بواری شانۆیی بەردەوامە، یەکێ لە گیروگرفتە سەرەکییەکانی ئەوەیە، زۆربەی مەکتەب و قوتابخانەکان لە شارەکانی کوردستاندا نمایشی شانۆییان (هەر چەند بە شێوەیەکی ساکاریش بووبێت) پێشکەش کردووە.

بۆ نموونە قوتابخانەی یەکەمی هەولێر لە پاییزی ساڵی ١٩٢١ شانۆیی (سەلاحەدین ئەیوبی) یان بۆ چەند ڕۆژێك پێشکەشکردووە، لە پاش هەولێکی زۆر سەخت هەر ناوی ئەو چەند ئەکتەرەمان دۆزییەوە (عەبدوللا عەزیز کارگەچی، غەریب سەلیم، حسام الدین یحیی، عەبدول موتەڵیب سەید جەمیل،عەلی ئەدیب).(خەڵکێکی زۆر لە باوکانی قوتابیان و پیاوە دیار و ناسراوەکان و هونەر دۆستان ئامادەبوون.....)[62]

ڕەنگە ئەم شانۆگەرییە هەر هەمان ئەو شانۆگەرییە بێ، کە لەو ساڵە دا (١٩٢١) لە لایەن خوێندنگەی ئیسلامی لە شاری مووسڵ نمایشکراوە لەلایەن هونەرمەند (ارشد افندی العمری) بۆ سەر شانۆ دەرهێنراوە، وەکو پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، ئاساییە، بە تایبەتی لە ڕێگەی خوێندکارەکانی شاری هەولێرەوە، کە لەوێ خوێندوویانە.

شانۆی مەکتەبەکان، لەگەڵ سادەییشیاندا، ناتوانرێ چاوپۆشی لێ بکرێ، چونکە لە مێژووی جووڵانەوەی درامای کوردی و عەرەبیش لە عێراقدا تا دوای دامەزراندنی حکوومەتی پاشایەتی عێراق تیپی مۆڵەت پێ دراوی یاسایی نەبوو، هەر بۆیە یاساو دەستووری دامەزراندنی کۆڕو کۆمەڵەکانیش لەو مێژووە بە دواوەیە.

دامەزراندنی (کۆمەڵەی زانستی کوردان) لە ساڵی ١٩٢٦ لە شاری سلێمانی، خاڵی وەرچەخانێکی گەورەبوو لە مێژووی ڕۆشنبیری و خوێندەواری ئەو شارەو کوردستانی عێراق بە گشتی.

ئەم کۆمەڵەیە، لە پاڵ گرنگیدانی بە خوێندن و خوێندەواری، هەوڵی ئەوەیداوە، کە دەوری شیاوی خۆی لە بەرەو پێشەوە بردنی ڕەوتی ڕۆژنامەوانیی و هونەریشدا هەبێت.

62 : محمد بکر تیمور، دەربارەی دراما رەخنە، گ؛ کاروان، ژ٤١، ل٦٤ .

کۆمەڵە بە تایبەتی مامۆستا فوئاد رەشید بەکرو کەریم سەعید زانستی چیرۆکی تەمسیلی (عیلم و جەهل) یان لە شانۆگەری (لولا المحامی)ی (سعید تقی الدین)ەوە وەرگرتووە و بە شێوەیەکی سادە و بێ دیکۆر نمایشیان کردووە.[٦٣] ئەم شانۆگەرییەش هەروەکو دیارە تێکستەکەی وەرگێڕاوە و کوردی نییە وە لە ڕێگەی شاگردانی بەغداوە تەرجەمە کراوەو لە سلێمانی پێشکەشکراوە.

دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٢٧ دا شانۆگەری (نیرۆن)نمایش کراوەو کۆمەڵەی زانستی لە سەرووی هەموویانەوە (پیرەمێرد) زۆر گرنگی پێداوە، تەنانەت لە ڕۆژنامەی (ژیان)دا (اعلان)ی بۆ کردووە و تیایدا هاتووە :

**(شەوی ئەم پێنجشەممەیە کە تەسادووفی٢٧ -٢٨ ی تەمووزی ١٩٢٧ ئەکات لە زانستیدا تەمسیلێکی ئەخلاقی و تەئریخی ئیجرا ئەکرێ.بۆ ئەوانەی بلیتیان وەرگرتووە جێی دانیشتن تەرتیب کراوە،مەئمووری تەشریفات بە پێی بلیت جێگایان پێشائەدا، جێ گۆڕین مەمنووعە. بلیت هەر بۆ یەك کەس کارکاو لە پاش دانیشتن وەر ئەگیرێتەوە.رەجامان وایە رعایەتی ئەم مەوادە بفەرموێ، ئەم مەوادە تەتبیق ئەکات).٦٤**

دوای پێشکەشیکردنی شانۆگەرییەکە، ڕۆژنامەی (ژیان) بە ناونیشانی **(لە بینای زانستیدا تەمسیل)** هەڵسەنگاندنێکی لە بارەی ئەو شانۆگەرییەوە نووسیووەو ئافەرینیان لێدەکات و دەڵێ:

**(.........ئەسلی تەمسیلەکە بە پێنج پەردە زوڵم و ئیستبدادی ئەوەدا بە واستەی سیناتۆ ئیمپراتۆرانی ڕۆماوە نەجات دانی ڕۆماییەکانی تەمسیلی ئەکرد، لە پەردەی ئەوەڵدا موفەسەلەن بۆ ڕزگارکردنی میللەت قەراری مەجلیسی سیناتۆ، سپۆت حیشمەتی ئیمپراتۆر نیرۆن نیشاندرا)٦٥** پاشان بەردەوام دەبێ :

٦٣- چەند سەرچاوەیەك باسی ئەم شانۆگەرییەیان کردوە، بڕوانە:حسن تەنیا، شانۆو شانۆی کوردەواری، ل٥١
کاوە احمد میرزا، دراسات عن الحرکة المسرحیة فی مدینة السلیمانیة،م جلة کاروان،ع ١٨،ص١٠٦.
مصطفی صالح کریم، صفحات مشرقة فی مسار المسرح الکردی، القسم الثانی، جریدة العراق العدد ٢٨،١٢١٩-١-١٩٨٠، ص٣
64 : ڕۆژنامەی ژیان ژ٧٥، س٢،١٩٢٧، ل٣، (بە ڕێنووسی ئەمڕۆ نووسیومانە)٠
65 : ڕۆژنامەی ژیان ژ٧٦، س٢،١٩٢٧، ل١، (بە ڕێنووسی ئەمڕۆ نووسیومانە)٠



**(........ئەم تەمسیلە بۆ ئەوانەی کە میقرۆبی ئیستبداد و فیکری زوڵم و تەحەکومیان لە کەللەدایە دەرسێکی ئەخلاقی و عیبرەتێکی تەئریخی بوو).٦٦**

لەو شانۆگەرییەدا (مامۆستا فوئاد رشید (هەزار ئافەرین بۆ فیداکاریت) دەوری شاژن وە کریم زانستی نیرۆنی زۆرداریگێڕا).[٦٧] جێگەی سەرنجە هەر لە ساڵی ١٩٢٧ دا ڕۆژنامەی (ژیان)ئاماژە بۆ کۆمپانیایەکی بیانی دەکات،کە لە سلێمانی نمایشی پێشکەشکردووە، و تیاترۆی ئەوان، کە چۆن زیان بە باری ئابووری دەگەیێنێ و لە هەمانکاتدا بە کارێکی پێویستیشی دەزانێ بۆ ڕزگاربوون لە خەم و پەژارە و ئاسودەیی دەروون، دەڵێ:

(تیاترۆ !..... لەمەودوا تیاترۆیشمان ئەبێ !.... **قۆمپانیایەکی قەومێك کە چەند ڕۆژێ لەمەو پێش هاتبوون و ئیشیان دەکرد، تەشەبوسیان بە جەلب و هێنانی تاقمێکی تیاترۆ کرد، و ئەم تەشەبوسیان خورج خستە قاڵبی تەتبیقەوە. ئێستا تاقمی تیاترۆیان هێناوە و موساعەدەیان ئیستیحسال کردووە کە یاری بکەن، ئێمە لێرەدا باسی ئەووە ناکەین کە ئەمە عەجەبا بەسەر ئەخلاقی عمومییەدا چەنەوعە تەئسیرێك ئەبەخشێت، ئایا حوسنی تەئسیری هەیە یان سوئی تەئسیرە؟..... و ئایا ئەمە دزی یەك بە ئیقتسادیاتی وڵات ئەگەیەنێ یان نا ؟..... بەڵام ئەوەندە ئەڵێین کە مەملەکەت لەم موئەسەسانە خاڵی نابێ !.... و خەڵقی لە پاش ئیش و کار و مەتاعیبی یەومی بۆ تەتبیبی دەماغ و ئیراحەتی نەفس بە ئەم تەرحە شتانە لزوم ئیحتیاجی یەك حس ئەکا).٦٨**

بۆمان ڕوون نەبۆوە، کە مەبەست لەو کۆمپانیایە کوێندەری بوون و چیان نمایش کردووە و لە کوێ و چەند ماونەتەوە و چەندان پرسیاری تر ؟؟........ تەنیا ئەوە نەبێ کە (ئەحمەد دەنگ گەورە) دەڵێ : وەکو زانراوە چیرۆکی شانۆگەری (جوولەکەی کۆڵ گێڕ) لە نووسینی بوێژی بە ناو بانگ شێخ سەلام لە ساڵی ١٩٢٢ دا نووسراوە . لەو سەردەمەدا تیپی هونەری شانۆگەری میسری بە سەرپەرشتی (بشارە واکیم) بەرهەمی نواندنی لە سلێمانی و شارەکانی تری

٦٦- هەمان سەرچاوە، ل١ ٠
٦٧- غەفور میرزا کەریم، تەقەڵلایەکی دڵسۆزانە بۆ لەناو بردنی خوێندەواریی و کۆمەڵەی زانستی لە سلێمانی، ١٩٨٥، ل١٢٦ ٠
٦٨- ڕۆژنامەی ژیان ژ٧٦، س٢،١٩٢٧، ل٣،(بە ڕێنووسی ئەمڕۆ نووسیومانە)٠

کوردستان پێشکەش کردووە)[٦٩] ، بەڵام ئەم نووسینە (ژیان) لە ساڵی ١٩٢٧ دا بڵاوکراوەتەوە، نازانین ئایا ئەو تیپە لوبنانییە تا ئەو کاتە لە سلێمانی ماوەتەوە یان نا ؟!

درامای میسری بە سەرپەرشتی (بشارە واکیم) بەرهەمی نواندنی لە سلێمانی و شارەکانی تری کوردستان پێشکەش کردوو، بەڵام ئەم نووسینەی (ژیان) لە ساڵی ١٩٢٧ دا بڵاوکراوەتەوە، نازانین ئایائە و تیپە لوبنانییە تا ئەو کاتە لە سلێمانی ماوەتەوە یان نا؟!

هەر لێرەشەوە دەمەوێ ئاماژە بۆ هەندێ تێکستی بڵاوکراوەی رۆژنامەی (ژیان)بکەم، بە شێوەی شانۆیی نووسراون و لە رەگەزەکانی شانۆییان تیا بەدی دەکرێت٠[٧٠]

لە ساڵی١٩٢٧-١٩٢٨ دا کۆمەڵەی زانستی کوردان، شانۆگەری (یۆلیۆس قەیسەر)ی پێشکەشکردوە (مامۆستایان رەمزی قەزاز و شوکرو سەید حەکیم-شارکە رەش و رەشید هەندێ تیپی تر دەوریان بینیوە)، وە لەهەمان ساڵا-یان بە شێوەیەکی وردتر بڵێین لە ساڵی١٩٢٨-١٩٢٩ دا ئەم مەکتەبە چیرۆکی شانۆگەری (شۆرشی فەرەنسا)ی چیشاندا، کە بەرێزان فایەق بێکەس و کەریم زانستی و ا٠ب هەوری و خەسرەوی حاجی ئاغاو٠٠زۆر هونەرمەندیتری شارەکە بەشداری یان کردووە)٠[٧١]

لە ساڵی ١٩٣٠ دا مەکتەبی زانستی کچان، دوو نمایشی پێشکەشکردووە یەکەمیان (مرۆڤ ئەوەی بچێنێت ئەوە ئەدورێتەوە)و دووەمیان (دایکێکی جاهیل) هەردوو شانۆگەرییەکە درامای فێرکردنن و لە بارەی ژیانی قوتابی و گرنگی خوێندەواری و کاریگەرییە بیروباوەری کۆن و دواکەوتووی بەسەر پەروەردەی منداڵ دایە٠[٧٢]

هەر لە هەمان ساڵدا جارێکی، تر شانۆگەری (صلاح الدین ئەیوبی) پێشاندراوە٠ لە ساڵی ١٩٣١ دا، شاری گۆیە هەر لە کۆنەوە شانۆگەری (نیرۆن)یان نمایشکردوە (عومەر

٦٩- دەنگ گەورە، مێژووی شانۆگەری کوردەواری، رۆژنامەی هاوکاری، ژ ١٩٧٢، ١١٦، ل٦٠.

٧٠- بڕوانە: شاکر فتاح، هاواری وگنه خۆشەویستەکەمان، رۆژنامەی ژیان، ژ٥٢، س٢، ٣ی شوباتی ١٩٢٧، ل٣- ٤ ٠

گفتوگۆ نە افراط نە تفریط، لە نێوان (ع) و (م)، رۆژنامەی ژیان، ژ٦، س ١٩٢٧، ٢، ل١-٢ ٠

71 : حەسەن تەنیا، شانۆو شانۆی کوردەواری، ل٥٣-٥٤ ٠

72 : مەغدید حاجی بە کورتی باسە ناوەرۆك و نمونەیەکی کورتی لێ وەرگرتوە بڕوانە: مەغدید حاجی، ئافرەت لە شانۆی کوردیدا، بەغدا ١٩٨٩، ل٢٢٥-٢٧ ٠



عەبدوڵلا) و (سەید نەزیف) بەشداریان تیا کردووە، لە هەمان ساڵیشدا شانۆگەری (کچی کوردستان)یان نمایشکردووە، کە چەند هونەرمەندێکی شارەکە بەشداریان تێدا کردووەو ئەو شانۆگەرییە بۆ ساڵی دواتر ١٩٣١-١٩٣٢ [٧٣]لە هەولێر جارێکی تر پێش کەش کراوە (سەید نقیف)دەوری (کچی کوردستان)ی دیوە٠[٧٤]

دەربارەی ئەو شانۆگەرییە (عزالدین فیچی)دەڵێت: (مامۆستا شێخ نەزیف بۆ یەکەم جار لە مێژووی شاری هەولێر شانۆگەری (کچی کوردستان)ی پێشکەشکر، هەر چەندە بەربەرکانێشی دەکرا، لە شوێنی (چێشتخانەی کۆماری)ی ئێستا، کە ئەو وەخت (چایخانە)بوو٠٠٠ واتە شانۆگەرییەکەی لەو چایخانە پێشکەشکرد٠ بەشداربووانی شانۆگەرییەکەش ئەمانە بوون، کاك فتاح جبار، کاك حیدر سلیم، بەخۆیشی دەوری کچی کوردستانی)٠[٧٥]

لە ساڵی ١٩٣٣ دا (ا٠ب. هەوری شانۆگەری (دڵداری و پەیمان پەروەری)[٧٦] نوسیوەو لە هەمان ساڵدا نمایشکراوە٠ ئەم شانۆگەرییە باس لە خۆشەویستییەکی راستەقینە لە نێوان کچ و کورێکی گەنجی کۆمەڵی کوردەواری دەکات، کە ئامادەن لە پێناوی خۆشەویستی و ئەڤینـدا، ئەو هەموو جەزرەبەو فیداکارییە بنوێنن٠ شانۆگەرییەکە سروشتێکی تراژیدیی هەیە، بەڵام کۆتاییەکەی بە خۆشی و زورنای زەماوەندی هەردووکیان کۆتایی دێت، نووسەری شانۆگەرییەکە خۆیشی دەوری تیا بینیووە٠

لە سالی ١٩٣٥ دا لە شاری سلێمانی شانۆگەری (سەربازی ئازا)، لە لایەن شاگردانی (کۆمەڵی زانستی)یەوە پێشکەشکراوە، لە بەشدارانی ئەو شانۆگەرییە عبدالواحید نوری و رەمزی قەزازو حامید فەرەج و چەند کەسێکی دی بوون٠ دەربارەی ئەم شانۆگەرییە (پیرەمێرد) لە رۆژنامەی (ژیان)دا دەڵێت:

٧٣- ساڵی پێپێشکەشکردنی ئەو شانۆگەرییە لای حەسەن تەنیا لە ساڵی (١٩٣٤-١٩٣٥)ە، بەڵام محمد بکر تیمور راستی کردۆتەوە ساڵە راستەکەی نووسیوە(١٩٣٢) لە هەولێریش جارێکی تر نمایشکراوە بڕوانە: محمد تیمور، دەربارەی دراماو رەخنە، گ؛ کاروان، ژ٤١، ل٧٢، هەروەها:طاهر احمد حەوێزی، مێژووی کۆیە، بەرگی دووەم یەکەم، ل ٢٤٨ ٠

٧٤- محمد تەیموور، دەربارەی دراماو رەخنە، ل ٦٢.

٧٥- رۆژنامەی هاوکاری، ژ ١٩٧٢، ١١٧.

٧٦- ا٠ب٠هەوری، دڵداری و پەیمان پەروەری، چ٢، سلێمانی،١٩٧١ ٠

(ئەم درامە زۆر شتی لێ دێتە بەرهەم، یەکەمیان تەمسیل ینعەتە و زۆر پەسەندەو دووەم چاو لێکەری و پێرەوی و لاسایی مەردانی نەبەرد لە مەعزوو ریشەی دڵی نەوجەوانانـدا بـنج بەستی ئەبێ، سبەی رۆژی زۆر بە ئارەزووەوە فیداکاری خاکە پاکەکەیان ئەکـەن)٠[77] پیرەمێـرد ناوی لێناوە (سوپاهییەکی مەرد)٠

لە هەمان ساڵدا (مەم و زین)، کە لە نووسینی (پیرەمێرد)ە، لـە لایـەن کۆمەڵـەوە نمـایش کراوە، نووسەر ئەوەندە سەرسام بووە بە جوڵەو گفتوگۆو مامەڵەی سەرکەوتووی هونـەرییان لـە گەڵ تێکستەکەو دابەشکردنی دەورەکانیان دا ناچار بووە، بڵێ لـە پیەسـەکەی منیـشیان رەت داوە، بۆیە دوای پێشکەشکردنی تێکستەکە پیرەمێرد دەڵێ:

**(بەتەرەف داریی ناڵێین، بە چاوێکی تەنقید و تەدقیق روانیومانـە ئـەتوانین بڵـێین هێـشتا تەمسیلی وا لیرەدا نەکراوە)٧٨**

لە ساڵی **١٩٣٦** دا چیرۆکی شانۆگەری (مەحموود ئاغای شیوەکەل)[79]ی پیرەمێرد لە لایـەن کۆمەڵەی زانستییەوە دواتـریش لـە **١٩٣٧**دا (شـەریف هەمەوەنـد)ی پیرەمێـرد نمایـشکراوە، هەردوو شـانۆگەرییەکەی پیرەمێـرد لـە مێـژووی نەتەوەییمانـەوە وەرگێـراون و پیرەمێـرد بـە شێوەیەکی هونەری داپڕشتووەو کردوونـی بـە شـاکارێکی هوونـەری و ناوەڕۆکەکەشـی پەنـد و عیبرەتێکی باشە بۆ لاکردنەوە بە لای بەرهەمی نەتەوەیی و هۆشیاری نەتەوەیی، کـە ئومێـدی رابـردوو و ئێـستای میللـەتی کـوردە، لـەو دوو شـانۆگەرییەدا پەنجـە بـۆ توانـای شـاعیر و هونەرمەندی بە توانـا (حـاجی بـاقی بەنگینـە)درێژدەکـەین، تەنانـەت لـە چـیرۆکی (مـەم و زین)یشدا کە نمایش، پیرەمێرد ستایشی رۆڵی ئەو هونەرمەندە دەکات لە دەورەکەیدا٠

٧٧- رۆژنامەی ژیان، ژ ٤٢٦ ، ١٢-١-١٩٣٥.

٧٨- رۆژنامەی ژیان، ژ ١٩٣٦، ٥٦٣ تێکستی هـەر دوو نوسـینگەی رۆژنامـەی (ژیـان)دەربـارەی هـەردوو شانۆگەری (سەربازی ئازا) و (مەم و زین)جارێکی تر لە گۆڤاری کاروان، ژ٤٩،س ١٩٧٦، ٥، لە لایەن یاسین قادر برزنجی، ل٦٣، ٦٤ بلاو کراوەتەوە٠

٧٩- پیرەمێرد، محمود ئاغای شیوەکەل، چ٢، چاپخانەی کاکەی فەلاح، سلێمانی،١٩٨٥ ٠



دوا شانۆگەری ئەو قۆناغە، نمایش شانۆیی (ئافاتی تاعوون لە نـاو حـەیواناتا)یـە، کـە لـە نووسینی (شێخ سەلام)ی شاعیر و لـە سـاڵی **١٩٣٧-١٩٣٨** لـە لایـەن قوتـابی قوتابخانـەی (فەیسەڵی کۆن)ەوە پێشکەشکراوە[80]٠

بەم شێوەیە یەکەمین قۆنـاغی شـانۆی کـوردی، قۆنـاغی سـەرهەڵدان و چـەکەرە کـردن و نەشونماکردنی ئەو هونەرە ژیاری و شارستانییە، کە دواتر لە مێـژووی درامـای کوردیـدا بـووە سەرچاوەو هاندەرێکی باش بۆ بەرەوپێشەوە چوونی ئەو هونەرە٠

٨٠- حەسەن تەنیا، (شانۆو شانۆی کوردەواری)، ل ٥٧.

بنچینەی وشەکە لاتینییە، واتا سروشت،... ئەم ڕێبازە ڕێبازێکی ئەدەبییە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم لە ئەوروپا سەری هەڵداوە پاشان گەیشتە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. ئەم ناوە خۆی زاراوەیەکی فەلسەفییەو بە واتای (ماتریالیزم) یان (دنیایی) دێت.. فەڕەنسا لانکەی سەرهەڵدانی ئەو ڕێبازەیە و پاشان (ئەمیل زۆلا (١٨٤٠ - ١٩٠٢)یش بە ڕابەری ڕاستەقینەی ئەو ڕێبازە ناسرا، بە تایبەتی دوای بڵاوکردنەوەی پێشەکییەکی بە پێز لەگەڵ ڕۆمانی (تیریز راکان Therese raquin) لە ساڵی ١٨٦٧، ئیتر لەوساوە بە ڕابەری ڕۆمانی ئەزموونگەریی زانستییەوە ناسرا.

ئەم نووسەرە لە پاریس لە دایك بووە و فرانچیسن زۆلای باوکی ئەندازیارێکی ئیتاڵی بوو. زۆلا سەردەمی منداڵیی لە باشووری فەرەنسا بەسەر بردووە... لە هەڕەتی گەنجیدا دوای ئەوەی چەند جارێك لە تاقیکردنەوەکانی خوێندنگە دەرنەچووە، مارەی کردووە و دواتر هاتۆتە نێو دنیای نووسین و کاری ڕۆژنامەوانییەوە و ژمارەیەکی زۆر وتاری لە ڕۆژنامەکانی ئەو ڕۆژگارەدا بڵاوکردۆتەوە. بۆ بابەتی ڕۆمانەکانی زۆر گەڕاوەو هاموشۆی خەڵکیی کردووە. زۆلا لە بارەی ڕۆمانی (Les Raugon Macquart)ەوە دەڵێت :

**(من دەمەوێ لە دەسپێکی سەدەیەك لە ئازادیی و ڕاستیی وەسفی خانەوادەیەك بکەم، کە ناتوانێ بەربەستبێ لە هێرش و قەرەباڵخی، تاوەکو بوون و کاریگەری هەبێ بەسەر سەرجەم شتە باشەکاندا و ئامادەبوونێك دروست بکات بە جووڵەو وزەی خۆی دایبڕێژێ و پلانی بۆ دابنێ و بەمەش پێشکەوتن و پەرەسەندنێك لە ژیاندا بهێنێتە کایەوە. ئەو گرژبوون و چوونە ناویەکە کوشندەیەی، کە هاوشان بوو لەگەڵ لە دایکبوونی جیهانێکی نوێ، بەربەستبوو لەبەردەم ئەو هەنگاوەی کە لە سەرەوە باسمان کرد.)**[81]

(زۆلا) هەر لە سەرەتاوە کەوتە لاساییکردنەوەی زاناکان و ئەویش کۆمەڵی وەکو (تاقیگە)یەك هەڵبژارد.

هەندێ لە ڕەخنەگرەکان پێیان وایە ڕێبازی ناتورالیزم لە ئەنجامی کاریگەریی فەلسەفەی ئەزموونگەرییدا هاتۆتەکایەوە، کە سەرەتاکانی ئەو فەلسەفەیە لە لایەن (جۆن ستیوارت

٨١- ئێمیل زۆلا١٨٤٠-١٩٠٢) دامەزرێنەری بزاڤی سروشتگەرایی لە ئەدەبدا، وەرگێڕانی: تاهیر عوسمان، گۆڤاری: نووسەری نوێ، ژ ٣٢،٢٠٠٦، ل ١٥٤.



میل)ەوە جێگیر بوو، کە تیایدا داوای بەرهەمی زانستیی دەکرد و بە تەنیا هەقیقەتی لە قەڵەم دەدا و پێی وابوو هەر زانستی ئەزموونگەرییە، کە دەمانگەیەنێتە زانستێکی یەقیندار.

پاشان (زۆلا) سوودی لە دەستکەوتەکانی (زانستی بۆماوەیی - علم الوراثة - وەرگرت، لەم ڕووەوە دەیوت :

(ڕەوشت و سۆز زۆر بە توندی پابەندی ئەو یاسایانەن، کە بایۆلۆژی و فیسۆلۆژی دەجووڵێنن...)، ئەگەر لایەنگرانی ئەم ڕێبازە زۆر جار خۆیان بە میراتگری (ریالیزمی ڕەخنەگرانە) دەزانن، بەڵام لە حەقیقەتدا وانییە، چونکە ڕێبازی ناتۆرالیزم لە کۆتاییدا ئەزمونەکانیان بە تەنیا لایەنە سلبییەکانی کۆمەڵی گرتبۆوە و تەنانەت بۆ نزمترین پلەی کۆمەلایەتی و حاڵەتە ئاسابەدەر و ناوێزەکان.....

بەرلەوەی (زۆلا) ڕوو لە مەیدانی ئەزمونگەریی زانستی بکات، هەر دوو برا (کۆنگۆر) پێشتر هەولی لەو بابەتەیان هەبوو، هەروەها دەبێ ئاماژە بۆ پزیشکی فەڕەنسیی (کلۆربێرنارد) بکەین، کە پاشان لە ساڵی ١٨٦٥دا کتێبێکی بە ناونیشانی (دەروازەیەك بۆ لێکۆڵینەوەی پزیشکگەریی ئەزمونکاری Medecine Experimentale)یەوە نووسی و ڕۆڵێکی مەزنی لە هاندانی (زۆلا) بۆ ئەوەی ئەو ئەزموونانە لەسەر ژیانی مرۆڤ جێبەجێ بکات، بینی.وای لە زۆلا کرد (پرەنسیپەکانی زانست لە پرۆسەی چاودێریی هەموار بکا و بەکاری بهێنێ و پاشانیش لە ڕۆمانەکانیدا گوزارشتی لێ بکات و بیگوازێتەوە بۆ ناو ئەدەب وەك ڕۆماننووسێکیش، کە دۆکیۆمێنت و ماتریاڵی دیکەی کۆدەکردەوەو لێیانی دەکۆڵییەوەو بوون بە بەشێك لە گەڕان و پشکنینی زانستی.)[82]

هەروەها بەر لەو مێژووەش فەلسەفەی (ئۆگست کۆنت) ڕۆڵی خۆی لە هاندانی ئەدەب بۆ ڕووکردنە زانستە ئەزموونگەرییەکاندا هەبوو.

زۆلا لە ڕۆمانەکانیدا هەمو و ئەو بابەتانەی لە نووسن و ئەدەبیاتی ڕۆژگاری خۆیدا پەراوێز کرابوون هێنایە نێو ئەدەباتەوە، ناوەرۆکێکی ڕۆمانێك بۆ بەدکاری سەرخۆشی و ئاکامەکانی، ڕۆمانی (مەست L’assommoipr)، یەکێ بۆ کاری سێکسی و ژیانی ژنانی بەزمگا و شوێنەکتنی رابواردن، ڕۆمانی (NANA).

٨٢- سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥٦.

ڕێبازی ناتۆرالیزم هەروەکو ڕێبازەکانی تر بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕیوە، لە حەفتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا گەیشتە چڵەپۆپەی بەرهەمەکانی و بە تایبەتی ڕووداوە سیاسیی و کۆمەڵایەتییەکانی فەڕەنسا لەو سەردەمەدا بۆ هەڵبژاردنی بابەتەکانیان یارمەتیدەرێکی باش بوون. ناتۆرالیزم لە ئەنجامی ئەو گۆڕانکارییانەی بەسەر کۆمەڵی ئەوروپیدا هاتن بە تایبەتی شۆڕشی پیشەسازی و تەکنۆلۆژی ئەوروپی لە دایك بوو. نەك هەر ئەو ڕێبازە، بەڵکو چەندین ڕێبازی هاوهەڵوێست و دژهەڵوێست هاوکات هاتنە پێشەوە، ئەم هاو هەڵوێست و دژ هەڵوێستییەش شتێکی سەیر نییە، چونکە هەموو ئەو ڕێبازانە لە مرۆڤەوە سەرچاوە دەگرن و لێکۆڵینەوەکانیان بۆ ژیانی ئادەمیزاد و کێشەو تەنگ و چەڵەمەکانی ئەو تەرخانکردووە.

(ناتورالیزم لە بەرامبەر ڕۆمانسییزم و میتافیزیکدا دژ وەستا بوو، بەڵام ناتورالیزم لەوەدا لەگەڵ ڕۆمانسییزمدا یەکی دەگرتەوە، کە هەردوو ڕێباز بە روانینێکی بەرز سەیری جوانیی سروشتییان دەکرد، هەروا لەگەڵ میتافیزیکیشدا لەوە یەکیان دەگرتەوە، کە هەردووکیان لە هەوڵی ئەوەدا بوون، بگەنە ئایدیایەکی دیاریکراو.)[83]، کەوایە دەکرێ بڵێین ڕێبازی ناتورالیزم جۆرە یاخیبوون و سەرکێشییەك بوو لە روانگەی بۆچوونی ماددییانەوە دیانڕوانییە دیاردەکانی ژیان، ڕەنگە هەر لەبەر ئەوەش بێت هەندێ پێیانوایە سەرچاوەی ڕێبازی ریالییزمی سۆشیالیست لەوەوە دەست پێدەکات.

## ناتورالییزم لە ئەڵمانیا

((ڕەنگدانەوەی ئەم ڕێبازە لە ئەڵمانیا لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا دەرکەوت، (سالانێکیش پێش ئەوە بەرخودانی کۆمەڵێکی ناسراو بە گەنجە ئەڵمانەکان Das Junge Deutschland، کە لە بەرامبەر ئەوەی (گۆتە)ی شاعیری گەورە لە رووی ئەو رووداوە سیاسییانەی رۆژ بێهوودەیە رەخنەی توندیان دەگرت و چونکە ڕۆمانسییزمیش رووی لە زیندووکردنەوەی کلتووری سەدەکانی ناوەڕاست کردبوو و لە باری سیاسییشەوە مەیلی رابردووخوازی هەبوو، مەحکوم دەکرد. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، مەیلی ریالییزم، کە گەشەپێدانی زانستە سروشتییەکان و پووچەڵکردنەوەی بیروباوەڕی ئایینی لە بەرامبەر هەڵوێستی سیاسی و گەشەی ئابووری ئەڵمانیای دوای جەنگ ١٨٧١ی بەرقەرار کردبوو، لە ئەدەبیاتدا بووە

---

٨٣- د.نبيل راغب، المذاهب الادبية من الكلاسيكية الى العبثية،ص ١٢٧.



ڕێگە خۆشکەرێك بۆ ڕێبازی ناتۆرالییزم، کە لایەنگرانی (گەنجە ئەڵمانەکان)داوایان دەکرد، بەو مەبەستەی دەبێت لە نێوانی ئەدەبیات و ژیانی کۆمەڵایەتیدا پێوەندییەکی راستەقینە بێتە کایەوە. سەرەتا بۆچوونی ئەو ناتۆرالییزمانە خۆی دژ بە مەسەلەی رەوشتی و کۆمەڵایەتی دەنواند، تەنانەت جارێکیان لە ئەنجوومەنی (پروس) گوتراوە دەبێ جێگەی شاعیرانی سەر بەو ڕێبازە زیندان بێت و بە شێوەیەکیش رووبەڕووبوویان بوونەوە نمایشەکانی ناتۆرالییزمەکان بە نهێنی و تایبەتی پێشکەش دەکران و هەندێ جاریش لە دەرەوە - سویسرا — چاپ دەبوون، بەڵام زۆری نەبرد، کە جموجۆڵەکانی ئەم بزووتنەوەیەش ئاشکرا بوو و کۆمەڵی ئەڵمانییش ئامادەیی ئەوەی دەردەبڕی، کە ئەو بزووتنەوەیە لە خۆ بگرێت. لە راستیدا بە پێچەوانەی ناتۆرالییزمەکانی (بەرلین)، کە تەنیا باسی ریالییزم و حەقیقەتییان دەکرد و ناتۆرالییزمەکانی (میونیخ) یش بیرو بۆچوونی نەتەوەیی و نیشتمانییان نیشان دەدا.... رابەرانی ئەو بزووتنەوەیە، کە کەوتبوونە ژێر کاریگەری مارکس و داروین و ئەمیل زۆلا و هەندێ لە نووسەرانی رووسیا و ئەسکەندەناڤی پێیان وابوو ئامانجی ئەدەبیات بریتییە لە وەسفکردن و وێنەکێشانی راستیی ژیان بە بێلایەنی و بە شێوەیەکی زانستییانە و خەوش و کەموکورتییەکانی ژیان وەکو خۆی. لەم رووەوە دیمەنی پەیوەند بە ژیانی خەڵکی عەوام و هەژاری و مەینۆشی و هەرزەیی سێکسی و کەم ئەندامی دەرئەنجامە بۆماوەییەکان لە ئەدەبیتی ئەو ماوەیەدا رەنگیداوەتەوە. ئەو ژانر و قاڵبەی کە زیاتر لەو ڕێبازەدا دەرکەوت و خۆی دۆزییەوە چیرۆك بوو، بەڵام شانۆییش لەو زەمینەیەدا زوو بە زوویی گرنگی پەیدا کرد و تەنیا شیعری لیریك نەبێت لەو مەیدانەدا هیچ دەسەڵات و پایەیەکی نەبوو. ئارنۆ هۆلتس (١٨٦٣ — ١٩٢٩)ی شاعیر و نووسەری ئەڵمانی بە باوکی ناتۆرالییزمی لە قەڵەم دەدەرێت و لەگەڵ یۆهانس شلاف (١٨٦٢ — ١٩٤١)دا هەوەڵێن سەرمەشقی ئەدەبییان لەو مەیدانەدا پێشکەشکردووە. هۆڵتس لە نامەیەکدا بە ناوونیشانی (هونەر، بوون، و یاساکانی)، کە لە ساڵی ١٨٩١دا بڵاوی کردۆتەوە بنەما تیۆرییەکانی ئەو ڕێبازەی روونکردۆتەوە. ئەمە بێجگە لەوەی ئۆتۆبرام (١٨٥٦— ١٩١٢) و (ئەلفرێد کیر ١٨٧٦ - )، کە لە بواری رەخنەی شانۆییدا رەواجیان بەو ڕێبازە داوە، هەروا میکایل ژۆرژ کۆنراد (١٨٤٦ — ١٩٢٧) هەوڵی دەدا لەسەر شێوازی ئەمیل زۆلا درێژە بە نووسین بدات، هەروا دەبێ لێرەدا یادێکیش لە دووی برای شاعیر و نووسەر بە ناوی هاینرش هارت (١٨٥٥ — ١٩٠٤)و یۆلیۆس هارت (١٨٥٩-١٩٣٠)، کە بە رەخنەگرانی میانڕەوی ئەم ڕێبازە دەژمێردرێن، بکەین. ئەو گۆڤارانەی لە لایەن

کۆنراد و برایانی هارت بۆ بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی سەر بەم ڕێبازە بڵاو دەکرانەوە، هەوڵ و کۆششێکی زۆریان دەکرد.

لە نێو ڕەخنەگرانی ناسراوی سەر بەو ڕێبازە ناوی (وێلهێلم شێرەر ۱۸٤۱ — ۱۸۸٦) زۆر بەرچاوە، کە شاگردی کارل لاخمان و لە نوێنەرە دیارەکانی ڕەخنەی شیکاری دەژمێردرێت و وتەیەکی ناسراوی هەبوو، کە دەیگوت ئەو شتەی لە ڕەخنەدا مایەی سەرنجە بریتییە لە **(ئەوەی بە میرات ماوەتەوە، ئەوەی بە ئەزموون بە دەست هاتووە، ئەوەی لێوەی فێر بوویت)** ( Ererbte Das Das Erlebte Das Erlernte)، لە ڕاستیدا بنەماکانی شێوەی ڕەخنەی شیکاری بەو شێوەی، کە ئەو دەیویست بەیان دەکات. ئیدی بەم جۆرە، لەو شێوە ڕەخنەیەی لای ناتۆراڵییزمەکان باو بوو، هەندێ چەمکی وەکو بۆماوەیی، ژینگە، هۆکاری دیاردەکان،تەوەری سەرەکی گفتوگۆکانیان بوو و مەسەلەی کاریگەری دەرەکی و وردەکارییەکانی ڕووداویش گرنگییەکی تایبەتی پێدەدرا.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا یاخیبوون بەرامبەر گیانی چەسپاو و شیکاری، لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا لە ئەڵمانیا و هەموو وڵاتانی تری ڕۆژئاوا وردە وردە فراوانتر دەبۆوە. بە تایبەتی کە بزاڤی ڕەوشتی و مرۆڤایەتی ئەم ڕێبازە بە هۆی دووبارەبوونەوە و خۆ جووینەوە، بێ بایەخ بوو ئەوەی بۆ ناتوراڵییزمەکان مایەوە تەنیا ریالییزمییەکی ئاوێتە بە توندوتیژی و پیس نەبێ هیچی تر بۆ نەمایەوە. هێرمان بار ۱۸٦۳- ۱۹۳٤)ل ە نامەیەکدا بە ناونیشانی (زاڵبوون بەسەر ناتوراڵییزم) بە ئاشکرا ئەوە نیشان دەدات، کە ناتوراڵییزم لە توانای ئەفراندن و داهێنانی شاکاری هونەریی نییە و بە دەرکەوتنی ئارەزوو و خواستی تازە بە تایبەتی ئارەزووی ڕۆمانسییزم و کلاسییزم، ڕەخنەو ئەدەبیاتی ئەڵمانی ڕەوتێکی تازەی وەرگرت. لە نێوان ساڵانی ۱۹۰۰ - ۱۹۱۰ ڕۆمانسییزم بە شێوەی جۆراو جۆر دووبارە دەرکەوتەوە، تاك گەرایی و دەروون گەرایی و ڕاکردن لە ژیانی ڕاستەقینە و گەڕانەوە بۆ ژیانی ڕابردوو گاڵتە کردنێك بوو بە ئەدەبیاتی ئەو ساڵانە. ئەو شێوە جۆراو جۆرانەی ڕۆمانسییزم بریتی بوو لە سیمبۆلیزم Symbolismus، کە بە پێکهاتەیەکی تازەی ڕێبازی ریالییزم و ڕێبازی ڕۆمانسییزم دەژمێردرێت، دەربڕینخوازی Expressionsmus، کە وەکو ئالتەرناتیڤێکی ناتوراڵییزم وابوو و ئایدیالییزمی کلاسییزمی نوێ، کە ئامۆژگاری نووسەرانی بۆ گەشانەوەی سەردەمی شیلەر و لیسینگ دەکرد.))[84]

٨٤- لەم کتێبەوە وەرمگێڕاوە: د.عبدالحسین زرین کوب، نقد ادبی، چاپ ششم، ۱۳۷۸، ص۵۸۸ -۵۹۱.



## خاسیەتەکانی ڕێبازی ناتۆراڵییزم

١ — یەکەم خاسیەتی لایەنگرانی ئەو ڕێبازە هێنانە ناوەوەی چەند ڕێگەیەکی زانستی بوو بۆ نێو ئەدەب بۆ ئەوەی ئاسانتر بگەێنێتە هەقیقەت و پیشاندانی واقیع.

٢ — بە لای ئەوانەوە وەزیفەی ئەدەب لێکۆڵینەوەو دۆزینەوەی ئەو یاسایانەی کە مەزاری ژیانی تاکەکەس لە کۆمەڵدا دەستنیشان دەکەن و پیشاندانی خەوشەکانی کۆمەڵ زۆرِ بە وردبینی یەوە لە ڕوانگەی زانایەکی ناتۆڕالیزمییەوە.

٣ — ناتۆراڵییزمەکان لە ژینگەی کۆمەڵایەتیان دەکۆڵییەوە، چونکە پێیان وابوو کاریگەری زۆری بەسەر کۆمەڵەوە هەیە و لەم ڕووەوەش لە ژێر کاریگەری تیۆری ڕەخنەگری بەناوبانگی فەڕەنسیی (تین)دا بوون، کە ژینگە بە یەکێ لە فاکتەرەکانی لە دایکبوونی دەقی ئەدەبی دادەنێت.

بەڵام یەکێ لە خەوشەکانی ناتۆراڵییزمییەکان ئەوە بوو تەنیا هەڵبژاردەیەکی زۆر کەمیان لە چینەکانی کۆمەڵ وەردەگرت و بە تایبەتی ئەوانەی پایەی کۆمەڵایەتیان زۆر نزمە.

٤ — لەسەر ئەو بنچینەیە ناویان لە خۆیان نەنابوو، کە هەر شتێ لە سروشت دەبینن لاسایی بکەنەوە، یان ئەدیب ڕێگە بەخۆی بدا بە ئارەزووی خۆی سروشت بخاتە قاڵبی ئەدەبییەوە، بەڵکو بە لای ئەوانەوە ناتوراڵییزم ڕێگەیەکی تازەیە بۆ چارەسەری ئەدەب، بیروبۆچوونەکانی لە گیانی زانستییەوە سەرچاوەی هەڵگرتووە.

٥ — ناتۆراڵییزم ئەو بیرانەیان ڕەتدەکردەوە، کە دەستنیشانی جۆری بابەتی ئەدەبیان دەکرد. بەڵکو ئەوان پێیان وابوو. هەموو بابەتێکی ژیان بۆ ئەدەب دەست دەدات.

٦ — ناتۆراڵییزمەکان جیاوازییان خستە نێوان سەرنج و ئەزموونگەرییەوە، سەرنج و ڕوانین بەلای ئەوانەوە بەکارهێنانی هۆیەکانی لێکۆڵینەوەیە لە دیاردەکانی سروشت وەکو خۆی بێگۆڕین، بەڵام ئەزموون بەکارهێنانی هەمان هۆیەکانی پێشووە، بەڵام بۆ گەیشتن بە ئامانجێك.

ناوەکەی : (پەرناس) ناوی چیایەکە لە یۆنان، گوایە خواوەندی شیعر (میوز) لەوێدا نیشتەجێیە. رێکەوتیش لەو مەسەلەیەدا دەوری خۆی بینیوە، یەکێ لە دەزگاکانی بڵاوکردنەوەی کتێب لە فەرەنسا کۆمەڵە هۆنراوەیەکی نوێ لە بەرگێکدا کۆکردەوەو بەو کۆمەڵە شاعیرە نوێخوازەی گوتووە (پەرناسیی هاوچەرخ). بە پێچی بیروڕای زۆربەی رەخنەگران رابەری راستەقینەی ئەم رێبازە ئەدەبییە (لۆکێنت دی لیل)ە، ئەو نووسەرەی، کە هەمیشە نارەزایی زۆری بەرامبەر رۆمانسییەکان دەردەبڕی لە بەرامبەر ئەوەی، کە زیاد لە پێویست خۆیان بۆ لایەنی خودی خۆیان تەرخانکردووە.

بنەماکانی ئەو رێبازە بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا لەسەر بنەمای فەلسەفەی میتافیزیکی ئیستاتیکی دامەزراوە، ئەو فەلسەفەیەی،کە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم بە دواوە بە هەموو ئەوروپادا بڵاو ببووەوە.

رابەر و لایەنگرانی ئەو رێبازە لە ژێر کاریگەری فەلسەفەی میتافیزیکی (کانت)دا بوون، کە دەیوت : (شاکاری هونەری خاوەندی چەندین خاسیەتی جەوهەریی تایبەت بە خۆیەتی)، بە پێی بیروڕای (کانت) شیعرییان لە هەموو مەبەستێکی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی بێ بەری دەکرد و فۆرم (رووخسار)یان بە مەبەستی سەرەکی هونەر دەزانی بۆیە زۆرجار دەستەواژەی هەوادار و لایەنگرانی (هونەر بۆ هونەر)یان بۆ بەکاردەهێنان و (تیۆفێل گۆتێیە ١٨١١-١٨٢٢)یش یەکێك لە لایەنگرە توندرەوەکانی بوو.[٨٥]

رەنگە دیارترین خاسیەتی ئەم رێبازە ئەوە بێت، کە نووسەرانی داوای هونەرێکی پاك و بێگەردیی دەکرد دوور لە بۆچوون و ئایدیالۆژیای سیاسییان دەکرد، بە شێوەیەك، کە شاعیرو نووسەر ببێتە زۆرناژەن و مەراییکەر بۆ پارت و لایەنێك و بەڵکو لەجیاتی ئەوە وەکو هەر سەنعەتێکی دی دەسرەنگینی و وردەکاری خۆی لە هەڵبژاردنی وشەو تەقاندنەوەی زمانی شیعریی تەرخان بکات بۆ گەیشتن بە حاڵەتی داهێنان و ئەفراندن. لە راستیدا ئەم رێبازە وەکو کاردانەوەیەك وابوو بەرامبەر پێشکەوتنی زانستە سروشتییەکان، هەروەها پەرناسییزمەکان هاوکات رەخنەیان لە ریالییزمەکان دەگرت و دژی رۆمانسییزمەکانیش بوون، کە لە قووڵایی خودی خۆیان مەلەیان دەکرد و بە هەموو شێوەیەك لە واقیعی راستەقینە دوور کەوتبوونەوە.

---

٨٥- بۆ ئەو کاریگەرییە بڕوانە: د.محمد غنیمی هلال، النقد الادبی الحدیث،القاهرة،١٩٧٧،ص ٢٨٩-٢٩٠.



## خاسیەتەکانی پەرناسییزم

١ — یەکەم خاسیەتی ئەو رێبازە ئەوە بوو، خۆی لە هەموو ئەرکێکی کۆمەڵایەتی و رەوشتی دوورە پەرێز دەگرت، لە جیاتی ئەوانە بە پلەی یەکەم جوانناسیی و مەسەلەی داهێنان لە فۆرم و ترپەی مۆسیقی شیعردا دەدۆزییەوە. واتا شیعر بە لای ئەوانەوە دوور بوو لە مەسەلەی سۆز و ئەندێشە بەقەد ئەوەی بیریان لە سەنعەتی شیعر دەکردەوە.



کانت

٢ — پەرناسییزمەکان زۆر بە توندی روویان لە کەلەپووری یۆنانی کردبوو و دژ بە مەسیحییەت بوون، بەمەش خۆیان لە کلاسییزمەکان نزیك دەکردەوە.

٣ — چونکە هەموو هەوڵ و کۆششێکیان بۆ (رووخسار) بوو، بۆیە ناوەرۆکیان پشتگوێ خستبوو، بۆیە شیعر دەنگی راستەقینەی سەردەم نەبوو و لە هەمانکاتدا لە موعانات و هەڵچوونەکانی شاعیر نەدەکرد. بەڵام بە پێچەوانەوە لە رووی رووخسار لە ئاسانی و سادە و

ساکاری لە دەربڕین دوورکەوتنەوە و شیعر دەگەیشتە لووتکە لە جوانی و لە مەسەلەی فێرکردن دوور دەکەوتەوە و شیعر بۆ شیعر بوو.

٤ — شیعر بەلای پەرناسییزمەکانەوە ئیلهام نەبوو.

٥ — جەماوەری پەرناسییزمەکان، وەکو خۆیان دەڵێن، کۆمەڵە کەسێکی کەمی بە زەوقی بەرزی کۆمەڵ بوو، بۆیە شیعر بەلای ئەوانەوە بۆ گشت کۆمەڵ یان ڕەش و ڕووتی کۆمەڵ نەبوو.

## نموونەی ئەدەبیاتی پەرناسییزم :

### نیوەڕۆ[86]

### Midi

### دەقی لۆکینت دی لیێل

نیوەڕۆ، سوڵتانی هاوینەکان، باڵی بەسەر دەشت و دەردا کێشاوەو هەروەکو سفرە زیوینەکان لە بەرزایی ئاسمای شینەوە دێتە خوارێ. هەموو شتێ خامۆشە. هەوا بێ هەناسە گڕ دەگرێت و دەسوتێت. زەمین لە جلی گڕاوی خۆی لە هۆش خۆی چووە. دەشت و هەرد بێ سنوورەو سەوزاییەکان بێ سایە و ئاوە ئەو کانیاوانەی، کە مێگەلەکان ئاوی تیا دەخۆنەوە وشك بوون. دارستانی دوورە دەستی نۆتەك وتارێك بێ جووڵە لە خەوێکی خۆشدایە.

تەنیا گوڵەگەنمە گەورە گەورە پێگەیشتووەکان، هەروەکو دەریای زێڕین، بێباك لە خەو لە کەناری ئاسۆ دا نقوم بوون و هەروەکو ڕۆچڵە ئارامەکانی زەمینی پیرۆز، بێ ترس و سام پێکی هەتاو هەڵدەدەن. هەندێ جار هەروەکو ئەو ئاهەی لە گیانی سووتاویان دەردەچێت، ئەو شادمانیەی بە چرپە لە ناخیان دەدوێ، شەپۆلێکی پیرۆزو پڕ شکۆ لەسەرخۆ دێتە کایەوە و خۆیان تا دامێنی ئاسۆی تۆزاوی دەکێشن و گیان دەسپێرن.

لەو نزیکانەوە، چەند گایەکی سپی لە نێوان ئالیکدا پاڵ کەوتوون، هێدی هێدی لیك بە بەرەغەبابەی ئەستووری خۆیاندا دەکەن و بە چاوی خومارو لە خۆبایی خەونەکان دەروونی خۆیان کە هیچ کات بە دوایی نایەت، درێژە پێدەدەن.

ئەی مرۆڤ، هەرجارەی بە دڵێکی پڕ لە شادی یان بێزار، دەمەو نیوەڕۆ ڕێت بە باخچەو سەوزاییە درەوشاوەکان بکەوێت، ڕاکە سروشت پڕەو خۆر دەسووتێ : لێرە هیچ شتێ زیندوو

---

٨٦- رضا سید حسینی، مکتبهای ادبی، ص ٤٩٤ — ٤٩٥.



نییە، هیچ شتێ خەفەتبار یان شاد نییە، بەڵام ئەگەر لەو فرمێسك و خەندە بە تەنگ هاتووی و لە فەرامۆشی ئەم جیهانە بێزاریت و دوور لە لێ بووردەیی یان نەفرەت، گەرەکتە تامی چێژی ئۆخەی و پەرێشانی بچێژی. وەرە خۆر بە وتەی کورت لەگەڵت دەدوێ، لە تیشکی تووڕەیی جاویدانی بتوێرەوەو بە دڵێك کە هەفت جار لە نەبوونی فریشتەییدا ڕاچەڵەکیوە، بە هەنگاوی لەسەرخۆ بەرەو دەبەنگترین شارەکان بگەڕێوە.

له ئاکامی ماڵوێرانی جەنگی یەکەمی جیهانیی لە ساڵی ١٩١٤ – ١٩١٨ دا، ژمارەیەك ئەدیب و نووسەری سەر بە چینی بۆرژوای بچووك وەکو نارەزاییی دەربڕین بەرامبەر کاولکاری و ڕووخانی بەها ماددی و مەعنەوییەکانی ئینسان بەیاننامەیەکیان بلاوکردەوەو تیایدا لە دایکبوونی ڕێبازێکی ئەدەبی و هونەریی نوێیان ڕاگەیاند.

دادائیزم خۆی لە خۆیدا هەولدانێك بوو بۆ جارێکی ڕێکخستنەوەی شارستانییەتی بۆرژوا کە ئەنجامی جەنگی جیهانی یەکەمەوە تێکچوو بوو.

لە شاری زیوریخ لە سویسرا چەند ئەدیب و هونەرمەندێك، کە سەر بە وڵاتە شەڕکەرەکان بوون کۆمەڵەیەك یان یانەیەکی شەوانەیان پێکهێناو تیایدا بیروڕای خۆیان لەمەڕ بەرهەمە ئەدەبییەکانی یەکتر دەگۆڕیەوە. (تریستان تزارا Tristan Tzara)، کە بە ڕابەری ڕاستەقینەی ئەو ڕێبازە دەژمێردرێت و خۆی بە بنچینە ڕۆمانییەو نیشتەجێی فەرەنسا بوو، دەڵێ: " ئەم شەڕە شەڕی ئێمە نییە، ناچاریان کردووین بەشداری تێدا بکەین "[٨٧].هەروەها " هۆگۆ بال Hugo Ball"، کە بە دامەزرێنەری یانەی دادائی یان (یانەی ڤولتێرCabaret Voltaire) دەژمێردرێ، دەڵێ: " مەبەستی یانەکەمان ئەوەیە، کە چەند نووسەرێکی بێ لایەن هەن دژی ئەو شەڕەن و وڵاتەکانیشیان، دەژین لە پێناو بەدیهێنانی بەهایەکی باڵاتر".

هاوکات لەگەڵ دادائیزمەکاندا بەیەکەوە چەند بزووتنەوەیەکی ئەدەبی تر، کە نزیك بوون لە یەك سەریان هەڵدا، لەوانە (التکعیبە)، (هەنووکەیی)، (فیوچەرییزمFuturism)، کە هەموویان گوزارشتیان لە گرفتی هۆشیاری نێو چینی بۆرژوا دەکرد. لەو نووسەرانەی، کە دادائیزمەکان.. زۆر سوودیان لە ئەزموونەکانیان وەرگرت.

ئەلفرید جاری، خاوەنی شانۆنامەی (یۆبۆی پاشا) و (جاك فاشیە Jacque Fiche ١٨٩٦ – ١٩١٩)، کە ئەزموونە تاڵەکانی لە بەرەکانی جەنگدا وای لێکردبوو، ڕق و کینە بەرامبەر

٨٧- لەو شەرانەدا زیاتر لە (٥٠٠) نووسەر و هونەرمەند و رۆشنبیر کوژراون، لەوانە: گیوم ئەپۆڵینەر، شارل پێگی Peguy و ئالن فۆرنیە و..، بڕوانە: رضا سید حسینی، مکتبهای ادبی، جلددوم، چاپ یازدهم، تهران، ١٣٨١، ص ٧٥١.



پێ شێل کردنی مافی مرۆڤ دەربڕێ، بۆیە دەڵێت: (مرۆڤ ناچار دەکەن سەربازی لەبەر بکات و خەڵکی تر بکوژێت).

لە ٨ ی شوباتی ١٩١٦ دا دادائییەکان ڕێبازەکەی خۆیان ڕاگەیاند و گۆڤاری (دا دا dada) یان دەکرد. هەر لە سەرەتاوە زۆر کەسایەتی ڕۆشنبیری فەرەنسی پاڵپشتی خۆیان بۆ ئەو بزووتنەوەیە راگەیاند، لەوانە (ئەپۆلینەر) و (لویس ئەراگۆن) و (فیلیپ سۆپۆ) و ئەندرێ بریتۆن.. هتد...

بە کۆتایی هاتنی جەنگییش دادائیزمەکان هەر بەردەوام بوون و لە فەرەنسا گۆڤاری (لیتراتور) یان لە ١٩١٩ بلاوکردەوە و پاشان لە ١٩٢٠ شاعیری فەرەنسیی (پۆل ئیلوارP.Eluard)یش هاوکاری دەکردن.

دادائیزمەکان لە کارە هونەری و ئەدەبییەکانیاندا، نەیتوانی هیچ بەهایەکی باش بە هونەرو شاکاری هونەری ببەخشن. تەنانەت لە بەیاننامەکانیشیاندا ئەو مەسەبەیان ڕوونکردۆتەوە، (تزارا) دەیووت (کارێکی بێ هوودەیە بەدوای جەوهەری ئینسانێکی دا بگەڕێ).

یان لە بەیاننامەکەیاندا هاتووە: " دادا خۆی هیچی ناوێ، هیچ، دەیەوێ شتێ بکا بۆ ئەوەی جەماوەر بڵێن هیچ تێ ناگەین، هیچ، هیچ، هیچ شتێ .. دادائییەکان هیچ پێشکەش ناکەن، هیچ، هیچ بێگومان هیچیش بەرهەم ناهێنن "...

ئەگەرچی ئەو نەهامەتییە (نەبوون – العدم)یەی بە بەیاننامەکەیانەوە دیارە، بەڵام هاوکات هەڵوێستی ئەوان دژ بە چینی بۆرژوایە، چونکە جەنگ و ئەوانەی ڕوویدا هەموو بە درۆ دادەنێنن. تەنانەت زۆرجار هەڵوێستی دژایەتییان بەرامبەر هەندێ مەسەلەی سیاسیی دەربڕیوە، لەوانە لە ساڵی ١٩٢٠ دا (بەیاننامەی بەرلین)یان دەرکرد.

## نموونەی دادابیزم :

**دوو بەش لە بەیاننامەی حەوتەم**

**” لە حەوت بەیاننامەکەی دادا، دوو بەشی بەیاننامەی کۆتایی، کـە بریتییـە لـە شـازدە بەش. بە ناوونیـشانی ئـەوینی لاواز و ئـەوینی تـاڵ، وەردەگـرین، بەشـی هەشـتەم و بەشـی شازدەهەم“.**

**بەشی هەشتەم:**

بۆ نووسینی شیعرێکی دادایی:
ڕۆژنامەیەك هەڵگرە
تۆزێکی بدڕێنە
لەو ڕۆژنامەیە وتارێك هەڵبژێرە درێژییەکەی بەقەد ئەو شیعرە بێ کە خۆت دەتەوێ بیڵێی
وتارەکە لە ڕۆژنامەکە جیاکەرەوە
دواتر هەریەك لە وشەکانی ئەو وتارە بە وردی ببڕە و بیکەرە کیسەیەکەوە
کیسەکە هەڵتەکێنە
ئەو کات هەریەك لە وشە بڕاوەکان یەك یەك دەربێنە
بە وردی بیاننووسەوە
بەو شێوەی خۆی، کە لە کیسەکە هاتە دەرەوە
شیعرێکی هاوچەشنی ئەوەی خۆت دەبێت
ئەوکات دەبیتە نووسەرێکی نوێ و بێوێنە و سەرنجراکێش،
کە خەڵکی ڕەشۆکی هیچ لە بەرهەمەکەت تێناگەن..

**بەشی شازدەهەم:**

**لەو بەشەدا وشەی (ووژژ)[٨٨] ! ٢٧٥ جار دووبارە بۆتەوە و دوا دێڕیـشی واتـا: ((هێشتاکە زۆر دڵگیرە.))**

٨٨- لە جیاتی هۆرل لە کوردیدا ووژژ جوانتر بوو.



Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle
Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle
Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle
Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle
Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle
Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle
Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle
Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle
Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle
Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle
Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle
Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle
Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle
Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle
Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle
Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle
Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle
Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle
Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle
Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle
Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle
Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle
Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle
Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle
Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle Hurle
Qui se trouve encore tres sympathiqe

Tristan Tzara

## دەروازەیەك

یەکێکە لەو ڕێبازە ئەدەبیانەی دوابەدوای خۆی کێشەی زۆڕی دروستکرد. هەندێ لە ڕەخنەگرەکان دەڵێن بەرلەوەی ئەم ڕێبازە وەکو ڕێبازێکی ئەدەبی دەربکەوێ بۆ یەکەمجار وەکو زاراوەیەك لە لایەن شاعیری فەڕەنسیی (گیوم ئاپۆلێنەر - GuillameApollinaire1880 1918)[89] بەکارهاتووەو بە مانای(سەروی واقیع)ەوە دێت.

لە چارەکی یەکەمی ئەو سەدەیە لە فەڕەنسا و پاشان زیاتر لە دەیان وڵاتی ئەورووپی وەکو سویسراو ئینگلتەرا و چیکۆسلۆڤاکیا و لە ئاسیاش ژاپۆن و تەنانەت ئەمریکاشی گرتەوە.

لە ساڵی ١٩٢٤دا ئەندرێ بریتۆن بەیاننامەی یەکەمی ئەو ڕێبازەی بڵاوکردەوە. چەند شاعیرێکی فەڕەنسیی زووبەزوویی پشتگیریان لێ کردوو لە ڕابەرەکانی یەکەمی ئەو ڕێبازە دەژمێردرێت، بەتایبەتی بۆدلێر و رامبۆ.... جێگای سەرنجیشە زیاتر لە هونەرەکانی تردا غەیری شیعر خۆی دۆزییەوە و ژمارەیەك نیگارکێشی بەلای خۆیدا ڕاکێشا، کە تا دوای مردنی بریتۆن (١٩٦٥) یش لەسەر هەمان ڕێبازی ئەو ڕۆیشتن، بەتایبەتی (سلڤادۆر دالی)، کە لەم ساڵانەی دواییدا کۆچی دوایی کرد، هەروەها (خوان میرۆ)وەکو هونەرمەندێکی سوریالی زۆر ناسراوە، بە تایبەتی لە هونەری (کۆلاژ)دا، واتا بە یەکەوە چەسپکردن و بە ستنەوەی پارچەی جیاوازی وێنەو تێکەڵاوکرنی رەنگ و بابەتی جیا بە مەبەستی دروستکردنی تابلۆیەکی هونەریی تازە.

٨٩- لە بارەی ئەم شاعیرەوە بڕوانە : د.حسن هنرمندی، گیوم ئاپۆلینەر، وەرگێڕانی لە فارسییەوە کۆسار فەتتاحی، گ؛ وەرگێڕان، ژ ٢، ١٩٩٧، ل ٤١ – ٤٣.





سلفادۆر دالی

هەندێ تابلۆی سریالی:



دالی: شاری کۆگا دارەکان



دالی: وێنەی شەڕ





میرۆ: ئافرەت و باڵندەی شەو

## هۆکارەکانی سەرهەڵدانی سوریالییزم

ئەم ڕێبازەش هەروەکو ڕێبازەکانی تر کۆمەڵێ هۆکاری تایبەتی بوونە ڕێ خۆشکەر و یارمەتیدەر بۆ هاتنەکایە و جێگیربوونی، لەو هۆکارانە دەتوانین ئاماژە بۆ هەندێکیان بکەین، لەوانە:

١– فەلسەفەی برگسۆن و ڕێبازی دەروونشیکاری فرۆید.

٢– ڕێبازی دادایيزم، کە بە ماوەیەکی کەم بەر لەو ڕێبازە هاتە کایەوە.

٣ – ماڵ وێرانی و ڕووخان و کاولکاری جەنگی یەکەمی جیهانی.

٤ – فەلسەفەی هێگل، کە داوای ڕووخان و لە بەین بردنی ڕابردووی دەکرد و بینای ژیانێکی بەختەوەری تازەی دەکردو دواتریش فەلسەفەی کارل مارکس کە داوای ڕووخانی ڕژێمی سەرمایەداری دەکردو لە جێگەی ئەوە ڕژێمێکی سۆشیالیستی و یەکسانی تیا بنیات بنرێ.

## ئامانجەکانی ئەم ڕێبازە

لە ناوبردن و یاخیبوون لە ژیانی واقیع و بەدواداگەڕانی واقیعێکی بالاتر لە واقیعی ڕاستەقینە. پشت بەستن بە جیهانی (نەست)، کە سێ بەش یان زیاتری عەقڵی مرۆڤی داگیرکردووە...

بەدەرخستنی حەزو ئارەزوو خەفەکراوەکانی جیهانی نەست و غەریزەکان (الليبيدو) بەپێی دەروون شیکاری فرۆید تەنانەت هەندێ لە ئەدەبیان و لایەنگرانی سەر بەم ڕێبازە (ئەفیون) و داوو دەرمانە. بێ هۆشکەرەکانیان بەکادەهێنا، بۆ ئەوەی بکەونە گێڕانەوەی جیهانی نەستی خۆیان و بەدەرخستنیان کە، (منی باڵا) بۆتە ڕێگری ئەو حەزەیان جیهانی خەون بەلایانەوە جیهانی باڵاو بە بەها بوو.

ڕەنگە لەم ڕووەوە کەم و زۆر سوودیان لە ڕێبازی (پەرناسییزم)یش دی بێ کە ئەوانیش واقیعیان ڕەتدەکردەوە و باوەڕیان بە واقیعێکی باڵاتر بوو لەوەی کە هەیە.



## خاسیەتەکانی ڕێبازی سوریالییزم

١- واقیعی ڕاستەقینەیان ڕەتدەکردەوە و بەدوای جیهانێکی خەیاڵیدا دەگەڕان، کە سەرلەنوێ بە ڕامانێکی بنیاتی بنێنەوە، لەم ڕووەوەش توانیان باس لە زۆر شت بکەن و پێوەندی نێوان شتەکان دەربڕن، کە دوورو نزیك پێوەندیان پێکەوە نییە، یان بە دەستەواژەی دی دەتوانین بڵێین مەسەلەی (موستەحیل) یان ڕەتدەکردەوە.

٢ – زۆر بە توندی دژی مەنتق دەجوولانەوە، بەتایبەتی لە مەسەلەی حەقیقەتی شیعردا، ئەم مەسەلەیەش لای ڕابەرەکەیان بریتۆن بە ئاسانی هەستی پێدەکرا، تەنانەت گوزارشت کردن لە شتە ناچیزەکان و شتی پڕوپووچ گرنگی یەکی تایبەتی هەبوو. یان شیعر بەلایانەوە خۆ ڕزگارکردن بوو لە ڕاڕای و نیگەرانی لەسەرووی هەستەکانییەوە.

٣ – بابەتی شیعرەکانیان زیاتر دوان بوو لە حاڵەتە ناوێزەکان و نەخۆشی و تاوان و شێتی ئەمەش لەو ڕوانگەیەوە، کە دەبووایە دەرچوون بووایە لە حاڵەتی هەست و مەسەلە باوەکان، بەڵکو زیاتر دەربڕینی حاڵەتی نەست بوو، هەروەها هیچ گرنگییەکی ئەوتۆیان بە وەسفی دەرەکی نەدەدا، بەهۆی دووری لە دەروونەوە، ئەمەش هەر گەڕانەوە بوو بۆ تیۆرەکانی فرۆید لە بواری دەروونشیکاریدا.

٤ – لایەنگرانی سەر بەو ڕێبازە هەوڵەکانیان لەوەدا یەکی دەگرتەوە، کە حاڵەتی شۆڕش و سیاسەت پەیوەست بە باری کۆمەلایەتی بکەن، پاشان زۆربەی ڕابەرەکانی چوونە ڕیزی حزبی شیوعی یەوە، بەلام یەکێ لەو حاڵەتە ناوێزەکانیان ئەوە بوو بڕوایان بەو دیالێکتێکییەی یان دژایەتییەی نێوان ژیان و مردن و خەیاڵ و حەقیقەت، ڕابردوو و ئێستانە بوو.

٥ – لە بواری زمان شیعرو ئەدەبیات زمانیان تێك دەشکاند یان زمانیان دەتەقاندەوە بۆ داهێنانی ئەدەبی.

٦ - لە بواری شانۆیشدا نووسەرانی سەر بەو ڕێبازە بڕوایان بەیەك بابەت و قاڵب نەبوو لە جۆرەکانی ئەدەب یان دراما، بەڵکو پابەند نەبوون بە زەمەن و شوێنی دیاریکراوەوە زۆربەی کات (لوتکە)ی تیا نەبوو.

## سوریالییزم لە نێوانی رابردوو و ئاییندەدا

سوریالییزم لەوانەیە بزووتنەوەیەکی هەمیشەیی بێت. ئەم ڕێبازە چەند ناوەڕۆکێکی تایبەتی هەبوو، کە جیا بوو لە ناوەڕۆکی (دادابیزم)، کە ئەندرێ بریتۆن لە ساڵانی ١٩٢٠دا دەستی پێکرد.[٩٠]

ڕێبازی سوریالییزم لە سەرەتای سەدەی (٢٠)ەمدا لە پاریس سەری هەڵداوە واتە لە نێوان هەر دوو جەنگی جیهانی واتە(جەنگی یەکەمی جیهانی و جەنگی دووەمی جیهانی)، کە ئەم ڕێبازە بە شێوەیەکی جیاواز لە ڕێبازەکانی پێش خۆی کە داب و نەریتە کۆنەکانی ڕەتدەکردەوە و شیعری بە شێوەیەکی نویێ دەنووسی.

" سوریالییزم سیمایەکی ڕەسەنایەتی پێوە دیارە بەرامبەر ئەو ڕێبازە ئەدەب و هونەرییانەی، کە لە پاشاندا بە شێوەی لاساییکردنەوە لەژێر پەردەی ئەم ناوە کاریان کردووە. بزووتنەوەی سوریالییزم بە شێوەیەکی راستەقینە دامەزراوە:-

ئۆرگانی تایبەتی خۆی هەبوو، وەك " مەڵبەندی سوریالی یان سەنتەری لێکۆڵینەوەی سوریالی " لەگەڵ بڵاوکردنەوەی" گۆڤار".

ئەندامەکانیشی لە چالاکییەکانی کۆمەڵەکەدا بەشداریان کردووە، ئەم بزووتنەوەیە سەرکردەکەی (Andrey Breton)ە، کە ناسراوە بە " پاپای سوریالییزم " هەر ئەندامێکی ئەم کۆمەڵەیە ئەگەر بهاتبایە بە پێچەوانەی ڕێنماییەکانی بجووڵابایەوە ئەوا یەکسەر لەو کۆمەڵەیە دەردەکرا. بەڕاستی سوریالییزم بەرلەوەی بزووتنەوەیەکی ئەدەبی یان هونەری بێت، پرۆژەیەکە بۆ ژیان ".[٩١]

بریتۆن داهێنەرێك بووە، لە شیعرەکانیدا خۆشەویستییەکی بێ سنووری بۆ ژن و شیعر هەبووە و لە بەرهەمی (یەکیەتی ئازاد)دا دەڵێ: (ئەگەر قەسیدە کۆتایی هەیە، ئەوە گوناهی شاعیر نییە، چونکە ژن هەروەکو شیعر بێکۆتاییە، خۆشەویستی (خوداوەندمە).[٩٢]

ئەندرێ بریتۆن سەرکردایەتی ئەم بزووتنەوەیەی دەکردو ئۆرگانی تایبەتی بۆ ئەم بزووتنەوەیە دامەزراندبوو، وە هەروەها ئەم بزووتنەوەیە گۆڤاری بڵاودەکردەوەو و ئەندام و لایەنگریشی لەو ماوەیەدا هەبووە.

---

٩٠- والاس ڤاولی : عصر السریالیه، ترجمە: خالدە سعید، دارالعودە – بیروت، ١٩٨١، ص ٧.

٩١- محمد کاکەیی : سوریالییزم، گۆڤاری وەرگێران، ژمارە (٢)، ١٩٩٧، ل ٤٣.

٩٢- بیار دی بوادیفر، معجم الادب المعاصر، ترجمە: بهیج شعبان، ص ٢٢١.





**ئەندرێ بریتۆن**

" نازیەت لە سییەکانی ئەو سەدەیەدا دەستی نایە بینی هەموو جۆرە هەوڵدانێکی ئەدەبی و هونەری بەمەش ناماقوڵییەت لێرەدا کپ بوو.

لە شوێنێکی تریش سەری هەڵدا ئەو شوێنەش فەرەنسا بوو کە ئەم کۆبوونەوەی ئەم جارە تاقمێکی تر وردە بۆرژاو ئەو بزووتنەوەیان بە ئەدەبێکی گێرەشێوێن و ڕەشبین دایە قەڵەم و خۆیان بە جۆرێکی تر، کە هیچی وای جیاواز نەبوو لەوان، خۆیان پێك هێنا باوەڕیان بە (ئێستاتیکای نائاگایی) هەبوو ".[٩٣]

---

٩٣- ئەحمەد محمد ئابلاخی : سوریالی، ڕۆژی کوردستان، ژمارە (٥٥) بەغداد. ١٩٧٩، ص ٤٢.

لێرەدا (سوریالییزم) دوابەدوای ڕێبازی دادایییزم وەکو ڕێبازێکی تازەو هاوچەرخ هاتە ئاراوە، کە خانەی (نەست)بە یەکێك لە بنەما هەرە گرنگەکانی خۆیان دەزانی و بەرهەمەکانی خۆیان بە ئێستاتیکییەتی بێ هۆش دەردەبڕی و بەرهەمەکانیان بە شێوەی شیعر و هەروەها لە نیگارکێشی و بە شێوەیەکی دەگمەنیش لە شانۆگەریدا بەرچاو دەکەوت.

" لویس ئەراگۆن دەڵێ : " زۆر کەس وا لە سوریالییزم گەیشتوون، کە حاڵەتێکی عەبەسیانە و لەناو خەون و وڕێنەو هەڵوەسە و بێ هودەییدا خنکاوە، ئێمە سوریالییزمان وەکو چەکێك دژی بۆرژوازی و شەڕ و وێرانکاری و دەست بەسەرداگرتن بەکارهێنا، خەباتمان کردو بانگی سوریالییزممان دا بۆ ئەوەی سەربەستی لە چاوی منداڵەکانماندا ببینێ ". [٩٤]



**لویس ئەراگۆن**

٩٤- نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد : ئەراگۆن ژیان و... مردن، گۆڤاری بەیان، ژمارە (٩٥) بەغداد : نیسانی ١٩٨٤، ص ٧٨.



کەواتە ڕابەرانی سوریالییزم چینی بۆرژوازی باڵا دەستبوون و شەڕو وێرانکاری باڵی بەسەریاندا کێشاوە. سەرهەڵدانی ڕێبازی سوریالییزم وەکو چەکێك بووە دژی ئەم کاولکارییەی جیهان و وەك خەباتێك بۆ ئەوەی منداڵەکانیان بپارێزن و بە سەربەستی بژیین.

" دوای بزووتنەوەی (دادایییزم)، لە (پاریس) بزووتنەوەی سوریالییزم سەری هەڵدا،، کە جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ بزووتنەوەی دادایییزمدا نەبوو. سوریالییزم باوەڕی وابوو، کە ژیان دەبێ لە ڕەگەوە بڕوخێ و لەسەر دارو پەردووی ئەو وێرانەیەدا بە شێوەیەکی جوانتر بنیات بنرێتەوە.

ئەم بزووتنەوە دەیویست جیهانێکی نوێ بنیاد بنێ بۆ ئەوەی ببێتە جیهانێکی نوێخواز، ئەم بزووتنەوە نوێیە شۆڕش و بنیادنان بوو، هەر لە کاتی جەنگی یەکەمی جیهانییەوە ئەم ڕێبازە مەیلی بۆ بنیادنان زیاتر بوو.

ئەم ڕێبازە نەیدەویست ببێتە قوتابخانەیەکی ئەدەبی و هونەریی، چونکە ئاواتی زۆر لەوە گەورەترو زیاتر بوو، دەیویست شێوەیەکی نوێ بۆ ژیان دابهێنێ، ئەم ڕێبازە دەیویست نەست و خەونی سەیر لەناو شیعر و نیگارەکانیاندا ڕەنگبداتەوە بۆ ئەوەی ژیان بشێوێنێ و ئەمەش بانگهێشت بکرێ بە واقیع، ئەم ڕێبازە دانی بە بەهرە دانە دەناو ئەمەش هەروەکو لە شۆڕش و بنیاتنانەکانیاندا دەردەکەوێ، دوو وتە هەیە یەکێکیان هی (لوتریامون)ە، خاوەنی " گۆرانییەکانی مالدۆرۆ " یە، کە دەڵێ : " شیعر پێویستە بۆ هەموو کەس پێویستە " و ئەویتر وتەی رامبۆیە، کە دەڵێ : " گۆڕانکاریی ژیان " ە.

چەند کەسانێك بوونە یارمەتی دەر بۆ دامەزراندنی ئەم ڕێبازە نوێیە، لە نیگارکێشەکاندا، وەکو / دشامپ – بیکابیا – شریکو...هەروەها لە شاعیرانیشدا وەکو / فردی – ئەپۆلینێر و کراڤان - ڤاشێ.

شیعرەکانی ئەپۆلێنێر " بە شێوەیەکی ئازاد لە شێوە باوەکانی شیعرنووسین دەردەچێت و لە شیعرەکانیدا لە خودی خۆی دەگەڕا تاکو وێنەو سۆزی ڕاستەقینەی خۆی لە خودی خۆیدا بدۆزێتەوە ".

(ئەپۆلێنێر) بۆ یەکەمجار وشەی سوریالییزمی بۆ ئەم ڕێبازە لە ئازاری ساڵی ١٩١٧ دا پێش ئەوەی بزووتنەوەکە خۆی ئەم ناوە دابنێ، بەکارهێناوە. کاتێ، کە جەنگی یەکەمیی جیهانیی هەڵگیرسا، (ئەندرێ بریتۆن) ئەو کاتە لە کۆلێژی پزیشکی خوێنکار بوو. لە ساڵی

١٩١٥ كرا بە سەرباز، تەمەنی هێشتا ٢٠ ساڵ بوو. بە بنەماكانی تیۆری دەروون شیكاری (فرۆید) سەرسام بوو، بۆیە هەرچەند جارێ لە ماوەی مۆڵەتەكانی سەربازیدا سەردانی پاریسی بكردبایە وای دەكرد، كە (ئەپۆلێنێر– پۆل ڤالێری–ئەندرێ جید) بەرامبەر بە فرۆید بوروژێنێ، بەڵام گرنگیان پێ نەدەدا، چونكە (بریتۆ) باوەڕی وابوو، كە فرۆید گەورەترین هێزو دەسەڵاتی هەیە كە بتوانێ یارمەتی ئادەمیزادی نوێ بدات بۆ دووبارەكردنەوەو دۆزینەوەو ژیانەوەی واتای وشە.

((فەیلەسووف و زانای ئیستاتیكی ئینگلیزیی (هێربێت رید)بۆچوونێكی جیاوازی هەیە و دەڵێت: ڕۆمانسییزم ڕێگەخۆشكەرێكی سروشتیی سوریالییزم بوو، چونكە ڕۆمانسییزم لە واقیعەوە دەست پێدەكات و لە كەش و هەوای خەیاڵدا دەسووڕێتەوە، ئەو خەیاڵش جگە لە زاراوەی نوێی(نائاگایی –نەست)شتێكی تر نییە، بەڵام هەندێ لە ڕەخنەگرەكانی دی بە پێچەوانەی ئەو سەیر دەكەن، ئەوان وای دەبینن، كە ڕۆمانسییزم تەنیا راكردنە لە جیهانی واقیع لە ڕێگەی دووبارە داڕشتنەوەی و دروستكردنی پێوەندییەكی نوێ لەسەر بنچینەی پێوەندی تاك بە كۆمەڵەوە، بەڵام ئەو دیاردەیەی، كە هزرمەندەكان هەموویان وەك چەمكێكی دیاریكراو لەسەری كۆكن ئەوەیە،كە سوریالییزم ڕێبازێكە هەوڵدەدا زیاتر دژایەتییەكان نەوەكو پێكەوە گونجانەكان زیاتر بەرجەستە بكا و ڕەفزی ئەو مەنتقە تەقلیدییە یان سواوە دەكاتەوە، كە دەبێتە بەربەست لەبەردەم ورێنەی خەڵكان و ڕێگەگرتن لەبەردەم نائاگاییان.))[95]

دیارە بێگومان ئەم ڕێبازە بە چەند قۆناغێكدا تێپەڕیوە، بە شێوەیەكی گشتی دەتوانین سێ قۆناغی جیاواز لە ڕەوتی ئەم قۆناغە دیاری بكەین :

**قۆناغی یەكەم :١٩٢٠ – ١٩٢٤:**

لەم قۆناغەدا زیاتر لایەنی ئیستاتیكی بەرجەستە كراوەو جەخت لەسەر بەها هونەرییەكان و شێوازی چارەسەركردنی ناوەڕۆكی نوێ و گشتیی كراوەتەوە لە پێناو پڕۆسەی ئاشكراكردنی

95 : د. نبيل راغب، المذاهب الادبية من الكلاسيكية الى العبثية، المكتبة الثقافية ٣٤٣، القاهره، ١٩٧٧، ص ٢٣١ -٢٣٢.



جیهانی نەست، هەروەها جەخت لەسەر لایەنی سیاسیی و گەڕان بەدوای بەرنامەیەكی ئەوتۆ كراوەتەوە، كە بە كەڵكی پێشخستنی بەها كۆمەڵایەتییەكان بێت.

**قۆناغی دووەم ١٩٢٥ – ١٩٣٠:**

لەم قۆناغەدا بانگەشەی ئەوەیان دەكرد، كە ئەدەبێك سوودی تیا نییە ئەگەر پشت بە كتوپڕییەكی لە خۆوە و دوور لە هەموو كۆت و بەند و قاڵبە كۆنەكان نەبەستێت.

**قۆناغی سێیەم ١٩٣٠ – بەدواوە :**

قۆناغی سێیەم، كە ماوەی سییەكان دەگرێتەوە، ناسراوە بە میانڕەوی و گەڕان بە دوای ناماقووڵ لەبەر ڕۆشنایی ماقووڵدا، بۆ ئەوەی مەیدانی ئەدەب نەبێتە جێگەی هەموو كەس، چونكە هەرچەندە كتوپڕی لەخۆڕا پەسەندیش بێت، بەڵام دەبێ پابەندی هەندێ ڕێ و شوێنی تایبەت بێت.[96]

## ناوەڕۆك و بنەماكانی ڕێبازی سوریالییزم

**١ – گاڵتەو گەپی سوریالی:**

" ئەو پووچەڵ و گەمژەڵیانەی دونیا كە لە نێو ژیاندا بڵاوە، ناكرێت لە بەرچاوی ئەو كەسەی شەیدای نا كۆتاییە نەبێتە پێكەنین ئامێز یا گاڵتەجاڕی، بەرلەوەی نەخشەی ڕێگایەكی نوێ دابنرێت دەبێت تێكبدرێت، بۆیە پێكەنین باشترین چەكە بۆ هەژاندنی تیری مەرایی، ئەی ئەوە ئیمتیازێك نیە گەر مرۆڤ بتوانێت بە پێكەنینی پلار ئامێز لە بەر بەستە كۆمەڵایتیەكان ئازاد بێت ". [97]

سوریالییزم ڕەوشتێكی هەیە ئەویش ئەوەیە، كە دەیەوێت بەرگێكی پێكەناوی بەبەر شتەكاندا بكات، بۆ ئەوەی ئەو شتانەی، كە لە جیهاندا هەن ببنە بابەتێكی گاڵتەجاڕی و خەڵك لە شێوازە كۆنەكانی كە لەسەری راهاتوون، بەم شێوەیە رزگار بكات. ڕەنگە ئەمە

٩٦- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە : د. نبیل راغب، المذاهب الادبیه من الكلاسیكیه الی العبثیة، ص ٢٣٥.
٩٧- ڕێبین رسول ئیسماعیل : گاڵتەوگەپی سوریالی، ڕۆژنامەی برایەتی (ئەدەب و هونەر)، ژمارە ١٦٠، هەولێر : ٢١ / ١ / ٢٠٠٠، ل٨.

ڕێگەیەك بێت بۆ جۆرێك لە سەر ئاوەڵاكردنی ژان و غەمە پەنگ خواردووەكانیان لە هەمبەر ناكۆكی و ناتەباییەكانی واقیع.

**٢ – سەیروسەمەرە (عەنتیكە) :**

" یەكێكە لە بنەماكانی سوریالییزم، واتە ئەو شتانەی كە لەو گەردوونەدا ڕوودەدات وەكو (شێوەی پێكەنین و، نهێنی و، سیفەتی غەریبی)، هەموو ئەمانە ون دەبن و قالبێكی سەیروسەمەرە و سەرسوڕمێن وەردەگرن. هەرچەندە ئەمانەش زۆر دوورن لە باوەڕكردن، بەڵام یەكێكە لە بنەماكانی سوریالییزم و دەچێتە ژێر خانەی سوریالییزمەوە و دەچێتە شتێكی سروشتی لەو ڕێبازەدا ". [٩٨]

**٣ – خەون :**

یەكێكە لە بنەما گرنگەكانی سوریالییزم، چونكە (خەون) پەیوەندی بە سەرووی واقیع و هەستی نائاگاوە هەیە، كەوا لە ئادەمیزاد دەكات ئەو شتانەی هەیە بە شێوەیەكی سروشتی نەبینێت، بەڵكو ڕووبكەنە خانەی هونەرمەندانە.

**١- نووسینی خۆكار(ئۆتۆماتیكی) و ڕێكەوت :**

نووسینی خۆكار یان ئۆتۆماتیكی ئەو جۆرە شێوازە نووسینەیە، كە نووسەر بە تەواوی شاعیر جڵەو بۆ خەیاڵی خۆی شل دەكات و لە نائاگاییەكی تەواودا بۆچوونەكانی خۆی دەنووسێتەوە و زۆرجاریش دەقێكی ئەدەبییە، كە بەشێوەی هەرەوەزییە و چەند ئەزموونێكی جیاوازی چەند شاعیرێكە بێ ئەوەی ئاگایان لە ناوەوەوی یەكتر بێت. (ژۆرژ هۆنیە)لە نامیلكەی (چەپكە گوڵێكی بچووك لە لە شیعری سوریالی) لە بارەی چۆنیەتی نووسینی شیعری (لاشەی خۆشگەوار شەرابێكی تازە دەنۆشێ) دەڵێ ئێمە چەند شاعیرێك لە دەوری یەك مێزدا یاری كاغەزێنمان دەكرد داوامان هەریەكە بێ ئەوەی ئاگای لە ناخی ئەوەی تر بێت یان چۆن وچی نووسیوە رستەیەك بۆ ئەوەی پێش خۆی زیاد بكات، یەكەم رستەی وەها ڕێكخرا (لاشەی خۆشگەوار شەرابێكی تازە دەنۆشێ). [٩٩]

---

٩٨- ایف دوبلیس : السریالیه، بهیج شعبان، داربیروت، ١٩٥٦، ص ٣٢.

٩٩- رضا سید حسینی، مکتبهای ادبی، جلد دوم، چاپ یازدهم، تهران،١٣٨١،ص٩٠٢.



هەوەها ڕێكەوتیش لایەنێكی ترە، كە سۆریالیستەكان جەختی لەسەر دەكەنەوە، یان بە واتایەكی دی پێوەندی نێوان جیهانی ئاییندەو جیهانی ماددی، ئەگەرچی سوریالییزم وەڵامی ئەو پرسیارەی نەداوەتەوە، كە باوەڕی بە جیهانی دوای مەرگ هەیە یان نا؟.

**نموونەی شیعری سوریالییزم :**

**چەند پارچە ڕۆژنامەیەك**

**شیعری ئەندرێ بریتۆن**

ئەندرێ بریتۆن لە وتاری (ڕازی هونەری سیحر ئامێز سوریالیستە) كە لە ساڵی ١٩٢٤ دا بڵاوی كردۆتەوە، دوای خاسیەت و ڕەوشتی شاعیری و نووسینی سوریالیستی، سێ نموونە لەو شێوانەی كە بە بڕینی ناونیشان و وتاری نێو ڕۆژنامەكان و پێكەوە نووساندنیان هاتۆتە كایەوە، دەربڕیەوە. وەرگێڕانی یەكێكیان هەروەكو خۆی بەم شێوەیەیە:

شیعر
زرینگەیەكی خەندە
یاقووت لە دوورگەی سیلان
جوانترین شەربەت
ڕووخسارێكی پەژمووردەیان هەیە
لە زیندان
لە كێڵگەیەكی دوورەخراوە
ڕۆژ بە ڕۆژ
توندتر دەبێت
چاپكراو
ڕێگەیەكی گالیسكەڕۆ
دەتانباتە كەنارە نەناسراوەكان

قاوە
بۆ قەددیسکەی خۆی دوعا دەکا
سەنعەتگەری ڕۆژانەی جوانی ئێوە[100]

* * *

### ڕوانینی تازە

**شیعری پۆل ئێلوار**

دەروازەکانی کۆڵان داخراون
جلەکانی خانەوادەیەکی گەورە
تیشکی هەتاو
پیاو دەترسێنیٚ
مەحکوومە
چونکە خۆی بچووکەو جلەکانی گەورە
شووشە شەرابێك
پەرداخێکی ئاو
دوو جووت عەینەك
یەك دەستەکراس
زۆر
کەمیٚ کەرە
بەڵام بەیانی سێبەری قاچەکانم
بەڵام چراکانی ئاو
بە گرێبەندی ژنهێنانی سێبەری باوکم     ئاسمانی ئاب
دەردێنم     کچەکانی کچی منن

(لە کتێبی ئاکامی خەونەکان)[101]

١٠٠- رضا سید حسینی، مکتبهای ادبی، جلد دوم، چاپ یازدهم، تهران،١٣٨١، ص ٩٣٦.
١٠١- رضا سید حسینی، مکتبهای ادبی، جلد دوم، چاپ یازدهم، تهران،١٣٨١، ص ٩٣٧.



## ڕێبازی سوریالییزم لە ئەدەبیاتی کوردیدا

ڕێبازی دادائیزم و سوریالییزم و سیمبۆلییزم و پەرناسییزم و نیهلیسزم و...هتد، کە هەموویان لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم لە ئەورووپای پڕ لە کێشەو شەڕو شۆڕش و مەیدانی بیروبۆچوون و ئایدیالۆژیای جوداواز لە دایك بوون، کە حاڵەتی ناهومێدی و ماڵوێرانی و خەمۆکی لە دڵی تاکی ئەورووپی پەروەردە کردبوو، بەرهەمی ئەدەبییشی گرتبۆوە.

ئەدەبیاتی کوردییش لەو دەقانەی کەم نەبووە، بەڵام بە ناو و زاراوەی جیاوازی ئایینی و سۆفیگەری و فەلسەفیی جیاوازەوە، نەوك وەك ڕێبازێکی ئەدەبی یان هونەری و هەندیٚ جارییش بە هۆی جیاوازی کلتوورەکان ئەو خاسیەتانە ڕێك و کت و مت وەك یەك نەبوون، بۆیە سەری لە لێکۆڵەرەوە شێواندووە یان دەرەقەت نەهاتن و نەوێران ئەو دەقانەی فەرامۆش کردووە. (نالی، مەلا خدری شارەزووری ١٨٠٠-١٨٧٢)، کە باسی کەرەکەی دەکات:

**عــــاقڵیٚ بوو ناوی کەر بوو، قاطیعی ڕێگەی سەفەر**
**خۆشی سوك تر لە صەد وێڵداشی هەرزە وگێژ و وێژ**[102]

نموونەیەکی ئەدەبی فۆرمالیستییە یان ئەدەبیاتی ناماقووڵە، پیرەمێرد لە چیرۆکی (ئاواتی دڵ - گەشتیٚ بەسەر باڵی پەڕندەی خەیاڵەوە)[103] هەمان ئەو خەیاڵە فراوانەی سوریالییزمەکانە، کە بە شێوەیەکی فانتازی جڵەوی بۆ خەیاڵی خۆی شل کردووە و بۆ بەدیهاتنی حەز و خواستەکان. بنەماکانی ئەم ڕێبازە فۆرمالیستییانە، کە بە پێچەوانەی ڕێبازە کۆنەکان زیاتر ئەدەبیات وەکو هۆکارێك سەرنج دەدەن، ئەمان ئەدەبیات وەکو ئامانجێك سەیر دەکەن و ستاتیکای دەق و شیکردنەوەو ڕاڤەی دەق لەسەر بنچینەی ڕەگەزە پێکهێنەرەکانی ناو خودی دەقەکە دەکەن بە پێوەر بۆ بنەمای ڕەخنەی ئەدەبی.

١٠٢- دیوانی نالی، لێکدانەوەی مەلا عبدالکریمی مودەریس و فاتح عبدالکریم، بەغدا،١٩٧٦، ل ٢٢٤.
١٠٣- بڕوانە، ڕۆژنامەی ژیان، ژ ٣٥٥-٣٥٧، ١٩٣٣.

لە دوای ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١ی خەڵکی کوردستان، بەهۆی گەڕانەوەی هەندێ شاعیر و نووسەری کورد لە دەرەوەی کوردستان، ئەمانیش تا ڕادەیەکی ئاشنای ئەدەبیاتی ڕۆژئاواییی بە زمانی زگماکی ئەوێ ببوون و بۆیە لەگەڵ گەڕانەوەیان یان بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانیان و وەرگێڕانی بەرهەمی نووسەرانی بیانی لە ڕۆژنامەوانیی کوردیدا جۆرە شڵەقانێکیان خستە نێو زەوقی شیعری و ئەدەبی بە گشتی، لەوانە فەرهاد پیرباڵ و ئەحمەدی مەلا، لە ناوەوەش فەرید زامدار و ئەنوەر مەسیفی و ئیسماعیل بەرزنجی و سەباح ڕەنجدەر...

لە بواری چیرۆکیشدا لە ناوەڕاستی حەفتاکانەوە تاوەکو ئەمڕۆ چەندین نموونەی چیرۆکی سوریالی و دادایی و ناماقووڵ و پووچگەرایی و خەیاڵی زانستی لە ئەدەبی کوردیدا دەرکەوتن، کە بە شێوەیەکی گشتی لە مەزرای ئەدەبیاتی فۆرمالیستی ڕۆژئاواییدا دەسووڕێنەوە، محەمەد موکری(نێچیر)[١٠٤] و عەبدوللا سەراج (کۆمەڵگایەکی ئاسنین)[١٠٥] و ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل (تابلۆیەکی سوریالی)[١٠٦] و عەباس عەبدوللا یوسف(چیرۆکێکی زۆر کورت) [١٠٧] و فەرهاد پیربال (پەتاتە خۆرەکان) [١٠٨]،... نموونەی ئەو جۆرە چیرۆکانەیان نووسیوە.

لە بواری شانۆیشدا هەوڵەکانی دانا ڕەوف و شەماڵ عومەر و نیگار حەسیب قەرەداخی و گەزیزە لە هەوڵدان بۆ هەوڵی ئەزموونکاری و نمایشی هەندێ بەرهەمی یۆژین یۆنسکۆ و ستراندبێرگ و سامۆئێل بیکێت و شانۆیی ناماقووڵ بە ڕەنگدانەوەی ئەو کارتێکردنە دەژمێردرێن.

---

١٠٤- محەمەد موکری، نێچیر، کۆمەڵە چیرۆك، چاپی دووەم،سلێمانی، ١٩٩٨، ل٨٣- ٨٦.

١٠٥- عەبدوللا سەراج، کۆمەڵگایەکی ئاسنین، گ؛ بەیان، ژ ١٦، بەغدا،١٩٧٤.

١٠٦- ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل، تابلۆیەکی سوریالی، ڕۆژنامەی هاوکاری، بەغدا، ژ٣٤٨، ١٩٧٦/١٢/٢٩.

١٠٧- عەباس عەبدوڵڵا یوسف، چیرۆکێکی زۆر کورت، ڕۆژنامەی ژین، ژ٢٨، ١٩٩٧/٨/٢٥.

١٠٨- فەرهاد پیربال، پەتاتە خۆرەکان، گ؛ ڕامان، ژ ١١، هەولێر، ١٩٩٧.



**نموونەی ئەم ڕێبازە لە ئەدەبی کوردیدا:**

**چار توخمە**[١٠٩]

**شیعری: عەباس عەبدوڵڵا یوسف**




ئاگر گەر بتسوتێنێ.........................دەبیەوە پەپوولە
ئاو گەر بتخنکێنێ..............................دەبیەوە ماسی
با گەر بتفڕێنێ................................ دەبیەوە باڵندە
خۆڵ گەر بتنێژێ.................................. دەبیەوە درەخت

١٩٧٩/١٠/٢٩

---

١٠٩- عەباس عەبدوڵڵا یوسف، چار توخمە، گ، نووسەری نوێ، ژ١٣، ئاداری ٢٠٠٠، ل ١٥٥.

نووسەرانی ڕێبازی نیهلیسییزم ئەوانە نین، کە خەم و پەژارەو بێ ئومێدی لە دڵی خەڵکیدا دەڕوێنن، نا هەرگیز ئەو نووسورانەن لە خەیاڵ بڵاوی ڕۆمانسیانەو لە دروستکردنی ئومێدی ئاییندەخوازی بە درۆ و ڕەنگڕێژکردنی ژیانی کرێکاریی و ناهەموارییە کۆمەڵایەتییەکان نین، بەڵکو بە ڕۆشنبیری و هۆشیارییەکی گەورەی سیاسیی و کۆمەڵایتییەوە بۆ ژیان دەڕوانن و باوەڕیان بە حەتمیەتی گۆڕان هەیە و لە بەرامبەر چارەنووسیی مرۆڤدا دۆش داماون. لە بەرهەمی گریك و ڕۆمانەوە بگرە تا سەدەکانی ناوەڕاستەوە بە سەدان تراژیدیا و شەڕ و شۆڕ و کارەساتی جەرگبڕ هەوڵ و ماندووبوونی مرۆڤ لە ئەنکیدۆی داستانی (گلگامیش)ەوە بۆ گیای نەمری تا بە ئەمرۆ چەمکی (نەمری) کردووە بە سەراب و بێ ئاکام ماوەتەوە، چۆن مرۆڤ ناکام نابێت ؟ ئەمە ڕاستییەك دەردەخات ئەویش ئەوەیە، کە توانای مرۆڤ دیاریکراوە و هەوڵ دەدات بۆ ئێستای بژیت و زۆرجار پشت لە ڕابردوو بکات، ئەمەش تا ڕادەیك نیهلیسییزم لە پۆزەتڤییزم نزیك دەکاتەوە بەوەی، کە گومان لە ڕابردوو بکات و واقیعی ماددی بکاتە بنچینە بۆ جێبەجێکردنی بۆچوونەکانی. دیارە لێرەدا مەبەست لەو جۆرە گومانەیە، کە لەسەر کایەیەکی ئەپستمۆلۆژی و بیری فەلسەفی دامەزرابێ و بنیادێکی فەلسەفی دروست بکات، وەکو ئەو گومانەی فەیلەسووفە سۆفستاییەکان دروستیان کردبوو. لێکۆڵینەوە لە نیهلیسییزم کێشەکەی لەوەدایە، کە بە شێوەیەکی فراوان پلوپۆی بە نێو ئەدەبیات و فەلسەفە و ڕەوشتناسی و کۆمەڵناسییدا بڵاوبۆتەوە.

لە سەدەی نۆزدەهەمدا هەندێ زانا و فەیلەسووف و بیرمەند کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر بیروباوەڕی نیهلیستی لە ئەورووپا هەبوو، لەوانە فیۆرباخ (١٨٠٤- ١٨٧٢) و داروین (١٨٠٩ — ١٨٨٢) و شۆپنهاوەر (١٧٨٨- ١٨٦٠) و نیتشە (١٨٤٤- ١٩٠٠) و سپینسەر(١٨٢٠- ١٩٠٣)، بە تایبەتی لەو ڕووەوە پشتگیرییان لەو بۆچوونانە دەکرد، کە پێیان وابوو مرۆڤ دەبێت تەنیا باوەڕی بە شتی ماتریال هەبێت و پشت لە بۆچوونە ئایینییە غەیبی و میتافیزیکییەکان بکات. ئەم بۆچوونە بێگومان ڕەنگدانەوەی کۆمەڵگای یان شارستانییەتی ڕۆژئاوایی سەدەی تێکچڕژاوی نۆزدەهەمی ئەورووپا بوو، کە بە گوزارشتی نیتشە (خوا تێیدا مردووە).[110]

لە بواری ئەدەبییدا بەکارهێنانی زاراوەی نیهلیسییزم بۆ یەکەمجار لە ڕۆمانی (باوکان و ڕۆڵەکان)ی ئیڤان تۆرگینێف (١٨١٨ — ١٨٨٣) دا دەرکەوتووە و لەسەر زاری پاڵەوانەکەی، کە

١١٠- عبدالحسین ازرنگ، نهلسیسییزم، مجله نگاه نو، ش ٩، مرداد وشهریور ١٣٧١.



ژیانێکی بێهوودە بەسەر دەبات، نەك بە مانا ڕەشبینییەکەی، بەڵکو بەو واتایەی باوەڕی پتەوی بە گۆڕان هەیە و گومان یان دژی بوونی هەموو دەزگا یاساییەکانە و بۆ واقیعێکی باڵاتر و باشتر تێدەکۆشێ. لە ڕۆمانەکەدا هاتووە:

بازارۆڤ ئیشی چییە؟

ئەرکاد بە زەردەخەنەیەکەوە وتی: لە ڕاستییدا دەتەوێ بزانی ئەو چییەو ئیشی چییە؟

- بەڵێ برازای ئازیزم دەی فەرموو بیڵێ.
- مامە گیان، پێت بڵێم ئەو چی دەکا؟ ئەو نیهلیستییە.)[111]،

بە کورتی ڕۆماننووس لە ڕۆمانی (باوکان و ڕۆڵەکان)دا کۆششی کردووە تاوەکو دژایەتی فیکری و کردەوەی نێوان دوو نەوەی کۆن و نوێ تا ئەوپەڕییەکەی لە ڕۆمانەکەیدا ڕەنگ بداتەوە.[112]

ڕۆمان، وەکو ژانرێکی ئەدەبی و هونەری مەیدانێکی باش بوو بۆ دەربڕینی بیرو باوەڕو بۆچوونی ئایدیالۆژیاو بەسەرهاتی مێژوویی و بۆ ئەو ڕۆماننووسانەی ئەم ڕێبازەیش بێگومان مەیدانێکی لەبار بوو. هەندێ لە ڕەخنەگرەکان ڕۆمانەکانی دیستۆیڤیسکی و کافکا و ژان پۆل سارتەر(١٩٠٥- ١٩٨٠) و ئەلبێرت کامۆ(١٩١٣ - ١٩٦٠)[113] بە نموونەی سەرکەوتووی ئەو مەیدانە دەزانن.

نیهلیسییزم، کە لە زاراوە لاتینییەکەوە وەرگیراوە Nihilism بە واتای نەبوون یان پووچگەرایی. ئەم چەمکە لە چەندین بواری سیاسی و فەلسەفی و ئەدەبییدا دەرکەوتووە. نیهلیسییزم بەو واتایەی کە بریتییە لە ڕوانین و ڕامانێك، کە لە ئەنجامی بێ ئومێدیی و جۆرێك لە شك و گومان لای مرۆڤ دروست دەبێت. لە سەردەمێکدا، کە بەها کۆمەڵایەتییەکان و شیرازەی ئاکارو ڕەوشت بەرەو هەرەس دەچێت و ئەو هیواو ئاواتانەی مرۆڤ لەسەردەم و ڕۆژگاری خۆی هەوڵی بۆ دەدا بەرەو لێکترازان و داڕمان دەچێت، نیهلیسییزم دەبێتە بەشێك لە بیرکردنەوەی کەسەکان، بە تایبەتی سەدەی نۆزدەهەم لە ئەورووپا دا سەروەری هاتنەکایەی ئامێرو

١١١- سەرچاوەی پێشوو.

١١٢- بڕوانە : علی غفوری، یادداشتهایی دربارەء نیهیلیسم، ص ٩٦.

١١٣- لە بارەی ژیان و بەرهەمەکانییەوە بڕوانە: البر کامو، فلسفەء پوچی، ترجمە و دکتر محمد تقی غیاثی، انتشارات پیام، چاپ چهارم، تهران، ٢٥٣٦، ص ٣-١٤.

بەرەو پێشەوە چوونی شۆڕشی پیشەسازی بوو، کە لە ئەنجامدا مرۆڤ ویست و کۆتایی خۆی بۆ بەرهەم هێنانی ئامێر بەکارهێناوە، کەچی لە ئاکامدا بە پێی بۆچوونی مرۆڤ خۆی نەکەوتەوە، خەڵکی فێری تەمبەڵی کردو وای لێهات مرۆڤ خۆی بووە کۆیلەی دەستی ئامێرو ئامێر بووە بەشێك لە مەینەتی و مایەی ئازار دروستکردن بۆ مرۆڤ، بێگومان ئەمە حاڵەتێکی سەیر نییە، چونکە لە مۆرك و خەسڵەتەکانی کۆمەڵگەی سەرمایەدارین. فەیلەسووفێکی وەکو (نیتشە) وەها باسی ئەو حاڵەتە، یان نەهیزلیزمەو هۆکارەکانی شارستانییەتی و ژیاریاری ڕۆژئاوای سەروەری خۆی دەکات :

**(نیهیلیسییزم لەودیو دەرگاوە وەستاوە، بەڵام ئاخۆ ئەم میوانە نامۆیە لە کوێوە دێت ؟ سەرەتا بە هەڵدا چووین ئەگەر هۆکاری نیهیلییزم لە تەنگ و چەڵەمەکانی کۆمەڵایەتی یاخود دارِمان فیزیۆلۆجی، یاخود خراپتریش لە فەساد دا ببینینەوە. چەرخی ئێمە شاراوەترین و تەمومژاوترین چەرخە تەنگوچەڵەمەی ڕۆحی و بەدەنی یاخود عەقڵی ناتوانن ئەمانە ببنە هۆکاری بوونی نیهیلیسییزم)[114].**



**نیتشە(١٨٤٤- ١٩٠٠)**

١١٤- عوسمان یاسین، فرێدریك نیتشە، گ: وەرگێران، ژ٢، ١٩٩٧، ل ١١.



هەندێ لە ڕەخنەگرەکان نیهیلیسییزم بە ڕوویەکی تری ڕێبازی بوونگەرایی (الوجودیە)ی ناودەبەن، بەڵام بە هەرحاڵ ڕەنگە تەواکەری یەکتر بن، کە هەریەکەیان هەوڵ دەدەن لە گۆشەیەکی تایبەتیەوە لە مرۆڤ بکۆڵنەوە بە تایبەتی پووچگەرایی هەوڵ دەدات لەو بیرو ئەندێشانە بکۆڵێتەوە کە هەر لە ئەزەلەوە مرۆڤی خەریك کردووە لە نێوانی بوون و نەبووندا، بە تایبەتی " ئەو بۆچوونانە زیاتر لەگەڵ بیروڕاکانی فەیلەسووفی بوونگەرایی (هایدگەر)ەوە زۆرتر قوڵبووەوە، کە جەختی لەسەر ئەوە کردووە پێوەندییەکی ڕێژەیی لە نێوان بوون و نەبوون (پووچی) دا هەیە و وتی (نەبوون) لە ژیانماندا هەیە، بە بەڵگەی ئەوەی، کە تاکە شتە (بوون) مان دەسەلمێنێ، ئەگەر (نەبوون) نەبوایە هەستمان بە مانای (بوون) مان نەدەدەکرد، نەبوون تەنیا مانای (هیچ) نیە "[115] ئەمەش ئەوە دەردەخا، کە ئەم بزووتنەوەیە یان ئەو ڕێبازە مانایەکی دوورو قوولتر لە هەستەکانی مرۆڤ دەگرێتەوەو زۆرجار شیکردنەوەو ڕاڤەکەی دەچێتە بواری زانست و ئاینییەوە.

ترسی مرۆڤ لە مردن بۆ خۆی جۆرێکە لە مەعریفە، بەڵام ئەو ترسەی مرۆڤ لەوەوە سەرچاوەی گرتتوە، بۆ ئەوەی بتوانێ بوونی خۆی پێ بسەلمێنێ لە بواری ئەدەبیدا ئەم جۆرە بۆچوونانە لە ڕوانگەی خەون و خەیاڵ و فانتازیاو ڕووبەڕووبوونەوەی (ئامێر)، لە سەدەی نۆزدەهەمدا زۆرترلە بواری ڕۆمانسی و شانۆییدا دەرکەوت نموونەی ڕۆمانەکانی (کۆشك) و (داوەری) و (داوەشان) ی ڕۆماننووسێکی وەکو فرانتس کافکا (١٨٨٣– ١٩٢٤) دەربڕی ئەم بۆچوونەن. مرۆڤ لەو ڕۆمانانەدا بێ ناونیشان و بێ ڕابردوو، چاوەڕێی ئاییندەیەکی بێ ئومێد و پڕ لە ترس و سام دەکات، بەڵام بێ ئەوەی ترس و سام دڵی بگرێت و یان گرنگی پێ بدات.

لە بواری فیکری و فەلسەفیدا بەرهەم و بۆچوونەکانی(نیتشە) و دواتر لە ڕۆمانەکانی (دیستۆیڤیسکی) ڕەنگیداوەتەوە و زۆر لە ڕەخنەگرەکان پەیوەندییەکی بەتین لە نێوان ڕاڕایی و نیگەرانی دیستۆیڤیسکی و نیهلیسییزمی (نیتشە) دا بەدی دەکەن.

## نیهلیسییزم و دراما

نیهلیسییزم لە بواری ئەدەبیدا زۆرتر لە بواری دراما دا دەرکەوت. ئەگەر ساڵەها بوو بنچینەکانی درامای کلاسیکی (ئەرستۆ)یی لە ئەوروپادا باوبوو، یان کەم و زۆر گۆڕانێکی کەمی بەسەر داهاتبوو، بەڵام لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا بە تەواوی کۆدێتایەکی گەورە لە لایەن

١١٥- د. نبیل راغب، المذاهب الادبیة، ص ١٦٥.

لایەنگیران و هەوادارانی (شانۆی پووچی) یان (شانۆی پێشڕەو) بەرپاکراو چ لە ڕووی دیکۆرو نمایش و ئەکتەرو چ لە زمانی دراماکاندا بە تەواوی پێوەرەکانی ڕابردوو ئاومژووکران و بە ڕوانینێکی تازە هاتنە مەیدان، ئەگەرچی پووچی خۆیان ئەو ناوەیان (واتا شانۆی پووچی) یان بەلاوە پەسند بوو، بۆ نموونە(یۆژین یۆنیسکۆ Eugene ionesco ١٩١٢- ١٩٨٩) دەڵێ :

**(سەرسوڕهێنەر، نەوەکو پووچ بە بڕوای من لە دنیادا بوونی هەموو شتێك مەنتیقی و (پووچ) ی بوونی نییە. خودخوازی و بوونییەتی سەرسورهێنەر.**[١١٦]

سەرەتاکانی کاری درامای پووچی بۆ ساڵی ١٩٤٧ دەگەڕێتەوە، کاتێ کە (ئەندرێ ژید)بەرهەمی (داوەری) ی (فرانتس کافکا)ی لە پاریس بۆ شانۆ ئامادە دەکردو (یۆژین یونیسکۆ) لە ساڵی ١٩٥٠ دا درامای (گۆرانیبێژی کەچەڵ La cantatrice chauve ی پێشکەشکرد. ئەوەی جێگەی سەیرو سەمەرەو عاجباتییە ئەوەیە، دراماکە نە گۆرانیبێژو نە کەچەڵی تیایە. ڕووداوەکان بێ مەنتقی و بێ سەروبەریان پێوە دیارە و هەموو شتێ پووچ خۆی دەنوێنێ سەرەتای شانۆیەکە سەعاتی دیوارەکە حەڤدە جار زرنگەی دێ و مەدام سمیت لەسەر تەختەی شانۆ دەڵێ:

---

١١٦- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: رضا سید حسینی، مکتبهای ادبی، جلد دوم، چاپ یازدهم، تهران،١٣٨١، ص ١٠٠٢.





**(یۆژین یۆنیسکۆ Eugene ionesco ١٩١٢- ١٩٨٩)**

**" سەیرە سەعات نۆیە "**، ئەمە یەکەمین وتەیە بەسەر زمانیدا دێت.

لە درامای پووچیدا بینەر تووشی بێزاری دەبێت و سست و خاوی ریتمی ڕووداوەکان دەبێتە بێزاری و ڕەگەزی هاندان و چێژ لە دڵی بینەردا دەکوژێ.

شانۆکارەکانی تریش، نووسەرانی وەکو (سامۆئیل بیکیت sameuel beckett 1906 – 1989)، کە ڕەنگە لە هەموویان زیاتر ناسراوتر بێت و فەیلەسووفترینیان بێت، بە تایبەتی درامای (لە چاوەڕوانی گۆدۆ Enattendant godo لەساڵی ١٩٥٣ دا سەروسەدایەکی زۆری بوو.



**sameuel beckett 1906 – 1989 سامۆئیل بیکیت**

(ئارتور ئادامۆڤ Arthur adamov ١٩٠٨ – ١٩٧٠، کە بە ڕەچەڵەک ئەرمەنییە لەساڵی ١٩٥٠ دا درامای (مانۆری گەورەو مانۆری بچووک Grandet la petite manroeuvre نووسی و هەر لەو ساڵەدا لە پاریس پێشەکەشکراوە. ئەم نووسەرە ئاشناییەکی



زۆری لەگەڵ ڕۆشنبیریی ئەڵمانی و فەرەنسیدا هەبوو، ڕووخسارێکی خەفەتبارو گۆڕەوی لەپێ نەدەکردو پێڵاوی سەندەلی لەپێ دەکردو بێهوودەیی و بێپاکی پێوە دیار بوو، لە ١٩٠٨ لە قەفقاز لەدایکبووە، لە تەمەنی شازدە ساڵی لە گەرمەی کارو بزاڤی سوریالیستەکانی پاریس لە ١٩٢٤ ئاگادار بووەو دۆستی یۆنیسکۆ شەیدای بەرهەمەکانی ستراندبێرگ و کافکا بووە. ئەم نووسەرە چەند شانۆنامەیەکی تری نووسیووە وەکو پارودی la parodie و (پەلامار).



**ئارتور ئادامۆڤ Arthur adamov ١٩٠٨ – ١٩٧٠**

## کافکا و نیهلیسیزم

(ئەو نووسەرانەی کە بۆ یەکە مجار ڕێگاو بیرو بابەتێکی تازە دێننە مەیدانەوە، دەگمەنن، بە تایبەتی مانایەکی تازە بۆ ژیان لە گەڵ خۆیاندا بێننە ئاراوە، کە بەر لە خۆیان بوونی نەبووبێ - کافکا بە یەکێك لە هونەرمەندترین نووسەرانی ئەو دەستەیە دەژمێردرێ.

خوێنەرێك، کە لەگەڵ دنیای (کافکا)دا سەروکار پەیدا دەکا، لەکاتێکدا وردو خاش بووە و بەرەولای دەچێ : کە لە دەرگای دنیایەکەی دەچێتە ژوورەوە، کارتێکردنی ئەو بەسەر ژیانی خۆیەوە دەبینێ و پەی بەوە دەبات، کە دنیا ئەوندە بن بەست نەبووە.

(کافکا) لە دنیایەکەوە بۆمان دەدوێت، کە تاریك و جەنجاڵ خۆی دەنوێنێ، بە شێوەیەك کە هەر لە سەرەتاوە ناتوانین بە پێوانەکانی خۆمان هەڵیسەنگێنین. لای ئەو باس باسی چییە ؟ بێ کۆتایی ؟ خودا ؟ جن و پەری ؟ نەخێر باس باسی ئەو شتانە نییە، بابەتە سادەکانی ژیانی ڕۆژانەی خۆمانە، لەگەڵ ئەو خەڵکە ئاساییە، لەگەڵ کارمەندانی دایەرەکان ڕوو بەڕوو دەبینەوە، کە هەمان کێشە و گرفتاری ئێمەیان هەیە، بەزمانی ئێمە دەدوێن و هەموو شتێ شوێنی ئاسایی خۆی وەردەگرێ، بەڵام لەناکاو هەستێکی پەشۆکاو یەخەمان دەگرێت! هەموو ئەو شتانەی لەلامان جددی و مەنتقی و ئاسایی بوون بە جارێ مانای خۆیان گوم دەکەن، بەندۆڵی کاتژمێر بە پێچەوانەوە دەسووڕێتەوە، مەوداکان بەپێی ئەندازەگیریی ئێمە دەرناچن، هەوا دەئاڵۆزێ و پشوومان تەنگ دەبێ، لەبەر ئەوەیە، کە ئەو شتانە مەنتقی نین ؟! بە پێچەوانەوە هەموو شتێ بەڵگەو پاژەی خۆی هەیە، بەڵگەیەکی ئاوەژوو، مەنتق هەوسارێکی پچڕاوەو ناتوانێ بەردەمی بگرێ، بەڵام نەء! هی ئەوەیە کە سەیر دەکەین ئەو خەڵکە بە گشتی سەریان شۆڕکردۆتەوە سەرکارەکانیان و بە وردی کاردەکەن و هاودەردمانن و وەك ئێمە بیردەکەنەوە، هەرچی کارمەند و پشتیوان هەیە (پووچ) دەنوێنن. مەکینەکانی خۆکار بەدبەختن و هەر چەند کارەکانیان جددیترو گرنگتر بێت گاڵتەجارانەتر دێنە بەرچاو، کارەکانی ڕۆژانەو ئەنجام و وەزیفەیان و هەموو ئەو شتانەی، کە خوومان پێوە گرتووەو لە لامان ئاساین، لە بەر قەڵەمی کافکادا واتای پێکەنیناوی و پووچ و هەندێ جار ترسناك بە خۆیانەوە دەگرن. ئادەمیزاد یەکەو تەنها بێ پشت و پەنایەو لەسەر زەمینێکی ناسازگاری گومناودا دەژی، کە شوێنی لە دایکبوونی خۆی نییە، ناتوانێ لەگەڵ کەس پێوەندی پەیدا بکاو دڵ بەکەسەوە ببەستێ، خۆی دەزانێ، چونکە هەر لە نیگاو ڕووخسارییەوە دیارە...

وەك ئاشکرایە (کافکا) تا ئەم دواییەش لە ئەورووپادا ناوی نەبوو، چونکە وەرگێڕانی بەرهەمەکانی بەر لەجەنگ گرنگییەکی ئەوتۆی پێ نەدرابوو، کەسێ لەبارەیەوە نەدەدوا، بەڵام دوای چوار ساڵ خامۆشی، کاریگەرییەکی وای بوو بەیەکجار ناوبانگییەکی جیهانی وەدەست هێنا، کافکا



کێیە ؟ کە پەیامی ئەو لە گەڵ ئاوازی دنیای ئێمەدا دەگونجێ و هاومەبەستی نزیك لەگەڵ ژیانی ئێستادا نیشان دەدات ؟ دەشێ خوێنەری ئەورووپا هێشتا لەگەڵ ئەم جۆرە بیرە ئاشنایی نەبووبێ، چونکە ئەو مانگەشەوە ساردەی ئاسمانی نووسینەکانی (کافکا)ی گرتووە، چریکەی سادە و توێژینەوەکانی (کافکا) بۆ نیشاندانی شێوانی هەقیقەت (وەك لەبەرچاوە) ئەو هەوڵدانە بێ ڕەحمانەی، کە کردوویەتی بۆ ئاشکرا کردنی (واجب الوجود) و نەگەیشتنی بە هیچ و ئەو تەم و مژەی لە لێکچواندنەکانیدا هێناویەتییەوە، هەموو ئەمانە بوون بە کۆسپ لە ڕێی ناوبانگ دەرکردنیدا، بەڵام کەسانێك، کە شارەزای تەواوی دنیاکەمانن، باوەشیان بۆ کتێبەکانی کافکا کردۆتەوە. لە رابردوودا بەر لەم جەنگەی دوایی، خەڵکی هێشتا ئارەزوومەندانی دیکتاتۆری لە جێگای ئازادی، کۆیلەیەتی لە جێگای مافی مرۆڤ، بۆمبای ئەتۆم لە جێگای داد، بێدادی یان گرتبووە بەر، هێشتا کۆمەڵانی خەڵك بەدەست سیاسەتبازان و تاڵانکەرانەوە نەگۆڕابوون بۆ گیانەوەرو مرۆڤی نیوەگیان. لەبەر ئەوەیە، کە خەڵك دوای جەنگ هەست بە ڕەنگدانەوەی دنیایەکی پووچ دەکەن، کە کافکای بە شێوەیەکی غەمبارانە پەروەردە کردووە. بۆ ئەوەی بتوانرێ بڕیاێکی یەکجاری دەربارەی نووسراوەکانی کافکا بدرێ، ناچار دەبێ ئەو زەمانەو ئەو سەرزەمینەی ئەوی لێ پەروەردە بووە، لەبەرچاو بگیرێ. نووسراوەکانی ئەو بەرهەمی پێش و دوای جەنگی یەکەمی جیهانی (١٩١٤)ەوەن، لەو زەمانیدا (پراگ) شارێك بووە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا دەسەڵاتی بووەو چەندان ڕەگەزی جۆراو جۆر تێکەڵ یەکدی ببوون، لەم شارەدا چەندان میللەت و شارستانییەت ڕووبەڕووی یەکتر ببوونەوە و کاریان کردبووە سەر یەك. تەنها پراگ توانیویەتی کەسێکی وەك (کافکا) پەروەردە بکا. هەڵاتنی (کافکا) لە دەست خزمەکانی ولە هەمانکاتدا هەڵاتنی لە پراگ و گوستن وای کردبوو زمانی جۆراو جۆر بزانێ. شیکردنەوەو لێدوان لە(کافکا) کامڵ نابێ ئەگەر کارتێکردنی دەوروبەرەکەی لەبەر چاو نەگیرێ، (کافکا) ناوێکی ئاسایی جوولەکەکانی نیشتەجێی چیکسلۆڤاکیای زەمانی ئیمپراتۆری هامبۆرگ بووە. لە زمانی چیکیدا بە مانای (فەرخە قەلەرەش)دێت و باڵندەی ناوبراو لە پراگ سیمبۆلی خانەی بازرگانی باوکی کافکا بووە.

(فرانتس کافکا) لە خێزانێکی چیکی جوولەکە لە ڕێکەوتی (٣)ی تەمموزی (١٨٨٣)دا هاتۆتە دنیاوە، کە ماوەیەك بوو تەپڵی کەوتنی ئەورووپا لێدراوەو ئیمپراتۆری ئۆتریش بەرەو هەڵوەشانەوە دەچوو. کافکا لە باوکێکی خوێندەواری زۆردار، کە هەموو وەختێك بە دوای کامەرانی خۆیدا دەگەڕاو شانازی پێوە دەکردو (کافکا) کوڕیشی پشتگوێ خستبوو، دایکێکی جوولەکەی باوەڕدار بە خورافات و خوشکانی ئاسایی پەروەردە بوو. (کافکا) حسێبێکی تایبەتی بۆ باوکی دەکرد،

چونکە لێی دەترساو تەواوی دەورەی ژیانی لەسایەی ترسی باوکییەوە بەسەر برد [١١٧]، دوای ئـەوەی خوێندنی ناوەندی بە زمانی ئەڵمانی تەواوکرد، ماوەیەك لە ئەدەبیات و پزیشکیدا کاری کرد. پاشان یاسا سەرنجی ڕاکێشاو بەڵکو بەهۆی ئەوەوە بتوانێ نان پەیدا بکات و سەربەستییەکی شەخسیی لە ژیاندا هەبێت. چووە کۆلێجی یاساو لە ساڵی ١٩٠٦ دا لە پراگ دکتۆرای لە یاسا وەرگـرت، هـەر چەندە ئەو بەشەی نەکردە پیشەی ژیانی خۆی، بەڵام شارەزایی لە یاسا بە چاکی لە نووسـینەکانیدا ڕەنگیداوەتەوە، هەر لەو کاتەدا لەگەڵ ڕۆماننووسی ئایندە (ماکس برود)max Brod ئاشـنایی پەیدا کرد، ئەگەرچی زەوقی ئەدەبییان لەگەڵ یەك نەدەگونجا، بەڵام هـەر ئـەو کەسـە دوایـی بـووە هاودەم و نووسەری ژیانی ئەو.



**Franz Kafka 1883 – 1924 فرانتس کافکا**

١١٧- کافکا لە سەرەتای نامەیەکدا، کە بۆ باوکی نووسـیووە Brief an den Vater ، جـەخت لەسـەر ئـەو ترس و سامەی خۆی لە باوکی دەکاتەوە و وەها دەست پێدەکات: (باوکی زۆر ئازیزم، دواجار لێت پرسـیم، کـە بۆچی گوتوومە لە تۆ دەترسم. هەروکو جاران لە بەرامبەر وەڵامی ئەو پرسیارەتدا بـە قـەد ترسـم لێـت، دۆش داماوم.)، بڕوانە: فرانتس کافکا، تمثیلها و لغزوارەها همراە نامە با پـدر، ترجمـە: امـیر جـلال الـدین اعلـم، انتشارات نیلوفر، تهران، ١٣٨٣، ص ٨٩- ١٥٣.



(کافکا) لە ١٩٠٨ دا بووە کارمەندی فەرمانگەی بیمەی کۆمەڵایەتی، دوایی بۆ ماوەیـەك لە فەرمانگەی دەوڵەتیی چاودێری کۆمەڵایەتی پراگ لە بەشی کارەسات خەریکی کـار بـووە، بـەڵام ئـەو کـارە ماندووکـەرەی فەرمانگـە هـەموو وەختێکـی دەبـردو هـەلی نووسـینی بـۆ نەدەرەخساندو (کافکا)یش چونکە نووسینی بە مانای ژیانی خۆی دەزانی، بۆیە بڕیاریدا بەشەو کار بکات و خەو لەخۆی حەرام بکات. بێگومان ئەو چێژێکی زۆری لـەو تاقیکردنـەوەی خـۆی دەبینی، ئەو دەوروبەرە پـیس و بـێ نـرخ و هەژارییـەی لـە دەزگاکـانی حکومـەت دەبینـی بەشێوەیەکی ورد لە کتێبەکانی دیـاری خستوون، پەیوەنـدی بـەو تاقیکردنـەوە هەیـە، بۆیـە (کافکا)ناچار بوو بە مێزی فەرمانگەوە بنووسێ و لە ماڵە نەفرەتییەکەی باوکی ژیـان بەسـەر بەرێ. وا دیارە خانەوادەکـەی و دۆسـتەکانی کۆمـەکیان نـەکردووە تـابتوانێ ئـەو حەسـانەوە دەروونییەی پێویستی پێبوو بۆ خۆی بڕەخسێنێ. مـاکس بـرۆد لـەو باوەڕەدایـە، کـە(کافکـا) باوەڕی بە سەهیۆنییەت بووە، بۆیە ئەو حەسانەوە دەروونییەی بۆ نەڕەخساوە، کەچی (کافکـا) لە بیروڕاکانیدا زۆر ئەڵمانی بووەو بە ئـەڵمانی مایـەوە لـەوەی سـەهیۆنی بـێ. نووسـینەکانی لەسەر ڕێ و شوێنی ئەدەبیاتی ئەڵمانی بوو. لەبارەی ڕووحیشەوە زیاتر لە پاسـكال pascal و سـۆن کـیرك گـارد Soren kierk Gaared(١٨١٣- ١٨٥٥) نـزیکتر بـووە لـەوەی لـە پێغەمبەرانی جوولەکە نزیك بێت. هەر چەندە برۆد ناچاری کـرد تـا زمـانی عیـبری فێربـێ و کتێبی (تلموژ) بخوێنێ، بەڵام(کافکا) هیچ کاتێ خەڵوەتی خۆی لەدەست نەداوە بۆ ئـەوەی لـە کۆمەڵگای قەڵپی جوولەکە تێبگات. لە ساڵی ١٩١١ دا لەگەڵ (ماکس برۆد) بـۆ ماوەیـەکی کورت چوونەتە پاریس، ساڵی دواتریش چاوی بە ویمارWeimar کەوتووە. ئەو زەمانە زۆرتـرین بەرهەمی ئەدەبی خۆی خستۆتە ڕوو، لە شەوێکدا چیرۆکی (بڕوا)ی نووسیووە، دوایـی ڕۆمـانی (ئەمریکا)ی بەدەستەوە گرتووە و چیرۆکی گەورەی (داوەشان)[١١٨]ی کۆتایی پێهێناوە. هـەروەها سەرەڕای ئەوەش لەگەڵ کچە ئەڵمانی F.B[١١٩] خۆشەویستی لە نێوانیاندا دروست بـووە، بـەڵام

١١٨- ئەم بەرهەمەی کافکا بۆ زۆر زمان وەرگێڕدراوە، دەقی فارسی: فرانتس کافکا، مـسخ، ترجمـە صـادق هدایت، مؤسسة انتشارات نگاه، تهران،١٣٨٣.

دەقی کوردی :کافکا، بەدگۆڕان، وەرگێڕانی: جەلیل کاکە وەیس، چ٢، هەولێر، ٢٠٠٥.

١١٩- کافکا نامەیکی زۆری بۆ خۆشەویستەکەی (فلیسە)نووسیووە، بۆ دەقی ئەم نامانـە بڕوانـە : فـرانتس کافکا، نامە بە فلیسە، ترجمە: افتخاری، تهران، ١٣٨٣.

بابەتی  ژن و مێردایەتی ئەمرۆ و سبەینێ پێکردووەو تا دوا جار دوای پێنج ساڵ حەزلێکردن وازی لە دەسگیرانەکەی هێناوە. ڕۆمانی (داوەری)[120] و (وڵگەی سزا) ی پێش ساڵی ١٩١٤ نووسیوون. لە ساڵی ١٩١٦ دا گۆیا بە هۆی کێشمەکێش و یان ریسوایی کە وەك (ماکس برۆد) ئیشارەتی بۆ کردووە، ماوەیەك ماڵی باوکی بەجێ هێشتووەو لە کۆڵانی (کیمیاگەران) ی پراگ خانوویەکی سەربەخۆی بەکرێ گرتووەو بە مانگانەیەکی کەم ژیانی بەسەر بردووە. لەوێ نەخۆش کەوتووەو تووشی سیل بووە. لە ساڵی ١٩١٧ دا کافکا خۆین رشاوەتەوە و چەند ساڵ بوو خۆیشی مۆتەکەی مەرگی هەر لەبەر چاو بوو، لە ساڵەکانی کۆتایی ژیانیدا نزیکی بەرلین گۆشەگیریی هەڵبژاردووە تا هەلی زۆری دەستکەوێ و بکەوێتە سەر نووسین و لەوێشەوە ماوەیەکی کورت ئاشقاتی لەگەڵ (دۆرا دیمانت) ی کچە جوولەکەی پۆڵەندی کردووە. ساڵەکانی قات و قڕی و گرانی دوایی (جەنگی بەرلین)یش دەگمەیەکی دی لێدا، خۆراك کەم بوو، نەخۆشی سیل زیادی کرد، گەڕایەوە نەمسا و لە(٣)ی حوزەیرانی ١٩٢٣ دا لە تەمەنی ٤١ ساڵی لە ئارامگای سیلدارەکان لە نێزیکی (ڤیەننا) دا بە شێوەیەکی غەمبار دنیای بەجێ هێشت. کافکا لە ژیانی خۆیدا تەنیا یەك کتێبی بە چاپ گەیاندو لە پێخەفی مەرگدا هەڵەکانی چاپی کتێبی دووەمی راست دەکردەوە. سی ساڵ پێش مەرگی، تکای لە ماکس برۆد کردووە، کە گشت دەسنووسەکانی لەکن وی بووەو هەروەها (داوەری) و (کۆشك) و (شووڕەی چین) هەموویان بسووتێنێ، خۆیشی بەر لە مەرگ چوار نامیلکەی ئەستووری نووسینەکانی خۆی سووتاندووە، بەڵام (برۆد) گوێی بەقسەکانی ئەو نەداوە. (کافکا) جگە لە چەند تێکستێکی، کە بەڕای خۆی تەواو کاملن، هەموو بەرهەمەکانی دی خۆی بەخراپ زانیوەو گوتویەتی لە دوای خۆم جگە لە خامۆشی هیچی دی نابەخشن...

ئەم نووسەرە پێویستی بە نوێنەرێك نەبوو بۆ ئەوەی دوای مەرگی خۆی ناوبانگ وەربگری، بۆیە وەسیەتێکی وای نەکرد. لە گۆشەگیرییەکی تەواو دا دەژیاو ئەوەی فەرامۆشکرد بوو خۆێنەر بۆ خۆی پەیدا بکا. رەنگە (کافکا) ئارەزووی کردبێ وەك رەمزێك لە چاوی ئەغیار بە پەنهانی بمێنێتەوەو بە شێوەیەکی نهێنی ئامێز بێ و دەرنەکەوێ. بەڵام ئەو پەردەپۆشییە بووە هۆی شانازیکردنی...

---

١٢٠- بڕوانە دەقی فارسی : فرانتس کافکا، محاکمە، ترجمە: امیر جلال الدین اعلم، چاپ ششم، تهران، ١٣٨٤.



ئەو نووسراوانەی لە (کافکا) جێماون، سی ڕۆمانی درێژن :

(داوەری) و (کۆشك) و (ئەمریکا) و کۆمەڵی کورتە چیرۆك و مەتەڵ و گوتەی کورت و یادداشتی ڕۆژانەی کەسی وئەندێشەی بڵاوو چەند وتارێکی رەخنەیی وچەند نامەیەکن، بەڵام نووسراوە ئەدەبییەکانی زیاتر بە ناتەواوی ماونەتەوە. سەربردەی ژیانی کافکاش لە لایەن (ماکس برۆد)ەوە نووسراوەتەوە، چەند پارچە نووسینێکیش لەسەر ژیانی (کافکا) بە قەڵەمی F.Feigl ودڵبەرەکەی دۆرادیمانت و کەسانی ترەوە نووسراونەتەوە. وا دیارە (کافکا) تەنیا لەگەڵ چەند کەسێك، کە بە پەنجەکانی دەست دەژمێردرێن لە نووسەرو فەیلەسووفان تێکەڵاوی هەبووە. شارەزاییەکی زۆری لە ئەدەبیاتی زەمانی خۆی نەبووە، لەوانەیە ئەم بلیمەتییەی لە ئەنجامی تۆژینەوەو خوێندنەوەی تێکستی عبری (تلموژ)ەوە بووبێ، بەڵام خوێندنەوەی ئەم تێکستە هیچ لە بیروباوەڕەکانی نەگۆڕی. کافکا لە بەرامبەر زۆر لە نووسەرە ناسراوەکانی ئەڵمان و نەمسا وای پێشان داوە، کە هیچ پێوەندییەکی لەگەڵیاندا نەبووە، لە نێوان نووسەرەکانی سەردەمی خۆیدا لەگەڵ رۆدلف کاسنەرkassner هۆفمانشتاڵ von Hofmannstahl وهانس کارۆسا H.Carossa وهێرمان هسە H Hesse و نۆت هامسۆن KuntHamsun و فرانتی وێرڤل F.werfel وێلهێلم شیڤەر W.Schafer و توماس مان T.Mann پەیوەندی هەبووە. بێگومان چیرۆکنووسانی ئەڵمانی وەك شتۆرم storm و کلایست kleist و هێبل J.H.Heble و فۆنتانە fontane و شتایڤەر stifter هەروەها گۆگۆڵ Gogol بەتەواوی لە رێگەو زمانی نووسینی ئەو بەشداریان کردووە.

(کافکا) بە وردی نووسراوەکانی گۆتەو تەورات و ئوپانیشا درایشی خوێندۆتەوە. بەڵام کارتێکردنی گوستاڤ فلۆبێر G.flaubertو (کیرك گارد) لە شەخسیەتی ئەو زیاتر لە خەڵکانی دی بەرچاو دەکەوێ، خۆیشی ستایشی مەعنەوی (گۆتە) و(فلۆبێر)ی کردووە. هەروەها جیاوازی (فلۆبێر) و(کافکا)یش لەوەدایە، کە (فلۆبێر) دەیویست کتێبێك دەربارەی بابەتی پووچی بنووسێ، کەچی (کافکا) دەیویست ژیان بە پووچ پێشان بدات. (فلۆبێر) نووسیویەتی :

**(هەموو شتێ دەزانم، بەڵام باوەڕم بەهیچیان نییە.)** (کافکا)یش زانای سروشت و خووئاکارە، بەڵام دەترسا لەوەی بەشتێ باوەڕبکا. (کافکا) وەك مشکە کوێرە بە شاری (پراگ)ەوە نووسا بوو، ئەوێی بەپەناگەی خۆی دەزانی و لە هەمانکاتدا لێشی بێزار بوو، کاتی دەست بەتاڵی خۆی بە نووسین و مەلەوانیو لێخوڕینی بەلەم و باغەوانی ودارتاشییەوە بەسەر

دەبرد. سەیر لەوەدایە بە هەمان شێوە، کە زەمەن تێدەپەڕێ سیمای (کافکا)یش بەهێز تر دێتە بەرچاو، ئەشێ بەرێگەی شیکردنەوەی دەروونی ئەو بتواندرێ تارادەیەك پەی بە ژیانی دەروونی ئەو ببردرێ، بەڵام نامۆیی خوورەوشتی هەر بەشاراوەیی دەمێنێتەوە.

سێ بابەت چارەنووسی (کافکا)یان دەستنیشانکردووە: دژایەتی باوك و لەئەنجامی ئەو دژایەتییەش دژایەتیکردنی کۆمەڵگای جوولەکەی (یەهوودی) ژیانێکی ناخۆش و سادە لەوێ کە باوکی بەنوێنەری یاساو کۆمەڵگاکە دەزانی.

بۆ تێگەیشتنی خوداوەند کەوتبووە گەڕانێکی شەخسیی ورد، بەڵام بەدەستی بەتاڵ دەگەڕایەوە. بۆ ئەوەی جددییەت لەگەڵ تەنیاییەکەیدا رابهێنێ وەك (کیرگ گارد)[121] دەسگیرانەکەی خۆی دوادەخست تاوەکو وازی لێهێنا و چاوپۆشی لە ژن و مێردایەتی کرد، بەڵام لەو کاتەدا دەردی بێ دەرمانی سیل وەدەرکەوت و ئەم نەخۆشییە تا سەرەمەرگ ئەشکەنجەی تەنیایی بۆ نایەوە. ئەو نموونەیەش بەسە بۆ ئەوەی چاکی و خراپی ئەومان بۆ دەربخات. گومانی تێدا نییە، کە (کافکا) ژیانی خۆی لەژێر ترسی فەرمانڕەوایی باوکە ستەمکارەکەی بەسەر بردووە، تائاخیری عومری نەیتوانیوە ئەم نێڵە تەکان پێ بدا. هەڕەشەی بابی بە هەموو دەمێ لە گوێیدا دەزرنگایەوە :

(**وەك ماسی زگت هەڵدەدرم**)، بەڵام ئەم کابرایە هەرگیز دەستی لەکوڕە تاقانەکەی بەرز نەکردۆتەوە. (کافکا) دڵخۆش دەبوو بەوەی بتوانێ کاروباری خانەوادەکەی رێکبخات، بەڵکو لەو بەندیخانەیەی باوکی رزگاری بێت. ئەو پەرۆشییەی بۆ ئازادی وەك سەراب لەبەردەمیدا خۆی دەنواند، بەڵام بەردەوام دەخزایە نێو گیرۆدەیی و کێشمەکێش لەگەڵ دەزگیرانەکەی و لێی دوور دەکەوتەوە و لێی نێزیك دەبۆوە، تا دواجار چارەنووسی غەمبارانەی کەسێکی هەڵبژارد، کە تەنیایی بۆ خۆی هەڵبژاردبێ، نەك لەبەر ئەوەی لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەی رێك نەدەکەوت، بەڵکو لەبەر ئەوەی ژیانی بەهیچ دادەنا. ئەو نامەیەی، کە (کافکا) بۆ باوکی نووسیووە (ماکس برۆد) چەند بەشێکی لێ بڵاوکردۆتەوە، تا ئەندازەیەك بنچینەی کێشەی ئەو

---

121- بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی (کیرکگارد)ەوە بڕوانە: شش متفکر اگزیستانیالیست، نویسندەو ه.ج. بلاکهام و جی.کلنبرگر، ترجمه ابو تراب سهراب و الهام عگاردی،مؤسسه انتشارات نگاه، تهران، ١٣٨٤، ص ١٧٨ – ١٩٩.

اگزیستنالیست، ترجمە: محسن حکیمی،چ٤،تهران،١٣٨٢، ص٣-٢٦.



لەگەڵ باوکیدا روون دەکاتەوەو هۆی گەڕانی بەدوای سروشتی باوکە جوولەکەکەیدا ئاشکرا دەکات. باوکی سووربوو لەسەر ئەوەی کە وەحدانییەت (یەکانە) رووخساری راستەقینەی جوولەکایەتییە (یەهوودییەتە). ئەم بانگەوازە کۆمەڵێ مەسەلە دێنێتە ئاراوە. بڕواهێنان و پێشوازیکردنی ئەو مەسەلانەش بەلای کافکاوە ناپەسند بووە. ماڵی باوکی بەڕای کوڕەکەی جێی گومان بوو. لە ژێر کومەڵێ کۆت و بەند دا دەبینیەوە. (کیرك گارد) گوتویەتی:

(**من زۆر قەرزباری ئەو کەسەم منی هێناوەتە وجود**). **کافکایش لەم رووەوە خۆی لە بەرامبەر باوکی بە بەدکار دەزانێ. لە نامەیەکدا، کە بۆ باوکی نووسیووە، ئەوە دێنێیتەوە یاد کە: (ئەوەی نووسیم پەیوندی بە تۆوە هەیە، ئەو گلەییانەن، کە نەمدەتوانی لەلات بیاندرکێنم، دڵپڕی خۆم وابە نووسینەکانم دەرکرد.)**، پاشان درێژەی پێ دەدا :

(**ئەو شوێنەی تێیدا دەژیم، تووشی دوودڵی و رارایی کردووم و بەجارێ تێکی هاڕیوم. هەرچەندە ناچار بووم بچمە شوێنێکی دیکەوە، بەڵام هەوڵێکی بێ سوود بوو، چونکە هیچم بەدەستەوە نەماوە**)، دەربارەی بیروڕای باوکیشی نووسیووتی :

(**هەتا لە گەنجیەتیشدا، تێ ناگەم تۆ بۆچی سەرزەنشتی منت دەکرد، کە دەبێ سەر بۆ ئەو یەهوودیەتییە پووچە دابنەوێنم، کە تۆ پێییەوە بەند بوویت. (دەتووت بۆ خواپەرستییە)، ئەوەندەی من لێی تێگەیشتووم ئەم یەهوودییەتە لە ڕاستیدا شتێکی ناچیزو گاڵتەیەو لە گاڵتەش گاڵتەترە.**)

(ماکس برود) لە ژێر سەری دەخوێنێ و دەیەوێ دووبارە رێنوێنی بکاتەوە بۆ ئەوەی باوەڕی بە یەهوودیەت هەبێ، بەڵام هیچ سوودی نابێ. (کافکا) بە هاوڕێکەی دەڵێ: (**من چیم بە جوولەکان دەچێت ؟**) لە ئەنجوومەنی سرووتی ئایینی جوولەکان دێتە دەرەوە (کافکا) بە توانجەوە دەڵێ:

(**ئەگەر راستیت دەوێ وەك ئەوە وا بوو لەنێو رەشە کێوی ئەفریقییەکاندا بووبین، ئەو شتە پڕوپووچە بێ نرخانە چی بوون !**).... لە یادداشتی شەخسی خۆیدا نووسیوویەتی:

(**نەك تەنها کەسانی وەك کیرك گارد نەیانتوانی دەستی ماندووی مەسیحییەت ئاشنای ژیانم بکەن، بەڵکو پەیڕەویکەرانی سەهێۆنییەتیش چ لە بەراییدا و چ لە دوایێدا نەیانتوانی ئارەزووی ئیسرائیل لە مێشکمدا بچەسپێنن**).

هەروەك (كافكا) خۆی وە دەریخستووە زیاتر بیرکردنەوەی لە (کیرکگارد)ەوە نزیکتر بووە، کەچی جیاوازییەکی زۆر لە نێوان (کیرکگارد)و (کافکا) دا بەرچاو دەکەوێ. بۆ نموونە، ئەگەر چی خودای (کیرکگارد) دڵڕەقە، بەڵام لە هەمانکاتدا میهرەبان و بەخشندەیە، کەچی خودای (کافکا) هەروەك لە نووسینەکانیدا بەرچاو دەکەوێ ترسناك و هەڕەشە کەرە لەسەر یاسا دەڕواو بەکاری ئاگادارکردنەوە و سزادان و بەخشندەیی هەڵدەستێ: هەتا (یهودا)ی تەوراتیش بەم شێوەیە نییە، هەر چەندە دڵڕەقیشە و رق و کینەی هەیە، بەڵام جاری وا هەیە سەد گوناهبار بۆ خاتری یەکێ دەبەخشێ..... دوو شت (کافکا)یان زیاتر بەرجەستەکردووە، یەکێکیان ئەوەیە، کە ئەگەرچی خوێنی جوولەکەی بووە، بەڵام لە کۆمەڵگای جوولەکان رایکردووەو ئەوەی تریان ئەوەیە، کە نەخۆش بووەو تەنییاکەی بۆتە دووقات بۆی..... کافکا لە تاقیکردنەوە دەروونییەکانی خۆیدا گەیشتە ئەوەی : کە بێ بەشە، شتێکی کەمە، لەگەڵ خەڵك رێك ناکەوێ، حەقیقەتی لەبەر چاو ونە، دوولایەنی لەئارادایە، مرۆڤ لەگەڵ خۆیدا بێگانەیە، لەنێوان بنیادەم وجیهانی بەهەشتدا گێژاوی بۆ دروست دەبێ، هەموو شتێ کۆسپێکی دێتەڕێ، مەبەستی کافکا چییە ؟ دنیایەکی دی؟ نەخێر، ئەو هەر ئەو دنیایەی دەوێ، حەقیقەتێکی تازەی گەرەك نییە، ئەوەی لە دەوروبەری خۆی دەیبینێ حەقیقەت نییە. کافکا هەوڵدەدا لە کەناری ژیان بوەستێ و هەموو شتێ ببینێ: سستی، ناخۆشی، تەنهایی وتوانای باوکە خوێندەوارەکەی، کە دەیەوێ کوڕەکەی خووڕەوشتی بازرگانانەی هەبێ. لە چیرۆکی(لانە)دا کاتێ مەترسی دوژمنی بەدفەڕ نزیك دەبێتەوە، وەك بوونەوەرێك بیردەکاتەوە:

(من وەك منالەکان بیرم نەدەکردەوە، کە نەختێکیش بە ساڵدا چووم بەیاری منالانەکاتی خۆم بەسەر دەبردو ترسی یارییەکانم هەبوون، هەر چەندە دڵم خەبەری ئەو مەترسیانەی دەدا، بەڵام گوێم پێنەدەدان).

رەنگە مەسەلەکە ترس بێ لە بەردەم لێپرسراوییەتی ژیان، ئەو هەستی کردووە، کە ژیانی کاتییە، شتێ دەستی پێ نەکردووە تا بەرەو کۆتایی بڕوات. هەرچەندە نووسەر بەدەست کورتی ژیاوە. بەڵام ئەوە لە بەردەمیدا نەبووە بە کۆسپ، خەڵکی هەموو خۆشیان ویستووە، بەتایبەتی بڵاو کەرەوەی کتێبەکانی، کە (ماکس برۆد)یش نامەکانی کافکای خستەروو، کافکا پاداشتی ئەدەبی پێوەرگرت، جا بۆیە دەبێ کۆسپێکی دی هاتبێتەڕێ، کە وای لێکردبێ ناکامی بەتوندی دەستی لەیەخەی گیرکردبێ، چونکە نوسیویەتی:



(نەك هەرتەنها بە هۆی باری کۆمەڵایەتی، بەڵکو شێوەی هەڵکەوتنی سروشتی خۆم وا هەڵکەوتووە مرۆڤێکی کەم دوو وردبین و کەم تێکەڵاوی خەڵك ببم و نائومێد بێمە دنیاوە. ناتوانم ئەمەش بە بەدبەختی بزانم، چونکەترووسکەیەکی ئەو مەبەستەیە، کە خۆم گەرەکمە).

کافکا هەر لە منداڵییەوە هەستی بەجودایی و ناسازگاری و جیاوازی خۆی لەگەڵ خەڵکدا کردووە : (کەس لە خووڕەوشتی تێنەدەگەیشت، ئەم بارودۆخەی تووشی مەحکومییەتی کردبوو، هەتا وای هەست دەکرد بە دۆستەکانیشی ناچێ، ئەوان هاودەردی ئەو نین. لە یادداشتەکانیدا نوسیویەتی :

**(ئەو خەڵکانەی دەدوێن و چاویان دەدرەوشێتەوە، باشە چ شتێك لە هەموان زیاتر تۆ بەوان دەبەستێتەوە، بۆ نموونە تۆش وەك ئەوان دڵت هەیە، رەنگە بۆ ئەوە بێ تا لەگەڵ ئەوان رێك بکەوی ؟ بەڵم تۆ لەگەڵ ئەوان رێك ناکەوی، بۆیە وائەم پرسیارەش لەلای تۆ سەر هەڵدەدات.)**

کە تەواو بیردەکاتەوە ئەم جار بەرەو خەڵوەتەکەی خۆی دەگەڕێتەوەو تەنیاتی بۆ خۆی هەڵدەبژرێتەوە. سەیر نییە، کە هەرجارێ کێشەیەك لە نێوان خۆمان و دنیای کافکادا بەرپابێ هەست بە تاوانێکی گەورە بکەین. تاوان نەك گوناه. چونکە کافکاو قارەمانەکانی خۆیان بە گوناهبار نازانن. کافکا بەهیچ شێوەیەك گوناه ناناسێ و پەی دەرپەی چەندان پرسیاری خەمبارانەی جاویدانەی مرۆڤ دەخاتەروو: بۆ کوێ دەڕۆین، لەژێر کارکردنی چ هۆیەکین، یاسا کامەیە؟ بیری ئەو پەیوەندییەی نێوان دوو تەوەری گوشەگیری و یاسایە، بەڵام لە نێوان هەردووکیاندا دێت ودەچێ و خۆی بە هیچیانەوە نابەستێتەوە — گۆیا مرۆڤ دەستی هێزێکە، کە زۆربەی کات لە هەڵوەشانەوەکەی چاو دەپۆشی، ئەویش بەهۆی ئەوەوەیە، کە بچووکترین هەستی پشکنینی نییە، کە دەتوانرێ لە کۆمەڵ بەچاکی بدۆزرێتەوە. ئایا وا دەرناکەوێ، کە نووسراوەکانی چالاکییەکە بۆ لە ناوبردنی ناکامییەکانی ژیان ؟ ئەو دنیایەی کافکا پێشانی داوە دنیایەکی وردەو لە کەلەبەرەکانی رۆحی مرۆڤ دەکۆڵێتەوەو وەك مۆتەکە تێدەپەڕێ، مرۆڤ کاتێ خۆی بەکاری پووچ و بێ مانا بەسەر دەباو تێ دەکۆشێ لەژێر باری ئەو گوناهانەی، کە پشتی چەماندۆتەوە شانی خاڵی بکات و لە تەنیایی و نائومێدی بن بەست دەست و پێ دەکوتێ، بێگومان ئەم جۆرە دنیایەش دنیای زۆر لە هاودەمانی ئێمەو هەروەها روونکردنەوەی ژیانی خۆیشیەتی.

کافکا بەرامبەر بە خۆی وەفادارە ئەوەی نووسیوویەتی لە دەردو ئەشکەنجەی گیانی و مەعنەوی خۆی هەڵیهێنجاوەو بە شێوەیەکی گەشبینی و مەنتقی و شك و بێبەزەییانەوە دەربخستوون وترس و سام دەخاتە دڵی خوێنەرەوە. قارەمانەکانی بەقەد رووخساری خۆیانن و نایەوێ بیانشارێتەوەو بە پیتی یەکەمی ناوەکەی خۆشیان دەیانخاتەروو، وەك : جۆزیف ك... ناوی تەواوی نییەو تەنها سێبەرێکی ئەوەو وادێتە بەرچاو، کە ك... نەیادگاری هەیەو نە ئایینده، بەشێکی گیانی ئەو ناوەیان قرتاندووەو هەڵیانگرتووە. ژنەکان رووخسار و ناوی دەستگیرانەکەی ئەویان هەڵگرتووەو دەورووبەرەکەی هەر هەمووی لە رۆمانەکانیدا بەرچاو دەکەون. لە رۆمانی (داوەری) و (کۆشك) دا خشڵەکانی ژیانی رۆژانەی کافکا دەدرۆزێتەوە. هەروەها ئارەزووی ئەو کارانەمان بۆ دەردەکەوێت، کە کردوونی تا بتوانیت دەستکەوتی ماددی و زەمەنیی زیاتری دەسکەوێت، بەڵام چۆن لەگەڵ دژوارییەکاندا رووبەرووبۆتەوە، هەروەها دەزگا شرو گاڵتە ئامێزەکانی دەوڵەتی وەدەرخستووە، وەك پشت گوێ خستن و رۆتین و نارێکی و پیسی دەفتەرەکان ولە کۆڵ خۆکردنەوە و توانای سەرۆکی فەرمانگەکان، هەموو ئەمانە بەچاکی لەم کتێبانەیدا رەنگیداوەتەوە. ئەوانە چەند راستییەکن کافکا بە ئازارەوە هەستی پێ کردوون و دەربخستوون. بە خستنەرووی ئەم شتانە وا دەردەکەوێ، کە توانیویەتی خۆی رزگار بکات ولە ژێر نیڵەی خێزان و کۆمەڵگای جوولەکەو زەمین نەژادی خۆی بێتە دەرەوە. بە دایکی دەگوت : (من هەمووتان بە بێگانە دەزانم)، بەڵام ئەوەندەی لە ژیان مایەوە بۆ شتە لە دەست چووەکانی گوزەرانی کرد (بەبێ نەوەکانی، بەبێ خاو خێزان و بەبێ ئەو شوێنەی لێی لە دایکبوو.). دەیویست دووبارە ئەم شتانە بە دەست بێنێتەوە، تا بتوانێ وەك خەڵکی دی بژی، بەڵام ئارەزووەکانی نەهاتە دی. تیژبینی و وردبینی بیری ئەو بووە کۆسپێك لە رێکەی ئەوەی بتوانێ گرێی دەروونیی خۆی لای خەڵك بکاتەوە.

کافکا یەکەمین کەسە باسی نەگبەتی مرۆڤ لە دنیایەکی بێ خودا بکات، دنیایەکی پووچی وا، کە دواییەکەی کەس نییە پشتگیریت لێبکات، ئەگەر بە هێزی خۆت بتوانی چارەنووسی خۆت دەستنیشان بکەیت، چونکە شیرازەی گشت نەریتە باوەکان لەیەك پچڕاون و بۆ ئەوەی دووبارە بێنەوە ئاراوە، دەبی بناغەکەیان بە پێی بنەماو بزوێنەری ترەوە دابڕێژرێنەوە، کافکا بۆ درێژە پێدانی تاقیکردنەوەکانی خۆی گۆشەگیری هەڵبژاردووەو ئیدی هەتاوی گەرەك نەبووە. لە یاداشتەکانیدا نووسیویەتی :



(زۆربەی کات دەبێ بەتەنیا بم. ئەو بەختیارییەی دەستم دەکەوێ لە دەوڵەتی تەنیاییەوە دەستم دەکەوێ).

لە هەراو هۆریاو جەنجاڵی هەڵاتووە، چونکە بەمە دەکەوتە نێو ژیانەوە لە ساڵی ١٩١٣ دا نووسیویەتی:

(لەم ساڵانەی دواییدا رۆژێ بیست قسەم لەگەڵ دایکم نەکردووەو لەگەڵ باوکیشم تەنها سڵاوم لێکردووە، لەگەڵ خوشکەکانم و زاواکانم بێ ئەوەی هیچیش لە نێوانماندا هەبێت هیچ قسەم لەگەڵ نەکردوون).

دوای ئەوە هەتا نەیویستووە (دکتۆر برۆد)ی برادەریشی ببینێ و خۆی لێ شاردۆتەوەو لەگەڵ کەس قسەی نەکردووە. چونکە هەربە ئەنقەست ویستوویەتی هەموویان بکاتە دوژمنی خۆی و هەموو هێزێکیشی لە پێناو مەبەستەکەیدا بە کارهێناوە :

(من شێتانە پردەکان، هەموو تێك دەشکێنم ! هەموویان لە خۆم دەکەمە دوژمن و لەگەڵ کەسیش قسەناکەم). ئاکاری ئەو خۆراگری بووە لەبەردەم نووسین و ئومێدەوە : (ئاسمان لاڵە، ئاژاوە بۆ کەرەکان دەنێتەوە) ژیانی نەمریی بە دەست کەس ناکەوێ ژینی سەرزەمین (بیابانێکی مەعنەوی)یە، کە لەوێ (لاشەی کاروانی رۆژانی رابردوو و داهاتوو) بەسەر یەکدا کۆمەڵ دەکرێن: (دەبێ سەری پر لە کینەو بێزاری بەسەر سنگدا شۆرکەینەوە و ووریای خۆمان بێن کەس بینە قاقامان نەگرێت.)

هەروا بە رستەیەك دنیای رابردووی خۆی رەت دەکاتەوەو دەڵێ: (من سەر کەوتووانە نەفی زەمانەم لەگەڵ خۆمدا گونجاند.)، لەم رووەوە کافکا تێکۆشاوە گیانی وتەکانی بە دەنگێکی تازەو ترسناکەوە دەربخات، بە دەنگێکی ئاوارە، کە دەنگی دیارو لەبەرچاوی ئەمرۆکەمانە...

لایەنێکی دی هەیە سەرنج رادەکێشێ، ئەویش ئەوەیە، کە هەر سێ رۆمانی کافکا (داوەری) و (کۆشك) و (ئەمریکا) و زۆر لە چیرۆکەکانی بە ناتەواوی ماونەتەوە. ئەم دیاردەیەش هەڵبەتە بەهۆی تەمبەڵی و پشت گوێخستن یان بە هۆی ناتوانایی نووسەرەکەیەوە نەبووە. پسپۆڕێکی دەروونناسیی ئەم شتە واشی دەکاتەوە، کە بێ شك بەهۆی کاری سێکسییەوە بووەو دەیبەستێتەوە بەوەی، کە کافکا ئارەزووی ژن هێنانی هەبووەو نەیتوانیوە کار بکات: لە گشت نووسینەکانیدا بابەتی شکست و ناکامی پەروەردە کردووەو وەك

پەیامبەرێك بە شێوەی جیاجیا بەرگری لێکردوون، بەڵام کافکا ئەزموونەکانی خۆی درێژە پێداون و بەهۆی نووسینەکانییەوە رایدەگەیاندن. چونکە خۆی نووسیویەتی :

(لەبەر تەمبەڵی و نیازپیسی و بێ تاقەتی نییە، کە لەشتێکدا چ لەژیانی خێزانداریيەتی وچ لەژن هێنان وچ لەکارو ئەدەبیاتدا رووبەرووی شکست و غەیری شکست دەبمەوە، بەڵکو بە هۆی نەبوونی زەمین و هەواو یاساوەیە، کاری منیش هێنانە کایەی ئەمانەیە... ئەمانە بەکاری سەرەکی خۆم دەزانم)..

بەم شێوەیە دەردەکەوێ، کە کافکا هەر لەسەر نەخشەکەی خۆی دەڕوا، قارەمانەکانی وەکو خۆی لە دنیایەکی ناسازگاردا دەژین، کە پڕە لە مەترسی و مۆتەکەو بارودۆخی خۆیان لەم دنیا پووچە بە جیا دەنوێنن و بە ئەنجامێکی ترسناك دەگەن، کە بن بەستەو دەربازبوونی تێدانییە.

خاڵێکی دیکە هەیە ئەویش ئەوەیە، کە دەتوانرێ (داوەری) و (داوەشان) بەم چاوەشەوە سەیر بکرێن و راڤە بکرێن. کە بەهۆی هەستکردن بە ناخۆشی و دەردەکەی خۆی بێ دەرمان بینیوەو سەیری کردووە دەوروبەرەکەی لێی دوورکەوتوونەتەوە، بۆیە نووسرابن، بەڵام ئەو بەرهەمانەی پێش ئەوەی تووشی نەخۆشی سیل ببێت نووسیووە. ماکس برۆد نەیزانیوە یاخو نەیگووتوە، کە کافکا نیشانەکانی ئەم نەخۆشییەی لەخۆی هەست پێ کردووە یان نا ؟...

کافکا زۆرخێرا نووسیویەتی هەندێ جاروەك دیستۆفسکی چیرۆکێکی لە شەوێکدا تەواوکردووە لەنووسینەکانیدا زۆرسەرنج ووردبووەو راستگۆییەکی تەواوی نیشانداوە ئەونووسیوویەتی چونکە، ویستویەتی پەیامێکی راستەو خوبەدەستەوەبدات نابێ بپرسن کافکا ویستویەتی جێ بڵێ، ئەوەی گوتویەتی هەرئەوەیە کەویستویەتی.

دنیای کافکا دنیای خەونەوبەمۆتەکە و ترسەکانی یەخەی مرۆڤ دەگرن، کەچی لەپرکە بەهۆش خۆمان دێینەوە رووبەرووی هەراو پووچی و گاڵتەجاڕیی دنیای بێداریی خۆمان دەبینەوە، کەخوومان پێوەگرتووەو بەجددیات وەرمانگرتووەو هەتا هەنووکە بە ناوەی حەقیقەت بۆیان کردووین بەقاڵب لە هونەردا تەنها رووخسار بە بێ بیرێکی پایەدار ناتوانێ خۆی راگرێ. کارەساتە ئاساییەکانی ژیان لە ژێرنووکی قەڵەمی کافکادا بە شێوەیەکی درامی خویان نواندووە. بەسەرهاتەکانی رۆمانێك لە چیرۆکێکدا کورت دەکرێتەوە. رستەکانی بەهێزن و هەندێ جار ئاڵۆز، بەڵام سادەو ئاساین. کافکا لە ژیانی ئاسایی و راستییەکانی ژیان هەڵاتووە. لەم رووەوە، خۆی راستییەکان دێنێتە ئاراوە. نووسینی ئەو مۆتەکەیە هەر وەك خەون خۆی



دەنوێنێ، هەروەك خۆی ئیشارەتی بۆخەوزڕانی شەوێکی خۆی کردووەو دەڵێ: (راستەمن دەنووم، بەڵام لەگەڵ ئەوخەونانەی دەیانبینم لەبێنە و بەردەدام.).خوێنەر دەچێتە دنیایەکەوە، کە لە نێوان خەو و بێداری دایە، وەلێ هێشتا بەئاگایەوخۆی دەناسێتەوە و ئەم دنیایەش بە پووچ و خەیاڵاوی و گومانلێکراو نایێتە بەرچاو، بەڵکو حەقیقەتێکی بە سوێیە. روخسارەکان تێکەڵ یەك دەبن، بەڵام پەرتەوازە نابن.

گەردوون و زەمانە لە شوێن خۆیانن. بەڵام مەنتقی کەسەکان و تووش بوونیان بەیەکتر جۆرە مەنتیقێك و تووش بوونێکە تەنها لە جیهانی خەوندا روودەدات. کافکا بێ ئەوەی بابەتی غەمبارانە یان داوای بێ سەروبن بخاتەروو بەری دڵ دەگرێ. هونەرەکەی حەقیقەت دەخاتە لاوە، واتا زیادەڕەوی لە واقیع بینیدا دەکاو بە شێوەیەك مەحکوومیان دەکات کە لە هونەرەکەی ئەودا رادەیەك بۆ جددیات و گاڵتە دانەندراوە...

وەرگێڕانی بەرهەمەکانی کافکا کارێکی ئاسان نییە، بە هۆی زمانەکەیەوە، کە هەرچەندە دیاریکراویشە، بەڵام لەبەر ئەوەی لەسەر رێو شوێنی تەواوی کلاسیکییە و ئاوازو کێش و ئاڵۆزی و گشت رێگەکانی دی کلاسیکییەتی رەچاوکردووە بۆیە پێویستی بە خۆماندووکردن هەیە لە نووسینەکانی کافکادا هەموو شتێ پەیوەندییەکی مەنفی بە ژیانەوە هەیە قارەمانەکانی یان چاکترە بڵێین شتەکانی غەیری قارەمانەکانی هەموو سەرشۆرو ستەمدیدەن. بێ فیزیی کافکا وەك بێ فیزیی پیرۆزمەندییەکانی مەسیحە، بەڵام بە پێچەوانەی ئەوان: مەبەستی ئەو لە بێ فیزیی داماوی تێکشکاوی نییە بەرامبەر بەخوا، بەڵکو بە پێچەوانەوە بە هۆی (نەفی) مرۆڤی ئێستا رووبەرووی رق لێبوونەوەی خودا دەکاتەوەو ئادەمیزاد هیچ و ناچیز دەکات. ئەو قارەمانەی لە دنیای ئاژەڵانەوە وەریدەگرێ ناکرێ لەوە زیاتر بچووکترو نزمتریان بکاتەوەو بەم رێگەیە دەیەوێ بڵێ، کە ئادەمیزادی ئێستا هیچ نییە. قارەمانە مرۆڤەکانیشی بۆ نموونە، کارل رۆسمان لە رۆمانی (ئەمریکا) دا نموونەی مرۆڤی بێ فیزە. لە رۆمانی (داوەری) دا جۆزێف ك... بەند دەکرێ و لە رۆمانی (کۆشك)دا ك...ی گەڕیدە وەك وەوەوایە (کلی لەچاواندا دزی بێ)، هەموویەك جۆرەسێبەرن،بەڵام چونکە سیماو ئەندام و کێشیان نازانین، بۆیە سوودێکی ئەوتۆیان نییە بەڵام دەزانین سێبەرێکن و مەبەستێکیان هەیە و ئیرادەیان لەبەهێزبوون دایەوجێی خۆیان دەکرن و هەڵدەسنکێندرێن و ئەنجامێك بەدەستەوە دەدەن، هەتانیشانەی بەرایی ناوەکەشیان زیادەیە، چونکە لەوهەرێمە بەستەڵەکانەدا (زۆرمان بە قەڵەم

ڕەساسێك کە لە ئاوەوە چەسپیوین و گومان دەکەین، کە شتێکمان دەسگیردەبێ. کەچی لە کاتێکدا کە نقووم دەبین خەونی رزگاربوون دەبینین.).

چۆنە هێشتا ناوێك بۆخۆمان دابنێین ؟ لەم شوێنانەدا هەموو شتێك پاك دەبێیەوە، نووزەی لێ دەبڕێ، ڕەنگی زەرد هەڵدەگەڕێ و پەیوەست دەبێت بە تیشکێکی خزەوە، وەك بڵێی: (مرۆڤ لە ناو ئاو سێبەری خۆی بخاتە ژێرپێیەوە) هیچ شتیك بوونی نییە. پیتی یەکەمی (ك)یش نیشانەی ئەوپەڕی بێ فیزی و لە خۆیایی نەبوونە. ئیرادەی ڕووخێنەری کافکا ناتوانرێ، لەبەرچاونەگیرێ، هەمووجارێ، کە چاومان بەو دوونامەیە دەکەوێ، کە تیایاندا وەسیەتی کردووە گشت بەرهەمەکانی بێ ئەوەی بخوێنرێنەوە بسووتێندرێ ئەوەمان بۆ دەردەخات، کە ئارەزووی ئەوەی کردووە بە تەواوی کەسیەتی خۆی لە ناوببات. باوەڕی پتەوی بەنەرێ و پووچی هەموو شتێ هەبوو، بەچاوی پووچ و سووکی لەبەرهەمەکانی خوێشی ڕوانیوە. نەیویستووە وەك سۆفییەکان بە شادی و بەختیارییەوە قۆڵ باسکی خۆی بکاتەوە و بڵێ:

(دوای ئەوەی ونبووم وەك ئەسپێکی تیژڕەو بە هەشتاوی بەرەو نەبوون رادەکەم)، نەخێر، بەڵکو ئارەزووی شەوی نەمریی کردووە بێ ئەوەی شوێن پێی ڕێبوارییی خۆی بەجێ بهێڵێ، کە لەسەرئەویش شتێکی نووسیووە حەزی کردووە زوو بیسرێتەوە، چونکێ گچکەترین ڕۆژنەی ئومێدی بەدنیای دوای مەرگ نەبووە...

لە (وڵگەی سزادا) دا، کە یەکێکە لە چیرۆکە دڵگیرەکانی کافکا، تا رادەیەك لەبەرهەمەکانی ئیدگار ئالان پۆ دەچێت، بەڵام لە ڕووی ناوەڕۆك و ئیدیۆمەوە وەکو هێناویەتییەوە جیاوازە. لەم چیرۆکەیدا (داوەری) لە شێوەی ئامێرێکی خۆکاری ئەهریمەنی خۆی نواندووە، کەبە پێی قسەکانی فەرماندە مردووەکە ئازاری لەشی گیراوەکە دەدا، لەبەرامبەر ئەو ئەشکەنجە بێ ئەنجامانەی بە بەندکراوەکەی دەدەن. ئەمان ڕێگەی بەرگری یان بۆ خۆیان هەڵبژاردووەو ئاگایشیان لە تاوانی خۆیان نی یەو هەتا ڕوونکردنەوەش بە زمانی بێگانە بۆ جیهانگەری تەماشاکەر وەدەردەخەن. ئەم ئامێرە لە داهێنانی فەرماندەی پێشوو دەبێ، کەمردووە. فەرماندەی تازە لەگەڵ بیروڕایەکانی ئەو ڕێك ناکەوێ و پەیڕەوەکانی درێژە پێ دەدات. لێرەدا هەرچەندە ئەمە مەحکومییەتێکی تەواوە یاساو دادگا بە شێوەیەکی میکانیکی هاتۆتە ناوەوە، بەڵام ئومێدێکی شاراوە بە گۆڕانی ڕژێم هەر هەیە لە کاتێکدا ئەم چیرۆکە بڵاو بۆوە (١٩١٩) ڕەنگە هەندێ بە خەیاڵێکی پڕو پووچی پەنگ خواردووی مێشکی



نەخۆشێکیان دانابێ و بەڵام دوایی ئەم خەیاڵە پایەیەکی گرنگی تاقیکردنەوەی لە لایەن کۆمەڵێ کەسانەوە گرتە خۆو پێشبینییەکی تەواوی ناکەسانەو خوێنخوازانەی دنیای ئێمەی گرتەوە، چونکە ئەو ڕژێمەی لەسەرەوە ڕازاوەتەوەو ئارایشتکراوە و بەناو پشتیوانی لە یاسا دەکا، بووە ڕووخساری ڕۆژانەی زۆر لە بەندکراوەکان. ئەو بابەتەی کە کافکا باسی لێوە کردبوو (جودایی، جیابوونەوە) بووە بابەتێکی ڕۆژانە. لەم چیرۆکەی کافکا، ئەو ئەفسەرەی کە کاری خوین ڕێژی لە ئەستۆ گرتووە، کە ئامێرەکە لە کار دەکەوێت بە شێوەیەکی سەیرو بە ئومێدەوە گیانی خۆی بەمەرگ دەسپێرێ و خۆی دەکوژێ. بەڵام ئەمە بەڵگەی ئەوە نییە، کە ڕژێمێکی چاکتر دێتە جێگەی، چونکە ترس دەخاتە ژێر پێیەوەو پێشبینییەکی ترسناکی نوێ دەدا، ئەویش زیندووبوونەوەی ئەفسەری رابردووە.

هێربێرت تۆبەر H:TaUber بۆ ئەوە چووە، کە داهێنەری ئامێرەکە، واتا فەرماندەی پێشوو لە هەمانکاتدا سەربازو دادپرس و ئەندازیارو کیمیاگەر بووە، ئیدیۆمی (توانای ڕەها)ی ڕەتکردۆتەوە. گیرار بۆدین G:Boden لەو باوەڕدایە، کە هیچ بیرکردنەوەیەکی نوێ یان ڕێگەیەکی تازە نییە لە خستنە ڕووی ستەمی فەرماندەی پێشوو کەناوی نەهێنراوە و لە ڕووخساری ئەفسەرەکەشدا نیشانەی (دڵسۆزی پەیمان) بەرچاو ناکەوێت. بەڵکو درکەیەکە، بۆ ئەوەی، کە یاسا سەختەکانی سەردەمە کۆنەکان (تەورات) ڕژێمی تازەشی چواندووە بە سەردەمی ئێستا (ئینجیل). ئەم جۆرە دەستەواژانە لە لێکدانەوەو شیکردنەوەی بەرهەمی ئەدەبیدا دەگونجێ هەبێت، بەڵام بەهیچ شێوەیەك ناتوانرێ بە بڕیارێکی یەکجارەکی بژمێردرێن.

هەرچەندە پەیامی کافکا نائومێدانەو بن بەستەو تیایدا گشت هەوڵ و کۆششێك سەری لە بەرد دەداو نەبوون (نیهلیسییزم) لە هەموو لایەکەوە هەڕەشە دەکات و پەناگەیەك نییەو ئاکام هەر دەچێتەوە سەر (پووچ) ی و شوێنێ نادۆزرێتەوە، کە تیایدا هەناسە تەنگ نەبێ، بەڵام کافکا ئەم دنیایە قبوڵ ناکات. لە دنیایەك، کە هەموو شتێ یەکسان بێت، دنیایەکی ئەهریمەنییەو هەر چەند جارێ دەوروبەرەکەی بەم شێوەیە دەبینێ مانای وا نییە ئیتر دەبێ گیانی بە بەڵا بسپێرێ و خەمی لێ بخوات.

بە پێچەوانەوە کافکا ڕقێکی زۆر بەرامبەر پلەو پایەی ستەمکاران بەرپا دەکات. لەو دیو نووسینە سەیرەکانییەوە بانگێشەکانیان دەداتە دەم بای گاڵتەجاڕی و ئەو یاساو دادگاو دەزگا ئەشکەنجەییە بەرزەخیانەیان مەحکووم دەکات و توانایان لە نێو دەبات و بە مردوویان لە قەڵەم

دەدات. ئەم دنیایە لەلای ئەو بەکەڵکی ژیان نایەت و خنکێنەرە، بۆیە بەدوای (زەمین و هەواو یاسا) یەکدا دەگەڕێ تا تیایدا ژیانێکی ئابڕوومەندانە بەسەر بەرێت.

کافکا لەو باوەڕەدایە، کە ئەم دنیای درۆو تەزویرو گاڵتەجاڕییە دەبێ تێك بدرێ و لەسەر رووی وێرانەکەیدا دنیایەکی چاکتر دروست بکرێ، ئەگەر دنیای کافکا یەخەی پووچی گرتووە ئەوە ناگەیەنێ، کە دەبێ باوەشی بۆ بکریتەوە، بەڵکو شوومە. هەست دەکرێ، کە کافکا بۆ خۆی وەڵامێکی هەیە، بەڵام ئەم وەڵامەی نەداتەوە.)[۱۲۲]

ناوەڕۆکی بەرهەمەکانی کافکا هێندە تەمومژاوی و پڕ رەمز و دڵڕەقانەن، کێشەی ئەوە بۆ لێکۆڵەر دروست دەبێت، کە ئەدەبیاتی کافکا بخاتە خانەی کام رێباز و تەوژمی ئەدەبییەوە، بۆ نموونە هەندێ چیرۆك و رۆمانەکانی ئەو لە رووی هونەری چیرۆکنووسینەوە بە شێوازی باو یان بە ریالییزمی سیحریی و هەندێ بە نووسەرێکی دەربڕینخوازی (التعبیریە)ی لە قەڵەم دەدەن[۱۲۳] .

بە هەرحاڵ، بەرهەمەکانی گوزارشتێکی راستەقیەنەنە لە توونددوتیژی و بێ بەزەیە مرۆڤ و تێکەڵاوییەکە لە نێوانی بۆچوونی کۆمەڵایەتی و فیکری و ئایینی دژ بە دامەزراوە یاساییەکانی رۆژگاری خۆی، کە ئامێری دروستکراوی مرۆڤ بۆتە هۆکارێکە دژ بە خۆی. لە نێو ئەم بارودۆخەدا سەیرنییە پاڵەوانی وەکو گریگۆری و جۆزێف.. ك دروست ببێت

---

۱۲۲- ئەم وتارە لە بارەی (کافکا)وە چیرۆکنووسی پێشەنگی ئێران (صادق هدایت) بۆ پێشەکی تەرجەمەکراوی فارسی رۆمانی (داوەشان)ی کافکای نووسوە، هیدایەت زۆر شارەزای جیهانی کافکا و فەلسەفەی پووچی بووە و تەنانەت بە شێوەیەکی غەمبارانە لە پاریس خۆی کوشت. پەراوێزەکان من بۆم زیاد کردووە.

۱۲۳- بۆ نموونە د.عبد الغفار مکاوی دوو دڵە لە نێوانی دەربڕینخوازی و سیمبۆلییزم دا، بڕوانە: د.عبدالغفار مکاوی، التعبیریة فی الشعر و القصة و المسرح،الهیئة المصریة العامة للتالیف و النشر، ١٩٧١، ص ٦٩- ٧٢.



**نموونەی درامای کلاسییزم:**

## شانۆنامەی
## فێڵەکانی سکاپن

نووسینی : مۆلییێر

هیمدادی حوسێن

لە فارسییەوە کردوویە بە کوردی

**کەسەکان**

ئارگانت Arganete : باوکی ئاکتاڤ و زێر بینێت.

ژێرونت Geronte : باوکی لێیاندەر و هیاسنت.

ئاکتاڤ Octave : کوڕی ئارگانت و ئاشقی هیاسنت.

لێیاندەر Leandre : کوڕی ژێرونت و ئاشقی زێر بینێت.

زێربینێت Zerbinette : کیژە دۆم — دڵبەری لێیاندەر.

هیاسنت Hyacinte : کچی ژێرونت و دڵبەری ئاکتاڤ.

سکاپن Sapin : خزمەتکاری لێیاندەر — فێڵباز.

سیلڤستەر Sylvester : خزمەتکاری ئاکتاڤ.

نێرین Nerine : دایەنی هیاسنت.

کارل Carle : دۆستی سکاپن — فێڵبازێکی دی

شوێنی ڕوودانی بەسەرهاتەکە ناپۆلییە.

**پەردەی یەکەم:**

**دیمەنی یەکەم : ئاکتاڤ — سیلڤستەر**

ئاکتاڤ: ئاخ! چەند هەواڵێکی ناخۆش بۆ دڵێکی ئاشق! تووشم بە تووشی چ بەڵایەك بوو! سیلڤستەر تۆ خۆت لە بەندەر گوێت لێ بوو، کە باوکم دەگەڕێتەوە ؟

سیلڤستەر: بەڵێ.

ئاکتاڤ: هەر ئەمڕۆ دەگاتە جێ؟

سیلڤستەر: هەر ئەمڕۆ.

ئاکتاڤ : بڕیاریشی داوە ژنم بۆ بێنێ؟

سیلڤستەر: بەڵێ.

ئاکتاڤ: یەکێ لە کچەکانی " ژێرونت "یش؟

سیلڤستەر: یەکێ لە کچەکانی ژێرونت.

ئاکتاڤ: هەر بۆ ئەم مەبەستە کچەکەشیان لە "تارانت"ەوە.
خواستووە؟

سیلڤستەر: بەڵێ

ئاکتاڤ: باشە تۆ ئەم هەواڵانەت لە مامەوە بیست؟

سیلڤستەر: بەڵێ لە مامت.

ئاکتاڤ: ئەم هەواڵانەی لە نامەیەکدا بۆ ئەو نووسی بوو؟

سیلڤستەر: لە نامەیەدکا نووسی بووی.

ئاکتاڤ: جا بە قسەی تۆ بێ مامم بە هەموو شتەکانی زانیوە؟

سیلڤستەر: بە هەمووی دەزانی.

ئاکتاڤ: ئاخ! دە قسە بکە! وام لێ مەکە بە زۆر قسەت پێبکەم .

سیلڤستەر : لەوە زیاتر چی بڵێم ؟ تۆ هیچت نەهێشتەوە، هەر چی یەك بوو وا خۆت وتت.

ئاکتاڤ : هەر هیچ نەبێ ئامۆژگارییەکم بکە و پێم بڵێ ئێستا لەم هەڵوێستە دژوارەدا چی بکەم؟

سیلڤستەر: ڕاستییەکەی، منیش وەك تۆ حاڵم

ئاکتاڤ: ئەم گەڕانەوە نەفرەتییەی، منی کوشتووە



سیلڤستەر: وەزعی منیش لە تۆ باشتر نییە.

ئاکتاڤ: باوکم بەو شتانە بزانێ هەر خوا بزانێ چیم لێ دەکا.

سیلڤستەر: لۆمە کردن هیچ نییە، خوابکا وا بەم ئاسانییە ڕزگارمان بێ، بەڵام لێم ڕوونە ئەم شێتییەی تۆ لەوە بەگرانتر لەسەرمان دەوەستێتەوە چۆن ئەو قامچیانەی لە هەور دەدرێ ئاواش بەر شانەکانی منیش دەکەوێ.

ئاکتاڤ: خوایە، لەم بەڵایە چۆن ڕزگار بم؟

سیلڤستەر: پێش ئەوەی تووشی ئەم بەڵایە بیت دەبووایە بیریشت لە ئەنجامەکەی بکردایەتەوە.

ئاکتاڤ: ئاخ ! تەڕ بەو ئامۆژگارییە بێ ڕێ و جێ یانەت دەمکوژێ.

سیلڤستەر: تۆیش بەم ئیشە بێ هودەییانەت باش خەفەتم دەدەیتێ.

ئاکتاڤ : دەبێ چی بکەین؟ بڕیاری چی بدەین؟ چارەمان چییە؟

سیلڤستەر: ڕاستیەکەی، منیش وەك تۆ حاڵم پەشۆکاوەو پێویستیم بە یەکێك هەیە ئامۆژگاریم بکات.

ئاکتاڤ: ئەم گەڕانەوە نەفرەتیەی، منی کوشتووە

سیلڤستەر: وەزعی منیش لە تۆ باشتر نییە.

ئاکتاڤ: باوکم بەو شتانە بزانێ هەر خوا بزانێ چیم لێ دەکا.

سیلڤستەر: لۆمە کردن هیچ نییە، خوابکا وا بەم ئاسانییە ڕزگارمان بێ، بەڵام لێم ڕوونە ئەم شێتییەی تۆ لەوە بەگرانتر لەسەرمان دەوەستێتەوە چۆن ئەو قامچیانەی لە هەور دەدرێ ئاواش بەر شانەکانی منیش دەکەوێ.

ئاکتاڤ: خوایە، لەم بەڵایە چۆن ڕزگار بم؟

سیلڤستەر: پێش ئەوەی تووشی ئەم بەڵایە بیت دەبووایە بیریشت لە ئەنجامەکەی بکردایەتەوە.

ئاکتاڤ: ئاخ! تەڕ بەو ئامۆژگارییە بێ ڕێ و جێ یانەت دەمکوژێ.

سیلڤستەر: تۆیش بەم ئیشە بێ هودەییانەت باش خەفەتم دەدەیتێ.

ئاکتاڤ: دەبێ چی بکەین؟ بڕیاری چی بدەین؟ چارەمان چییە؟

**دیمەنی دووەم:**

**سکاپن — ئاکتاڤ — سیلڤستەر**

سکاپن: ها مسیو ئاکتاڤ چی بووە؟ هەواڵی ئێرە چییە؟ چی ڕووی داوە؟ وا دەستەوە ئەژنۆ داماوی.

ئاکتاڤ: ئاخ !سکاپنی خۆشەویست، ئیتر من تەواو، هەموو شتێکم لە دەست چوو، بەدبەخت ترین کەس منم!

سکاپن: چۆن؟

ئاکتاڤ: ئاگات لێ نی یە چیم بەسەرهاتووە؟

سکاپن: نەخێر.

ئاکتاڤ : باوکم و میسو ژێرونت هاتوون دەیانەوێ ژنم بۆ بێنن.

سکاپن: جا باشە، ئەوە خەفەتی بۆ چییە؟

ئاکتاڤ: داخ! تۆ بە خەم و خەفەتەی من نازانی

سکاپن: نەو، بەڵام ئەگەر خۆت حەز بکەی، ئەوا منیش بە زووترین کات بە هەموو شتێك دەزانم، من دڵنەوایی خەڵکی دەدەمەوە. من کەسێکی وام لەبارەی ئیشی لاوانەوە زۆر شت دەزانم.

ئاکتاڤ: ئاهـ، سکاپن، ئەگەر بتتوانیایە فێڵێك بدۆزیتەوەو بەزمێکی وات ڕێکخستایە منت لەم بەڵایە ڕزگار بکردایە، هەتا مابووم قەرزار باری تۆ دەبووم.

سکاپن : ڕاستییەکەی پێت بڵێم، کە بمەوێ خۆم لە کارێکەوە هەڵبقورتێنم نەبوونی شتێکی موستەحیلە بە بێهیچ شك و گومان، خوا ئەقڵێکی وای پێبەخشیوم،لە هەموو جۆرە داهێنان و جوانکارییەك و وردکاریەکدا سەر دەکەوم، لەو هونەرانەی کە عەوام و نەزانەکان بە فێڵبازیی دادەنێنن. بە بێ خۆ دەرخستن دەتوانم بڵێم یەکێکی دی لە من فێڵبازترو تەکبیرکەرتر نادۆزیتەوە،

بە شانازییەکی زۆرەوە سەری لەم کارە شەریفە دەربچێ، بەڵام ڕاستییەکەی ئەمڕۆ بەختم یار نەبوو و کارێکم هات پێش زۆر دڵتەنگی کردم.

ئاکتاڤ: چۆن؟ کاری چی سکاپن؟

سکاپن : کارەساتێکی وابوو قانوون لە قافاگرتمی.



ئاکتاڤ: قانوون گرتتی؟

سکاپن: بەڵێ، ئاوا کورتە شەڕێکمان بوو.

ئاکتاڤ : ئەی قانوون بۆ؟

سکاپن: بەڵێ، ئەو ڕەفتارێکی زۆر ناشیرنی بەرامبەر بە من نواند منیش بەرامبەر ئەو نارەواییەی زەمانە وا تووڕە بوومە،هیچ شتێك ئۆقرەم نادا، وازبێنە. بەسەرهاتەکەی خۆتم بۆ بگێڕەوە.

ئاکتاڤ: سکاپن، خۆت دەزانی ئەوە دوو مانگە باوکم و ژێرونت پێکەوە بە کەشتی بۆ گەشتێکی بازرگانی ڕۆیشتوونە.

سکاپن: ئەوە دەزانم.

ئاکتاڤ: هەروەها دەشزانی، کە من و لێیاندەریان لێرە بەجێ هێشتووە، منیان بە سیلڤستەرو لێیاندەر یشیان بە تۆ سپاردووە ؟

سکاپن: بەلێ، منیش بە چاکی بەکاری خۆم هەڵساوم.

ئاکتاڤ: پاش ماوەیەك، لێیاندەر عەشقی کیژە دۆمێك بوو.

سکاپن: باش دەزانم.

ئاکتاڤ: چونکە ئێمە هاوڕێیەکی گیانی بە گیانین، لێیاندەر ڕازی عەشقەکەی لە لای من کردووەو منی لەگەڵ خۆی برد بچین کچە ببینم کچێکی جوان بوو، بەڵام نەك ئەوەندەی لێیاندەر باسی دەکرد. دوای ئەوە لێیاندەر ئیدی بێجگە لەو کیژە باسی هیچیدی نەدەکرد، هەموو کاتێ دەربارەی جوانی و قسە خۆشی خۆشییەکەی پێدا دەچوو، ستایشی خوڕەوشتی دەکرد، بە سۆزەوە گفتوگۆی شیرینی خۆیانی دەگێڕایەوە و هەرچی قسەیەکیان لە نێوان خۆیان بکردا بابە بۆ منی دەگێڕایەوە. لێیاندەر هەوڵی دەدا پێم بسەلمێنێ، کە عەشقەکەی ئەوان پیرۆزترین عەشقی سەرزەمینە هەندێ جار بیدیتبایە زۆر گوێ نادەمە گڕی عەشقەکەی لۆمەی دەکردم.

سکاپن: هێشتا نازانم مەبەستت لەم قسانە چییە؟

ئاکتاڤ: ڕۆژێك من و لێیاندەر پێکەوە دەچووینە ماڵی دۆمەی دڵبەرو ئومێدی ئەو، لە کۆڵانێکی دوور، لە خانوویەکی خراپ، گوێمان لە هاواری شین و گریانێك بوو. پرسیمان ئەوە چییە؟ ژنێك بە غەمبارییەوە ئەو ماڵە غەریبە شتێکیان بەسەرهاتووە یا خوا کەس بەسەری نەیێت.

سکاپن: ئێ ی دوای ئەو؟

ئاکتاڤ: زۆرم لە لێپیاندەر کرد تا لێ بکۆڵینەوە بزانین مەسەلەکە چی یە. چووینە ژوورەوە، سەیر دەکەین پیرێژنێك وا لە سەرە مەرگ دایە، خزمەتکارەکەی دەگریێ و کچێکی جوانیش چاوی پڕ فرمێسك بووە، کچی وا نازدارو خان و مان هەر نەبینراوە.

سکاپن: ئاخ، ئاخ!

ئاکتاڤ: ژنێکی دیش لە تەنیشت دانیشتبوو، دیار بوو دەترسا، چونکە کراسێکی کورتی سادەی خەوی لەبەربوو،چەفییەکی زەردی لەسەری بەستبوو و پرچی تێکچرژاویشی بەسەر شانەکانیدا پەخش ببووە، لەگەڵ ئەوەشەوە، لە جوانی و دلگیریدا دەدرەوشایەوە و زیاتر پێی ناسکتر و نیانتر بوو بوو.

سکاپن: وا بزانم تەشکیلات دروست دەبێ.

ئاکتاڤ: ئەگەر ئەو کاتەی من دەڵێم، تۆیش ئەو کاتە بتدیتبایە، هەتا هەتاییێ هەر وەسفت دەکرد.

سکاپن: ئۆف! من هیچ گومانم لەوەدا نییە بێ ئەوەی بینیبیشتم، دەزانم لە ڕادەبەدەر نازدار بووە.

ئاکتاڤ: فرمێسکەکانی ئەوە نەبوون بلێ ی دەم و چاوی بگۆڕێ، کە دەشگریا هەر جوان بوو. خەمی ئەو جوانترین خەمی دنیا بوو.

سکاپن: هەموو تێ دەگەم.

ئاکتاڤ: یەك بە چاوی فرمێسکی دەڕشت و ئەو کاتە ئاشقانە خۆی بەسەر پیرێژنێدا شۆڕکردبۆوە، بانگی دایکە خۆشەویستەکەی دەکرد، باوەڕ ناکەم کەس هەبێ بە بینینی ئەو ڕووحە شیرینەی دڵی نەگوشرێ.

سکاپن : دەزانم ئاخیرەکەی ئەو دیمەنە جوانە و ئەو ڕووحە شیرینەی وای لێ کردی ببیە برادەری.

ئاکتاڤ: ئاخ، ئیسکاپن! گەر دڕندەیەکیش بیدیتبایە دەبووە برادەری.

سکاپن: دڵنیام! چۆن نابێتە برادەری؟!

ئاکتاڤ: هەوڵمدا بە خەفەتەوە بیدوێنم و ئەو جوانەی بڕوێنمەوە و پاشان ئێمە بڕۆین. ئەو کاتە لە لێپیاندەرم پرسی ڕات چی یە بەرامبەر بەم کچە؟ ئەویش بە ساردو سڕی یەوە وتی: بە



ڕای من کچێکی جوانە. لە وەڵام دانەوە ساردەی تووڕە بووم و نەمویست چیدەی باسی ئەو کچە جوانەی بۆ بکەم، کە کاری کردبووە سەر دڵ و دەروونم.

سیلڤستەر: ئەم هەقایەتە ئەگەر وا بڕوات دەبێ تا بەیانی لێرە بوەستین. وازبێنە با من دوو قسەی تەواوی بکەم (بە سکاپن دەڵێ) لەو کاتە دڵی گرتبوو. ئیدی نەیتوانی بەو دڵە خەمبارەی لە دۆستەکەی دوورکەوێتەوە. دوای ئەوە چەند جارێکی دیش چوی پێکەوتەوە، ئەو خزمەتکارەی لە دوای مردنی دایکی سەر پەرشتی کچەکەی دەکرد بە مەسەلەکەی زانی. ئیدی کاکم هەر بەو ئومێدەیەو دەکروزێتەوەو دەلاوێتەوە و تکا دەکا، بەلام هەمووی بێ سوودە، پێیان گوت، کە کیژە لە خێزانێکی ئابڕومەندە یا دەبێ کیژەکە بخوازی یان دەنا تاقەتی ئەو خۆشەویستییە دوور بە دووی یەیان نییە. ئەم بەم شێوەیە ئەو عەشقەی گۆڕاوە بە مەشخەڵێکی ئاگر. جا بە گوێرەی ئەقڵی خۆی بیری لێ دەکا تەوەو تەگبیران دەکا و بەڵگە دێنێتەوە، خۆی گران دەکاو سەرئەنجام بڕیارەکەی خۆی بە جێ گەیاند: ئەوە سێ ڕۆژە بڕیاری داوە لەگەڵ ئەو کیژە زەماوەند بکا.

سکاپن: تێ گەیشتم.

سیلڤستەر: ئێستا کە لەگەڵ ئەم بەسەرهاتەش، گەڕانەوەی چاوەڕوان نەکراوی باوکیشی لەبەرچاو بگرە، هەتا دوو مانگی دی خۆ هەر بە تەمانین بێتەوە، وا مامی ئاگادارە، جا ئێستا کێشەکە ئەوەیە دیانەوێ کچەکەی کاك ژێرونت، ئەوەی کە لە ژنە تارانتیەکەیە بدەنە ئەو (ئیشارەت بۆ ئاکتاڤ دەکا)

ئاکتاڤ : سەرباری ئەوانەش هەمووی ئەو نەبوونی و دەست کورتییەی منیش لەبەرچاو بگرە، وا بە جارێ پەکی خستووم.

سکاپن: ئیتر تەواو؟ ئێوە هەردووکتان لە پێناو شتێکی پووچەوەوا خۆتان تێك داوە! ئەو هەموو پەشێویەی بۆ چییە؟ تۆ (ئیشارەت بۆ سیلڤستەر دەکا) شەرم ناکەیت بەرامبەر مەسەلەیەکی ئاوا دەستەو ئەژنۆ وەستاوی؟ شەیتان بە نەعلەت بێ! تۆ (سەلامەت نەبی) سەلامەتی دایك و باوکت بەوە دەدەی، کوڕەگەورەی ئەوانی، بەم سەرو کەللەو تەبەشەتەوە، نەتدەتوانی چەند فێڵێکی باش و چەند پیلانێکی شەرافەتمەندانە بۆ بەرێ کردنی کارەکەتان بێنیتەوە؟ تف! گێلە بڕۆ بمرە !چەند حەز دەکەم هەڵخەڵەتاندنی ئەو پیرەمێردەیان بدابوایە دەست من! من هەردووکتان لەسەر پەنجەی خۆم دەسووڕێنم.

**دیمەنی سێیەم:**

**هیانست – ئاکتاڤ – سکاپن- سیلڤستەر**

هیانست: ! ئاکتاڤ ئەوەی سیلڤستەر بە " نێرین " ی وتوە ڕاستە کە باوکت دەگەڕێتەوەو دەیەوێ ژنت بۆ بێنێ ؟

ئاکتاڤ : بەلێ، هیاسنتە جوانەکەم! ئەم هەواڵە چ دەگەیەکی لێداوم. بەڵام، چی بکەم؟ ئەوە دەگرییێ؟ ئەو فرمێسکانە چییە؟ بڕوات بە من نییە ؟ پێم بڵێ بزانم هیچ بێ وەفای یەکت لە من دیوە؟ چییە لە عەشقەکەی من دڵنیا نیت؟

هیاسنت: بەلێ ئاکتاڤ، من دڵنیام ئێستا تۆ خۆ دەوێ، بەڵام نازانم بە بەردەوامی منت خۆش دەوێ؟

ئاکتاڤ: ئاخ! مومکین دەبێ کەسێك ئاشقی تۆ بێ و بە درێژایی ژیانی تۆی خۆش نەوێ؟

هیاسنت: دەڵێن عەشقی ئێوەی پیاوان زۆر کەم خایەنتر دەبێ لە عەشقی ئێمەو ئەو گەرم و گوڕیەی پیاوان وای پیشان دەدەن، ئاگرێکە زۆر ئاسانتر دەکوژێتەوە لەوەی کە هەڵگیرسا.

ئاکتاڤ: نا! هیاسنتی خۆشەویست دڵی من هەروەك دڵی ئەو خەڵکە نییە، من وا هەست دەکەم تا سەرەمەرگیش هەر خۆشم دەوێ.

هیاسنت: حەز دەکەم بزانم دڵ و زمانتان یەکە. من زۆریش بێگومانم لە قسەکانت زیادەڕەوەی یە و لە ناخی دڵتەوەیە، بەڵام دەترسێم ئەو هەستەی پاکەی دڵت کە بەرامبەر بەمن هەتە نەتوانی بەرامبەر زەبری باوکت خۆی ڕاگرێ و تەسلیمی باوکت بێ، کە دەیەوێ ژنێکی ترت بۆ بێنێ. خۆ من دڵنیام ئەگەر کارەساتێکی وا بەسەر مندا بهاتایە، هەر دەمردم.

ئاکتاڤ: نەو، هیاسنتی جوان، هیچ باوکێك نییە بتوانێ وام لێ بکا پەیمانەکەم لەگەڵتا بشکێنم، پێش ئەوە تۆ بە جێ بهێڵم بڕیار دەدەم و وڵاتەکەم و هەتا ژیانیش جێ بهێڵم. من هەر لە ئێستاوە بەرامبەر بەو ژنەی بە تەمان بۆمی بخوازن، بێ ئەوەی دیتبێشم زۆر ڕقم لێ دەبێتەوە، ئینشاللا خوا لە کۆڵی دەکاتەوە. هیاسنت، خۆشەویستم، تکا لێ دەکەم چیدی مەگرییێ، چونکێ ئەو فرمێسکانەتە من دەکوژێ بە بینی ئەم گریا نەت دڵم دەگوشرێ.

هیاسنت: مادامەکێ تۆ پێت ناخۆشە وا فرمێسکەکانم دەسڕم و بە دڵێکی پڕ لە ئاواتەوە چاوەڕێ چارەنووسی خۆم دەکەم.

ئاکتاڤ: خوا گەورەیە.



هیاسنت: ئەگەر تۆ تۆزێك بەوەفابیت، من چیم دەوێ، چ ترسی دیم نییە.

ئاکتاڤ: باوەڕ بکە من هەر بە وەفام.

هیاسنت: ئەگەر وابێ منیش دڵخۆش دەبم.

سکاپن: (لەگەڵ خۆیدا) ئەم کیژۆڵەیەش ئەوەندە دەبەنگ نی یە، دەتوانێ دان بە خۆیدا بگرێ.

ئاکتاڤ: ئەویش پیاوێکی وایە، ئەگەر حەز بکا، هەرچی ئارەزووەیەکمان هەبێ، دەتوانێ کۆمەکی و هاریکاری زۆرمان بکا.

سکاپن: من سوێندم خواردووە چیدی خۆم لە ئیشی کەس هەڵنەقورتێنم، بەڵام ئەگەر ئێوە هەردووکتان، سوورن لەسەر ئەوەی داوام لێ بکەن، ڕەنگە....

ئاکتاڤ: ئاها! ئەگەر مەسەلە یارمەتی بێ، لە پاڕانەوە زیاتر چیدی هەیە، لە هەموو دڵەوە تکات لێ دەکەم، وا خۆمان هاوێشتە بەختی تۆوە، ئیدی خۆت و ویژدانی خۆت.

سکاپن: (بە هیاسنت دەڵێ) ئەی تۆ، تۆ هیچت پێ نەوتم؟ بێ! ماتت(٨)

هیاسنت: منیش وەك ئەو، داوات لێ دەکەم، بیکە بە خاتری خۆشەویسترین کەست لە دونیادا، بە هانای ئەو عەشقەمان وەرە.

سکاپن: چاکە و پیاوەتی شتێکی پێویستە، بڕۆن، من خۆم بە دووتان دا دەنێرم.

ئاکتاڤ: باوەڕ بکە..........

سکاپن: وس! (بە هیاسنت دەڵێ) تۆ بڕۆ ئیسراحەتی خۆت وەرگرەو (بە ئاکتاڤ دەڵێ) تۆیش بە چاکی و بە بێ ترسەوە خۆت بۆ دیداری یەکەمی باوکت ئامادە بکە.

ئاکتاڤ: دانی پیادەنێم گەر دیدارەکە ڕووبەڕوو بێت دەلەرزم، زۆر کەم ڕوومە، دەستم بەسەریدا ناشکێ.

سکاپن: بە هەرحاڵ، خۆت بۆ مستی یەکەم ئامادە بکە نەوەك بە لاوازت تێ بگاو وەك مندالّ بە ئارەزووی خۆی هەڵتسوڕێنێ، هەنووکە هەوڵدە پڕۆڤە بکەی و خۆت ڕابێنی. تۆزێ ئازابەو بیر لە وەڵامدانەوە پچڕ پچڕەکانی ئەو بکەرەوە.

ئاکتاڤ: هەوڵ دەدەم بە چاکترین شێوەیەك کاری خۆم بە جێ بگەێنم.

سکاپن: با هەوڵ بدەین تۆزێ تۆ لێ ڕابێنین، بۆ ئەوەی لەسەر ئیشەکەت چاپووك بیت، تا بزانم بە چاکی کارەنت پێ ئەنجام دەدرێ. ئامادەبە. بە ژنت ڕێك بێت، سەرت بەرزکەرەوە، وا سەیری بکە، کە جێگای باوەڕ بیت.

ئاکتاڤ : ئاوا ؟

سکاپن : نەختێ چاکتر.

ئاکتاڤ : ئاوا ؟

سکاپن : چاکە! وا بزانە کە لە ڕێگا دەگەیتە من زۆر بە تـووڕەیی و گـرژی یـەوە وەڵامـم بدەرەوە. وەك بڵێ ی وەڵامی ئەو دەدەیتەوە. چۆن ! فێڵباز، هەی دەبـەنگ، ڕیـسوا، نارەسـەن !پاش ئەو بەدکاری و بێ ناموسیەت، دوای ئەو ڕەفتارە بێ شەرمانەی لـەپاش مـن کردووتـە هێشتا ڕووت هەیە ببێتە بەرچاوم ؟ فێڵبازی ڕوو قایم، بە بـێ ڕەزای باوکـت دەتـەوێ بـە دزی یەوە ژن بهێنێ؟ وەڵامم بەرەوە، بێ شەرەف !وەڵامم بەرەوە! با تۆزێ گوێم لـە بەهانـە بـەڕێ و جێکانت بێت! ئاه، شەیتان بە نەعلەت بێ! ماتت[١٢٤] لە دەست چوو؟

ئاکتاڤ : لەبەرچاومە باوکیشم عەینی ئەم قسانە دەکات.

سکاپن: بەه !بەڵێ، بەڵام وا دەبەنگ و کڕوبێ دەنگ نەبیت!

ئاکتاڤ: بەم پڕۆڤەیە زۆر زاتم پەیدا کرد، بە بێ ترس وەڵامی دەدەمەوە.

سکاپن: بەڕاست؟

ئاکتاڤ : بەڕاستمە!

سیلڤیستەر: ئەوەتا، باوکت هات.

ئاکتاڤ: (یەکسەر ڕادەکات) — خوایە،دەست و پێ ی خۆم لێ بزر بووە!

سکاپن: هۆ! ئاکتاڤ، بوەستە! خۆرهەڵات! کابرایەکی بەستەزمانە! خۆ چـاوەڕێ ی نـەکرد تا پیرەمێرد دێت.

سیلڤیستەر: چی پێ بڵێین ؟

سکاپن : لێگەڕێ من قسەی دەکەم، بەڵام تۆ هەرچی یەکم پێ وتی وا بکە.

١٢٤- مات: لە یاری شەترەنجدا بە شاکوژران دەوترێ مت.



**دیمەنی چوارەم:**

**ئارگانت — سکاپن — سیلڤیستەر**

ئارگانت: وا (دەزانێ تەنیایە) باشە تا ئێستا کێ بیستوویەتی وا بەم شێوەیە باسی ژن خواستن بکرێ؟

سکاپن: ئەویش بە مەسەلەکەی زانیوە و پێشی نارەحەت بووە، بۆیە وا لەبەرخۆیەوە دەنگی لێ هەڵبڕیوە.

ئارگانت: (وا دەزانێ تەنیایە) بێ ناموسیەکەی گەورەیە!

سکاپن: با تۆزێك گوێ لە قسەکانی ڕابگرم.

ئارگانت: (وا دەزانێ تەنیایە) دەمەوێ بزانم لە بارەی ئەو زەماوەندە ڕێك و پێکەیان چیم پێ دەڵێن.

سکاپن: ئێمەش بیرمان لەوە کردۆتەوە.

ئارگانت: (وا دەزانێ تەنیایە) باشە هەوڵ دەدەن نکۆڵی لێ بکەن؟

سکاپن: نەو، بیرمان لەوە نەکردۆتەوە.

ئارگانت: (وا دەزانێ تەنی) یان دێن داوای لێ بووردن دەکەن؟

سکاپن: ئەوەیان لەوانەیە.

ئارگانت: (وا دەزانێ تەنیایە) دەیانەوێ بە قسەی هیچ و پووچ هەڵمخەڵەتێنن؟

سکاپن: لەوانەیە.

ئارگانت: (وا دەزانێ تەنیایە) کوڕە ساختەچییەکەم دەخەمە زیندانەوە. [125]

سکاپن: ئەوەشیان دەبینین.

ئارگانت: (وا دەزانێ تەنیایە بۆ سیلڤیستەری بێ شەرەفیش، دەبێ بە کۆڵە مستان هەموو قەلبی بشکێنم)

سیلڤیستەر: سەیر بوو ئەگەر منی لە بیر چووبایە.

ئارگانت: (سیلڤیستەر دەبینێ) ئاه ! ئاه ! ئەوە تۆ لێرەی! پەروەردە ئاقڵکەی خێزانەکەم! سەرپەرشتی کەری چاکی گەنجەکان !

١٢٥- لە سەدەکانی ١٧ و ١٨ دا باوك دەیتوانی کوڕەکەی بە هۆی یەك سەرپێچی بچووکەوە بخاتە زیندانەوە، وەك ئەوەی (مۆرد میرابۆ) لەم ڕووەوە بە ناوبانگە. (و:فارسی).

سکاپن: گەورەم، بە گەڕانەوەتان خۆشحالّم.

ئارگانت: سەلام، سکاپن. (بە سیلڤیستەر دەڵێ) بەڕاستی فەرمانەکانی منت زۆر بەچاکی جێبەجێ کردووە، کە من لێرە نەبوومە زۆر ئاقلانە لەگەڵ کوڕەکەم جوولاّیتەوە!

سکاپن: وا دیارە حالّتان زۆر باشە؟

ئارگانت: باشە (بە سیلڤیستەر دەڵێ) بۆ خۆت مات کردووە، دەبەنگ! بۆ قسە ناکەی؟

سکاپن: سەفەرەکەتان خۆش بوو؟

ئارگانت: خوایە، بەڵێ زۆر خۆش بوو ! وازم لێ بێنە با تۆزێ بیرکەمەوەو پرسیاری لێ بکەم.

سکاپن: دەتەوێ پرسیار بکەی؟

ئارگانت: بەڵێ دەمەوێ پرسیاری لێ بکەم.

سکاپن: لە کێ، گەورەم؟

ئارگانت: (سیلڤیستەری پێ نیشان دا) ؟ لەم دەبەنگە!

سکاپن: بۆ؟

ئارگانت: تۆ نەتبیستووە خەڵکی چی دەڵێن دەربارەی ئەو شتەی دوای من ڕووی داوە؟

سکاپن: گوێم لێ بووە خەڵکی دەربارەی مەوزوعێکی ئاوا بچووک قسەیان کردووە.

ئارگانت: چۆن؟ مەوزوعێکی بچووك! هەر ئەو مەوزوعەیە!

سکاپن: حەقی خۆتانە!

ئارگانت: بێ باکیش بەو ڕادەیە؟

سکاپن: ڕاستە.

ئارگانت: کوڕ بە بێ قایل بوونی باوکی ژن دێنێ؟

سکاپن: بەڵێ، ئەم شتانە حەقی خۆیەتی پێی بوترێ،بەلاّم دڵخۆش دەبم ئەگەر ئاژاوە نەنێتەوە

ئارگانت: من دڵخۆش نیم، دادوبێدادمە!خەریکە ڕۆحم دەردەچێ تۆچۆن ئاگات لێ نیە من یەك دنیا ڕقم هەڵساوە؟

سکاپن: ئەڵبەتە، منیش یەکەمجار کە ئەو مەوزوعەم بیست پێم ناخۆش بوو و لە بەر خاتری ئێوە دەمویست داوا لە کورشەکەتان بکەم شتێکی وا نەکا. لێی بپرسە بزانە



سەرزەنشتیم کردووەو چەن جاران ڕامسپاردووە کە مرۆڤ دەبێ ڕێزی باوکی بگرێ و کەمترین ڕێزی کوڕێك بۆ باوکی پێی ماچ بکا، چ کەسێك، هەتا خۆیشت لەم قسانەت چاکتر پێ نەدەوەت، بەلاّم چی دەکەی ! سەیر دەکەم ئەویش لەم جۆرە بیر — کردنەوەی خۆیدا کەم و کووڕی نییە.

ئارگانت: دەتەوێ پاکانەی چی بۆ بکەی؟ ئەو هێشتا کەم و کووڕی نییە چوو بەبێ چەند و چۆنی لەگەڵ کچێکی نەناس زەماوەندی کردووە؟

سکاپن: تۆ چیت دەوێ؟ چارەنووسی وا بووە

ئارگانت: هەی! هەی! جوانترین مەنتقی دونیایە! پاو هەرچی تاوان و فێڵبازی و دزی و پیاوکوژی هەیە بیکاو دوایی بۆ پاکانە بڵێ چارەنووس وا هاتووە!

سکاپن: خوایە، تۆ قسەکانی من زۆر فەلسەفیانە لێك دەدەیتەوە! من دەمەوێ بڵێم ئەو بە بێ ئەوەی خۆی

بیەوێ تووشی ئەم ئاژاوەیە بووە.

ئارگانت: بۆ تووش بووە؟

سکاپن: تۆ دەتەوێ ئەویش وەك خۆت ئاقڵ بێ؟ ئەم مێردمنداڵانە گەنجن و وا دوور ناڕوانن تا بیر لەم شتانە بکەنەوە، کە دوایی دێتەوە ڕێگایان. هەر بە نموونە، لێیاندەری ئێمە، سەرەڕای ئەوە هەموو ئامۆژگاریانەی من، لەگەڵ ئەو ئاگالێبوونەوەی من، ئەوە لەدەستی چوو. ئیشێکی خراپتری لە ئیشی کوڕی ئێوە کردووە. جا بۆ مەگەر خۆیشتان ئاواجاحێڵ نەبوونەو لە زەمانی خۆتان ئەو هەرزەکاریەتان نەکردووە؟

ئارگانت: ڕاست دەکەی، منیش کە گەنج بووم بە دووی ژنی جوان و شیرین زمان دەکەوتم، بەلاّم ئەوەندەش زیاد نەڕۆیشتووم، تووشی هەڵەی وا بێم.

سکاپن: بۆ دەتویست چی بکا؟ کچێکی عازەبی بینیوەو ویستویەتی چاکەی لەگەڵ بکا (چونکە هەستەی لە تۆوە بۆ ماوەتەوە، کە پەیوەندی ئەم لەگەڵ ژنان هەبێت) کچە گەنجەکەی لەبەر چاوی زۆر دلّرفێن بووە چەند جارێك یەکتریان بینیوە قسە خۆشی بۆ کردووە، هەناسەی ئاشقانەی بۆ هەڵکێشاوە، خستویەتیە جۆش و خرۆشەوە. کچەکە دڵی پێداوەو بەختیاری خۆی لەودا بەدی کردووە. ئیدی ئەو وەختە دایك و باوکی کچەکە خۆیان لێ گێل کرد بوو تا بە زەبری کوتەك ناچاریان کرد زەماوەند لەگەڵ کچەکەیاندا بکات.

سیلڤیستەر: (لەگەڵ خویدا) ساختە چییەکی چاکی!

سکاپن: باشە بەوە قایل دەبووی بیانکوشتبایە ژن هێنانەکەی لە کوشتنەکەی باشتر بوو!

ئارگانت: کەسێ بەمنی نەوتووە کە وەزعی وا بەم شێوەیە بووە.

سکاپن: (ئیشارەت بۆ سیلڤیستەر دەکات) لێی بپرسە، بزانە وا نییە؟

ئارگانت: (بە سیلڤیستەر دەڵێ) بە زۆر تووشی ئەو ژن هێنانەیان کرد؟

سیلڤیستەر: بەڵێ گەورەم!

سکاپن : قابیلە من درۆت لەگەڵدا بکەم!

ئارگانت : من دەبێ بۆ ڕەخنەگرتن لەم کارە خۆم بگەیەنمە لای " دادنووسێك "[126]

سکاپن : ئاخر مەسەلە ئەوەیە، ئەویش حەزی نەدەکرد شتێکی وا ڕووبدات.

ئارگانت: دادنووس بۆ بەتاڵ کردنەوەی ئەو ژن هێنانە ئیشەکەم بۆ ئاسان دەکا.

سکاپن: بەتاڵ کردنەوەی ئەو ژن هێنانە؟

ئارگانت: بەڵێ.

سکاپن: تۆ هیچ کاتێك بیر لەوە مەکەوە ئەو ژن هێنانە بەتاڵ بکەیتەوە.

ئارگانت: من ئەو ژن هێنانە بەتاڵ نەکەمەوە؟

سکاپن: نەخێر

ئارگانت: چۆن؟ من وەك باوکێك هەقم نییە بەرامبەر بەوەی، کە بە زۆر کوڕەکەمیان تووشی ژن هێنان کردووە، شتێ بکەم؟

سکاپن: کوڕەکەت بەم شتە ڕازی نابێ.

ئارگانت: ڕازی نابێ؟

سکاپن: نەو!

ئارگانت: کوڕی من؟

سکاپن: کوڕی تۆ! دەتەوێ دان بەوە دابنێ کە لە ترسان بە زۆر ئەم شتەیان پێ کردووە؟ ئەو ئامادە نییە دان بەوە دابنێ چونکێ بەوەیان زۆر زەرەریەتی و وای پیشان دەدا کە کوڕێك نارەسەنە بۆ باوکێکی وەك تۆ.

ئارگانت: من گوێ بەوە نادەم.

١٢٦- لە سەدەی ١٧ دا Le notairo بە کاری پارێزەری ئەمڕۆ هەڵساوە. مەبەست لە (دادنووس)ە.



سکاپن: لەبەر خاتری ئابرووی تۆو خۆی دەبێ بڵێ بە قایل بوونی خۆم لەگەڵ ئەو کچە زەماوەندمان کردووە.

ئارگانت: بەڵام، من دەمەوێ، لەبەرخاتری ئابرووی من و خۆی بە پێچەوانەی ئەوە بڵێ.

سکاپن : نەخێر، دڵنیام کاری وا ناکا.

ئارگانت : من وای لێ دەکەم دانی پێدا بنێ.

سکاپن: منیش بەڵێنت پێ دەدەم کاری وا نەکا.

ئارگانت: یا دەبێ کارێکی وابکا، یا لە میراتەکەی خۆم بێ بەشی دەکەم.

سکاپن: تۆ؟

ئارگانت: ئا، من.

سکاپن: باشە.

ئارگانت: باشە چییە؟

سکاپن : تۆ، لە هیچ شتێکدا بێ بەشی ناکەیت.

ئارگانت: من بێ بەش ناکەم؟

سکاپن: نەخێر!

ئارگانت : نەخێر؟

سکاپن: نەخێر!

ئارگانت: سەیرە! ئەوەیان خۆشە! من کوڕەکەم لە میراتەکەی خۆم بێ بەش ناکەم؟

سکاپن: نەخێر، من دەزانم.

ئارگانت: کێ ناهێڵێ؟

سکاپن: تۆ خۆت.

ئارگانت: من؟

سکاپن: بەڵێ، خۆت دڵت ڕێگات نادا کاری وا بکەی.

ئارگانت: با دەیکەم!

سکاپن: تۆ گاڵتە دەکەی!

ئارگانت: تۆ گاڵتە دەکەی!

ئارگانت: نا گاڵتە ناکەم!

سکاپن: خۆشەویستی باوکایەتی دەگاتە دادی.

ئارگانت: خۆشەویستی باوکایەتی هیچی بۆ ناکا

سکاپن: بەلێ، بەلێ!

ئارگانت: پەیمان بێ وا دەکەم!

سکاپن: بێ سوودە.

ئارگانت: مەلێ بێ سوودە.

سکاپن: هەیهوو، من تۆ دەناسم، تۆ پیاوێکی چاکی.

ئارگانت: من هیچ چاك نیم ! هەر کاتێ بێتە سەرم زۆریش بەدکارم. دەبێ ئەو مەسەلەیەش یەکالا بکەمەوە، بەزەییم پێدادێتەوە! (ڕووله سیلڤیستەر دەکا) بڕۆ، جەردە، بڕۆ با بـچینە لای ژێرۆنت و ئەم باسەی بۆ بگێڕینەوە، ئەو حەلێکمان بۆ دەدۆزێتەوە!

سکاپن: گەورەم، ئەگەر خزمەتێکتان بەمن هەیە، بفەرموون.

ئارگانت: سوپاست دەکەم. ئاخ! ئاخر بۆچی کوڕە تاقانەی من بوو؟ بۆ چ ئەو کچە خوا بۆ خۆی بردییەوە و ئێستا لێرە نییە تا ببێتە میراتگیری من.



**دیمەنی پێنجەم :**

**سکاپن – سیلڤیستەر**

سیلڤیستەر: دانی پیا دەنێم گەورەی، ئەم ئیشانەشت باش لەبەردەستی دەڕوا.

سکاپن: وازبێنە با کاری خۆم بکەم. فێڵێك بدۆزمەوە. لەمەوپاش دەبمە پیاوێکی وا جێگای متمانە بم و پلانێکی وایشی بۆ دادەنێم لەسەری بڕوا. تەماشاکە، تۆزێ خۆت ڕاگرە، کڵاوەکەت وەك منداڵە شەڕاوییەکان لارکەرەوە، چاوەکانت تووڕەیی دەربڕن، کەمێکیش ڕۆیشتنەکەت لە ڕۆیشتنی " سوڵتانی تیاترۆ "[١٢٧] بچێ. واباشە وەرە بەدوامەوە. کە ئیشارەتم بۆ کردی ڕەنگ و ڕووی خۆت بگۆڕە.

سیاڤستەر: تکات لێ دەکەم، یاسا منیش نەگرێتەوە.

سکاپن: بڕۆ، بڕۆ، لە زەرەو قازانج شەریکین، سێ ساڵ زیندانی بە کاری سەختەوە، شتێ کەمتر یان زیاتر، ئەوەندە چییە چۆن دڵێکی پاك لە کار دەخات.

١٢٧- مـۆلییێر لـە سـاڵی ١٦٦٣دا لـە (راگـوزاری ڤێرسـای Le Impromptu de Versailles وێنـەی سوڵتانێکی تیاترۆ وا دەکێشێ: گەورەیی و ورگنی بە قەد چوار کەس، ورگی لە رادەبەدەر گەورە و پان وپۆڕ بە شێوەیەك، کە بتوانێ کورسییەك بە چاکی پڕ بکاتەوە. (و: فارسی)

## پەردەی دووەم

**دیمەنی یەکەم:**

**ژێرونت — ئارگانت**

ژێرونت: بەڵێ، بەم هەوا خۆشە، بێگومان جێگرەکانمان ئەمڕۆ دەگەنەجێ و ئەو کەشتیەوانەی لە تارانتەوە دێت، پێی وتوم کچەکەشم لەگەڵ کەشتییەکە و هێشتا نەگەیشتۆتە ئێرەو ئاگای لەو بارودۆخە نارێکە نییە، کە کوڕەکەت بە شێوەیەکی زۆر سەیر ئەو بڕیارانەی دابوومان، سەرپێچی هەموویانی کردووە.

ئارگانت: نارەحەت مەبە، منیش خەریکی ئەم مەسەلەیەم و قبوڵ ناکەم و وا خەریکم.

ژێرونت: لە ڕاستیدا، مسیو ئارگانت، حەزدەکەم مەبەستی خۆمت پێ بڵێم، کە نیازم لەم قسانە چییە. پەروەردەکردنی منداڵ زۆر پەیوەندی بەم کارەوە هەیە.

ئارگانت: بێ گومان، بەڵام بە چ بۆنەیەکەوە ئەم قسەت کرد؟

ژێرونت: هەر بەم بۆنەیەوە، کردارو ڕەفتارە ناشیرنەکانی گەنجەکان، لە ئەنجامی خراپ پەروەردەکردنی باوکیانەوەیە!

ئارگانت :جارێ ئەم مەوزوعە هاتۆتە پێشەوە بەڵام مەبەستت لەم قسەیە چییە؟

ژێرونت: مەبەستم لەم قسەیە چییە؟

ئارگانت :بەڵێ.

ژێرونت: ئەگەر تۆ وەك باوكێكی چاك، كوڕەكەت بهێنابووایە ژێر باڵی خۆتەوە، ئەویش ئەوها گەمەی پێ نەدەكردی.

ئارگانت: زۆر باشە. جا وا دیارە ئێوە کوڕەکەی خۆتان باش هێناوتە ژێر باڵی خۆتانەوە؟

ئارگانت: بێ گومان، ئەگەر کوڕی من ڕەفتارێکی وای بکردایە، زۆر زۆری لێ پەست دەبووم.



ئارگانت : باشە تۆ ئەگەر وەك باوكێكی چاك باسی چاكی كوڕەكەت دەكەی، ئەگەر كارێكی خراپتری لە كاری كوڕی من كرد بوو؟

ژێرونت: چۆن؟

ئارگانت: چۆن؟

ژێرونت: دەتەوێ بڵێی چی؟

ئارگانت: مسیۆ ژێرونت دەمەوێ بڵێم وا بە پەلە بڕیار لەسەر ڕێگای پەروەردەکردن و خەڵكی وەدەرنجا دەبێ هەوەڵ جار ئاگای لە عەیبەكانی خۆی بێ.

ژێرونت: من ئەم مەتەڵانەم نەبیستووە!

ئارگانت: بۆت دەگێڕنەوە!

ژێرونت: باشە تۆ، هیچت لەدەمی خەڵكی دەربارەی كوڕی من بیستووە ؟

ئارگانت : خەڵك قسە دەكەن.

ژێرونت: باشە کێ بەتۆی وتوە؟

ئارگانت: سكاپنی ئێوە، بەڵام لەو كاتە من تووڕە بووم، ئەویش شتێكی ئەوتۆی نەدركاند، بەڵام تۆ خۆت دەتوانی لەو یان لە كەسانی دی بە دوورو درێژی لە باس و خواسی ئەم مەسەلەیە بپرسی. منیش وا بە پەلە دەچمە لای داد نووسێك بەشكو تەگبیرێك لی حاڵی خۆم بكەم، خوا حافیز.

**دیمەنی دووەم :**

**لێیاندەر — ژێرونت**

ژێرونت: باشە دەبێ كاری ناشیرنتر هەبێ لەوەی كوڕەكەی ئەو كردوویەتی؟ باوەڕ ناكەم كەس كاری لەوە ناشیرنتری كردبێ. من لەو باوەڕەدام ژن هێنانی كوڕ بە بێ قایلبوونی باوكی ئیشێكی ئەوتۆیە هەرچی بیری لێ بكەیتەوە لەوە ناشیرینتر نییە، ئاه، ئەوە تۆ لێرەیت!

لێیاندەر: (بەرو لای باوكی ڕادەكات تا لە باوەشی بگرێت) ئای، باوكە، چەند بەم گەڕانەوەیەت دڵخۆشم.

ژێرونت: (ناهێڵێ) بوەستە! با تۆزێ باسی ئەو وەزعەت لەگەڵ بكەم.

لێیاندەر: ڕێگام بدە لە ئامێزت بگرم و ماچت بكەم، كە.

ژێرونت: (پاڵی پێوە دەنێ) پێت دەڵێم بوەستە!

لێیاندەر: چی؟ باوکە تۆ ناهێڵێ ماچت بکەم تا هەست و سۆزی خۆمت بۆ دەربڕم؟

ژێرونت: بەڵێ، مەسەلەیەك هەیە دەبێ ڕوونی بکەینەوە.

لێیاندەر: چییە؟

ژێرونت: برۆ دواوە با لەبەرچاو بیت.

لێیاندەر: چۆن؟

ژێرونت: تەماشای ناو چاوم بکە!

لێیاندەر: باشە چی بووە؟

ژێرونت : دەنگ و باسی ئێرە چییە؟

لێیاندەر: دەنگ و باس چی یە؟

ژێرونت: بەڵێ دوای من چ کەتنێکت کردووە؟

لێیاندەر: باوکە، کەتنی چی؟

ژێرونت: من ناڵێم کەتنی چی، تەنها لێت دەپرسم چیت کردووە؟

لێیاندەر: هیچم نەکردووە تۆ پێی نارەحەت بووبیت.

ژێرونت: هیچ؟

لێیاندەر: نەخێر.

ژێرونت: تۆ تەخسیریی زۆرت کردووە.

لێیاندەر: من لە بێ تاوانی خۆم دڵنیام.

ژێرونت: بەهەرحاڵ، سکاپن قسەی تازەتان لەبارەوە دەکا.

لێیاندەر: سکاپن!

ژێرونت: ئاخ ! ئاخ ! (بە بیستنی ئەم ناوە سوور دەبێتەوە !)

لێیاندەر: چی لە بارەی منەوە گوتووە؟

ژێرونت: ئێرە بە کەڵکی باسکردنی ئەم باسە نابێت، کاتێکی کە باسی ئەو مەسەلەیە دەکەین. کە چووینە ماڵەوە. بەزوویی لەمبارەیەوە دەدوێین. هەی ناپاك ! ئەگەر ئابڕووم دەبەیت، بە کوڕی خۆمت نازانم، ئیتر بۆ یەکجاری وازت لێ دێنم.



**دیمەنی سێیەم :**

**ئاکتاڤ – سکاپن – لێیاندەر**

لێیاندەر: (تەنیایە) ئەو ناپاکییەی لەگەڵ کردم بێ شەرەفی وا بەسەد ئەم لاو ئەولا یەکەم کەس بوو کە نهێنی یەکانی من بپارێزێ، کەچی دوای پێش هەموویان یەکەم کەس چۆتە لای باوکم ئەو شتانەی ئاشکرات کردووە! ئاخ! خوا بەخۆی ئاگادارە، تۆڵەی ئەو ناپاکییەی لێ دەکاتەوە.

ئاکتاڤ: سکاپن ئازیزەکەم، نازانم بەرامبەر ئەو خزمەتانەت. چی بکەم؟ تۆ پیاوێکی شیاوی چاکە و چاکەکاریت! خوا چ لوتفێکی پێدام وا تۆی بۆ ڕزگارکردنی من نارد

لێیاندەر: ئاخ! ئاخ! تۆ لێرەیت؟ زۆر پێم خۆش بوو دۆزیتمەوە، هەی دەبەنگ.

سکاپن: گەورەم، خزمەتکاری تۆم ئەوەش شانازییە کە پێم دەبەخشی و لەسەریشم زیادە.

لێیاندەر: (شمشێر دەگری بەدەستەوە) تۆ زیان بەخشێکی دەبەنگی! ئێستا تێتدەگیێنم!

سکاپن: (بە ئە١نۆ دەکەوێ) گەورەم!

ئاکتاڤ: (خۆی دەخاتە نێوان هەردووکیانەوە تا نەهێڵێ لێیاندەر هیچ بکا) ئای! لێیاندەر!

لێیاندەر: نا، ئاکتاڤ، تکات لێ دەکەم پێشم مەگرە.

سکاپن: ئاخ، گەورەم !

ئاکتاڤ : (لێیاندەر دەگرێ) مەحز بۆ ڕەزای خوا!

لێیاندەر: (دەیەوێ لە سکاپن بدا) لێگەڕێ دڵم تەقی..

ئاکتاڤ: وەك دۆستێك تکات لێ دەکەم ئازاری مەدە!

سکاپن: گەورەم، ئاخر چیم کردووە؟

لێیاندەر: (دەیەوێ لێی بدا) تۆ چیت لەگەڵ کردووم؟ ناپاك!

ئاکتاڤ: (پاڵی پێوە دەنێ)، ئای، بوەستە !

لێیاندەر: نا، ئاکتاڤ، حەزدەکەم هەرخۆی دان بەو ناپاکییانەیدا بنێ، کە بەرامبەر بە من کردوونی. بەڵێ، دەبەنگی بێ نامووس! من دەزانم چ پیلانێکت بۆ ناومەتەوە، هەموو شتێکیان پێ وتوم. خۆ من دەتوانم بە نهێنییەکانیشی بزانم، بەڵام حەز دەکەم یان بە زمانی خۆی دان بە ناپاکی یەکانیدا بنێ یان بەم شمشێرە ورگی بدڕم.

سکاپن: ئاه، گەورەم! ئاوا دڵڕەقن؟

لێیاندەر: دەبدوێ!

سکاپن: چیم بە ئێوە کردووە گەورەم؟

لێیاندەر: بەڵێ، هەی گەمژە!

سکاپن: باوەڕکە، ئاگام لێ نییە!

ئاکتاڤ: (دەیگەڕێنێتەوە دواوە) لێیاندەر!

سکاپن: زۆر باشە، گەورەم مادام حەزدەکەی ئێستا دانی پێدا دەنێم، کە بەرمیلە شەرابە بـچووکە ئیسپانییەکەی چەند ڕۆژێك لەمەوپێش بۆتـان هـاتبوو لەگـەڵ هاوڕێکەمانـدا خواردمانـەوەو پاشـان درزێکی بچووکم تێ کردو دەوروپشتەکەیم ئاوڕشێن کرد تا وا بزانن شەرابەکە ڕژاوەو لێی چووە!

لێیاندەر: کەوابێ، تۆ، جەردە، شەرابە ئیسپانییەکەی منت خواردۆتـەوەو ئـەو هـەموو قرەقرەشـم لەگەڵ خزمەتکارەکە کرد، وامزانی ئیشی ئەوە؟

سکاپن: بەڵێ، گەورەم! داوای لێ بووردن دەکەم.

لێیاندەر: بە بیستنی ئەم بەسەرهاتە دڵخۆشم، بەڵام پرسیارەکەی من لەم بارەیەوە نەبوو.

سکاپن: ئەمە نەبوو، گەورەم؟

لێیاندەر: نەو، پەندێکی ترت بە من کردووە، دەمەوێ بەخۆت پێی لێ بنێی.

سکاپن: گەورەم! بە خەیاڵمدا نایێت چی دیم کردبێ.

لێیاندەر: (دەیەوێ لێی بدا) بۆ قسە ناکەی؟

سکاپن: ئاخ !

ئاکتاڤ: (دەیگەڕێنێتەوە دواوە) بوەستە!

سکاپن: بەڵێ گەورەم، دانی پیا دەنێم سێ هەفتە لەمەوبەر ڕۆژێکیان عەسر بوو تۆ سەعاتێکی بچووکت دامێ بیبەم بۆ کچە دۆمەکەی تۆ خۆشت دەوێ. کە گەڕامەوە ماڵەوە، جلەکانم هەموو تۆزو سەروچاوم هەموو خوێن بوو، پێم وتن دز دارکاریان کردووم و سەعاتەکەشیان دزیوە، بەڵام گەورەم، بۆ خۆمم گل داوە.

لێیاندەر: تۆ سەعاتەکەی منت بردبوو؟

سکاپن: بەڵێ، تا بتوانم حیسابی کاتەکەی پێ بکەم!

لێیاندەر: بەها! بەها! شتی خۆش خۆش لێرە دەبیستم بەڕاستی خزمەتکارێکی بەوەفام هەیە ! بەڵام ئەمەشیان نییە، کە من پرسیاری لێ دەکەم.

سکاپن : ئەمەش نییە.



لێیاندەر : نەو ڕیسوا! ئەوەی من دەمەوێ دانی پێدا بنێی شتێکی دییە.

سکاپن: ئەی چییە!

لێیاندەر: زووکە قسەکە، بەپەلەم.

سکاپن: گەورەم، ئەوە هەموو ئەو کارانە بوون کە کردبوونم.

لێیاندەر: (دەیەوێ لە سکاپن بدا) ئەوە هەموویەتی ؟

ئاکتاڤ: (دەچێتە پێشەوە) ئای !

سکاپن: زۆر باشە گەورەم ئەو شێتییەتان وەبیر کەوتۆتەوە، کە شەش مانگ لەمەوپێش، شەوانە یەکێك هەمووتانی دەدایە بەر قامچیان ئێوەش ناچار هەڵدەهاتن، تا شەوێکیان زۆری نەما بوو بکەویتە نێو چاڵێکەوەو ملت بشکێ.

لێیاندەر: ئێ ؟

سکاپن: ئەو کەسە من بووم گەورەم شێتەکە بووم.

لێیاندەر: تۆ شێتەکە بووی، ناپاك؟

سکاپن: بەڵێ گەورەم، هەر بۆ ئەوەی بتان ترسێنم و شەوان کە دەکەوتنە هـەوەس، مـن بـەدەوری دیوارەکاندا دەسوڕامەوەو خۆم هەڵدەکوتایە سەرتان.

لێیاندەر: من هەموو ئەم شتە بە ڕێ و جێیانەی بیستم وا تازە دێنەوە خەیاڵم، بەڵام ئێستا ئیـشم هەیەو پێم بڵێ، چیت بە باوکم

وتووە.

سکاپن: بە باوکت؟

لێیاندەر: بەڵێ، ساختەچی، بە باوکم.

سکاپن: من، لەوەتەی گەڕاوەتەوە، هەرنەمبینیوە.

لێیاندەر: تۆ نەتبینیوە؟

سکاپن: نەخێر گەورەم!

لێیاندەر: دڵنیایت؟

سکاپن: دڵنیام! حەزدەکەی لەبەرچاوی خۆیشت پێی دەڵێم.

لێیاندە: بەهەرحاڵ، من ئەمەم لە دەمی خۆیەوە بیستووە.

سکاپن: ئەگەر ڕێگام بدەی، ڕاست ناکات.

**دیمەنی چوارەم :**

**کارل — سکاپن — لێیاندەر — ئاکتاڤ**

کارل: گەورەم! خەبەرێکم پێیە بۆ عاشقاتییەکەت، زۆر ناخۆشە.

لێیاندەر: چۆن؟

کارل: قەرەجەکان دەیانەوێ بینێتیت لە دەست دەربێنن. زێربینێت خۆی بەچاوی بە فرمێسکەوە هاتە لام و وتی کە بە پەلە بێم تۆ ئاگادار بکەمەوە ئەگەر تا دوو سەعاتی دی ئەو پارەیەی قەرەجەکان لە خوازبێنی من داوایان کردووە نەنێرێت، بۆ یەکجارەکی زێربینێت لە دەست دەڕوا.

لێیاندەر: بە ماوەی دوو سەعات؟

کارل: بە ماوەی دوو سەعات.

لێیاندەر: ئای! سکاپنی ئازیز! زۆر ئاتاجی تۆم.

سکاپن: (بە فیزەوە بەبەردەمیدا دەڕوا) "ئای سکاپنی ئازیز" کە پێویستیتان پێم دەبێ یەکسەر دەبمە سکاپنی ئازیز !

لێیاندەر : بڕۆ، هەموو ئەو شتانەی پێت وتووم لێت دەبوورم، هەتا ئەگەر شتی خراپتریشت دەرهەق کردبم.

سکاپن : نا! نا! هیچ لێم مەبوورە! شمشێرەکەت بۆ ورگم دەهێنا! پێم خۆشبوو ئەو کاتە بتکوشتمایە.

لێیاندەر: نا، تکات لێ دەکەم بە فریای ئەم عەشقەم بکەوە. ژیانم ڕزگار بکە.

سکاپن: هەرگیز ! هەرگیز! چاکترین شت ئەوەیە من بکوژی.

لێیاندەر: تۆ لای من زۆر بە نرخی، تکات لێ دەکەم وەرەوە هۆش خۆت و ئەم هۆشە چاکەت، کە لە هەموو شتێکدا سەرکەوتووە بۆ منی بخەوە کار.

سکاپن: نەخێر! پێم وتی من بکوژە!

لێیاندەر: ئای! مەحز بۆ ڕەزای خوا! چیدی بیر لەم مەوزووعە مەکەرەوە، بیرێ لەوە بکەرەوە چۆن بە هانامەوە بێیت و بۆ بە جێ بێنی.

ئاکتاڤ: سکاپن، دەبێ شتێکی بۆ بکەی.

سکاپن: پاش ئەو هەموو ئەتك کردن و سووککردنە



لێیاندەر: تکات لێ دەکەم تووڕەییەکەی من لە بیربەرەوەو چالاکی و زیرەکی خۆتم بۆ دەربخە.

ئاکتاڤ: منیش تکات لێ دەکەم.

سکاپن: بەم جنێوانەی دڵی ڕەنجاندم.

ئاکتاڤ: وا چاکترە ڕق و کینە لە دڵ نەگری.

لێیاندەر: سکاپن، دەتەوێ ئێستا لەم تەنگانەیەی هاتۆتە ڕێی عەشقەکەم، بە تەنیا جێم بهێڵی؟

سکاپن: هەر لە خۆتەوە هاتی وا سووکت کردم!

لێیاندەر: دان پێدا دەنێم، کە من گوناهبارم

سکاپن: بەم قسانە گەلحۆ، فێڵباز، ساختەچی ڕیسوا.. ڕێزم دەگری!

لێیاندەر: لەم ڕووەوە زۆر بەداخەوەم.

سکاپن: دەتویست شمشێرەکەت لە ورگم ڕاکەی.

لێیاندەر: لە هەموو دڵەوە داوای لێبووردنت لێ دەکەم. ئەگەر دەڵێی بۆ لێبووردن (پێ یەکانت ماچ دەکەم). سکاپن فەرموو (دەکەوێتە سەر پێیەکانی)، دیسان تکات لێ دەکەمەوە بە تەنیام جێ نەهێڵی.

ئاکتاڤ: ئاها! لەو باوەڕەدام ئیدی هەر دەبێ قایل بێ.

سکاپن: هەڵسەوە ! لە بیرت نەچێ جارێکی دی وا خۆش باوەڕ نەبیت.

لێیاندەر: ئیدی بەڵێن دەدەی یارمەتیم بدەی؟

سکاپن: لەم بارەیەوە دەبێ بیری لێ بکەمەوە!

لێیاندەر: بەڵام، خۆت دەزانی کاتەکەی کەمە.

سکاپن : دڵتەنگ مەبە. چەندت پێویستە؟

لێیاندەر : پێنج سەد ئەکوا. [۱۲۸]

سکاپن: تۆ چەندت گەرەکە ؟ (بە ئاکتاڤ دەڵێ)

ئاکتاڤ: دوو سەد پیستۆڵ. [۱۲۹]

---

۱۲۸- پارەیەکی کۆنی فرەنسییە. ecusئەکوی زیوینی فەڕەنسی شەست شاهی یان سێ لیرە دەکات. ئەکوی زێڕیش ١١٤ شاهی دەکات.(و: فارسی).

سکاپن: ئەو پارانەتان لە باوکتانەوە بۆ دێنم ! (بە ئاکتاڤ دەڵێ) بۆ باوکی تۆ پیلانێکی چاکم بۆ داناوە. (بە لێیاندەر دەڵێ) بۆ باوکی تۆش، هەرچەندە یەکجار پووشتە، پێویستی بە فێڵێکی بچووك هەیە، چونکە خۆت دەزانی لە هەموو زیرەکی و ئەقڵ و لوتفی خودا بێبەشە بەڵام کارەکانی وا بۆ ڕێك دەخەم، کەوا بزانێ خۆیشی هەروای ویستوە. ئەو دەردەسەریەتان لە کۆڵ دەکەمەوەو وا دەکەم گچکەترین زویر بوونیش لە نێوانتان دروست نەبێ. وابزانم ئەوە باوکی ئاکتاڤیش هات. با لەگەڵ ئەو دەست پێ بکەم. بێگومان دوای ئەوەی گەیشتە ئێرە ئێوە لێرە بڕۆن (بە ئاکتاڤ دەڵێ) تۆیش سیلڤیستەر ئاگادارکەرەوە زوو بێتە ئێرە با هەولێ لەگەڵ بدەین.

**دیمەنی پێنجەم :**

**ئارگانت - سکاپن**

سکاپن: (لەگەڵ خۆی) ئەمانە دەیانەوێ کاوێژ بکەن.

ئارگانت: (وا دەزانێ تەنیایە) کەمی چاودێری و پەروەردەکردن، ئەم دەردەسەرییە ئەنجامەکەیەتی ئاخ! ئاخ! گەنجی سەرکەش!

سکاپن: گەورەم، خزمەتکارت.

ئارگانت: سکاپن، چۆنی.

سکاپن : بیر لە گرفتاری کوڕەکەتان دەکەیتەوە؟

ئارگانت: دانی پێدا دەنێم ئەم کارەساتە تووشی خەم و خەفەتی کردوومە.

سکاپن: گەورەم، ژیان پڕیەتی لە تەنگ و چەڵەمە هەر باشە مرۆڤ دەتوانێ بەرامبەر ئەو هەموو تەنگ و چەڵەمانە خۆی بگرێ. من زۆر لەمەوپێش لە کابرایەکی دنیا دیدە قسەیەکم گوێ لێبوو، قەت لە بیرم ناچێتەوە.

ئارگانت: قسەکە چی بوو؟

سکاپن: ئەوە بوو، کە باوکێك بۆ ماوەیەك لە ماڵەکەی دووردەکەوێتەوە، دەبێ خۆی بۆ هەر ناخۆشی یەك ئامادەکردبێ لە کاتی گەڕانەوەیدا ڕووبەڕووی دەبێتەوە.

---

١٢٩- پارەیەکی کۆنی ئیسپانییە.(و: فارسی).



دەبێ خەیاڵی بۆ ئەوە بچێ کە ماڵەکەی ئاگری تێ بەربووە، پارەکانی دزراوە، ژنەکەی مردووەو کوڕەکەی شتێکی بەسەر هاتووە، کاتێکیش دەگەڕێتەوە دەبینێ هیچ ڕووی نەداوە، ئەوەیان بە خێرو چاکە بۆی گەڕاوە، من هەمیشە لە فەلسەفە گچکەکەی خۆمدا، لەسەر ئەم پەندە ڕۆیشتووم و هیچ کاتێك نەگەڕاومەتەوە بە بێ ئەوەی خۆم بە تووڕەیی و سەرزەنشت و جنێو لێدان و کوتان و دارکاری ئەربابەکانم ئامادەنەکردبێ. ئەگەر کەمتریشم پێ کەوت، ئەوە بە بەخت و یوقبالی چاکی خۆمی دەزانم.

ئارگانت: ئەوەیان دەباشە، بەڵام ئەو ژن هێنانەبێ شەرمانە سەری لێ شێواندووم، شتێکی ئەوتۆ نییە بتوانم بەرگەی بگرم. من چووبووم ئەو ژن هێنانە بەتاڵ بکەمەوە تەگبیرێك لە دادگا بکەینەوە.

سکاپن: بەڕای من، گەورەم و ئەگەر بە گوێی من دەکەی، هەوڵ دەدەن لە ڕێگایەکی دییەوە داواکەتان بەرز دەکەنەوە. تۆ خۆت وەزعی دادگا کانی ئەم وڵاتە چاك دەزانی. دەتەوێ خۆت تووشی دەردەسەری یان بکەیت.

ئارگانت: ڕاست دەکەی، منیش دەزانم، بەڵام چار چییە؟

سکاپن: من بیرم لە ڕێگایەکی دی کردۆتەوە نەم خەم و خەفەتتان بەر دڵی گرتووم، ناچارم دەبێ ڕێگایەك بدۆزمەوە بۆ ڕزگارکردنتان، چونکە بە بینینی باوکێکی سەنگینی وەك تۆ کە بە هۆی کوڕەکەیەوە دووچاری خەم و پەژارە بووە، زۆر کارم تێ دەکا، سەرباری ئەوەش، من هەر هەست و خۆشەویستییەکی تایبەتیم بۆت هەیە.

ئارگانت: سوپاس.

سکاپن: من برای ئەو کیژەم دۆزییەوە، لە پیاو کوژەکانە، لەو کەسانەیە کە سەرتاپای لەشی زەخمی شمشێرە پیاو بشکێنی ورتەی لە دەم دەرنابێت، پیاو کوشتن و ئاو خواردنەوەی لە کن وەك یەکە! باسی مەسەلەی ئەو ژن هێنانەم لاکردو وتم بزانم چ دەڵێ و هەوڵی چی دەدا بۆ بەتاڵکردنەوەی ئەم ژن هێنانە، ئەو هەوڵی ئەوەی دەدا تۆیش دەبێ وەك باوکێك یاسات بەسەردا بسەپێندرێ، بەڵام گرنگ نییە، پارەی سپی بۆ ڕۆژی ڕەشە، ئەوەندە لەگەڵیدا پێداچووم ناچاربوو گوێ لە پێشنیارەکانم بگرێ، بە چەند قسەیەك ئیشەکەم ڕاستەڕێ کردو ئەویش قایلبوو بەوەی ئەو ژن هێنانە بەتاڵ بکاتەوە بە مەرجێ ئێوە پارەی بدەنێ.

ئارگانت: داوای چەند دەکا؟

سکاپن: ئۆهـ، هەوەڵ جار داوای پێنج سەد — شەش سەد پیستۆڵی دەکرد.

ئارگانت: پێنج سەد — شەش سەد دەك نەگەی بیخۆی قەشمەری بە خەڵکی دەکا؟

سکاپن: منیش هەروام پێ وت و پێشنیازییەکم ڕەتکـردەوە و تـێم گەیانـد کـە ئێـوەش وا نەزان نین تا داوای پێنج سـەد — شەشـە سـەد پیـستۆڵیان لێ بکـەی. سـەرەنجام دوای بێنـەو بەردەیەکی زۆر لەسەر ئەوە ڕێکەوتین : وتی " ئێستا کە ئێمە ئەو قسانە دەکـەین. مـن دەبـێ خۆم بە خزمەتی یاسا بگەێنم و هەر لە ئێستاوە خەریکی خۆ ئامادەکردن دەبم، بـەڵام ئاتـاجی برە پارەیەکیشم لەبەر ئەوە ناچارم بە قسەکانی ڕازی بم بە مەرجێ ئەسپێکم بۆ سواری بۆ بکـڕێ ئاوا لە دەوری شەست پیستۆڵێك"

ئارگانت: زۆر باشە، من شەست پیستۆڵەکەی دەدەمێ.

سکاپن: ئێی، زینێکی دەوێ بۆ ئەسپەکەی و دەمانچەیەکیش بـۆ خـۆی ئەوانـەش بیـست پیستۆڵێك دەکات.

ئارگانت: بیست پیستۆڵ و شەست پیستۆڵ دەکاتە هەشتا پیستۆڵ.

سکاپن: زۆرە.

ئارگانت: زۆرە، بەڵام باشە بەوەندەش هەر ڕازیم.

سکاپن: " ئەسپێکیـشی دەوێ بـۆ سـواربوونی خزمەتکارەکـەی ئـەویش سـی پیـستۆڵێك دەکات"

ئارگانت: شەیتان بە نەعلەت بێ ! کابرا خۆی حەز دەکا بە پیادە بـڕوا خـۆ چ کۆسـپی لـە پێش نییە!.

سکاپن: گەورەم !.

ئارگانت: نەخێر، پیاوێکی زۆر چاو نەترسە!.

سکاپن: حەز دەکەی خزمەتکارەکەی پیادە بێت؟.

ئارگانت: چۆن دەڕوا با بڕوا، ئەربابیشی هەروا!.

سکاپن: خوایە، گەورەم! بۆ شتێکی وا بچووك خۆت مەکێشەوە تکات لێ دەکـەم مەچـۆرە دادگاو بۆ ڕزگاربوونت لە دەست یاسا ئەم پارانە ببژێرە.

ئارگانت: زۆر باشە، دەی، ئەو سی پیستۆڵەش دەدەم.

سکاپن: وتی ئەسپێکی تریشم پێویستە بۆ بردنی..



ئارگانت: ئەهۆ! ئەسپ ئەسپ نەبڕایەوە! ئەمە زۆر دەکا! دەچینە لای قازی!

سکاپن: مەحز بۆ ڕەزای خوا گەورەم.......

ئارگانت: نەخێر ئەو زێدە مەسرەفیەی ناکەم!

سکاپن: گەورەم هەر جوانووێك!

ئارگانت: کەرێکیش چییە بۆی ناکڕم!

سکاپن: بیرێکی لێ بکەرەووە.

ئارگانت: نەو، من بەم داوەرییە (محاکمە) ڕازی نابم.

سکاپن : ئای گەورەم! ئەوە تۆ باسی چی دەکەی؟ بڕیارت لەسەر چی داوە؟ سەیرێکی پێچ و پەنای یاسا بکە، چەندت لێ وەردەگرن، شکایەت و شکایەتکاری، ئەو هەموو دادپرسییە، ئەو هەموو حەشامەتە ئەو هەموو ئاژەڵە دادپرسییە ئەو هەموو ئاژەڵە فریودەرانە دەبێ خۆتیان لە چنگ قورتار بکەی، عەریفەکان، نماینەدەکان، قازی یەکان، هەواڵدەرەکان دادستانەکان و سەرنووسەران و جێگرەکانیان، لەو هەموو خەڵکە یەکێ نادۆزییەوە بە لانی کەمەوە دەگەیەك لە مافی ئێوە نەدا، عەریفێك، ئیشێکتان بە کەم و کورتی بۆ دەکا، بێ ئەوەی پێشی بزانن بەوە مەحکووم دەبن. نوێنەرەکەتان، لە داواکارییەکەتان شتێکتان بۆ دروست دەکاو پارەیەکی زۆرتر وەردەگری ئێوە فەرامۆش دەکا. وەکیلەکەتان، ئەویش تەماع دەیگرێ و لە کاتی دادوەرییەکەدا هەر خۆشتان پی نیشان نادا. یان لە دادگا بەڵگەی وا هیچ دێنێتەوە کە هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێ. ئەفسەرەکان، بەهانای ئامادەنەبوون لە دادگادا ئێوە تاوان باردەکەن. سەرنووسەرەکان پارەتان لێ بەردەدەنەوە.

هەواڵدەرەکان ئەوەی بە چاوی خۆیان بینیبویانە دانی پێدا نانێن. ئەو کاتە ئەگەر ئێوە ئەو پەڕی زیرەك و ڕۆشنبیریش بن ناتوانن ئەو هەموو سکاڵایە ڕەت بکەنەوە هەروەها بێتەوە قازیەکانیش بەناوی پیاوی ئایینی پیرۆزیان لەبەر خاتری ئەو ژنانەی دۆستیانن، حوکم لەسەر ئەوە دەدەن و توشی بەڵاتان دەکەن. جا گەورەم دەتوانی خۆت لە نێو ئەم دۆزەخە ڕزگار بکەی؟

ئارگانت: ئێستا ئەسپ سواری ئەو چەندی تێ دەچێ؟

سکاپن: گەورەم، بۆ جوانووەکە، بۆ ئەسپەکانی خۆی و خزمەت کارەکەی، بۆ چەك و زین و چەند وورده شتێکی بچووکی دی، کە دەبـێ بیداتـە خـاوەن مێوانخانەکـە، هـەمووی دووسـەد پیستۆڵی دەوێ.

ئارگانت: دوو سەد پیستۆڵ؟

سکاپن: بەڵێ؟

ئارگانت! (بە تووڕەییەوە بە درێژایی پیاسە دەکا)یالڵلا دەچینە دادگا.

سکاپن: بیرکەرەوە.......

ئارگانت: من، دەست بە داواکەم دەکەم.

سکاپن: تۆ، چ جاران خۆت نەچوویت.......

ئارگانت: من دەمەوێ سکالاکەم پێشکەش بکات.

سکاپن: بەلام، بۆ سکالا کردن، پوولی دەوێ. پوولی دەوێ بۆ ئیجرائیە، جێبەجێ کردنی سکالاکەت پوولی دەوێ، وەکالەت پوولی دەوێ، ناسین پارەی دەوێ راوێژکار پارەی دەوێ، دانیشتن پارەی گەرەکە، کرێی رۆژانەی وەکیل و هەروەها دەبێ بۆ راوێژو رێکخستنی وتاری بەرگری لێکردن و نماینەدکان و ئامادەکردنی ڕوونووسەکان پوول ببژێری دەبێ بۆ راپۆرتی داواکاری گشتی پوول ببژێری بۆ هەقی چاوپێکەوتن لەگەڵ قازی و ئامادەکردنی داخوازی نامەو سکالاکانت بۆ هەقی ئەفسەرانی دادگا بۆ ئامادەکردنی ڕوونووسی یاداشتەکانی دادوەری بەرایی، بۆ ئیجرائیە بۆ ئیمزا بۆ ناردنی پەیامی سەرنووسەرەکان بۆ هەموو ئەمانە دەبێ پوول ببژێری ئیتر ئەو دیاری یانەش هەر هیچ کە دەبێ بینێری.ئەو پارانە بدە ئەو کابرایەو خۆت دەربازکە.

ئارگانت: چۆن!! دوو سەد پستۆڵ!

سکاپن: بەڵێ، قازانجتانە، من لە لای خۆمەوە حیسابێکی بچووکم بۆ خەرجییەکانی دادگا کردووەو تەماشام کردووە دوو سەد پیستۆڵتان قازانجە.جا ئەو غارە غار و زەحمەتی و دەردەسەریانەش هەر هیچ من بم سێ سەد پیستۆڵیشی بوێ دەیدەمێ، بەرگەی داوای پیسی ئەو ناپاکانە ناگرم.

ئارگانت: من قەت دوو سەد پیستۆڵ نادەم!

سکاپن: بە هەرحاڵ ئەوە قسەکانی کابرا بوون.



**دیمەنی شەشەم :**

**سیلڤیستەر – ئارگانت – سکاپن**

سیلڤیستەر: (وەك پیاو کوژێك جلەکانی خۆی گۆڕیوە) سکاپن، بزانە بەو ئارگانتەی باوکی ئاکتاڤم ناناسێنی.

سکاپن : بۆچی مسیو.

سیلڤیستەر: بیستوومە دەیەوێ من ڕاکێشێتە دادگاو بە پێی یاسا شووکردنی خوشکەکەم بەتاڵ بکاتەوە.

سکاپن: نازانم ئەو بیری لەوە کردۆتەوە یان نا، بەلام هەرگیز بەدانی ئەو دوو سەد پیستۆڵەی تۆ داوات کردبوو قایل نابێ، دەڵێ ئەو پارەیە زۆر زۆرە!

سیلڤیستەر: قوڕی بەسەر ئەگەر دەیدۆزمەوە، دەبێ پشتی بشکێنم (ئارگانت نەوەك سیلڤیستەر ببینێ دەلەرزی و خۆی لە پشت سکاپن دەشارێتەوە)

سکاپن: مسیۆ! ئەمە ئەو نییە، ئەمە ئەو نییە!

سیلڤیستەر: برادەریشی نییە؟

سکاپن : نە، مسیۆ! بە پێچەوانەوە، ئەمە دوژمنی گیانیی ئەوە!

سیلڤیستەر: دوژمنی گیانی ئەوە؟

سکاپن: بەڵێ.

سیلڤیستەر: (بە ئارگانت دەڵێ) ئاە، ئافەرین! بەمەیان دڵخۆشم، مسیۆ تۆ دوژمنی ئەو ئارگانتە دەبەنگەی؟ ها؟

ئارگانت : بەڵێ، بەڵێ زایە!

سیلڤیستەر: (دەستی ئارگانت ڕادەتەکێنێ) دەستت بێنە! دەستت بێنە! من بەڵێنت پێ دەدەم و سوێن دەخۆم بە شەرەفم بەو پەیمانەی بەستومانە دەبێ هەر ئەورۆ بەم شمشێرە نەیهێڵم باوەڕم پێ بکە سکاپن : مسیۆ! شتی بەزۆرە ملێ بە هیچ شێوەیەك لەم وڵاتە ڕێ ی پێ نادرێ.

سیلڤیستەر : من گاڵتەم بەو شتانە دێت. هیچم نییە خەفەتی بۆ بخۆم.

سکاپن : حەتمەن ئەویش کەس و کاری هەیە بەرگری لێ بکەن، دایك و باوکی، برادەرەکانی و خزمەتکارەکانی هەموویان لە بەرامبەر ئەم ڕقەبەری یەی

تۆ، لەسەری دەکەنەوە.

سیلڤیستەر : ئەمە، هەمان شتە، کە منیش دەمەوێ پرسیاری لێبکەم. خوای گەورە منیش پرسیاری ئەوە دەکەم! (شمشێرەکەی دەگرێ بە دەستەوەو ڕایدەوەشێنێ، وەك بڵێی چەند کەسێکی وا لەبەردەمە).

ئاە! کەللە! ئاە ! ورگ! مەگەر هەر ئێستا خۆی و برادەرەکانی نەبینمەوە، مەگەر بە خۆی و سێ کەسی ترەوە نەکەونە بەرچاوم ! مەگەر ڕووبەڕوو دەست و ڕمیان نەبینم! چۆن بێ شەرەفانە زاتی ئەوە دەکەن لێم نزیك ببنەوە! یاڵلا! بکوژە! بێ ئەمان. لێیان بدە. بە توندی بیانگوشم !ئاە، دەبەنگینە! ئاە هیچ و پووچینە! ئێوەش دیارە دڵتان کوتەك دەخوازێ ؟ دەتانەوێ چینەکتان لێدەم! قیت بنەوە! دەبەنگینە! هەڵسنەوە ! یاڵلا! شمشێرەکەی بەم لاو بەولادا دەوەشێنێ و(بە تەنیشت سکاپن و ئارگانت دا دەسوڕێتەوە) چۆن! دەکشێنە دواوە! (پێیەکانی دەکوتێ)! یاڵلا! (پێیەکانی دەکوتێ!)

سکاپن: ئاخ! ئاخ! ئاخ! ئێمە نین!

سیلڤیستەر: ئەو تێی گەیاندوون کەس زاتی ئەوە ناکا خۆی تووشی ئەو بکات (دوور دەکەوێتەوە).

سیلڤیستەر : زۆر باشە، جا دەبینی چەند کەس لەسەر ئەو دوو سەد پیستۆڵە دەکوژێ، یاڵلا! هیوای سەرکەوتنت بۆ دەخوازم.

ئارگانت: فەرموو.

ئارگانت: بڕیارمدا، دوو سەد پیستۆڵەکە بدەم.

سکاپن: بە هۆی ئەو پەیوەندییەی لە نێوانمان دایە، بەم بڕیارەت دڵخۆشم.

ئارگانت: با بچین بیدۆزینەوە. دوو سەد پیستۆڵەکەی بدەمێ.

سکاپن: تۆ، پارەکەم بەرێ و هەقت نەبێ لەبەر ئابڕووی خۆت با چاوی پێت نەکەوێ، ئەویش دوای ئەو کارەساتە نایەوێ کەسی دی پێ بزانێ سەرباری ئەوەش دەترسێم کە تۆ بناسێ داوای پارەیەکی زۆرتر بکات.

ئارگانت: بەڵێ، بەڵام زیاتر دڵم خۆش دەبێ ئەگەر بە دەستی خۆم پارەکەی بدەمێ.

سکاپن: بڕوات بە من نییە؟

ئارگانت: نا، بەڵام.......



سکاپن: ئافەرین گەورەم! من یان فێڵبازم یان پیاوێکی بێ شەرەفم لەو دوو شتە بەدەر نییە. من ئەگەر بمویستبایە تۆ هەڵخەڵەتێنم نەمدەتوانی؟ بەڵام من جگە لە قازانجی تۆ و ئەربابم چ مەبەستی دیم نی یە. تۆ هەقی هیچت نی یە هەر ئەوە نەبێ بێت بزانێ کێ گرفتاری ئێوەی پێ چارەسەر دەکرێ.

ئارگانت: زۆر باشە، بگرە.

سکاپن: نا، گەورەم! پارەکەتان بە من مەسپێرن. من پێم خۆشە ئەم ئیشە بە یەکێکی دی بسپێری.

ئارگانت: خودایە ! بگرە !

سکاپن: نا پێت دەڵێم، باوەڕ بە من مەکە! کێ دەڵێ من پارەکەتان لە چنگ دەرناهێنم؟

ئارگانت: پێت دەڵێم بگرە! لەوە زیاترحەفت و هەشتم لەگەڵ مەکە. بەڵام ئاگات لێ بێ لێ ی دڵنیابە.

سکاپن: بۆ منی لێگەڕێ.

ئارگانت: لە ماڵەوە چاوەڕێت دەکەم.

سکاپن: دێم دێم. (تەنیایە)، ئەمە یەکێکیان دەبێ ئەوەی دیشیان بدۆزمەوە. ئاە! بەڕاستی ئەوانە وەك بڵێی خوا یەك بە یەك بە تۆڕەکەی منیان وەدەکا!

**دیمەنی حەفتەم:**

ژێرونت - سکاپن

سکاپن: (وا پیشان دەدا ژێرونتی نەدیوە) ئای خوایە! ئۆخ! کارەساتێکی چاوەڕوان نەکراو بوو! ئاخ! باوکی داماو! ژێرونتی بەستەزمان! چ دەکەی!

ژێرونت: بەم ڕوخسارە خەمبارەتەوە چی دەربارەی نییە پێم بڵێ ژێرونت لە کوێیە؟

ژێرونت: چی بووە سکاپن ؟

سکاپن: (سکاپن لەسەر شانۆدا ڕادەکات و نایەوێ ژێرونت ببینێ و گوێی لە دەنگی بێ) چۆن دەتوانم ببینم ئەو کارەساتە دڵتەزێنەی پێ ڕابگەیێنم.

ژێرونت: (بەدوای سکاپن دا ڕادەکات) ئاخر چی بووە ؟

سکاپن: (بەهەمان حاڵ) دەبێ هەر بەغار هەموو لایەك بکەم تا دەیدۆزمەوە.

ژێرونت: من لێرەم.

سکاپن: (بەهەمان حاڵ) دیارە خۆی لە جێگایەك مات کردووە تا کەس نەتوانێ ئەم هەواڵەی پێ ڕابگەیێنێ.

ژێرونت: (سکاپن دەوەستێنێ) هۆ! مەگەر تۆ کوێری من نابینی؟

سکاپن: ئاخ! گەورەم! هیچ ڕێگەیەك نەبوو تا چاوم پێت بکەوێ

ژێژرونت: ئەی ئەوە یەك سەعات نییە لە بەردەم تۆم، چی بووە؟

سکاپن: گەورەم!...

ژێرونت: چی بووە؟

سکاپن: گەورەم کوڕەکەتان.......

ژێرونت: ئێ باشە کوڕەکەم........

سکاپن: تووشی کارەساتێکی زۆر سەیر بووە.

ژێرونت: چییە ؟

سکاپن: تەماشام کرد زۆر خەمبارە. نازانم چیت لەمنەوە پێ وتبوو وەها لەمنت تاڵ کردبوو بۆ ئەوەی بتوانم ئەو خەم و پەژارەیەی بڕوێنمەوە پیاسەیەکی لای بەندەرم پێ کرد. لەوێ لەو هەموو شتە چاومان بڕیبووە کەشتیەکی جەنگی تورکی زۆر ڕێك و پێك. گەنجێکی تورکی باڵا بەرز، داوای لێکردین سواری کەشتییەکە بین، ئێمەش سواربووین و خزمەتێکی زۆری کردین، نانی عەسرێی داینێ میوەمان زۆر خوارد، کە ئێمە لەو جۆرانەمان نەدی بوو، هەروا بێتەوە شەرابمان نۆشی، جا شەرابێك شەرابی وا چاك لە دنیادا نییە.

ژێرونت: جا ئەم شتانە خەم و خەفەتی چیان تێدایە؟

سکاپن: ئارامت بێ! ئیستا پێت دەڵێم کاتێ ئێمە نانی عەسرمان دەخوارد ئەو کەشتی یەکەی خستبووە ئاوەوەو لە بەندەری دوورخستبووە پاشان منی بە گەمییەکی بچووك ناردەوە کەنار کە بێم بە تۆ بڵێم ئەگەر هەر ئێستا پێنج سەد (ئەکۆ)ی بۆ نەنێری کوڕەکەتان لەگەڵ خۆی دەباتەوە جەزائیر.

ژێرونت: چۆن ؟ لەعنەتی! پێنج سەد(ئەکۆ(!

سکاپن: بەڵێ گەورەم! لەوەش خراپتر لە دوو سەعات زیاتر مۆڵەتی نەداوینەتێ!



ژێرونت: ئاخ! تورکە جەردەکان! بەم ڕێگایە من دەکوژن!

سکاپن: گەورەم! لەسەر ئێوە وەستاوە بە پەلە ڕێگایەك بۆ ڕزگارکردنی کوڕەکەتان بدۆزنەوە ئەو کوڕەی وا زۆر خۆشتان دەوێ.

ژێرونت: چۆن هەڵەی واتان کرد لە خۆتانەوە سواری ئەو کەشتییە بوون؟

سکاپن: ئەو بیری لەو پێشهاتە نەکردبۆوە.

ژێرونت: بڕۆ بۆ لای سکاپن تۆ بڕۆ بۆ لای بەم تورکە بڵێ من یاسای لەگەڵ بەکاردێنم.

سکاپن: یاسا لە نێو دەریا؟ ئێوە گاڵتە بە خەڵکی دەکەن گەورەم؟

ژێرونت: چۆنهەڵەی واتان کرد لە خۆتانەوە سواری ئەو کەشتی یە بوون؟

سکاپن: هەندێ جار، چارەنووس، مرۆڤ گومڕا دەکا.

ژێرونت: سکاپن، تۆ وەك خزمەتکارێکی بەوەفا ئیشێك هەیە پێویستە بیکەی.

سکاپن : چی بکەم گەورەم؟

ژێرونت: تۆ بڕۆ بەم تورکە بڵێ کوڕەکەم ڕەوان بکاتەوەو تۆ لە جیاتی ئەو لای خۆی بهێڵێتەوە، تا ئەو پارەیەی ئەو داوای کردووە ئامادە دەکەم.

سکاپن: ئای گەورەم ئەوە دەڵێی چی؟ تۆ وادەزانی ئەو تورکە ئەوەندە دەبەنگە داماوێکی وەك من لە باتی کوڕەکەی تۆ لای خۆی گل بداتەوە؟

ژێرونت: چۆن هەڵەی واتان کرد لە خۆتانەوە سواری ئەو کەشتییە بوون؟

سکاپن: ئەو لە کوێ بەڵای وای ڕەچاو کردبوو گەورەم بیرکەرەوە دوو سەعات زیاتر مۆڵەتی پێ نەداوین!

ژێرونت: وتت چەندی دەوێ؟

سکاپن: پێنج سەد ئەکۆ.

ژێرونت: پێنج سەد ئەکو ! هیچ ویژدانی نییە؟

سکاپن: لە ڕاستیدا، بەڵێ هەروەك ڕێگرێك قسە دەکات!

ژێرونت: جا باشە دەزانی پێنج سەد ئەکو یانی چەند؟

سکاپن: بەڵێ گەورەم ! دەزانی کە هەزارو پێنج سەد لیرە دەکات.

ژێرونت: ئەو ناپاکە، وا دەزانێ هەزارو پێنج سەد لیرە شتێکی ئەوەندە کەمە؟

سکاپن: ئەوانە مەنتقیان لە کەللەدا نییە!

ژێرونت: بەڵام چۆن هەڵەی واتان کرد لە خۆتانەوە سواری ئەو کەشتییە بوون؟

سکاپن: ڕاستە بەڵام چی دەکەی کێ پێشبینی ئەو هەموو شتانەی دەکرد.. مەحز بۆ ڕەزای خوا گەورەم تۆزێ خێرابە.

ژێرونت: بگرە ئەمە کلیلی خەزینەکەمە.

سکاپن: باشە!

ژێرونت : دەیکەیتەوە.

سکاپن : زۆر باشە!

ژێرونت: لە لای دەستە چەپ کلیلێکی لێ یە، ئەوە کلیلی ئەمباری ژێر زەمینەکەیە.

سکاپن: بەڵێ.

ژێرونت: هەرچی شمەك و شتی ڕازانەوەی لێیە هەمووی ببە بیدە بە کۆنە فرۆشێك، بەڵکو پارەکەی بتوانین کوڕەکەم بکڕینەوە.

سکاپن: (کلیلەکەی دەداتەوە) ئاخ گەورەم تۆ خەون دەبینی؟ من هەموو ئەو شتانەی تۆ دەیڵێی بیفرۆشم سەد فرەنك ناکا سەرەڕای ئەوەش تۆ خۆت دەزانی کەمترین مۆڵەتی پێداوین؟

ژێرونت : چۆن هەڵەی واتان کرد لە خۆتانەوە سواری ئەو کەشتییە بوون!

سکاپن: ئاخ قسەی هیچ! واز لەو کەشتییە بێنە و بیر لەو تەنگانەیە بکەرەوە، دوورنییە کوڕەکەتت لە دەست بچێ حەف ئەربابە بەستەزمانەکەم ڕەنگە هەتا عومرم مابێ جارێکی دی نەتبینمەوە لەوانەیە ئێستا کەوا لێرە قسە دەکەم، تۆیش خەریکن بە دیلی بتبنەوە جەزائیر، بەڵام خوا ئاگای لێیە هەرچی دەکەم لە تواناداا بووە بۆم کردووی و ئەگەر ئێوەش نەتوانن کوڕەکەتان بکڕنەوە بەڵگەی کەم عەشقی و خۆشەویستیتانە بۆ کوڕەکەتان.

ژێرونت: گوێ بگرە، سکاپن من وا دەچم ئەو پارەیە دێنم.

سکاپن: دە خێراکە، گەورەم! زەنگی سەعاتەکەم لەرزی هێناو مەتێ.

ژێرونت: وتت چوار سەد ئەکو؟

سکاپن: نەخێر، پێنج سەد ئەکو! بەڵێ!

ژێرونت: چوونە نێو ئەو کەشتی یە چی بکەن!

سکاپن: هەقی خۆتە بەڵام دە خێراکە!

ژێرونت: چ سەیرانگایەکی دی نەبوو؟



سکاپن: (لەگەڵ خۆیدا) بە داخی ئەو کەشتییەوە دەمرێ!

ژێرونت: بگرە، سکاپن لە بیرم نەبوو ئەوەندە پارەیەم هەڵگرتووە بە خەیاڵمدا نەدەهات ئەم وەها بە زوویی دڵخۆشم بکات. (کیسەی پارەکانی پێ نیشان دەدات، بەڵام نایداتێ لە هەمانکاتدا دەستی بۆ لای ئەو درێژ دەکا، لەو کاتەدا سکاپن دەستی بۆ وەرگرتنی پارەکان درێژ دەکا) بگرە، دەی بڕۆ کوڕەکەم بکڕەوە.

سکاپن: بەڵێ گەورەم!

ژێرۆنت: بەڵام بەو تورکە بڵێ و ئەوە تۆ پیاوکوژی؟

سکاپن: بەڵێ.

ژێرونت: بەدکارە!

سکاپن: بەڵێ!

ژێرونت: کابرایەکی بێ ئیمانە! دزە!

سکاپن: بۆ منی لێگەڕێ.

ژێرونت: بە بێ هیچ یاسا و دەستوورێك پێنج سەد ئەکوم لێ دەسێنێ!

سکاپن: بەڵێ!

ژێرونت : من لە دنیایە و نە لەو دنیا پارەی خۆم خۆش نابم !

سکاپن: زۆر باشە!

ژێرونت: ئەگەر بشیدەمێ تۆڵەی هەر لێ دەکەمەوە.

سکاپن: بەڵێ

ژێرونت: (کیسەکە دەخاتەوە گیرفانی و دەکەوێتەوە ڕێ)بڕۆ، بڕۆ زووکە کوڕەکەم بێنینەوە.

سکاپن: (بەدوایدا دەڕوا) ئاه، گەورەم!

ژێرونت: چی بوو؟

سکاپن: ئەی کوا پارەکە؟

ژێرونت: ئەی نەمدایتێ؟

سکاپن: نەخێر، خستتەوە گیرفانت.

ژێرونت: ئاه خەم و خەفەت دڵی گرتووم!

سکاپن: دیارە !

ژێرونت: چۆن هەڵەی واتان کرد سواری ئەو کەشتییە بوون ؟ ئاه کەشتی لەعنەتی، بە نەعلەت بیت تورکی ناپاك.

سکاپن: (تەنیایە) ناتوانێ دان بە خۆیدا بگرێ بۆ ئەو پێنج سەد ئەکوەی لێم سەندووە، بەڵام هێشتا وازی لێ ناهێنم دەبێ پێش ئەوەی کوڕەکەی بۆ بێنمەوە بڕە پارەیەکی دیشی لێ بەردەمەوە.

**دیمەنی هەشتەم:**

**ئاکتاڤ – لێیاندەر – سکاپن**

ئاکتاڤ: ها، سکاپن پلانەکەت سەری گرت؟

لێیاندەر: تۆ، بۆ ڕزگارکردنی عەشقەکەم لەو بەڵایە هیچت بە هیچ کردووە؟

سکاپن: (بە ئاکتاڤ دەڵێ) ئەمە ئەو دوو سەد پەستۆڵەی لە باوکتم سەندووە.

ئاکتاڤ: ئاه چەندە دڵخۆشت کردم.

سکاپن: (بە لێیاندەر دەڵێ) بۆ تۆ چ نەمتوانی چی بکەم.

لێیاندەر: (دەیەوێ بڕوات) جا دەبێ خۆم بکوژم

ئەگەر زێربینێتم لەدەست بچێ ئیدی من ئومێدی چیم بە ژیان دەمێنێ.

سکاپن: هەیهای هەیهای ئارامت بێ! ئاوا زوو ژیانتان لێ تاڵ دەبێ؟

لێیاندەر: (ئاوڕ دەداتەوە) دەتەوێ چی بکەم؟

سکاپن : وەرە، پارەکەی تۆیشم پێ یە.

لێیاندەر: (دەگەڕێتەوە) ئاه ! ژیانی منت کڕیەوە.

سکاپن: بەڵام بە مەرجێك ڕێگام بدەی، بەرامبەر بەو خراپییەی باوکت بەرامبەر من نواندی تۆڵێیەکی بچووکی لێ بکەمەوە.

لێیاندەر: چی دەکەی بیکە.

سکاپن: ئەوە ئاکتاڤ شاهێدە خۆ ڕێگات پێدام؟

لێیاندەر: بەڵێ!

سکاپن: بگە ئەمەش پێنجسەد ئەکوەکەی تۆ.

لێیاندەر: با بڕۆم بەم پارەیە چارەیەکی خۆم بکەم.



## پەردەی سێیەم

**دیمەنی یەکەم:**

**زێربینێت – هیاسنت – سکاپن – سیلڤستەر**

سیلڤیستەر: بەڵێ، دڵدارەکانتان لە نێوان خۆیاندا بڕیاریان داوە، لەگەڵ یەکدا بژین و ئێمەش بە پێی فەرمانەکانی ئەوان بجولێینەوە.

هیاسنت: ئەو فەرمانانە بەلای منەوە زۆر ئاساییە من بە خۆشحاڵییەوە ئەو دۆستایەتیەی وەردەگرم و هیچ بەلامەوە گرنگ نییە دۆستایەتییەکەی ئەویش وەك دۆستایەتی هەموو برادەرەکانی دیم دێتە پێش چاو.

زێربینێت: منیش بە پێشنیازەوە قایلم. من لەو کەسانە نیم یەکێ دەستی دۆستایەتیم بۆ درێژ بکات و منیش لە دواوە پێیوە بدەم.

سکاپن: ئەی ئەگەر بۆ عەشقبازی رووتان تێ بکەن؟

زێربینێت: عەشق شتێکی دیکەیە، ئەو کاتە مەترسی زۆر تری تیایە و زۆر باکم پێ نییە.

سکاپن: ئەوەی ئەربابی من لەبەر خاتری تۆ کردوویەتی تۆ دەبێ شانازی پێوە بکەیت و لا لە عەشقەکەی بکەیتەوە.

زێربینێت: ئەوەی ئەو بۆ منی کردووە، بۆ تەواو دڵنیابوونی من بەس نییە. ڕاستە من خولق و خۆیەکی خۆشم هەیە و هەموو دەمێ پێدەکەنم، بەڵام لە هەمانکاتدا لە هێندە مەسەلان زۆر جدیمە ئەربابت ئەگەر وا بیردەکاتەوە بە کڕینی من بە ماڵی خۆی بزانێ ئەوە بە هەڵەدا چووە. دەبێ جگە لە پارە گرنگی بە شتێکی دیش بدات تا بە ئارەزووی دڵی ئەو لای لێ بکەمەوە دەبێ دیارییەکی دی عەشقم پێ ببەخشێ دیارییەك، کە لەسەر ڕێ و شوێنێکی پێویست و شیرین بێ.

سکاپن: ئەویش هەر ئەوەی دەوێ جگە لە پاراستنی ڕێزو ئابڕووی تۆ چ مەبەستی دی نییە، ئەگەر مەبەستی دیکەشی هەبێ، پیاو نەبم گەر خۆم تێ هەڵنەقورتێنم.

زێربینێت: من باوەڕ بەم قسانەت دەکەم، بەڵام بیر لەوە دەکەمەوە بـاوکی دەیـەوێ کۆسـپ بخاتە ڕێگامانەوە.

سکاپن: ئێمەش بۆ لابردنی ئەو کۆسپانە ڕێگایەك دەدۆزینەوە.

هیاسنت: چارەنووسمان یەکە دەبێ بێنە هانامانەوە، ئێمـە هـەردووکمان کەوتوینەتـە یـەك بێزاری و هەراسانی یەوە و هەردووك تووشی ئەم بەدبەختی یە بووینە.

زێربینێت: تۆ لە من باشتری هەر نەبێ دەزانی لە کوێ لە دایـك بوویـت و دایـك و باوکـت کێن و یارمەتیت دەدەن و زەماوەندەکەتان بە دڵخۆشییەوە بەڕێوە، بەڵام من چ یـارو پـشتیوانم نینە و لە وەزعێکی وام کە جگە لە ماڵ و سامان نەبێ هیچ شتێ نی یـە تـووڕەیی و دڵڕەقـی باوکم بتوێنێتەوە.

هیاسنت: بەڵام تۆش ئەوەت هەیە، ئەو کەسەی تۆ خۆشـت دەوێ، چـاکە خـەریکی کیـژان نییە خەریکی هیچ نییە.

زێربینێت: دڵ گۆڕینی ئاشق جێگای ترس ونیگەرانی نییە. زۆر ئاسایی یـە بـۆ ئـەوەی تـا ئەوەی دەستی کەوتووە پارێزگاری لێ بکات، بۆئەوەی دالّدەی بدات، بـەڵام ئـەوەی مـن ترسـم لێیەتی دەسەڵاتی باوکەو بەرامبەری هیچ ناکرێ بێ سوودە.

هیاسنت: ئەفـسووس! بۆچـی هەمیـشە وا کۆسـپ دەخەنـە ڕێـی هەسـت و سـۆزی پـاك؟ عەشق،چەندە خۆشە بە مەرجێ بچووکترین بەربەست نەخەنە نێوان دوو دڵان.

سکاپن: گاڵتە دەکەی، ئاسایشی خەیاڵ لە عیشقدا، نائارامییە دڵخۆشی و پێکبڕانمان ماندوومان دەکا تا دەیگەینێ هەورازو نشێو لە ژیاندا هەر هەیە و ئەو تەنگ و چەڵەمانەشی دێنە ڕێمانەوە، گەرم و گوڕی شادییەکانمان زیاتر دەکات.

زێربینێت: خوایە، سکاپن دە کەمێك باسی ئەو فێڵانەمان بۆ بکە، کە بۆ پارە بەردانەوە لە پیرە ئەربابە خنس بە چەکەت بەکارت هێنابوون دەڵێن زۆر خۆش و عەنتیکەن دەزانی، ئەگەر یەکێ هەقایەتێکم بۆ بگێڕێتەوە مەگەر چۆن دەنا زوو لە بیرم دەچێتەوە، بەڵام ئەگەر یەکێ شتێکی خۆشم بۆ بگێڕێتەوە و دڵخۆشم بکات پاداشتێکی چاکی دەدەمێ.

سکاپن: ئەوە سیلڤیستەر ئەوە لە من چاکتری لێ دەزانی با بەسەرهاتەکانت بۆ بگێڕتەوە من نیازی تۆڵەیەکی بچووکم هەیە، دەڕۆم لەززەتەکەی دەچێژم.

سیلڤیستەر: بۆچی چێژ لە شەڕفرۆشی وەردەگری؟



سکاپن: من وام گەر خۆم تێکەڵ کاری بەد بکەم دڵخۆش دەبم.

سیلڤیستەر: من، پێشتریش پێم وتوی، ئەگەر بە قسەی من دەکەی واز لەم کارەت بێنە.

سکاپن: نا، من خۆم حەز دەکەم.

سیلڤیستەر: چ فکرێکی شەیتانی وا چۆتە کەللەتەوە؟

سکاپن: جا ئەو فکرە شەیتانی یە بۆ نارەحەتی کردووی؟

سیلڤیستەر: ئەوەی من بزانم تۆ دەتەوێ هەروا لە خورت و خۆرایی خۆت بخەیتە بەر ڕەحمەتی قامچی.

سیلڤیستەر: ڕاست دەکەی، تۆ شانت داوەتە بەر هەر ئیشێك کە خۆت دڵت بیخوازێ.

سکاپن: ئەو جۆرە مەترسییانە لە کارەکەم پەشیمانم ناکاتەوە. من نەفرەت لەو کەسە ترسنۆك و بێ غیرەتانەش دەکەم، کە لە ترسی ئەوەی نەوەکو کۆسپێکیان بکەوێتەڕێ دەستیان چ ئیشان ناگرێ.

زێربینێت: ئێمە پێویستیمان بە چاودێری تۆ هەیە.

سکاپن: بڕۆن، زوو دەگەڕێمەوە لاتان با وانەزانێ یەکێك هەروا لە خۆیەوە دەیـەوێ ناپـاکی لەگەڵدا بکات و نهێنییەکانی وەدەربخا، نابێ کەس پێی بزانێ.

**دیمەنی دووەم:**

**ژێرونت — سکاپن**

**(سکاپن کیسەیەکی بەدەستەوە گرتووە)**

ژێرونت: ها، سکاپن، مەسەلەی کوڕەکەم گەیشتە کوێ؟

سکاپن: کوڕەکەتان گەورەم؟ جێگاکەی باشە، بەڵام ئێـستا گـەورەترین مەترسـی دونیـات هاتۆتە ڕێ و من وای بە چاك دەزانم، کە تۆ ماوەیەك لە ماڵ نەیێتە دەرەوە.

ژێرونت: چی بکەم، سکاپنی خۆشەویست؟

سکاپن: گەورەم، نازانم بەڵایەکی سەیرە لەبـەرتۆ سـەرتاپای گیـانم دەلـەرزی و... ووریـای خۆت بە (وەردەچەرخێ، خۆی وا پیشان دەدا کە بـەرەوکۆتایی تەختـەی شـانۆکە دەڕواو بزانـێ کەس لەوێ نییە)

ژێرونت: (دەلەرزی) ها؟

سکاپن: (دەگەڕێتەوە) نا، نا، نا، کەس لێرە نییە.

ژێرونت: پێت ناکرێ ڕێگەیەك بدۆزیتەوە لەم دەردەسەری یە ڕزگارم بکەی؟

سکاپن: من چارەیەکم بە خەیاڵ دا دێت، بەڵام ترسی ئەوەم هەیە، خۆم تیایدا بکوژرێم

ژێرونت: ئاها! سکاپن! تۆ خزمەتکارێکی بەوەفای ڕزگارم بکە، تکات لێ دەکەم!

سکاپن: قبوڵە بەهۆی ئەو پەیوەندییەی لەنێوانماندا هەیە خۆیشم ڕازی نابم وا بە تەنیا لەم ناوە جێت بهێڵم.

ژێرونت: پاداشتت دەدەمەوە بەڵێن بێ ئەم جلانەم تۆزێکی دی کۆنتر بێ دەتدەمێ.

سکاپن: سەیرکە، ئەمە (ئیشارەت بۆ کیسەکە دەکات)بۆ ڕزگاربوونی تۆ زۆر چاکە تۆ دەبێ بچیتە نێو ئەم کیسەوە.

ژێرونت: (وادەزانێ یەکێ بینیویەتی) ئاها!

سکاپن: نا، نا، نا! کەس نییە تۆ دەبێ بچیتە نێو ئەم کیسەیەوەو دوژمنەکانت دا دەبەم و دەتگەیێنمەوە ماڵەوە کە گەیشتینەوە ماڵەوەش دەتوانین پەسارگەیەك دابمەزرێنین و بە دووی چەند کەسێکدا بنێرین بێنە هاریکاریمان.

ژێرونت: فێڵێکی چاکە.

سکاپن: فێڵی وا هەرنییە، دەبینی ! (لەگەڵ خۆیدا) تاوانی هەڵخەڵەتاندنی خۆت دەخەیتە شەستۆی منەوە!

ژێرونت : ئاها!

سکاپن : دڵنیام دوژمنەکانت هەموویان بەوە هەڵدەخەڵەتێن تۆ لە نێو کیسەکە ئارامت بێ و بە تایبەتی وریای ئەوەبە خۆتیان پێ نیشان نەدەی هەرچی یەك بوو جووڵەنەکەی.

ژێرونت : ئەوەیان وازی لێ بێنە بۆ خۆم، خۆم دەزانم بە چ جۆرێك...

سکاپن : خۆت بشارەوە! یەکێ لە پیاو کوژەکان لێت دەگەڕێ (دەنگی خۆی دەگۆڕێ) چییە کەس غیرەتی نییە لە کوشتنی ئەو ژێرونتە بە جواب بێت، یانی بە پرسیارانیش نادۆزرێتەوە پێم بڵێ ئەو بێ مەعریفەتە لە کوێیە ؟ (بە دەنگی خۆی ژێرونت دەڵێ) مەجوڵێوە، (دەنگی خۆی دەگۆڕێ) بەناوی خوا لە ژێر عەرزیش بێ دەری دێنم (بە دەنگێکی ئاسایی بە ژێرونت دەڵێ)خۆتیان پێنیشان مەدە (ئەو قسانەی بەدەم پیاو کوژەکەوە دەیوتن بە دەنگێکی گۆڕاوو ئەوانی دی بە دەنگی خۆی دەیوتن) " هۆی کابرای کیسە بەشان — بەڵێ میسۆ



- ئەگەر پێم بڵێی ئەو ژێرونتە لە کوێیە یەك (لویی)ت دەدەمێ.

- ئێوە لە ژێرونت دەگەڕێن؟

- ئەستەغفیروڵڵا! بەڵێ! لەو دەگەڕێم.

- چ ئیشت پێیە میسۆ؟ — چ ئیشت پێیەتی؟

— بەڵێ

- دەمەوێ ئەوەندەی قامچی لێدەم تا دەیکوژم ! ئەرێ بە ناوی خوا — ئاخ مسیۆ قامچی کاری تێ ناکا سەرەڕای ئەوەش ئەو کابرایەکی وا نییە تۆ بەم شێوەیە لەگەڵیدا بجوڵێیتەوە

— کێیە ئەو ژێرونتە دەبەنگە ئەو هیچ و پووچە ئەو گەدایە؟

- مسیۆ، مسیۆ ژێرونت نە دەبەنگەو نە نە هیچ و پووچە و نە گەدایشە، تۆزێك بە ئەدەبەوە قسە بکە.

- چۆن ! لەسەری بە جواب دێ ؟ بەرامبەرمان قەپۆزت دەردێنێ؟ ئێ پێویستە لەسەر من کە کابرایەکی بەشەرەف بە بێ ڕێزی باسی بکرێ، دەبێ بەرگری لێ بکەم.

- کەوابێ تۆ لە برادەرەکانی ئەو ژێرونتەی؟

- بەڵێ مسیۆ، من برادەری ئەوم — ئاه وەڵڵاهی مادام برادەری ئەوی، پێ خۆشحاڵم (بە قامچ- یان وەردەگەڕێتەوە سەر کیسەکە) بگرە!بگرە! لەبەر خاتری ئەو ئاه! ئاه! ئاه! هێواش! ئاه!

— بڕۆ ئەو دیاریانەی لەمنەوە بۆ ببە! گێلە!

ئاه! (گاسکەون؟) (١٦) نەعلەتی شەیتانت لێبێ! ئاه! ئاه! (لە کاتێکدا ناڵە دەکا دەستی بە پشتیشی دا دێنێ وەك بڵێی قامچییەکان بەر ئەو کەوتبن).

ژێرونت: (سەری لە کیسەکە دەردێنێ) - ئاه! سکاپن، من لەوە زیاتر خۆم بۆ ناگیرێ.

سکاپن: ئاه !گەورەم! هوردو پوردیان کردم، شانم ژان دەکا

ژێرونت: چۆن ! ئەو لە پشتی منی دەدا.

سکاپن: نەخێر گەورەم ئەو لە پشتی منی دەدا.

ژێرونت: ئەوە تۆ دەڵێی چی؟ من زۆر چاك هەستم بە لێدانەکانی دەکردو ئێستاش وا جێگەکەی ژان دەکا.

سکاپن: نا، تەنها قامچییەکانی دوایی بەرپشتی تۆ کەوتن.

ژێرونت: تۆ، دەبێ بۆ چاودێری من هەندێکی دیکەش، دوورتر بڕۆی.

سکاپن: (ناچاری دەکا سەری بخاتەوە نێو کیسەکە) وریابە! ئەوەتا یەکێکی دی یان بەوان دەچێ غەریب دیارە. (ئەمەش بە زمانی ئاسکۆتییەکان دەدوێ) خۆ مردم ئەوەندەی بگەڕێم ئەو ژێرونتە نەعلەتییەم هەر نەدۆزییەوە!

(بە ژێرونت دەڵێ) خۆت بشارەوە.

— هۆی کابرا بێ زەحمەت ئەگەر دەزانی پێم بڵێ ئەو ژێرونتە، کە من لێی دەگەڕێم لە کوێیە گیانەکەم بەڕاستیم پێ بڵێ ئیشێکی ئەوتۆم پێ نییە تەنها حەز دەکەم دوازدە تاکە قامچی لە پشتی بدەم سێ چوار زامی بچووکیشی لە تەختی سنگی بە شمشێر بۆ بنەخشێنم. - مسیۆ باوەڕ بکە من نازانم لە کوێیە.

— لە پێش چاوم شتێك لە نێو ئەم کیسەیە دەجوڵێتەوە بۆ ئەوەی دڵمان ڕەحەت بێ هیچی تێدا نییە شمشێرێکی لێدەم

— (بە ژێرونت دەڵێ) گەورەم وریابە سەری کیسەکە تۆزێ واڵا بکەرەوە بزانم چی تێدایە

— بوەستە مسیۆ

— چۆن بوەستم؟ ناتەوێ بزانی چی تێدایە؟

— بەڵێ دەمەوێ بزانم چی تێدایە.

— هیچی تێدا نییە.

— هەیهوو ئەمەیان خۆشە

— جل و بەرگی خۆمن

— پێت دەڵێم پێشانم بدە.

— پێشانت نادەم

— پێم پێشان نادەی؟

— نا! ئەم قامچییەت لە پشتی ورد دەکەم!

— من پێکەنینم بەم شتانە دێت

— ئاوا! پێکەنینت بە ئیشەکانی من دێت؟ ئێستا پێت دەڵێم

— ئاه! ئاخ! ئاخ!

— باشە! ئەمە دەرسێکی بچووك بوو بۆ ئەوەی لە بیر نەکەی جارێکی دی دەبەنگی وا بکەی!

— ئاه! یاخوا بمری، زمانت بە برین بچێ ئاه!



ژێرونت: (سەری لە کیسەکە دەردێنێ) ئاه! گشت گیانم ورد بوو.

سکاپن: خۆ من مردم.

ژێرونت: ئەوە خۆ هەموویان لەپشتی مندا! نەعلەتیانە!

سکاپن (سەری ژێرونت دەخاتەوە نێو کیسەکەوە) وریابە دوو سەربازی تر پێکەوە هاتن (لە چاو سەربازەکان دەکاتەوە) با بچین هەوڵدەین ژێرونت بدۆزینەوە هەموو جێگایەك بگەڕێین.

دریغی نەکەین. ڕاکەین بۆ هەموو لایەك، بچینە کوێ ؟ بەم لایە بسوڕێینەوە، نە، بەم لایە، بەلای چەپ، بەلای دەستە ڕاست دا، نەخێر.

(بە ژێرونت دەڵێ) باش خۆت بشارەوە.

ئاه ! برادەران ئەمە خزمەتکاەکەیەتی ! یاڵڵا! دەبەنگ! ئەربابەکەتمان پێ نیشان بدە، کوانێ! زووکە !

— ئاخ بەڕێزان! ئازارم مەدەن.

یەڵلا قسە بکە کوانێ ! قسە بکە! خێراکە! خێراکە!

- بەڕێزان هێواش کەن!

(ژێرونت بە هێواشی سەری لە کیسەکە دەردێنێ و چاوی بە فڕوفێڵەکانی سکاپن دەکەوێ)

ئەگەر هەر ئێستا ئەربابتمان بۆ نەدۆزیتەوە خۆت لەبەر ڕەحمەتی قامچی دەبینییەوە

- من ئامادەنیم هەموو شتێکتان بۆ بکەم بۆ ئەوەی ئەربابم بدۆزنەوە.

- ئێمە ئێستا مەبەستی کوشتن لێت دەدەین!

- هەرچییەك دەکەن بیکەن!

- تۆ وادیارە حەز دەکەی کوتەك بخۆی؟

- من بە هیچ شێوەیەك ناپاکی لەگەڵ ئەربابی خۆم ناکەم.

- وا دیارە حەز دەکەی تامەکەی بچێژی؟ ئەمانە..

- ئاخ! (کاتێك خۆی ئامادە دەکات لە ژێرونت بدات، ژێرونت لە کیسەکە دێتە دەرەوە، سکاپن هەڵدێت.)

ژێرونت : ئاه، ڕیسوا! ئاه، ناپاك حەیوان! بە فێڵان من دەکوژی!

**دیمەنی سێیەم:**

**زێربینێت — ژێرونت**

زێربینێت: (ژێرونتی نەدیوە) — ئاه! ئاه! حەز دەکەم تۆزێك هەواکە بگۆڕم.

ژێرونت: (وا دەزانێ تەنیایە) بەڵێن بێ دوایی ئەم تۆڵەیەت لێ بکەمەوە.

زێربینێت: (ژێرونتی نەدیوە) ها! ها! ها! چیرۆکێکی بە لەزەتە! پیرەمێردێکی ساویلکەو هەڵخەڵەتاوە !

ژێرونت : هیچ شتێکی وا سەیر لەم ناوە نییە پێی بکەنی.

زێربینێت : چی ؟ دەڵێی چی مسیۆ؟

ژێرونت :دەمەوێ پێت بڵێم گاڵتە بە من مەکە.

زێربینێت: تۆ؟

ژێرونت: بەڵێ!

زێربینێت: چۆن؟ کێ گاڵتەی بە تۆ کردووە؟

ژێرونت: چۆنی هاتوویتە ئێرە، بەڕیشی من پێبکەنی؟

زێربینێت: ئەوە هیچ پەیوەندییەکی بە تۆوە نییە. من بۆ خۆم بەو چیرۆکە پێ دەکەنم، کە بۆیان گێڕامەو چۆن کوڕێك بۆ پارەبەردانەوە لە باوکی فێڵی لێ کردبوو. خۆشترین شتێك بووە، ئەشێ لەبەرئەوەش وا بڵێم چونکێ قازانجی خۆمی تێدابوو!

ژێرونت: بە فێڵێك کوڕەکەی بۆ پارەبەردانەوە لە باوکی کردبووی؟

زێربینێت: بەڵێ ئەگەر تۆش هەر سووری لەسەری ئەوە، ئەوا شتەکەت لە نووکەوە بۆ دەگێڕمەوە دوایش من هەر خۆم حەز دەکەم، ئەوەی بیستوومە بۆ خەڵکی بگێڕمەوە.

ژێرونت: تکات لێ دەکەم ئەو داستانەم بۆ بگێڕەوە.

زێربینێت: حەز دەکەم، منیش حەز دەکەمکێڕانەوەشی بۆ یەکێکی وەك تۆ چ مەترسی تێدا نییە، بۆیەش وا دەڵێم چونکێ کارەساتێکی وایە ماوەیەکی زۆری بەسەردا تێ نەپەڕیوە....چارەنووس وا ڕێکەوت کە بکەومە نێو کۆمەڵی کەسەوە کە بە دۆم و قەرەج ناودەبرێن و لەملاو لەولا دەمێننەوەو دەواریان دەخەن جا ئیتر لە هەر کوێیەك بێت. کە گەیشتمە ئەم شارە کوڕە لاوێك منی بینی و عاشقم بوو، لە بەرایێ دا ئەویش وەك هەموو گەنجەکانی دی بیری لەوە دەکردەوە هەقی لەسەر هیچ نەبێ، بێت چەند قسەیەکم بۆ بکاو ئیشەکەی بۆ بچێتە سەر. بەڵام



لەبەردەم من تووشی لە خۆیایی بوون بووو ناچار بوو ئەو فیکرەیەی لە ئەرەتادا بیری لێ دەکردەوە نەختێ هەولێ زیاتری بۆ بدات. هەڵسا چوو ئەو هەستەی بەرامبەر بەمن هەیبوو لای خزم و کەسەکانم خستیەڕوو ئەوانیش وتیان بەمەرجێ کچەکەت دەدەینێ بڕە پارەیەکمان بدەیێ، بەڵام ئیشەکە وا ڕێکەوت دڵدارەکەم لە بارو دۆخێکی وا دابوو. وەك چۆن زۆربەی گەنجی خێزانەکانی دی تێیدانە، یانی بێ پارە بوو. باوکیشی کەم و زۆر پارەی هەبوو، بەڵام بێ ئەندازە چاوچنۆك بوو یەکێ بوو لە خنس بەچەترین کەسانی جیهان! تەماشا کە ها، ناوەکەیم بە بیرنایێتەوە ها! تۆیش نەختێ یارمەتیم بدە، ناتوانی ناوی کەسێ بڵێی لەم شارە وا بەو ئەندازە خنس بەچە بێت!

ژێرونت: نەخێر

زێربینێت: ناوەکەی رن.. رونتی تێدایە.. ئور.... ئورونت نە...ژێرونت.. بەڵێ ژێرونت! خۆیەتی دۆزیمەوە، با بگەڕێینەوە سەر داستانەکەی خۆمان، خزم و کەسەکانم ئەمرۆ دەیانەوێ لەم شارە باربکەن و دڵدارەکەشم، بۆ پارە پەیدا کردن سەری کردووە بە هەموو لایەك داو ئەگەر زیرەکی خزمەتکارەکەی نەگاتە دادی و پارەکەی بۆ لە باوکی نەسێنێ، ئەوا منی لە کیس دەچێ. ناوی خزمەتکارەکەیم چاك لە بیرە، ناوی ئەو کابرا بێ هاوتایە "سکاپن"ە، پیاوێکی وایە شایانی هەموو جۆرە ڕێزو هێژاییەکە!

ژێرونت: (لەگەڵ خۆیدا) ئاخ ! کەوابێ ئەوە تۆ بوویت دەبەنگ!

زێربینێت: ئەو ڕێگەیەی پیرەمێردی پێ هەڵفریواند بوو ها! ها! ها! هەرکە بیرم دەکەوێتەوە هەر ئەوەتا ناپچڕێم لە پێکەنین ها! ها! ها! چوو بوو ئەو سەگە چاوچنۆکەی دۆزیبۆوە، ها! ها! ها! پێی وتبوو، کە لەگەڵ کوڕەکەی ئەو پیاسەیان کردووە هێ! هێ! کەشتییەکی تورکی یان بینیوە و ئەوانی بۆ سواربوونی کەشتییەکە داوەت کردووەو لاوە تورکەکە لەوێ نانی عەسری داونەتێ و ها ! کە ئەوان خەریکی نان خواردن بوونە، کەشتییەکەی خستۆتە گەڕو دوایی ئەوی بە گەمەیەکی بچووك ڕەوانی وشکایی کردۆتەوە تا بە باوکی ئەربابەکەی ڕابگەبەنێ کە ئەگەر دەم و دەست پێنج سەد ئەکوی بۆ نەنێرێ، کوڕەکەی لەگەڵ خۆی دەباتەوە جەزائیر ها! ها! ها! جا ئەو بەرازە پیسە ئەو کابرا چاوچنۆکە لە ترسان و لە خەفەتان و لەبەر خۆشەویستی کوڕەکەی بەو چاوچنۆکی یەی خۆی هەولێکی عەنتیکەی داوە داواکردنی پێنج سەد ئەکو بەلای ئەوەوە وەك لێدانی پێنج سەد مست وابووە! ها! ها! ها! هەر چییەکی کردووە نەیتوانیوە بڕیاربدا و دڵی لەو پارەیە بێتەوە، بیری لەسەد ڕێگەی سەیر کردۆتەوە بۆ ئەوەی دووبارە کوڕەکەی دەست کەوێتەوە. ها! ها! ویستویەتی لە نێو

دەریا دا یاسا بنێرێتە سۆراغی کەشتی یە تورکی یەکە، ها! ها! ها! خزمەتکارەکەی ناچار کردووە کە خۆی بچێتە جێگای کوڕەکەی تا ئەو کاتەی ئەو پارەیەی کە نیازی نەبوو بیدا، بۆی ئامادە دەك ها! ها! ها! لە جیاتی پێنج سەد ئەکو چوار پێنج دەستە جلی کۆنەی خۆی، کیە هەموو سی ئەکوی نەدەهێنا، دابوویە خزمەتکارەکەی ها ! ها ! ها! خزمەتکارەکەشی بۆ فێڵە هەڵبەستراوەکانی هەرجارەی بە هانەیەکی دی بۆ دودۆزیەوە، کە چ پەیوەندییەکی بە پێشنیازەکانی ئەوەوە نەبوو. بەڵام ئەو کردی سواری ئەو کەشتییە بوون! ئاها! کەشتی نەعلەتی، تورکی ناپاك.

سەرەنجام دوای بێنەو بەردەیەکی زۆر، دوای ماوەیەك ئـاه و ناڵـە... بـەڵام تـۆ وا دیـارە بـەم داستانەی من پێکەنینت نایێ ؟ ڕات لەم بارەیەوە چییە؟

ژێرونت: بە ڕای من، کوڕە لاوەکە فێڵبازو بێ شەرم و بێ ئابڕوویەکی ئەوتۆیە، کـە چـووە ئـەو کردووەو دەبێ لە لایەن باوکییەوە سزا بدرێ کیژە دۆمەکەش کیژێکی بێ بێ ئابڕوو بێ حەیایە، کە بە پیاوێکی وا بەڕێز دەڵێ نارەسەن و بەمەوە وا پیشان دەدا جگە لە سووککردنی کوڕی خـەڵکی چ ئیشی دی نییە، خزمەتکارەکەشیان پەندێکی ئەوتۆی بە ژێرونت کردووە نابێ بگاتە سبەینێ دەبـێ بچێت ژێر ڕەحمەتی دارەوە.

**دیمەنی چوارەم:**

**سیلڤستەر - زێربینێت**

سیلڤیستەر: بۆچی دەتەوێ ڕابکەیت؟ ئەی تۆ ناتەوێ لەگەڵ باوکی دلّدارەکەت قسە بکەی؟

زێربینێت: من خۆم ئەوم بەرامبەر بە خـۆم بـە دیـن کـرد بـێ ئـەوەی بیناسـم چـوومە لای و داستانەکەم بۆ گێڕایەوە!

سیلڤیستەر : چۆن! داستانەکەی خۆی؟ خۆش بوو، ئەوەندە حەزم دەکرد بیگێڕمەوە.

زێربینێت: بەڵێ! داستانەکەم ئەوەندە لە لا خـۆش بـوو و ئەوەنـدە حـەزم دەکـرد بیگێڕمـەوە خەریك بوو ئاگرم تێ بەردەبوو، بەڵام بە کەڵکی چی دێ؟ لەگـەڵ ئـارەزووی ئـەو نـەدەگونجا، مـن خەیاڵما نایێت ئەم بەسەرهاتە بتوانێ گۆڕانێك بخاتە ئەو بارودۆخەی ئێمەوە!

سیلڤیستەر: تۆ دەزانی چەند زۆر بلّێی ئەگەر زمانت بوەستایە سەریشت ڕەحەت دەبوو.

زێربینێت: بۆ مەگەر ئەو بەسەرهاتە کەسی دی نەیبیستووە؟



**دیمەنی پێنجەم :**

**ئارگانت — سیلڤیستەر**

ئارگانت : هەهۆی ! سیلڤیستەر !

سیلڤیستەر: (بە زێربینێت دەڵێ) تۆ بڕۆوەماڵەوە من ئەربابم بانگم دەکا.

ئارگانت: ئێوە لەگەڵ یەك ڕێککەوتوون، دەبەنگ! سکاپن و تۆو کوڕەکەم. لەگەڵ یەك ڕێککەوتوون من هەڵخەڵەتێنن وا دەزانی من بەرگەی ئەم هەموو شتە دەگرم؟

سیلڤیستەر: گەورەم، ئەگەر سکاپن لۆ خۆی تۆی هەڵخەڵەتاندبێ من گوناهم چییە بەڵێنیشت پێ دەدەم من بە هیچ شێوەیەك هاوکاری ئەوم نەکردووە.

ئارگانت: باشە! دەبینین هەی جەردە! دەبینی! من مافی کەس پێ شلّ ناکەم.

**دیمەنی شەشەم :**

**ژێرونت — ئارگانت — سیلڤیستەر**

ژێرونت: ئای مسیۆ ئارگانت، کارەساتێکی زام بەسەر هاتووە لە پەل و پۆی خستوومە!

ئارگانت: منیش دووچاری داماوی و نەفرەتییەکی وا بوومە!

ژێرونت: سکاپنی تڕوهات، بە فێڵان پێنج ئەکوی لەمن بەرداوەتەوە.

ئارگانت: هەر ئەو ڕێگرە بە فێڵان سەد پێستلّیشی لە من بەرداوەتەوە.

ژێرونت: جا بە وەرگرتنی پێنج سەد ئەکوەش دلّی ئاوی نەخواردۆتەوە، کارێکی وایشی پێ کردم شەرم دەکەم بیگێڕمەوە بەڵام تۆڵەکەی هەر لێ دەکەمەوە.

ئارگانت: حەز دەکەم پێم بلّێ مەبەستی چی بوو لەو شتەی بەرامبەر بە من کردی!

ژێرونت: منیش دەبێ تۆڵەیەکی وای لێ بکەمەوە بۆی ببێ بە پەند!

سیلڤیستەر: ئینشاڵڵا، من بەر ئەو ناکەوم

ژێرونت: مسیۆ ئارگانت هەر ئـەوە نییـە ئێمـە هەمیـشە بەدبـەختیمان لێ نـابڕێ یـەکێ پێشەنگی ئەوەی دی یانە. منیش تا ئەمڕۆ خۆم بـە کـچێکەوە خـەریك کـرد بـو، بـاش بـوو فەرامۆشییەکەی پێ دەبەخشیم، بەڵام ئێستا بیستوومە کە ئەویش ماوەیەکی زۆرە لـە تارانـت نەماوەو شکم بۆ ئەوە دەچێ ئەگەر ئەو کەشتییەی ئەو سوار بووبێ، نقووم بووبێ.

ئارگانت : بەڵام باشە بۆ لە (تارانت) داتنابوو؟

ژێرونت : بۆ ئەمەیان چیت لێ بشارمەوە تێکنەچوونی وەزعی خێزانەکەم، ناچاری کرد بووم ئەو ژن هێنانەی دووەمم هەتا ئێستا ئاشکرا نەکەم بەڵام چووزانم؟

**دیمەنی حەفتەم:**

**نێرین - ئارگانت — ژێرونت — سیلڤیستەر**

ژێرونت:ها ! دایەنەکە، تۆ لێرەی؟

نێرین: (بە ئەژنۆ دەکەوێ) ئاه مسیۆ پاندەلف چ...

ژێرونت: بە ژێرونت بانگم کە، جگە لەم ناوە ناوی تارانت ئەم ناوە بـۆ خـۆم دابنـێم تـەواو بەسەرچوو.

نێرین : مخابن ئەم ناو گۆڕینەی تۆ چەندە خەم و خەفەت و ترسی دەداینێ و چەندە هەوڵمان دەدا ئەم ناوەت لێ دوورخەینەوە.

ئارگانت : کوا کچەکەم و دایکی؟

نێرین : کچەکەتان گەورەم لێرەوە دوور نی یە بەڵام پـێش ئـەوەی ببینـی دەبـێ داوای لێ بووردنتان لێ بکەم پێتان بڵێم شووی کردووە دواجار ئێمە لێرە تەنیا ماینەوە.

ژێرونت: کچەکەم شووی کردووە؟

نێرین: بەڵێ گەورەم

ژێرونت: بە کێ؟

نێرین: بە کوڕە لاوێك بەناوی " ئاکتاڤ " و کوڕی کابرایەکی ناو ئارگانت ە.

ئارگانت: چی بووە!

ژێرونت: زوو کەن خێراکەن بمبەنە لای

نێرین: هەر خۆت ماوی بچیتە لای

ژێرونت: تۆ لە پێشەوە بڕۆ مسیۆ ئارگانت تۆیش وەرە بە دوامەوە.

سیلڤیستەر: بەسەرهاتێکی سەیرە !

**دیمەنی هەشتەم:**

**سکاپن — سیلڤیستەر**

سکاپن: ها سیلڤیستەر، گەورەکانمان چی دەکەن؟

سیلڤیستەر: من دوو هەواڵم پێیە بۆ تۆ: یەکەمیان ئەوەیە ئاکتاڤ کاری تەواو بەدەرکەوت هیاسنت کیژی مسیۆ ژێرونتە و ئیشەکە وا ڕێکەوت کە باوکیان بەڕاو تەکبیری خۆیشیان



بووایە هەروایان دەویست هەواڵی دووەمیشیان ئەوەیە کە هەردوو پیرەمێرد هەڕەشەیەکی زۆر لە تۆ دەکەن، بە تایبەتی مسیۆ ژێرونت.

سکاپن : گرنگ نییە ئەو هەڕەشەیان نارەحەتم ناکا (با)یەو بە بن گوێمدا تێ دەپەڕێ!

سیلڤیستەر : وریای خۆت بە، کوڕەکان بە چاکی لەگەڵ باوکیان ڕێککەوتوونەتەوەو دوایی تۆ دەکەویتە تەڵەوە!

سکاپن: وازی لێ بێنە بۆ من، خۆم ڕێگەیەك دەدۆزمەوە..

سیلڤیستەر: خۆت بشارەوە، خەریکن بێنە دەرەوە.

دیمەنی نۆیەم:

**ژێرونت — ئارگانت — سیلڤیستەر —نێرین - هیاسنت**

ژێرونت : کچم وەرەوە ماڵێ ئەو کاتە خۆشییەکەمان تەواو دەبێ، کە دایکیشتان لەگەڵ ئێوە ببینم.

ئارگانت : ئەمەش ئاکتاڤ تەواوی لە کاتی خۆی گەیشتەجێ.

**دیمەنی دەیەم:**

**ئاکتاڤ — ژێرونت — هیاسنت — نێرین — زێربینێت - سیلڤیستەر**

ئارگانت: وەرە کوڕم وەرە با هەموومان پێکەوە بەو شادو دڵخۆش بین خودایە............

ئاکتاڤ: (هیاسنتی نەدیوە) نا بابە، پێشنیازەکانی تۆ بۆ ژن هێنـانی مـن بـە کـەڵك نـایێ دەبێ پەردە لە ڕووی هەموو شتێك لابدەم و هەموو شتێکتان پێ بڵێم.

ئارگانت: بەڵێ، بەڵام تۆ نازانی..........

ئاکتاڤ: گرنگ نییە بیزانم یان نەیزانم.

ئارگانت: حەز دەکەم پێت بڵێم کچی مسیۆ ژێرونت...

ئاکتاڤ: کچی مسیۆ ژێرونت بە کەڵکی من نایێ .

ژێرونت: ئەو.....

ئاکتاڤ: (بە ژێرونت دەڵێ) نە مسیۆ، داوای لێ بوردنت لێدەکەم من بڕیاری خۆم داوە.

سیلڤیستەر: (بە ئاکتاڤ دەڵێ) گوێ بگرە.......

ئاكتاڤ: نەخێر تۆ وس بە من گوێ لە هیچ ناگرم.

ئارگانت: (بە ئاكتاڤ) ژنت

ئاكتاڤ: نەخێر پێت دەڵێم بابە پێش ئەوەی لە هیاسنتی خۆشەویستم جیاببمەوە دەبێ بڕیاری مرگی خۆم بدەم (بە سەر شانۆدا تێدەپەڕێ تا دەچێتە لای ئەو) بەڵێ، بە چاكی تێگەیشتی گیانم بۆ ئەوە من لە هەموو ژیانمدا هەر ئەوم خۆش دەوێ و جگە لەو كەسی دیم ناوێ......

ئارگانت : زۆر باشە، ئەمەش خۆیەتی ئەوەیە كە بەتۆی دەدەن گێژەی نەعلەتی !

هیاسانت: (ژێرونتی پێ نیشان دەدا) بەڵێ ئاكتاڤ ئەمە باوكمەو دۆزیمەوە ئیدی هیچ دەردەسەری یەكمام نەما.

ژێرونت: با بچینە ماڵێ ئێمە لەوێ دەتوانین بە ئیسراحەت قسەی لێ بكەین.

هیاسنت: (زێربینیت پێ نیشان دەدا) ئاه باوكمە تكات لێ دەكەم من لەو دۆستە خۆشەویستەم مەكە بەڕاستی شایانی ئەوەیە زوتر بتناسیایە و بەختمان چاكتریش دەبووو زیاتریش خۆشت دەویست.

ژێرونت: تۆ دەتەوێ من كەسێك لەگەڵ خۆم بەرمەوە ماڵەوە ئاشقی براكەتەو نەختێ لەوە پێش هەزار جنێوو سووك و ئەتكی كردم؟

زێربینێت: گەورەم تكات لێ دەكەم ببەخشە ئەگەر دەمزانی جەنابتی، چۆن قسەی وام دەركرد. من تۆم هەر بە شوهرەتەكەتەوە ناسی بوو.

ژێرونت: چۆن بە شوهرەتەكەم؟

هیاسنت: بابە لە عەشقی لێیاندەری برام بۆ زێربینێت چ گومانی تێدا نییە بۆ زێربینێتیش ئەوا من لە داوێن پاكی ئەو دڵنیات دەكەم.

ژێرونت: ئەمەیان زۆر چاكە ! منیش هیچ مەبەستی دیكەم نییە جگە لە زەماوەندی كوڕەكەم و ئەو نەبێ نەوەك لەگەڵ كچێكی نەناس و بەرەڵلا بێ.



**دیمەنی یازدەهەم:**

**لێیاندەر — ئاكتاڤ — هیاسنت — زێربینێت —**

**ئارگانت — سیلڤیستەر — نێرین**

لێیاندەر: باوكە، هیچ پێ دڵتەنگ مەبە، كە من كچێكی نەناس و بێ ئەسڵ و فەسڵم خۆش بوێ، ئەو قەرەجانەی، كە من ئەوم لێ كڕیون، خۆیان دانیان بەوە داناوە، كە هی ئەم شارەیەو لە خێزانێكی بەڕێزیشەو تەمەنی چوار ساڵان بووە كە ئەوان دزیویانە ئەم ناونیشانەیان داومەتێ بە یارمەتی ئەم ناونیشانە دتوانم باوك و دایكی بدۆزمەوە.

ئارگانت: حەیف ئەم ناونیشانە ئەوە دەگەیێنێ، كە ئەمە كچەكەی منە لە هەمان تەمەن كە تۆ دەیڵێی بزرم كردووە.

ژێرونت: كچی تۆ؟

ئارگانت: بەڵێ ئەوە خۆیەتی چەند نیشانەیەكی هەیە كە بە تەواوی دڵنیام دەكاتەوە.

ژێرونت: خوایە بەسەرهاتێكی زۆر سەیرە.

**دیمەنی دوازدەهەم:**

**كارل — لێیاندەر — ئاكتاڤ — ژێرونت —ئارگانت - هیاسنت**

**زێربینێت — سیلڤیستەر - نێرین**

كارل: ئاه بەڕێزان ڕێكەوتێكی زۆر سەیر ڕوویدا.

ژێرونت: چی بووە؟

كارل: سكاپنی بەستەزمان!

ژێرونت: ئەو كابرا دەبەنگەی من دەمەوێ دادكاری بكەم!

كارل: ئەفسوس! گەورەم زەحمەت كاری وابكەی كە بەبەردەم بینایەكەیدا تێپەڕیوە چەكوشێكی سەنگ تاشیی بەسەردا بەربۆتەوەو ئێسكی سەری شكاندووەو مێشكی پژاندووە وا لە سەرەمەرگ دایەو داوای كردووو كە بیهێنن بۆ ئێرە پێش مردنی قسەتان لەگەڵ بكات

ئارگانت: لە كوێ یە ؟

كارل: لێرەیە......

**دیمەنی سێزدەهەم:**

**سکاپن — کارل — ژێرونت — ئارگانت و خەڵکی دی**

سکاپن: (دووکەس هەڵیان گرتووە، سەری پێچاوەتەوە وەك بڵێی بەڕاستی شەری شکاوە) ئاخ ئاخ بەڕێزان من دەمبینن؟ ئاخ ئێوە وا بەم شێوە سەیرە من دەبینن ؟ ئاخ نەمدەویست بمرم تا لە هەموو ئەو کەسانەی ڕەنجاندوومن داوای لێ بووردنیانم لێ نەکردنیایە ئاە ئاخ بەڵێ بەڕێزان پێش ئەوەی دوا هەناسە بدەم هەمووتان سوێندم بۆ بخۆن کە بەرامبەر هەموو ئەو کارانەی لەگەڵم کردوون لێم دەبوورن بە تایبەتی مسیۆ ئارگانت و مسیۆ ژێرونت ئاخ.

ئارگانت: من بە نیسبەت خۆمەوە لێت خۆش دەبم، برۆ بە ئیسراحەتی خۆت بمرە.

سکاپن: (بە ژێرونت دەڵێ) گەورەم من زۆر تۆم ڕەنجاندووە بە لێدانە قامچیانەی کە......

ژێرونت: لەوە زیاتر مەدوێ منیش لیێت خۆش دەبم.

سکاپن: بەڕاستی لێدانی ئەو قامچیانە بۆ من نەنگییەکی گەورە بوو.

ژێرونت: ئەم شتە لە بیربەرەوە...

سکاپن: لەم سەرەمەرگەدا وەشاندنی ئەو قامچیانە زۆر ئازارم دەدا کە..

ژێرونت: ماشەڵڵا، دە وس بە..

سکاپن: ئەو قامچییە شوومانەی کە من لە تۆم....

ژێرونت: بیبڕەوە پێت دەڵێم من ئەم شتانەم هیچی لە یاد نەماون.

سکاپن: حەیف چ گەورە بوون دڵ گەروەیی خۆتە گەورەم کە وا لە لێدانی ئەو قامچیانەم دەبووری ئەو قامچیانەی کە....

ژێرونت: ئاە بەڵێ باچیدی لەسەری نەڕۆین! من بەیەکجاری لێت دەبوورم ئەمە شتێ بوو ڕۆیشت..

سکاپن: ئاە گەورەم دوای ئەم گفتوگۆیە بە ڕاستی من خۆم بە هەست لاواز دەزانم.

ژێرونت: بەڵێ بەڵام لەبەرئەوەی تۆ دەمری من لێت خۆش دەبم.

سکاپن: چۆن گەورەم ؟

ژێرونت: ئەگەر تۆ لەسەر مەرگ بگەڕێیتەوە منیش لە بەڵێنەکەی خۆم پژێوان دەبمەوە.

سکاپن: ئاخ ئاخ  کەوابێ دووبارە سووك دەبمەوە.



ئارگانت: مسیۆ ژێرونت بە شوکرانەی ئەم شادییەوە دەبێ بە بێ چەندو چۆنی لێی خۆش بی.

ژێرونت: باشە

ئارگانت: با بچین پێکەوە نانەکەمان بخۆین تا چاکتر لەززەتی دڵخۆشییەکەمان بچێژین.

سکاپن: جێی منیش لە لایەکی مێزەکە بکەنەوە تا زووتر چاوەڕوانی مردن بکەم.

کۆتایی

## پلاتۆنۆڤە شێت

### شانۆنامە

نووســــینی :چیخــۆف

هــیمــدادی حوســێن

لە فارسییەوە کردوویە بە کوردی



**پلاتۆنۆڤە شێت**



**کەسەکان:**

* ئانا پترۆڤنە ڤۆی نیتزۆڤ، بێوەژنی جەنەڕاڵ ڤۆی نیتزۆڤ .
* سێرگی پاڤلۆیچ، کوڕی خوێندەواری بێوەژن.
* سۆفیا ئەڤرۆڤنا، هاوسەری.
*مێشێل ڤاسیلی ڤیچ پلاتۆنۆڤ، مامۆستای قوتابخانە.
* ئیڤان ئیڤانۆیچ تیرلیتزکی، سەرهەنگی خانەنشین.
* نیکۆلای ئیڤانۆیچ تیرلیتزکی، پزیشك، برای.
* ساشا ئیڤانۆنا، خوشکی نیکۆلای تیرلیتزکی و هاوسەری پلاتۆنۆڤ.
* پریڤێری سیمۆنیڤیچ گلاگولییێڤ، پیرێکی دەوڵەمەندی خاوەن بانق.
* کیریل پریفێریچ گلاگولییڤ، کوڕی.
* ئابرام ئابرامڤیچ ڤانجرۆیچ، جوولەکەیەکە پارە بە قەرز بەخەڵك دەدات.
* پێنرن

دوو قەرزدەر بە خەڵکی گەڕەك.

*بۆگەرۆڤ

*ماریا ئەڤییمۆنا گرکۆڤا، ژنێکی گەنجە، خاوەن زەوی و زارێکی زۆری ناوچەکەیە.
*ئاسیپ، مۆچیك، (دوو جووتیاری رووسین).
*یاکۆڤ
*ڤاسیلی
*کاتیا

خزمەتکارانی ڤۆی نیتزۆڤ.

*مارکۆڤ، دەرگاوان.

شوێنی رووداانی کارەساتەکە روسیایەو لە دەوروبـەری سـاڵی ١٨٨٠ دایـەو لـە گونـدێکی بچووکی ڤۆی نیتزۆڤە.

پلاتۆنۆڤە شێت- درامایەکە لە چوار پەردەدا.

# پەردەی یەکەم

## پلاتۆنۆڤە شێت

شانۆ: باغی نیتزۆڤە. لەلایەك شاخێکی پێچ پێچ بەرچاو دەکەوێ. لە ناوەڕاستی تابلۆکەدا فانۆسێکی داگیرساو هەڵواسراوە. باغەکە چەند کورسی و مێزێکی تێدایە. لە دەستە چەپ دیمەنی خانوویەکی گەورەی لێیە. قادرمە پانەکانی لای پەنجەرەکانییەوە کۆتایی دێت. لە قادرمەی پێشەوەی بینایەکە خەندەو گفتوگۆیەکی گەرم بەرگوێ دەکەوێ. دەنگی مۆسیقای سەماو پیانۆ و ڤیۆلن و ڤالس دێت. لە کۆتایی باغەکەدا کۆلیتێك لەسەر شێوەی چینی دروستکراوەو بە فانۆسان رازاوەتەوە. لە بەشی سەرووی نێو کۆلیتەکەدا نووسراوە (س.و)، لەپاڵ کۆلیتەکەدا نیشانەشکێنی دەکەن، هات و هاواری یاری بەرگوێ دەکەوێ، (پێنج دانە باشە، چوار دانە باش نییە).

باخ وماڵەکە رووناکن و میوانەکان لەو سەری باغەکە پیاسە دەکەن، ڤاسیلی و یاکۆڤ و خزمەتکاران چراکان هەڵدەواسن و دایان دەگیرسێن.

کاتەکەیش بەرەبەرە خۆرئاوابوونی ڕۆژێکی خۆشی هاوینە. میوان و خزمەتکاران بەبن هەیوانەکەدا دێن و جارجار ڕەت دەبن.



**دیمەنی یەکەم:**

**نیکۆلای تیرلیتیزکی، بۆگەرۆڤ، پیرە گلاگولییێڤ.**

بۆگەرۆڤ و پیرە گلاگولییێڤ لە قالدرمەکان دێنە خوارێ و تیرلیتیزکی تا رادەیەك مەستە، لە نزیکەوە تاقیبیان دەکات. تیزلیتیزکی، کە بۆی دەکرێ بۆگەرۆڤ لە هۆش خۆی ببات، قۆڵی دەگرێت.

تیرلیتیزکی :- یاللا، یاللا باڤێلێ پترۆیج.

بۆگەرۆڤ :- سووکم نەکەی دکتۆر، ناچارم مەکە شتێ بڵێم، کە نابێ بوترێ.

تیرلیتیزکی، لە کاتێکدا خۆی بە گلاگۆلییێڤ شۆڕ دەکاتەوە :- ئێی، تۆ، دۆستی خۆشەویستم بۆ ئەو کارەم بۆ ناکەیت ؟ بەخوا سوێندت بۆ دەخۆم، داواکارییەکەم وا گەورە نییە، با بۆگەرۆڤیش بە شایەد بێت.

بۆگەرۆڤ، دەستی بۆ ئاسمان بەرز دەکاتەوە :- من شایەتی هیچ شتێ نییمە. من لە باخ بانگم دەکەن. (دوور دەکەوێتەوە.)

تیرلیتیزکی، قۆڵی لە قۆڵی گلاگولییێڤ هەڵدەکێشی و رایدەشەکێنێ :- یاللا، ئیشەکی باشە. تۆ لێرەی زێڕت هەیەو دەشڵێی لە قەرزدان بێزارم، بەڵام باوەڕت بێ ئەمە قەرز نییە، چونکە بە هیچ شێوەیەك نییمە دوایی بتدەمەوە. سوێندت بۆ دەخۆم.

گلاگۆلییێڤ:- زۆر چاکی بۆ چوویت.

تیرلیتیزکی:- ئاه، کوڕی چاك، تۆ بەخشندە نییت !

(کە گلاگۆلییێڤ دوور کەوێتەوە) یاللا گلاگۆلییێڤ، هەر دەبێ لە بەرامبەرتدا بە چۆك دابێم؟ دڵنیام تۆ دڵێکی باشت هەیە.

گلاگۆلییێڤ، کە ئاهێکی قووڵ هەڵدەکێشێ :- دکتۆر تیرلتیزکی، تۆ قەت دەردی منت پێ چارە ناکرێت، بەڵام بە پێچەوانەی ئەوەشەوە هەموو هونەرێك بەکاردێنی تا پارەم لێ بەردەیتەوە !

**تیرلیتیزکی** :- جا چی بکەم هەر ئەوەندەی لێ دەزانم.

(ئەویش ئاهێك هەڵدەکێشێ).

گلاگۆلییێڤ، جزدانی پارە دەردێنێ :- ناچارم دەکەی، باشە چەندت پێویستە؟

(جزدانی پارەکەی دەردێنێ)

تیرلیتیزکی :- بە چاوێکی رژدەوە لە پارەکان دەڕوانیێ:- خوایە! دەشیانەوی ئێمە باوەڕیمان بیێ، کە رووسیا پارەی کەمە! ئەو هەمموو پارانەت لە کویێ بوو؟

گلاگۆلییێڤ:- بگرە (پارەی دەداتیێ.) پەنجا رۆبلە، لە بیریشت نەچیێ ئەمە دواجارە ها!

تیرلیتیزکی:- بەڵام خۆ تۆ لەوەندە زیاترت هەیە ! سەیرکە ئەوە بەس هی بەردەستانە.

گلاگۆلییێڤ:- بگرە. ها هەمووی، چییە کراسەکەشم لەبەر دادەکەنی، ئەو دزیانە چییە دەیکەی تیرلتیزکی.

تیرلیتیزك:- بەدەم ژماردنەوە:- حەفتا... حەفتاو... پێنج... هەمووی دەکاتە ئەسکەناسێکی رۆبلی. تۆ وا لێك بدەوە، کە ئەوان سواڵیان کردووە : جا دڵنیایت، کە ئەوان فێڵباز نین ؟

گلاگۆلییێڤ :- ئەگەر فێڵیشیان کرد، بۆم بگەڕێنەوە.

تیرلتیزکی :- کە بە خێرایی ئەسکەناسەکان دەشارێتەوە :- ئەگەر سوودی تۆی تیایە من ئەم کارە دەکەم، بەڵام پیرڤێری سمۆنیج ژیانت ئاسایی نییە، دەخۆیتەوە، دەدوێیت، شەوان نانوییت، کە چی لە کاتێکدا بێگومان تۆ دەبیێ زوو بخەویت. زەختت هەیە رەنگە دڵت بوەستیێ، دەمارەکانت دەرپەڕیوە و ئەم شەو لێرەیت، دەتەویێ خۆت بکوژی ؟

گلاگۆلییێڤ:- بەڵام دکتۆر...

تیرلتیزکی:- (بەڵام) ی ناویێ. نامەویێ بتترسێنم، هەڵبەتە تۆ دەتوانی چەند ساڵێك بژییت، بەڵام بەوەی، کە ئاگات لە خۆت بیێ و پارێز بکەی، دەڵێم : بەڕاست، پارەت زۆرە؟

گلاگۆلییێڤ:- ئیتر..

تیرلتیزکی:- غەدر دەکەی، ئەم جۆرە شەونیشینیانەت دەتکوژیێ.

گلاگۆلییێڤ:- بەس، ئەم قسانە بەدڵ نییە..

تیرلیتیزکی:- باشە ئێستا با وەك دوو برادەر بدوێین، نەك وەك دکتۆرێك ! وا نەزانی من کوێرم، دەزانم بۆ چی لێرە دەمێنیتەوە، بێوەژنێکی جوانی لێیە، وا نییە ؟ بەڵام بە هەر حاڵ برۆیشتیتایەوە بۆ خۆت بحەسایتەوە چاکتر بوو.

گلاگۆلییێڤ:- تیرلتیزکی، دەزانی تۆ کابرایەکی گەلحۆی! هەندیێ جار لە خۆڕا سەرو دڵم دەگری، بەڵیێ، تۆ زۆر گەمژەی.



تیرلتیزکی، **هێوری دەکاتەوە:** دەفەرموو سەیرکە، سەیرکە. ئاخ چیت لیێ بکەم، وەك دۆستێك تکات لێدەکەم، بڕۆ خۆت تۆزی لە کوخەکەی خۆت بحەسێوە، نەختێکی تر باش دەبیت..

گلاگۆلییێڤ، **لییێ دوورکەوتەوە:**- بەڵیێ، هەقی خۆتە، بەلام بە هەر حاڵ تۆ کابرایەکی بیێ فەڕی.

(دەچێتە دەرەوە).

**دیمەنی دووەم:**

**نیکۆلای تیرلتیزکی، یاکۆڤ، ڤاسیلی، ڤۆی نیتزۆڤ، ئاناپترۆڤنە**

نیکۆلای تیرلتیزکی کە سەرنجی پارەکان دەدات:- پارەی خاوەن بانق بۆن بۆگەنی دەشتەکییەکی لێدێت، بۆ خاتری خوا پێم نالێی ئەوەندە چییە و لە چی سەرفی بکەم ؟

دوو خزمەتکار بەسەر شانۆ دا رەت دەبن، هەرکە ئەوان دەچنە دەرەوە، ڤۆی نیتزۆڤ لە قادرمە دێتە خواریێ و لە پشت ئەویشەوە لە رۆخ پەنجەرە ئاناپترۆڤنە دەبینریێ.

ڤۆی نیتزۆڤ:- بەڵیێ دایە هەموو ماڵەکەی بە دوادا گەڕام، نەمدۆزییەوە.

ئاناپترۆڤنە، بەنەرم و نیانییەوە:- سەیرێکی باغەکەیش بکە.

ڤۆی نیترۆڤ هاوار دەکات : سۆفیا، هۆی، سۆفیا.(بە تیرلتیزکی دەڵیێ) دکتۆر، ژنەکەم بزر بووە تۆ نەتدیوە؟

نیکۆلای تیرلتیزکی: نەخێر، لە خەیاڵم نییە، بەڵام شتێکی دیم پێیە بۆ تۆ. (سیێ رۆبڵ دەخاتە دەستی ڤۆی نیتزڤ و هەرخۆی پارەکانی دەخاتە گیرفانییەوەو لەناکاو پارەکانیش فڕیێ دەدات، بە ڕاکردن بەرەو باغەکە ڕادەکات.) هەتا سوپاسێکی ئاساییشی نەکرد.(لەگەڵ خۆی دەویێ) بنیادەم بۆ وای لێهاتووە، ئینسانییەت نەماوە! دەچەمێتەوەو لەسەر خۆی ئەسکەناسەکان کۆ دەکاتەوە.

**دیمەنی سێیەم:**

**ساشا، ئیڤان تیرلتیزکی، نیکۆلای تیرلتیزکی.**

ساشا، دێتەژوورەوە، دێتەوە ماڵەوە واز لە باوکی دێنێ.

ساشا:- ئێستا ڕێگایەك بدۆزینەوە.

ئیڤان تیرلتیزکی : بەڵام چۆن، نازدارەکەم، گوڵی نازەنینم؟

ساشا:- هێشتا وەختی نان خواردنێ نییە و تۆیش وەك عەرەبانچییەك مەستی، شەرمەزار نابی وا من سوك دەکەی؟

ئیڤان تیرلتیزکی:- ڕۆڵە خۆشەویستەکەم تۆ سادەییت، تۆ هەرگیز لە پیاوێکی وەکو من تێناگەی : دایکیشت هەروابوو، چاوەکانت، پرشتن، سەیرکە ڕۆیشتنیشت وەك ئەوە، دەڵێی فەرخە مراوی، خوا عافوویکا.

ساشا:- **بابە!**

**ئیڤان تیرلتیزکی :-** تەنها من وانیم، سەیری ئەو مرۆ ڤە خاوەن شکۆیە بکە، کە لەسەر زەوی دەگەوزێ.

ساشا، بەداماوی:- خوایە خۆ ئەمە تووڕە نابێ، هەڵسەوە، نیکۆلای ئەوەندە بەس نییە، کە بابت ئارەق خۆربێ ؟چ دەکەی؟

نیکۆلای تیرلتیزکی:- هێواش، هێواش کە، دەمەوێ هەندێ پارە بخەمە لاوە.

ساشا:- تۆ هەرگیز بیر لەوە ناکەیتەوە، کە پزیشکی ئەم ناوچەیەی؟ دەبی تۆ رێنوێنی خەڵك بکەی.

ئیڤان تیرلتیزکی :- راستە، زۆر، زۆر راستە؟!

ساشا:- ئەی تۆ بابە، بەم تەمەنەوە هێشتا بیر لەوە ناکەیتەوە خەڵك چیت پێ دەڵێن، دەبێ هەر شەرم لە خوا بکەی.

ئیڤان تیرلتیزکی:- ساشا، گوڵی نازەنینم، تۆ بێ مێشك مەبە، پێت وایە چیت؟ لات وایە خاچی خودابیت لە گیرفانتا هەڵگرتووە؟ ساشا...ساشا..من عەرەق دەناسم؟ هەوڵ نادەم درۆبکەم، بچکۆلەکەم، من عەرەقم نۆشیووە، تەنها عەرەقم نۆشیووە، بۆنا؟ من کابرایەکی سەربازییم، لە سوپادا ئەو شتانە تێ دەگەن، بەڵام تۆ هیچ تێناگەیت، هیچ. ئاه، ئەگەر دیسان دەگەڕامەوە نێو سوپا. ژیانی ڕاستەقینە لەوێیە، ئەگەر هەندێکی تر دەمامەوە، تەنها کەمێکی دی، ئێستا جەنەڕاڵ بووم، جا بیری لێبکەرەوە.



ساشا:- بابچینە ماڵەوە.

ئیڤان تیرلتیزکی :- گوتم: گوتم جەنەڕال!

ساشا:- جەنەڕاڵەکان وەها زۆر ناخۆنەوە. دەبابرۆین بچینەوە.

ئیڤان تیرلتیزکی:- دەڵێی چی؟ وا دەزانی جەنەڕاڵەکان ناخۆنەوە، بە درێژایی ڕۆژ دەخۆنەوە، لە سوپادا هەموو تەنها بۆ (شادی ژیان) دەخۆنەوە.

ساشا:- دەباشە هەر چی تۆ بلێی ڕاستە.

ئیڤان تیرلتیزکی: وش، کربە، تۆزێ ڕێزت هەبێ و گوێ لە قسەکانم بگرە، ڕۆڵە ئازیزەکەم، تۆ وەك دایکە بێچارەکەتی، بی.... بیز..، بیز.. ئەمە هەمووی سەرو سەدای ئاشنای ئەوە هەمیشە بەرگوێم دەکەوێ. نیکۆلام دێنێتەوە بیر؟ بیز...ز...بی...زن بە خودا شەو و ڕۆژ ناڵەناڵییەتی، ئەگەر بەهانەی خواردنەوەی لێ نەگرتبامایە بەهانەی شتێکی دی پێ دەگرتم. ئێوە هیچ کامتان لە من تێ نەگەیشتوون، بی...ز...بی...ز...ئاه، ڕۆڵە تۆ وێنەیەکی راستەقینەی دایکتی، من هەردەم، بیری لێ دەکەمەوەو دەزانم جارێکی دی نایبینمەوە، حەزدەکەم بگریم. ئای، چەندەم خۆش دەویست، بەڵام خوا هەر خۆی ئەوی بە من بەخشی و هەر ئەویش لێی سەندمەوە.

(بەئەژنۆدا دێت:) ئاخ ببەخشە، ببەخشە ساشای بچکۆلانە من پیرەمێردێکی لاواز و نەفامم، بەڵام تۆ کچی منی دە بڵێ لێت خۆش دەبم.

ساشا:- بێگومان لێت خۆش دەبم، دەی هەڵسەوە.

ئیڤان تیرلتیزکی:- دە سوێند بخۆ.

ساشا:- باشە سوێند دەخۆم، بەڵام دەبێ تۆیش سوێندەکەی خۆتت لە یاد نەچێ.

ئیڤان تیرلتیزکی:-کام سوێند؟

ساشا:- واز لە خواردنەوە بێنی، ئەگەر نیکۆلا دەیەوێ بۆ حەسانەوەی خۆی وەك بەراز ڕەفتار بکات، بەڵام بۆ پیرەمێردێکی وەك تۆ شەرمە.

ئیڤان تیرلتیزکی: کچە بچکۆلانەکەم، سێبەری دایکە مردووەکەت وەك زەنگێکی ترسناك لە ژیانتدایە، لە ئێستا بەدواوە نابێ یەك دڵۆپە ئارەق چییە بێتە سەر ئەو لێوانەم. سوێندت بۆ دەخۆم بە شەرافەتی سەربازیم سوێند دەخۆم. مەگەر ناڵێم بۆ دەرمان، ئەویش ئەگەر ناچاری بێ.

تیرلیتیزکی، پارەکانی کۆدەکاتەوەو نێزیك دەبێتەوە.

نیکۆلای تیرلتیزکی:- جەناب، سەد کوپەك دەکات، ڕێگام بدە با بۆت بەدەرمان بدەم.

ئیڤان تیرلتیزکی: سەد کوپەک؟ ئاه، کوڕەلاو ئەوە تەگبیری تۆ و کوڕی کۆلۆنیـل ئیڤـان ئیڤـانۆیچ تیرلتیزکییە ئەی وانییە ؟ ئەو کوڕەی لە گاردی شاهانشانی خزمەت دەکات ؟

نیکۆلای تیرلتیزکی :- بەڵێ خۆمم.

ئیڤان تیرلتیزکی :- جا ئەگەر وابـێ مـن بەتـەواوی ئـارەزووەوە پەسـەندی دەکـەم. (پێدەکـەنێ) سوپاس، خۆ من سەدەقە نابژێرم، بەڵام چونکە کوڕمە قبوولی دەکەم، من پیاوێکی شەریفم، ڕۆڵەکان. سوێند دەخۆم، کە هەمیشە سەر ڕاست بوویمەو هەرگیز گیرفانی برادەرێکم خالی نەکردۆتـەوە و نـەك ئێستا هەتا ئەو وەختەی لە حکومەت کاربەدەستیش بووم بەهەر حاڵ: کارێکی ئاسان نەبوو، من خۆم فەسادی وام دیوە نەوعی ناپلیۆنیش نەبووە، بەڵام دەستەکانی خۆم بە پاکی ڕاگرت. جگە لە مانگانەی سەربازیم کوپەکێکم نەبوو.

نیکۆلای تیرلتیزکی:- کارێکی زۆر بەجێت کردووە، بەڵام بابە پێویست ناکا شانازی پێوە بکەیت.

ئیڤان تیرلتیزکی:- شانازی پێوە ناکەم، نیکۆلا، تەنها بۆ ئێوەم باسکرد. ئەی نـەدەبوو دەربـارەی ئێوە وەلآمی خوا بدەمەوە؟ بێگومان. شەوێکی شاد.

نیکۆلای تیرلتیزکی :- بۆ کوێ دەڕۆیت؟

ئیڤان تیرلتیزکی :- بۆ ماڵەوە. ئەم پینەچییە داوای لێکردووم، کە ڕێگای بدەم بڕواتـەوە. لەگـەل ئەو دەڕۆم، لەشەونشینی دەترسێ، تا ماڵەوە دیگەیێنم خۆم دەگەڕێمەوە.

نیکۆلای تیرلتیزکی :- وەرە، ها ئەمە سێ ڕۆبڵ.

ئیڤان تیرلتیزکی، لە پڕ تووڕە دەبێ :- ئەی چیم پێ وتی؟ ئەم دەسـتەی مـن هـەرگیز فەسـادی نەدیوە. کوڕم، کوڕم، وەختێك دژی تورکەکان دەجەنگاین و خزمەتم دەکرد...

نیکۆلای تیرلتیزکی :- ئافەرین، کۆلۆنێل، بڕۆ، ڕاست، ڕاست بەرەو پێشەوە!

**ئیڤان:-** نەخێر بەدەستە چەپدا، نیو هەنگاوێ جا بەرەو پێشەوە.

ساشا:- با بڕۆین، بەسە، ڕێگایەك بدۆزینەوە.

ئیڤان تیرلتیزکی :- نیکۆلا، خوا ئاگادارتبێ. بەڵی، بەڵێ تۆ کـوڕی چـاکی نیکـۆلا، پلاتۆنـۆڤی زاوات کابرایەکی ئازادیخوازە، بەڵام کوڕێ خاسە.

(بە ساشا دەڵێ :) دێین، دێین.

ساشا، لەسەر ڕۆیشتنە: تۆ ڕۆڵەیەکی واقیعیت.

ئیڤان تیرلتیزکی :- بەڵی هەقی خۆتە.

(دەچێتە دەرەوە)



**دیمەنی چوارەم:**

**پێترن، بۆگەرۆڤ، نیکۆلای تیرلتیزکی، ئاناپترۆڤنە.**

پێترن و بۆگەرۆڤ شان بەشان دێنە ژوورەوە.

پێترن:- بەس ٥٠ هەزار ڕۆبڵم بدێ، سوێندت بۆ دەخۆم دەیاندزم، بەڵام دەترسم بمگرن، تـۆیش لـە گوڵ گرانتری پێ مەڵێ.

بۆگەرۆڤ:- ئاه، نا، نا، پێترن، من نا.

پێترن:- من ڕۆبلێکیش دەدزم، راست دەکەی ؟! یەکێ ڕاستگۆ بێ شێتە.

بۆگەرۆڤ:- کەوابێ من شێتم.

نیکۆلای تیرلیتزکی:- (باز دەدات) ها ئەوەش ڕۆبڵێك بۆ سەر ڕاستی تۆو دۆستان (ئەسکەناسـێك دەداتە بۆگەرۆڤ).

بۆگەرۆڤ دەیخاتە گیرفانییەوە: ئۆ هۆ، سوپاست دەکەم.

دکتۆر پێترن: باشە زۆر زوو وەرتگرت، بۆگەرۆڤی سەر ڕاست!

نیکۆلای تیرلتیزکی: تۆ ئەوە مەڵێ، بلێ وەختێك شیرە خۆرە بوویت، خۆتت بەسەر ڕاست دەهاتـە بەر چاو!

پێترن:... من ئامادەم مەرجت لەگەڵ بکەم، کە بەقەد نیوەی تۆیشم نەخواردووە.

نیکۆلای تیرلتیزکی : لە دادو دادگەری دەبێ من پشت بە تۆ ببەستم، لە ئارەقخۆران بێزارم. بەڵام بەخشندە دەمێنمەوە، گەر بفەرمووی ڕۆبلێکی دیکەشم لێ وەربگری، جا بـۆ هـەر کامێکتـان بێـت.

(ئانا پترۆڤنە لە پەنجەرەوە دەردەکەوێ).

ئاناپترۆڤنە:-تیرلیتزکی، ڕۆبلێکیش بدە من. (لە پەنجەرەکەوە لا دەچێت).

نیکۆلای تیرلتیزکی :- نەك ڕۆبلێ، بلێ پەنجا ڕۆبل، تۆ هاوسـەری جەنـەراڵێکی گـەورەیت، خـۆم بۆت دێنم.

(دێتە ماڵەوە).

**دیمەنی پێنجەم:**

**پێترن، بۆگەرۆڤ.**

پێترن: پەڕی جادووگەری خۆی کێشایەوە.

بۆگەرۆڤ: بەڵێ.

**پێتڕن:** من بەرگەی ئەو ژنە ناگرم، وا دیارە زۆر هەیتەیە و زۆر لەخۆی باییە، هێشتا بێوەژنەکان هێورترو ئارامترن، چاك نییە ئەوان ناتوانن بە خۆیانەوە بنازن. من لە خۆم دەپرسم باشە ئەو کوندە پەپووە پیرە، ئەم گلاگولییێڤە دەبێ چی لێ هەڵکڕێنێ...

بۆگەرۆڤ:- کێ دەزانێ؟

پێتڕن:- ئەو پیرەمێردە خاوەنی ئەو هەموو پارەیشە شێتیشە. (لە باغەکەدا پیاسە دەکەن)

بۆگەرۆڤ:- وایە. لەهەر دانیشتنێکی شەوانەدا خۆی دەگەیەنێتە لای بێوەژن و قورقەپ دادەنیشێ و چاوی تێ دەبڕێ. پێتڕن دەڵێم: باشە دەبێ ئەم جۆرە تێڕوانینە ژن بۆ لای خۆی ڕابکێشێ؟

**پێتڕن:-** دەڵێن بەتەمایە بیهێنێ.

بۆگەرۆڤ:- بەم پیرییە تازە (بۆڵە بۆڵدەکات)، جا خۆ نێزیکەی ساڵ دەبێ.

پێتڕن:- دەستی دەڕوا، بەڵام من زۆر حەزدەکەم بەژن و مێردایەتی بیانبینم.

بۆگەرۆڤ:- بۆ؟

پێتڕن:- جا کاتێ مێردەکەی مرد. بێوەژن گشت ماڵ و سامانی مێردەکەی ئاوا دەکرد، خانوو و زەوییەکەی لە رەهن دایە چ ئومێدێکمان پێ نییە. تۆزێك دوای ئەوە) ئەگەر بێوەژن لەگەڵ پیرە گلاگۆلییێڤ زەماوەند بکات من زوو پارەی خۆم وەردەگرمەوە. پارەی رەهنەکەم دەدەنێ. هەوەڵجار بە پێچەوانەی وان دەجوولێینەوە و پاشان پارەکەم بە دەست دێنمەوە. شازدە هەزار ڕۆبڵم قەرزارە.

بۆگەرۆڤ :- سێ هەزار ڕۆبڵی منیش قەرزارە. ژنەکەیشم فەرمانی داوە لێی وەربگرمەوە، بەڵام هەرچەند دەکەم ناتوانم بە هێوری بچمە ماڵەکەیەوە و پێی بڵێم: ((ئاناپترۆڤنەی ئازیز من پێویستیم بە پارەکانمە. داوات لێ دەکەم دەست بەجێ بۆم بگەڕێنیتەوە.)). دواییش خۆ ئێمە لادێیی نین، نانا ژنەکەم ئەگەر پێویستی بەپارە هەیە با بۆ خۆی بچێ داوای بکاتەوە. ئەمەیان مەسەلەیەکی پەروەردەییە.

(دەچنە ژوورەوە).



**دیمەنی شەشەم:**

**سۆفیا، ڤۆی نیتزۆڤ.**

(جوولانەوەکانی ئەم دیمەنە تا ڕادەیەك خێرایە.)

سۆفیا:- دەمارگرژی:- راستییەکەی شتێکم نییە پێت بڵێم.

ڤۆی نیتزۆڤ:- چییە ئەوە بۆ مێردەکەیشت جاسووسی دەکەی؟ پێم بڵێ بزانم لەم دواییە چی بووە؟

(دادەنیشێ)

سۆفیا:- نەخێر، نازانم، خۆیشم نازانم چیم بەسەر دێت، سەیرم مەکە.(وەستان، دوایی بە سۆزەوە:) سێرگی با بڕۆین.

ڤۆی نیتزۆڤ:- رۆیشتن؟ ئاخر بۆ؟

سۆفیا :- دەبێ سەفەرێکی دەرەوە بکەم. دەتۆیش بڵێ باشە.

ڤۆی نیتزۆڤ:- بەڵام بۆ؟

سۆفیا:- هیوادارم لێم نەپرسیت بۆ.

ڤۆی نیتزۆڤ:- (دەستی ماچ دەکا) زۆر باشە. سبەینێ دەڕۆین، لێرە لە نێو ئەم دێهاتییانە حەوسەڵەت نامێنێ بۆگەرۆڤ! پێتڕن!

سۆفیا:- هیچ کەس بەرپرسیار نییە.

ڤۆی نیتزۆڤ:- من لە خۆم دەپرم، نازانم ئێوە ژنان ئەو هەموو نارەحەتییە لە کوێ دەدۆزنەوە، (گۆنای ماچ دەکا) هەر چۆنێك بێت شادمان بە، با بۆ خۆمان بژین، تۆ دەبێ یاساکانی پلاتۆنۆڤ بەکاربێنی، بۆچی نارۆیت جارێ لەگەڵیا بدوێیت؟ یان لەگەڵ دایەو تیرلیتیزکی بدوێین. هەوڵدە لە خۆباییانە تێیان نەڕوانی، ئەکەر چاکتر بیان ناسی، ئەتۆیش خۆشت دەوێن.

**دیمەنی حەفتەم:**

**هەر ئەوان، ئاناپترۆڤنە.**

ئاناپترۆڤنە، لە پەنجەرەوە:- سێرگی! سێرگی!

ڤۆی نیتزۆڤ:- بەڵێ دایە.

ئاناپترۆڤنە:- نەختێ وەرە ئێرە.

ڤۆی نیتزۆڤ:- واهاتم. (بە سۆفیا دەڵێ:) بەڵێن بێ سبەینێ دەڕۆین، ئەوە نالێم ئەگەر تۆ بیرورات بگۆڕی.

**دیمەنی هەشتەم:**

**سۆفیا، پلاتۆنۆڤ.**

سۆفیا دوایی بێ دەنگییەك، لەگەڵ خۆیدا:- دەبێ چی بکەم؟ ئەی خوای بەخشندە، یارمەتیم بدە! ترسناکە. قەت چاوەڕێی شتی وا نەکرابوو.

پلاتۆنۆڤ، لەماڵ دەچێتە دەرەوە وە هاوار دەکات:- گەرمامە. نەدەبوایە ئارەقم بخواردبایەوە...

- کێ لێرەیە، سۆفیا، ئەگرۆڤنا؟ تەنیایی؟!

(پێدەکەنێ و سۆفیا هەڵساوەتەوەو ئامادەی جوولانەوە دەبێ. ئەم دیمەنە سەرجەم دەبێ بەپەلە بێت)

سۆفیا:- بەڵێ.

پلاتۆڤ:- هەموو کەسێ سووك دەکەی؟

سۆفیا:- من کەس سووك ناکەم.

(دادەنیشێ)

پلاتۆنۆڤ لە تەنیشتی دادەنیشێ: ڕێگام دەدەی؟

ئەگەر تۆ کەس ڕەت ناکەیتەوە، بۆچی من ڕەت دەکەیتەوە؟ من دێمە ژوورەوە تۆ دەچیتە دەرەوە، کە من لە باغ پیاسە دەکەم تۆ بزر دەبی، پەیوەندییەکەمان دەشێوێنی، باشە من بێزارت دەکەم؟ من نەفرەت ئەنگێزم؟ من تاعوونمە؟ (قیت دەبێتەوە) لە ڕاستیدا من خۆم بە بێ تەخسیر دەزانم. ئومێدەوارم لەم شوێنە دەبەنگە ڕزگارم بکەیت. لەوە زێتر بەرگەی چی دی ناگرم.

سۆفیا (بەپەلە) :- ڕاستی، من لە دیتنی تۆ خۆم دەپارێزم. بەڵام ئەگەر دەمزانی تۆ پێی ناڕەحەت دەبی، بە جۆرێکی دی رەفتارم دەکرد.



پلاتۆنۆڤ، (قسەکانی پێ دەبڕێ):- ئا، بەم شێوەیە لە دیتنی من خۆت دەپاراست، خۆت وات پێ باش بوو، لەبەرچی؟

سۆفیا (یەکڕاست رستە کورتەکانی دەدا بەدەم یەکەوە):- وا هاوار مەکە، من بەرگەی ئەوانە ناگرم کە دەنگیان بەرز دەکەنەوە.

(بێ دەنگی) کە گەیشتمە ئێرە، چێژم لە قسەکانت وەردەگرت، بەڵام ئەو زەوق و چێژە بەرەبەرە گۆڕا و ناخۆش کەوتەوە. باش لێم تێ بگە: من دژی تۆ نیم، بەڵام هەموو ڕۆژێ، کە یەکدیمان دەبینی پێت دەگوتم زۆر دەمێکە، کە منت خۆش دەویست چیرۆکێکی هیچ و بێ مانایە، بەڵام مەسەلە ئەوە نییە. کە باسی ڕابردووت دەکرد وەك بڵێی شتێ دەخەیتە ڕوو. وەك بڵێی لە ڕابردوودا شتێکت لەدەست چووبێ و ئێستا ئارەزووت هەیە تێ بچیتەوە. دەنگت ستەمکارانەیە. لە سنووری خۆشەیستی تێ دەپەڕێنێ، تووڕەیت، هاوار دەکەی، دەستم دەگری، سۆراغم دەکەی، چاوەدێریم دەکەی، ئارامت لێ بڕیوم، چیت لێم دەوێ؟ من چی تۆمە؟

پلاتۆنۆڤ:- ئاوا؟ زۆر باشە، (سوپاست دەکەم) بۆ ئەو رقەبەرییەت. (دوور دەکەویتەوە).

سۆفیا، بە لەخۆبایی بوون و تاڕادەیەکیش ڕوو گرژییەوە:- فەرموو، تووڕە بوویت. میشێل ڤاسیلیڤیچ ناڕەحەت نەبیت.

پلاتۆنۆڤ، دەگەڕێتەوە: بەڵێ من دەزانم رقت لێم نییە، تۆ دەترسێی.

سۆفیا، دەستی بەرزدەکاتەوە:- پلاتۆنۆڤ، لاچۆ، درۆدەکەی، من ناترسم.

پلاتۆنۆڤ: جا ئەوە چۆن دەبێ تووشی هەر شتێ بی و لە عەشقی مێردەکەت بترسی. ئەی‌توانای کەسیەتی تۆ کوانێ؟ خۆت دەبینی من هەموو ڕۆژێ دێمە ئێرە، چونکە وا دەزانم تۆبێ لێپرسینەوەیت، بەدکاری،بەرحاڵ، دەبێ هەراسانت بکەم، من خۆم بەلای تۆ دانابوو.

سۆفیا: بەسە، تۆ مافی ئەوەت نیە ئەم قسانە بکەیت، لاچۆ.

پلاتۆنۆڤ، بەپێکەنینەوە:- ئا، بەم شێوەیە سۆراغت دەکات دەیەوێ لە مێردەکەت بتدزێ؟ پلاتۆنۆڤ!، ئەم پلاتۆنۆڤە ترسناکە تۆی خۆش دەوێ، ریسوا! بەهەر حاڵ، من چاوەڕێی وام لە ئافرەتێکی تێگەیشتووی وەك تۆ نەدەکرد.

(بە هەنگاوی گەورە گەورە بەرەو ماڵ دەبێتەوە.)

سۆفیا:- پلاتۆنۆڤ تۆ شەڕانیت! بێ ئەقڵیت. (کە دەبینێ بە جێت هێشتووە:) وای ! جێی مەترسییە، دەبێ بیدۆزمەوە و تیێ بگەیێنم من بەرگەی ئەوە ناگرم.

**دیمەنی نۆیەم:**

**یاکۆڤ، ڤاسیلی، ئاسیپ.**

یاکۆڤ کەمێك تووڕەیە، بەڵام  بە ڕوویەکی خۆشەوە دەڵێ:- مەگەر هەر شەیتان بزانێ دیسان ئەو مێوانانە چیمان بۆ دەبیننەوە.

بۆچی وەك خەڵکی دی بەیاری کاغەزێن قایل نابن؟

ئاسیپ:- ئەری ئا.....برام، ئابرامڤیچ ڤانجرۆمڤیچ لێرەیە؟

(راوەستانێکی خێرای یاکۆڤ ڤاسیلی)

یاکۆڤ:- لەماڵەوەیە.

ئاسیپ:- برۆ بیدۆزەرەوەو پێی بڵێ، کە من گەیشتووم.

(یاکۆڤ  دەچێتە دەرەوە. هەر لەم کاتەدا ئاسیپ مۆمەکە دەکوژێنێتەوەو دەیخاتە گیرفانییەوە.)

ڤاسیلی وا خۆی پیشان دەدا دەترسێ، بەڵام وەك بەڕاستی بێت، ئاسیپ دەترسێنێ:- ئەم فانۆسانە بۆ لەززەت و سەرگەرمی تۆنین، بۆچی هەڵتواسیون؟

ئاسیپ:- جا ئەوە چ پەیوەندییەکی بە تۆوە هەیە، دەبەنگ؟

(کلاوەکەی سەری ڤاسیلی بەرز دەکاتەوەو رووەو پەنجەرەکەی فڕێ دەدات.) زۆر باشە، دە شتێ بکە، هیچ نەبێ زللەیەکم  لێدە، نا؟

ڤاسیلی:- من حەز دەکەم وا لە یەکێکی دی بکەی.

ئاسیپ:- ئەژنۆت بخەرە سەر ئەرز.(بەرەو لای دەڕوا بیترسێنێ) گوێت لێ نەبوو چیم پێ وتی؟ ئەژنۆت بخەرە سەر ئەرز.

(ڤاسیلی بە ئەژنۆدا دەکەوێ)

ڤاسیلی:- ئەم هەڵەیەت زەرەرت پێ دەگەیەنێ ئاسیپ.



**دیمەنی دەیەم:**

**ڤاجرۆیچ، ئاسیپ، پلاتۆنۆڤ.**

ڤانجرۆیچ دەردەکەوێ. ڤاسیلی بەهەلی دەزانێت خۆی لە دەست ئاسیپ قورتار بکات.(سەرتاسەری ئەم دیمەنە دیالۆگەو بە خرۆشانەوە دەگوترێ.)

ڤانجرۆیچ:- کێیە بانگم دەکا؟

ئاسیپ:- (بە شەڕانییەوە) جەنابم.

ڤانجرۆیچ:-چیت دەوێ.

ئاسیپ:- لە مەیخانەوە یەکێکت بە دوامدا ناردبوو، ئامادەم.

ڤانجرۆیچ:- نەدەبوو لە شوێنێکی تر یەکتر ببینین؟

ئاسیپ:- بۆ کوڕی باش، پیاوی گەورە هەموو جێیەکی شاسیتەیە.

ڤانجرۆیچ:- نا، تۆ بەکەڵك نایەی، تۆ بێ ئەدەبی!

**ئاسیپ:**- داوای یەکێکی بێ ئەدەبت نەدەکرد، ئەی وا نییە؟

ڤانجرۆیچ:- زۆر دەترسێ:- سووك بدوێ..پلاتۆنۆڤ دەناسی؟

ئاسیپ:- مامۆستایەکە؟

ڤانجرۆیچ:- بەڵێ، ئەو کابرایەکە، زۆر لە خۆی ڕازییەو زۆر خۆی بە گەورە دەزانێ. چەندت دەوێ تا سەری لێ تێکدەی؟ وریا بە، ناڵێم بیکوژی! کوشتن گوناهێکی گەورەیە! بەڵام ئەو ڕوخسارەی ئەوەندەی پێ دەنازێ بیشێوێنی، یەك دوو ددانیشی بشکێنی، بەزمێکی وای پێ بکەی تا عومری ماوە لە بیری نەکات.(پلاتۆنۆڤ لە لای هەیوانێ بە دەردەکەوێ) وریا بە وا یەکێك بەرەو ئێرە دێت! یەکدی دەبینینەوە.

(ئاسیپ بە پەلە خۆی بزر دەکا، لە کاتێکا پلاتۆنۆڤ لە جێگاکە نزیك دەبێتەوە، لەسەر قالدرمەکانی سەرەوە ڕادەوەستێ. ڤانجرۆیچ بەرەو ڕووی دەچێت...)

**دیمەنی یازدەهەم:**

**ڤانجرۆیچ، پلاتۆنۆڤ.**

ڤانجرۆیچ:- لە کێ دەگەڕێی؟

پلاتۆنۆڤ:- لەکەس، دەمەوێ لە خۆم بێ ئاگا بم.

(بێ دەنگی)

ڤانجرۆیچ:- لەززەت بەخشە، وانییە؟ نۆشینی شامپاین و پیاسەی لابەلای ناوداران لە ژێر تریفەی مانگ.

**پلاتۆنۆڤ:-** کە مەست دەبم حەز دەکەم لەسەر ڕووی بورجی بابلەوە لەو ئاسمانە خۆم هەڵدەم! وەرە خۆمان تاقی بکەینەوە.

ڤانجرۆیچ:- سوپاست دەکەم. (لەسەر قاڵدرمەکان دادەنیشێ)من ئاکارم وایە سوپاسی هەموو شتێ بکەم، هاوسەرەکەت لە کوێیە؟

پلاتۆنۆڤ :- چۆتەوە ماڵەوە.

(وەستان)

ڤانجرۆیچ: - دوای ئەوەی ئاهێکی قووڵ هەڵدەکێشێ:- شەوێکی بێ هاوتایە! دەنگی مۆسیقا لە دوورەوە، خەندە، ئاوازی چۆلەکە، فوارەی ئاو، ئاه، باغ پڕ تەنها لە شتێکی کەمە!

پلاتۆنۆڤ:- ئاه، بەڵێ؟ شتەکە چییە؟

ڤانجرۆیچ: -پەرستنی ژنێ کە خۆشمان دەوێ، جا بەدەنگی خۆی گۆمی بێ دەنگی شەو ڕاشڵەقێنێ. فوارەکانی زەمین، بەڵگەی عیشقی ئەون. ئاه ژنەکە...(پلاتۆنۆڤ دەڵێ) وادیارە ئاگات لە خۆت نییە؟ تۆ دەڵێی ئەگەر جیددی بوومایە وا قسەم نەدەکرد؟ ئاوا هەستی جوولەکەیەکی وەك منت بریندار نەدەکرد؟

پلاتۆنۆڤ:-نا، بەهیچ شێوەیەك!

ڤانجرۆیچ:- ڕەنگە تۆ وا بیر بکەیتەوە من بێ هەستم؟ بەڵی سەیرم کە! زۆر بەشاعیران ناچم؟ ئەی وا نییە؟

پلاتۆنۆڤ:- بەڕاستی نەء ؟

ڤانجرۆیچ: - ئا، زۆر باشە پێ خۆشحاڵم. قەت جوولەکەیەك جوان نەبووە، نازانم بۆچی منیش بەوان نەچوومە؟ هاوڕێ، پیرە دایکمان، سروشت، باشە گەمەی پێ کردووین. ئێمە



خۆمان لە نەژادی هونەرمەندانین کەچی ڕوخسارمان پێچەوانە دەنوێنی. مرۆڤ هەمیشە لە ڕووخساری شتەوە بڕیار دەدات، لەبەر ئەوەیە دەڵێن جوولەکەیێ نەبووە بە شاعیر.

پلاتۆنۆڤ:- کێ وا دەڵێ!

ڤانجرۆیچ:- ئاه، هەموو خەڵك، شتێکی ئاشکرایە.

پلاتۆنۆڤ:- بەسە ئەوە ورتە ورتە: کێ وا دەڵێ؟

ڤانجرۆیچ:- ئەو خەڵکە هەموو، بەڵام هەموویشیان درۆ دەکەن، بۆ نموونە سەیری سلێمان و داود بکە. دەبینی، ها، سەیری گۆتە بکە.

پلاتۆنۆڤ:- ببەخشە، گوتە ئەڵمانی بوو.

ڤانجرۆیچ: - بەڵێ، دڵنیام جوولەکەیەکی ئەڵمانی بووە.

پلاتۆنۆڤ:- نانا، ئەڵمانییەکی ڕەسەن بووە.

ڤانجرۆیچ: -دایکی جوولەکە بووە.

پلاتۆنۆڤ:-من دەڕۆم، ئێستا بۆچی لێبکۆڵینەوە،؟

ڤانجرۆیچ:-هەڵبەتە. (وەستان) هەرچۆنێ بێ ئەمە هیچ گرنگییەکی نییە. کێ خەمی شاعیرانییەتی؟ هەموویان مشەخۆر و لە خۆباین. جا باشە (گۆتە) قەت تیکەنانێکی بە کرێکارێکی ئەلمانی داوە؟

پلاتۆنۆڤ هەڵدەستێتەوە بڕوا، دوایی دەگەڕێتەوە:- بەڵام بە هەر حاڵ، ئەو هەرگیز تیکەنانێکیشی لەکەس وەرنەگرتووە ! کێ دەتوانێ وەك ئەو بێ؟ تۆ؟

ڤانجرۆیچ:- قسەی قۆڕ.

پلاتۆنۆڤ :- نەخێر لەوەش زیاتر دەڵێم: شاعیرێك هەزاران بازرگانی نابوود دێنێ، سەد هەزارش زێتر ! دە بەسە، دەی!

ڤانجرۆیچ، بەبێ بیر کردنەوە:- چۆن لە شەوێکی وا تووڕە دەبیت ؟ تکایە دانیشەوە، پلاتۆنۆڤ تۆ بەرگری لە شتان ناکەیت، تۆ دەڵێی لە جیهانێکی دیکە دەژی. بەڵی، تۆ لە چاخی ئێمە دا نەهاتوویتە دونیاوە. لە خۆت مەترسێ ئێمە هەموومان لێرانە زۆر کێوینە، نیوە شارستانین. هەتا ئاناپترۆڤنای بێوەژنش، بەڵام بەهەر حاڵ : چۆن هەڵکەوتووە، زۆر تێگەیشتوو، ئەو سنگەی، ئەو گەردنەی! باشە هەر بە ڕاست من لە تۆ دەبەنگترم؟ ئەگەر لە ژیاندا، ئەم شانسەم دەبوو (مەبەستی ئانا پترۆڤنایە) وا بێنە بەرچاوی خۆت، ئێستا ئەو لە نزیك ئەو

درەختانەیە و پەنجەم بۆ رادەشەقێنی، ئۆف، بەکەڵکی چی دێ تا خۆم نەیبینم، من خۆیشم باش دەزانم، کە دەبەنگم.

پلاتۆنۆڤ :- بەڵام...

(سەیری زنجیری سەعاتەکەی ڤانجرۆیچ دەکات.)

ڤانجرۆیچ:- بۆتە مایەی خۆش بەختی بۆ کەسێکی لە خۆبایی.

پلاتۆنۆڤ بە جۆرێکی گاڵتە ئامێزەوە:- هەڵبەت!! هەژاری ئەو پەڕی بەختەوەرییە!

(بەردەوام دەبێ :) زنجیری سەعاتەکەت لەبەر رۆشنایی مانگ چ بریقەدارە!

ڤانجرۆیچ:- ها ؟ تۆ حەزت لەم شتانە هەیە؟

(پێ دەکەنێ) ئەم شتە هونەرییانە سەرنجی فەیلەسووفەکانیش رادەکێشن ؟ تۆ باسی خووڕەوشتی شاعیرانە دەکەیت و ئێستاش ئامادەیت بۆ نەختێ ئاڵتوون خۆت بکەی بە دز :- هەڵی گرەوە. بە دەبەنگییەوە، (زنجیری سەعاتەکەی فڕێ دەداتە سەر عەرزەکە.)

پلاتۆنۆڤ :- قوورسە.

ڤانجرۆیچ:- نەك هەر بۆ قوورساییەکەی، ئاڵتوون لەبەر دڵی خاوەنەکەیشی وەك ئاسنی قوورس وایە.

پلاتۆنۆڤ لێی دەستێنی:- چەند بە ئاسانی لە دەستی دەکرێتەوە و لێی دەسەنرێ.

ڤانجرۆیچ:-... ئای بێچارەی بێ کەس، چەند برسی، چەند مەست لە ژێر تریفەی مانگدان؟ هەزاران کەس هەن بە هەموو توانایەکیانەوە کاردەکەن و خاوەنی پولێکیش نین پلاتۆنۆڤ لەگەڵ تۆمە بۆ وەڵامم نادەیتەوە.

پلاتۆنۆڤ :- لێمگەڕێ، تاقەتی زرنگە زرنگی کەنیسەم نییە، دەچم دەنووم.

ڤانجرۆیچ:- ئاوا، هەر من بە کەڵکت دێم، ها ! تۆیش بە جۆرێکی دی لێم تێ دەگەی.

پلاتۆنۆڤ :- بەڵێ، بێگومان، بەڵی تۆ بۆ هەموو شتێك بەڵگەت دەوێ شەوێکی شاد! (سەعاتی دیوارەکە لە دوورەوە لێ دەدا).

ڤانجرۆیچ، سەیری سەعاتەکە دەکات :- ها! نزیکی سەعات دووە، ئەگەر عاقڵ بوومایە دەبوایە یەکسەر بچووامایە ماڵەوە. شامپانی و شەونشینی درێژ و نەخەوتن هەموویان بۆ من خراپن و ژیانم لێ تێك دەدەن. هیچ نەزم و رێك و پێکییەك ناهێڵن. (قیت دەبێتەوە) سنگیشم



لێ بەژان دەکەوێ، شەوێکی شاد. (دوور دەکەوێتەوە) من برادەرایەتی تۆ ناکەم، تۆ شاسیتەی ئەوەیت.

پلاتۆنۆڤ: زۆر باشە.

ڤانجرۆیچ: دووبارە دەگەڕێتەوە.

پلاتۆنۆڤ: ها، چییە؟

ڤانجرۆیچ: زنجیری سەعاتەکەم لێرە بە جێ هێشتووە.

(بێ دەنگی) ڤانجرۆیچ بەدوایدا دەگەڕێ.

پلاتۆنۆڤ:- ئابرام ڤانجرۆیچ، خزمەتێکی بچووکم هەیە.

ڤانجرۆیچ:- چییە خزمەتەکەت؟

پلاتۆنۆڤ:- ئەم زنجیرەم بدەرێ، بۆ خۆم نا! کابرایەك دەناسم هەرچەندە ئیش دەکات خاوەنی پوولێ نییە.

ڤانجرۆیچ، زنجیرەکە دەدۆزێتەوە:- بەداخەوە هیچ پەیوەندییەکی بەمنەوە نییە، گەمە بەبیرەوەرییەکانی خێزانێك بکەم.

پلاتۆنۆڤ، هاوار دەکات:- بڕۆ!

ڤانجرۆیچ:- بەم شیوەیە لەگەڵم مەدوێ!

(بەباغەکەدا دەکەوێتە رێ)

پلاتۆنۆڤ هاوار دەکا:- بڕۆ.

**دیمەنی دوازدەهەم:**

**گرکۆڤا، پلاتۆنۆڤ.**

گرکۆڤا، لەماڵ دێتە دەرەوە:- پلاتۆنۆڤ چییە بۆ وا هاوار دەکەی؟ مەستی یان شێتی؟

پلاتۆنۆڤ:- هیچیان نیم، تەنها ڕای خۆم دەربارەی ناپیاوی کابرایەك دەردەبڕم. ئەگەر تۆش حەز دەکەی و بۆ تۆیشی دووبارە دەکەمەوە.

گرکۆڤا:- سوپاست دەکەم! تۆوا چاکترە زیاتر گوێ لە ڕای خەڵك بگری، بزانی چیت پێ دەڵێن، من حەز دەکەم چەند شتێکت پێ بڵێم، ..بەڵام سوودی چییە!

پلاتۆنۆڤ:- دەبیڵێ؟ دەبیڵێ نازدارەکەم!

گرکۆڤا:- من نازدار نیم، ئەوانیش، کە پێم دەڵێن جوانی، بێ زەوقن (وەستان) بەلای تـۆوە من جوانم؟ بەڕاستتە؟

پلاتۆنۆڤ:- دوایی وەڵامت دەدەمەوە، ئێستا ئەو شتانەی دەتەوێ دەربارەی من بیلێی، پـێم بلێ، من چۆن پیاوێکم؟

گرکۆڤا:- بەڕای من تۆ یان بنیادەمێکی لە یاسا بەدەریت یان کەسێکی دەبەنگی هیچیت، یەکێ لەم دوانەیت.٠ پلاتۆنۆڤ پـێ دەکـەنێ) باشـە، دەی پێبکەنـە، مـادام شـتێکی شـایانی پێکەنین هەیە ٠خۆیشی پێدەکەنێ).

پلاتۆنۆڤ، دیسان دەداتە قاقای پێکەنین:- بەقسەی ئەو قەڵەموونە بـچووکە پێدەکـەنم! بـا واز لەوە بێنین، بەردەوام بین. دەستی دەخاتە سەر سنگی گرکۆڤاوە) کـچێکی وەك تـۆ! بـاڵق و ئازاد! کە شارەزایی لە فەلسەفەدا هەبێت! چۆن قسەی وا گێلانە دەکات! لە ئامێزی دەکات.

گرکۆڤا خۆی لە ئامێزی رادەپسکێنێ:- نـا، تکایـە! (خـۆی لـە باوەشـی ڕادەپـسکێنێ و دادەنیشێ) بۆ لەباوەشم دەکەی؟

پلاتۆنۆڤ:- تۆیش هەر ئەوەت دەویست، ئەی وانییە؟ (درێژەی پـێ دەدا) : کـچێکی چـەند تێگەیشتووی. (دووبارە ماچی دەکاتەوە).

گرکۆڤا:- باشە تۆ منت خۆش دەوێ، وانییە؟

پلاتۆنۆڤ:- لاسایی دەکاتەوە:- (تۆ منت خۆش دەوێ؟)

گرکۆڤا، گریان قوڕگی دەگرێ:- ئەگەر منت خۆش نەویستایە منـت مـاچ نـەدەکرد، ئـەی وانییە؟ (دەگریێ) تۆ منت خۆش دەوێ؟ منت خۆش دەوێ؟

پلاتۆنۆڤ:- یەك دەنك چییە نەء نازدارەکەم! بەڵام شێتە بچووکەکانم خۆش دەوێـن! چ بکـەم لەوە زیاترم لە دەست نایێ. فەرموو. ئێستا لە تووڕەییان ڕەنگی پـەڕیوەو چـاوەکانی بریـسکە دەدەن، ئامادەیە زللەیەکم لێ بدات.

گرکۆڤا:- من لە خۆبایم. نامەوێ دەستی خۆم پیس بکـەم. (قیـت دەبێتـەوە) پێـشتر پـێم وتی، کە تۆ یا کابرایەکی ئاسـایی نیـت یـان دەبـەنگ و هیـچیت. بـەڵام ئێـستا تێگەیـشتم ئادەمێکی بێ نرخیت ! رقم لێتە. (بەرەو ماڵ دەبیتەوە) دەستت لە دەستی دەکەمەوە. (بـەرەو ماڵ دەبێتەوەو لەسەر قالدرمەکانەوە نیکۆڵای تیرلیتیزکی دەبینێ).



**دیمەنی سێزدەهەم:**

**نیکۆلای تیرلیتیزکی، گرکۆڤا.**

نیکۆلای تیرلیتزکی :- ئەو هەراو هۆریایە چییە ! قەلەڕەشەکان هێشتا نەخەوتوون؟

گرکۆڤا:- نیکۆلای ئیڤانۆیچ ئەگەر یەك تۆزقـاڵ ڕێـزت بـۆ مـن یـا بـۆ خـۆت هەیـە لـە برادەرایەتی ئەو کابرایە دوورکەوە!

(پلاتۆنۆڤی پێ نیشان دەدات)

نیکۆلای تیرلیتزکی :- پێ دەکەنێ:- بەزەییت هەبێ ماریا، ئەوە زاوامە.

گرکۆڤا:- برادەریشتە!؟

نیکۆلای تیرلیتزکی :- دووپاتی دەکاتەوە:- برادەریشمە!

گرکۆڤا:- کەوابێ من بەهەڵە لە سـەلیقەی تـۆ تێگەیـشتووم، تـۆ پیـاوێکی شـەریفی لـە گاڵتەکردنی خۆت ناکەویت، بەڵام ئێستا وەختی گاڵتە نییە! دەبینی منی سووك کـردووەو پـێم پێدەکەنێ، زۆر باشە برادەرایەتی خۆت هەر بکە.. و بەرگری لێ بکە و ستایشی بکە (دەگرییێ) لەپێش خۆی هەڵێنێ، بیپەرستە، پەیوەندی بە منەوە نییە چاوەڕێی هیچ شتێ لە تۆ ناکەم.

(بەپەلە دەڕواتە ماڵەوە)

**دیمەنی چواردەهەم:**

**نیکۆلای تیرلیتزکی، پلاتۆنۆڤ.**

نیکۆلای تیرلیتزکی :- دیسان بێ ئەدەبانە جووڵایەوە.

پلاتۆنۆڤ:- هیچم نەکردوە.

نیکۆلای تیرلیتزکی :- بۆچی ئەوەنـدەی ئـازاری دەدەی، دەسـتی لێ هـەڵناگری؟ میـشێل ڤاسیلی ڤیچ خۆ تۆ دەبەنگێك نیت، پیر بوویت بە کەڵکی ئەم بەزمە نایێت، بۆ واز لـەو کـچە بەستەزمانە ناهێنی بۆ خۆی بحەسێتەوە؟ (وەستان) هەر بیر لە من بکەرەوەو وا خۆم هاویشتۆتە نێوان هەردوولاتانەوە. دڵم نیوەی لە ژێر دەستی ئێوەدایەو نیوەکەی تریشی هاودەردی کچێکە.

پلاتۆنۆڤ: ببەخشە، بەڵام پێویست ناکات لە نێوان ئێمەدا ئاوا خۆت دابەش بکەیت.

نیکۆلای تیرلیتیزکی :- بێوەژنی جەنەراڵ هەردەم پێم دەڵێ: (تۆ ڕەفتارت لە ڕەفتـاری پیـاوی بەئابڕۆ ناچیت) و بەنموونە تۆ دێنێتەوە، من گومانم لەوە هەیە مەسەلەکە بە پێچەوانەی ببینێ.

پلاتۆنۆڤ:- مەبەستەکەت چاکتر ڕوون بکەرەوە.

نیکۆلای تیرلیتزکی : وا دەزانم تا ڕادەیەکی پێویست مەبەستی خۆم ڕوونکردۆتەوە. لەبەرامبەر من وەك شتێك ڕەفتارت لەگەڵ دەکرد و بەخۆیشت دەڵێیێ بە ئابروو. ئەو کەسانەی خۆیان بە ئابڕوون، خۆیان دەزانن، برادەرەکانیان (عیزەتی نەفسیان) هەیە. دەموت شێت نییە، زاوامە، شێت نییە، ئاه، خۆم دەزانم دەبێ ئاوا خەڵکی ئازار دەدەیت و سووکیان دەکەی؟ بەدەست خۆمان نییە؟ بەڵام ئەوئارام و میهرەبانە و دەزانێ، هەرگیز وەڵامت ناداتەوە، زۆر باشە بەڕاستی من ئەو شتانە هەمووی ئاگام لێیە. خواحافیز، دەڕۆم پێکێ دەخۆمەوە!!

(دوور دەکەوێتەوەو دوایی دەگەڕێتەوە)

پلاتۆنۆڤ:- بوەستە تۆ لە هیچ شتێێ تێناگەی، تۆ هیچ ئاگایەکت لەو دۆزەخە نییە، کەمنی تێدا دەژیم. دۆزەخی پەشێوی و بێ شەرمییە.

تۆ هەرگیز نەفرەت لەو کەسە ناکەیت، کە ڕابردووت پێشان دەدەن. نەفرەت لەوانە ناکەیت کە ڕابردوویەکی لەکیس چووتان پێ نیشان دەدەن و ئارەزووە خەفەکراوەکانی گەنجێتیتان وەبیر دێتەوە؟ کاتێ گەنجین هەموو شتێ ئاسانە، لەشی بەگوڕو بیری کراوە، شەرافەتی لەدەست نەچوو، بێباکی و عەشق بەسەربەستی، بەڕاستی و بە گەورەیی. (پێ دەکەنێ) بەڵام لەناکاو ژیانی ڕۆژانە دەست پێ دەکات و لەناکاو دەبەنگترین وێنەی خۆی پێشان دەدات، ساڵەها بەسەر دەبەین چ دەبینین؟ میلۆنەها مرۆڤی مێشك بەتاڵ دەبینین. بەهەر حاڵ ئەگەر بیر بکەینەوە بژین یان نە؟ هەمیشە زیانێکی بچووکمان لێ دەکەوێ ئەزموونێکی هاوبەش هەر هەیە، ئەویش مەرگە. دووبارە دەگەڕێینەوە خاڵی جووڵانەوە بە پاکییەوە. (وەستان) (کە دێینە سەر ڕووی دونیا دەگرین، چونکە دێینە نێو شانۆی شێتییەوە.)) ترسناکە، بۆ بۆ بیر ناکەیتەوە؟

**نیکۆلای تیرلیتیزکی،** کە بە شێوەی نائاسایی و بە جددییەوە وەری گرتبوو، دێتەوە سەر خۆی:- با بڕۆین، پێکێ بخۆینەوە. من پزیشکی ئێوەم، بۆ ئێستا نەبێ بۆ چی باشم... ئەمشەو ئاناپترۆڤنە چی لێ بەسەر هاتبوو؟ وا پێ دەکەنی و ئەو خەڵکەی لەباوەش دەکرد، دیارە عاشقە.

**پلاتۆنۆڤ:-** کێ دەتوانێ لێرە ئاشقاتی بکات؟ زۆر باوەڕ بەخەندەکانی مەکە، نابێ بەخەندەی ئافرەتێ باوەڕ بکەی، کەگریان نەزانێ. باوەڕم پێ بکە، دەیەوێ وامان لێ بکا مێشکمان بپرژێنێ تا بگریین. خۆ ئەمە لەچاوەکانیدا باش دەخوێندرێتەوە.



**نیکۆلای تیرلیتیزکی :-** بەهەڵە چوویت. ژنان چەکی شەڕیان نییە. ژەهر سەرچاوەی پێوەندییانە لەگەڵ خەڵکی، با چیتر باسی ئەوە نەکەین، تۆ لەگەڵما نایێی؟

**پلاتۆنۆڤ:-** نەخێر.

**نیکۆلای تیرلیتیزکی :** کەوابێ بەتەنیا یان لەگەڵ قەشە دەچم پێکێ دەخۆمەوە. (کاتێ دێتە ژوورەوە، گلاگۆلێیێڤی گەنج لەلای دەرگاوە دەبینێ.) داوای لێبوردن دەکەم گەورەم، هانێ ئەوەش سێ ڕۆبڵ لە جیاتی ئەو مستەی لە شانم دایت.

**دیمەنی پازدەهەم:**

**گلاگۆلییێڤی گەنج، پلاتۆنۆڤ.**

**گلاگۆلییێڤی گەنج** بە پلاتۆنۆڤ دەڵێ:- باشە ئەم ڕێکەوتنە تا ئەو ڕادەیە ناشیرین بوو!

**پلاتۆنۆڤ:-** تۆبۆ سەما ناکەیت؟

**گلاگۆلییڤی گەنج،** بەڕێزو بەجیدییەوە:- سەما؟ لێرە؟ لەگەڵ کێ؟ ڕێگا هەیە داوا لە تۆ بکەم؟ (ئەو دادەنیشێ.)

**پلاتۆنۆڤ:-** بۆچی بەڕای تۆ شۆخێك دەست ناکەوێ؟

**گلاگۆلێیڤی گەنج:-** ئەی سەیرت نەکردوون؟ دەڵێی داربییە چەماوەکانی بان جادەن. لووتیان دەڵێ دەندوکە. خۆشەویستی چی ! ئی ژنەکانیش... (پێ دەکەنێ)... دەم و چاویان غەرقی بۆدرەیە مەگەر شەیتان بزانێ چی دیشیان هەیە. بەڕاستی من نانیشم پێ ناخورێ. ئەو هەناسەیەی ئێمە لە ڕووسیادا هەڵیدەکێشین. ناتوانم، بەرگەی رووسیا ناگرم، چیدیکە بەو فەزاحەت و بێکارییە!!... ئۆف! باشە تۆ پاریست دیوە؟

**پلاتۆنۆڤ:-** نەخێر.

**گلاگۆلێیڤی گەنج:-** بەداخەوە! دەزانی ئێستاش دەتوانی، دەچیتە ئەوێ، من لە نێو ئەو ڕووداوانە بەجێ بهێڵە — گشت ڕازەکانی پاریست بۆ دەدرکێنم. ناوی سێ سەد دۆستت دەدەمێ و بۆ خۆت سێ سەد جوانی فەرەنسی لە باوەش دەگری.

**پلاتۆنۆڤ:-** سوپاست دەکەم، ئەرێ ڕاستە بابت بڕیاری داوە زەرەرو زیانەکانی ئاناپترۆڤنە ببژێرێ؟

**گلاگۆلیێڤی گەنج**، باوێشك دەدات:- بڕوا بکە ئاگام لە هیچ نییە، من بازرگانی هەربە پەسەند نازانم. ئاگات لێیە، بابم چۆن دەورو خولی بێوەژن دەدا؟ ئەو حەیوانە پیرە دەیەوێ زەماوەند بکا. بەڵام بێوەژنیش جوانە ها! (لە شانی پلاتۆنۆڤ دەدات)، ڕاستە دەڵێن (کۆرسیەش)یش دەبەستێ؟

**پلاتۆنۆڤ:**- چوزانم، خۆمن نەچوومەتە جێی خۆ ڕازاندنەوەی ئەو؟

**گلاگۆلیێڤی گەنج:**- ئۆف، من پێیان وتبووم کە...وامزانی...

**پلاتۆنۆڤ،**(بەئارامی):- تۆ دەبەنگیت.

**گلاگۆلیێڤی گەنج:**- گاڵتەت لەگەڵ دەکەم، بۆ تووڕە دەبیت؟ کابرایەکی سەیری، پێم بڵێ بزانم ڕاستە بیستوومە بۆ پارە هەموو شتێ دەکاو دەشخواتەوە.

**پلاتۆنۆڤ:**- جا بۆ ئەمە لە خۆی ناپرسی؟

**گلاگۆلیێڤی گەنج،** هەڵدەسێتەوە:- ڕاستە، فیکرەیەکی جوانە، شەیتان بەنەعلەت بێ، دەچم لەخۆی دەپرسم، پلاتۆنۆڤ بەڵێن بێ چۆنی دەڵێم وایە.

(بەپەلە بەرەو ماڵ دەبێتەوەو بەقاڵدرمەکانی پێش هەیوانەکەدا چوار پایە سەردەکەوێ تیرلیتیزکی و ئاناپترۆڤنا دەبینێ.)

**دیمەنی شازدەهەم:**

**هەر ئەوان، نیکۆلای تیرلیتیزکی، ئاناپترۆڤنە.**

**گلاگۆلیێڤی گەنج:**- ئاه (دەچەمێتەوە)(داوای لێبووردن دەکەم خانم) (دەچێتە دەرەوە)

**نیکۆلای تیرلیتیزکی** پلاتۆنۆڤی پێ نیشان دەدا:- فەرموو ئەوەش ئەو کەسەیە،کە من باسم دەکرد: باڵندەیەکی ڕەشی فەلسەفەیە و چاوەڕێی ڕاووشکارە.

**ئانا پترۆڤنە** بەگاڵتەوە:- چەنگیش لێ دەدا؟

**نیکۆلای تیرلیتیزکی:**-نەخێر، یەکجار بکەوێتە ناو تەڵەوە دان بە زۆر نهێنی ئاشقاتی خۆیدا دادەنێت، کوڕیژگەیەکی بەستەزمانە، داخیشی بۆ دەخۆم، بەڵام لەباتی ئەوەی کە وەك فەلەیەك خۆی مەست بکات، دوور دەکەوێتەوە، (بەردەوام دەبێت :) ئاه، لەبیرم چوو، ژوانم هەیە! قەشە لەبۆفە وا چاوەڕێم دەکات. (بەپەلە دەچێتە دەرەوە)



**دیمەنی حەڤدەهەم:**

**ئاناپترۆڤنە، پلاتۆنۆڤ.**

**ئاناپترۆڤنە** بەرە لای پلاتۆنۆڤ دێت:- بۆچی لە خەڵکی دوور دەکەویتەوە؟

**پلاتۆنۆڤ:**- هەوای ژوورەوە زۆر گەرمە و بنمیچی گەچ هەر وایە، دەرەوە خۆشترە.

**ئاناپترۆڤنە** لە پاڵی دادەنیشێ :- بەڵێ، بەڕاستی شەوێکی دڵگیرە، هەوایەکی خۆش و شێداری هەیە! مانگ دەڵێی فانۆسە، جێگای داخە، کە ژنان حەقی خەوتنی ژێر تیشکی ئەستێرەکانیان نییە. وەختێ گەنج بووم دایکم شەوانی هاوین ڕێگەی پێ دەدام لە هەیوانی بەردەم ماڵەکەمان بنووم. (وەستان)...ئەمشەو بۆینباخەکی تازەت بەستووە.

**پلاتۆنۆڤ:**- بەڵێ، دوێنێ شەو کڕیم.

(وەستان) (جووڵانەوەکانی ئەم دیمەنە لە دوورەوە بەباشی بەردەوام دەبێت.)

**ئاناپترۆڤنە:**- ئۆف، نازانم چیم لێ بەسەر هاتووە، هەموو شتێکم خۆش دەوێ، میشێل بۆ بێدەنگی؟ من هاتووم گوێ لە قسەکانت بگرم.

**پلاتۆنۆڤ، بەزەردەخەنەوە:**- زۆر باشە هاتوویت گوێ لە قسەی من بگری؟

**ئاناپترۆڤنە:**- دووبارەی دەکەمەوە نازانم! واهەست دەکەم ئەمشەو لە جاران زێترم خۆش دەوێی، خۆشەویستییەکی وا، ئەمشەو.....

**پلاتۆنۆڤ:**- ئەی تۆ، تۆیش زۆر جوانی! لە ڕاستیدا تۆ هەردەم جوانی.

**ئاناپترۆڤنە:**- پلاتۆنۆڤ یەکترمان خۆش دەوێ ئەی وا نییە؟

**پلاتۆنۆڤ:**- باوەڕ بکە پەیوەندییەکی بەتینم لەگەڵ تۆدا هەیە ئانا پترۆڤنە. هیچ شتێ ناتوانێ هەستی من بەرامبەر بە تۆ بگۆڕێ، هیچ شتێ، قەت..

**ئاناپترۆڤنە:** کەوابێ ئێمە دوو دۆستی گەورەی یەکین؟

**پلاتۆنۆڤ:** بەڵێ.

**ئانا پترۆڤنە:** زۆر باشە (وەستان) خۆشەویستم، قەت بیرت لەوە کردۆتەوە خۆشەویستی نێوان ژن و پیاوێك ئەنجامێکی هەبێ و بتوانن هەنگاوێ هەڵێنن؟ (پێ دەکەنێ)

**پلاتۆنۆڤ:** بەڵێ، بەڵام من وتۆ، چونکە من و تۆ هەنگاومان بچووکە قەت بەرەو دۆزەخ ناچین.

**ئانا پترۆڤنە:** بۆچی ئێمەش بنییادەم نین؟ دڵداری شتێکی خۆشە، بۆ سوور هەڵدەگەڕێی؟

**پلاتۆنۆڤ:** تۆ حاڵت باشە، وەرە با لەسەر ئاوازی ڤالس سەما بکەین!

**ئاناپترۆڤنە:** نەخێر، تۆ نازانی سەما بکەی! من حەز ناکەم قسەی جددی لەگەڵ تۆدا بکەم. وەرە تۆزێ لە ماڵ دوور کەوینەوە. (لەسەر قەڵەرەوێڵیەکی دی دانیشین.) ئەمشەو زۆر سەیرە نازانم لە کوێوە دەست پێ بکەم.

**پلاتۆنۆڤ:** حەز دەکەی یەکەم جار من دەست پێ بکەم؟

**ئاناپترۆڤنە:** پلاتۆنۆڤ تۆ گەلحۆیانە دەدوێی! قسەکانت بێ فەڕن وگوێشت لێ دەگرم، ئای میشێلی ئازیزو نەفام لە کورتیدا بیبڕەوە!

**پلاتۆنۆڤ:** باشی هەمووی بەیەك وشە دەردەبڕم و دەڵێم (بۆچی؟)

**ئاناپترۆڤنە :** ئەی بۆچی نا؟ (وەستان) باسەربەستیش بی لەوەی، کەمن بکەی بەهاوسەری خۆت، بەڵام ئەی بیری لێ ناکەیتەوە.(جەناب) من خۆم لەدەست تۆ قوورتار دەکرد. (ساتێ بێ دەنگی) کێ دەڵێ نا. (وەستان) پلاتۆنۆڤ ئەگەر لەگەڵمایت راست دەکەی بۆ بێ دەنگ دەبی.

**پلاتۆنۆڤ:** ئاناپترۆڤنە با واز لەم قسانە بێنین توخواکەی ئەگەر واز لەم شتانە نەهێنی!

**ئاناپترۆڤنە،** (شانەکانی بەرز دەکاتەوە):- هەندێ جار لەخۆم دەپرسم دەڵێم باشە بڵێی پلاتۆنۆڤ ئەوەندە تێگەیشتوو بێ وەك خەڵکی باسی دەکەن؟ (لەسەری دەڕوا: ) هەر هیچ نەبێ تۆ خۆت بۆم روون کەرەوە بزانم بۆ چی وایە؟

**پلاتۆنۆڤ:** چونکە ڕێزت دەگرم، حەز ناکەم ئەو ڕێزگرتنەت نەمێنێ. من پەکم پێ نییە، ئەگەر شوێنێکی باش بەخۆم بدەم و مەسەلەی دڵدارییەکی نهێنی ڕەت بکەمەوە، بەڵام بەرگەی ئەوەی ناگرم بەشداری کارەساتێکی گومان لێکراو بکەم، کە بۆ ئێوە مایەی خەفەت بێ. یەك دوو مانگان گەمژانە لەگەڵ یەك دەژین و دوایی بە شەرمێکی زۆرەوە لێکدی جودا دەبینەوە، من شتی وام گەرەك نییە.

**ئاناپترۆڤنە:** بەڵام من باسی دڵداریم دەکرد!

**پلاتۆنۆڤ:** زۆر باشە بەڵام ئایا من تۆم خۆش ناوێت؟ تۆم بە دڵە، تۆ نازدارو میهرەبانی، بێ گومان من خۆشم دەوێی، بەڵام نائومێدانە، من لە پێناوی تۆدا دەژیم.

**ئاناپترۆڤنە:** بەڵام خۆی عەشق و دڵداری وایە، هەمیشە دەبێ لە بێ نرخترین دەرەجەیدا ئاشکرا بکرێ؟



**ئاناپترۆڤنە** بەدەم هەڵسانەوە: زۆر باشە، ئازیزم شەوێکی شاد. دوایی قسەی لێدەکەین. ئەمشەو هیلاکی.

**پلاتۆنۆڤ:** من هەروەك خۆت دەزانی ژنم هێناوە.

(دەستی ئاناپترۆڤنە ماچ دەکات.)

**ئاناپترۆڤنە:** تۆ هەموو بە هەموو شێوەیێ منت خۆش دەوێ، بڕۆ! بۆچی ئێستا لەم کاتەدا باسی ژنەکەت دەکەیت؟

**پلاتۆنۆڤ:**- هیوادارم تووڕە نەبیت؟ ئەگەر بۆم دەکرا ئێستا ماوەیەك بوو ئەڤیندارت بووم.

(دێتە ژوورەوە)

**ئاناپترۆڤنە:** کابرایەکی چەند بێ سەبری. خۆیشی دەزانێ بەبێ من ناتوانێ بژی، بەڵام (ڕێزی دەگرم).

**دیمەنی هەژدەهەم**

**پیرەگلاگۆلییێڤ، ئاناپترۆڤنە.**

**پیرەگلاگۆلییێڤ،** دەگەڕێ! دەچێتەوە بۆ قولغەکەی. پیرە گلاگۆلییێڤ تووڕە دیارە. بە پەلە دێت.) :- قسەی لەگەڵ دەکەم و دەڕۆم!

**ئاناپترۆڤنە:** ئەوە لە ژێر لێوەوە چ دەڵێی، پرۆڤێری سمۆنۆویچ.

**پیرەگلاگۆلییێڤ** لە پر ئارام دەبێتەوە:- ئاه، ئەوە تۆ لێرەیت؟ لە تۆ دەگەڕام.

**ئاناپترۆڤنە:** دەتەوێ چیم پێ بڵێی؟

**پیرەگلاگۆڵیێڤ** تۆزێ شەرمەزار دەبێ:- خوایە، لە ڕاستیدا تەنها دەمویست پێ بکەوم بزانم ئاناپترۆڤنە بۆ وەڵامی نامەکانم چ دەڵێ؟

**ئاناپترۆڤنە :** چیت لێم دەوێ، پرۆڤێری سمۆنۆیچ.

هاوسەرم هەیە چاوپۆشی لێ دەکەم. ماڵەکەم بەهەشتێکە و فریشتەی تێدا نییە.

**ئاناپترۆڤنە:** من نازانم لە بەهەشت چی دەکەی؟ نازانم؟ بەڵام دەزانی بەیانی چی دەکەی؟ دەتوانی بۆ خۆت رۆحێکی گەورە لە ئاسمان و زەوی بدۆزێتەوە.

**ئاناپترۆڤنە:** وادەزانم هەتا ئێستاش ژیان بەسەر بردن لە ژورێك لەگەڵ تۆدا بەكەڵكی من نایێ. پرۆڤێری سمۆنویچ داوای لێ بووردنت لێ دەكەم، بەڵام لەم پێشنیازە سەرم سوورِماوە بۆچی زەماوەند بكەین؟ تۆ پێویستی چییت بە خۆشەویستی ژنێك هەیە؟ بێگومان ئەوە پەیوەندی بە منیشەوە نییە، بەڵام من لە جیاتی تۆ بوومایە، و ئەو سامانەیشم هەبووایە، ئەومیهرەبانی و راست گۆییەی تۆیشم هەبوایە، پێویستم بە هیچ نەدەبوو، ئەگەر دڵیش خۆشەویستی گەرەك بووایە، ئەوا پێشنیازی یەكێكم دەكرد هاوشان و ئاووكوفی خۆم بووایە. (هاوشانی خۆت خۆش بوێ)

**پیرەگلاگۆلییێڤ :** گاڵتەم پێ مەكە، من ئامادە نیم سەیری هاوشانەكەم بكەم. بۆ عەشق و خۆشەویستی هاوشانەكانی خۆت. دەبێ زۆر چاپووك بیت و پشتیوانت هەبێت، بەڵام من هیچیانم نییە. من هەوڵمدا كاری چاك ئەنجام بدەم، كەچی بەئاژاوە بەسەرمدا كەوتەوە. لە هیچ شتێكدا وام بەسەر نەهاتووە، مەگەر خۆشەویستی بۆ خۆی بۆ لام بێت.

**ئاناپترۆڤنە:** نەخێر، با واز لەم قسانە بێنین! باوەڕ بكە ئەوانەی داوات رەت دەكەنەوە ئینسانی خراپ نین. (پێ دەكەنێ دەنگە دەنگێ لە راراوەكەدا بەرگوێ دەكەوێت) خوای گەورە، ئەم دەنگە دەنگە چییە؟ حەتمەن پلاتۆنۆڤە و دیسان ریسواكراوە. (بەبێ تووڕەیی) بنیادەمێكی سەیرە!

**دیمەنی نۆزدەهەم:**

**هەر ئەوان، گرگۆڤا، نیكۆلای تیرلیتیزكی.**

گرگۆڤا و نیكۆلای تیرلیتیزكی بەدەم قسەكردنەوە دێنە ژورەوە. لە دوای میوانەكانی دی، وەك: گلاگۆلییێڤی گەنج و پێترن و بۆگەرۆڤ دێنە ژوورەوە.

**گرگۆڤا،** دەگری، كەمێك تووڕەیشە:- من قەت وا سووك نەكراوم.

(بە تیرلیتزكی دەڵێ:) ئینسان دەبێ لە هەموو پیاوەتییەك بێ بەری بێ، بۆ ئەوەی بێهەڵوێست بێت!

**نیكۆلای تیرلیتیزكی:** ماریا گرگۆڤا، من لە تۆ دەپرسم، باشە دەمتوانی نەبوایە. برۆ! برۆ! ئەگەر هەرییەكێك بەم شێوەیە رەفتاری لەگەڵ بكردایە، من بەو ژنایەتییەی خۆم قایل نەدەبووم!

**نیكۆلای تیرلیتیزكی:** نا وا لە دوورەوە لە شتەكە مەڕوانە، تۆزێ لیێ تێ بگە...



**گرگۆڤا:** تەمبەڵ. تەوەزەڵ، بگەڕێوە بۆفە پیسەكەت، نامەوێ چیدی بتبینم، خواحافیز.

**نیكۆلای تیرلیتیزكی:** تكام وایە ئیشەكە وا گەورە مەكە، دوایی نەخۆش دەكەوم. ئەو فرمیسكانەت چییە، ئۆف، خوایە، سەرم دەسوورێ! مێشكم لە كەللەدا نەماوە.

**دیمەنی بیستەم:**

**گرگۆڤا، ئانا پترۆڤنە، پیرە گلاكۆلییێڤ.**

تیرلیتیزكی لە كاتێكا سەری خۆی گرتووە، بەبێ توانایی دوور دەكەوێتەوە، گرگۆڤا لەسەر قەرەوێلەیەك دادەنشێ و بەدەنگێكی بەرز دەگری.

**گرگۆڤا:** مێشكم نەماوە! خوایە! چیم كردبوو وا بەم شێوەیە سووكت كردم؟

**ئاناپترۆڤنا** بۆ لای دەچێت: ماریا ئەفیمۆڤنا، تكات لێ دەكەم، من ئەگەر لە جێی تو بوومایە لێرە نەدەمامەوە. (لە ئامێزی دەكات :) ئازیزم، مەگریی، ژنان بە سووك كردنی پیاوان زیاتر جەزرەبە دەكێشن.

**گرگۆڤا** بە هاوارەوە: نا من دەبێ تۆڵەی بكەمەوە، ئەگەر ئەوەی من دەیزانم بیلێم لە قوتابخانە دەری دەكەن. سبەینێ زوو پێش هەموو شتێ دەچمە لای قوتابخانە نەتەوەییەكان.

**ئاناپترۆڤنا:** زۆرچاكە. ئێستا ئارامبە مەگری ! بەیانی دێم بۆ دیدەنیت. بزانم چی روویداوە؟

**گرگۆڤا :** لە پێش چاوی هەموان منی ماچ كرد، وەك شێتێك لەگەڵما جووڵایەوە، پاشان فرێی دامە سەر مێزێك. (دەردی لە گیانم) (گرگۆڤا دەچێتە دەرەوە.)

**ئاناپترۆڤنا،** بانگی یاكۆڤ دەكات :- یاكۆڤ، یاكۆڤ. گالیسكە بۆ ماری ئەفیمۆڤنا ئامادە بكە.

**دیمەنی بیست و یەكەم**

**ئاناپترۆڤنە، پیرەگلاگۆلییێڤ، گلاگۆلییێڤی گەنج.**

**ئاناپترۆڤنە :-** ئای، پلاتۆنۆڤ، پلاتۆنۆڤ! هەر بزانە لەو رۆژانە چیت بەسەر هات!

**پیرە گلاگۆلییێڤ:** كچێكی نازدارە، بەڵام وەك دەڵێن مامۆستاكان خۆشیان ناوێ لەبەر ئەوە شتێكی ئاساییە ئەگەر هەستیان بریندار كردبێت.

**ئاناپترۆڤنە:** زۆر جددی نییە. ئەم شەو گەلەکی هەڵگێر و وەرگێر پێ دەکات و سبەینێش دێت داوای لێ بردوونی لێ دەکات. ئەمە ئیشێتی.

**گلاگۆلییێڤی گەنج،** لە تەنیشتی :- پیرەشێت. هەمییشە لەگەڵ ئەوە!

(دەچێتە لای باوکی) باشە ؟

**پیرەگلاگۆلییێڤ :** ئێستا تۆ چیت دەوێ ؟

**گلاگۆلییێڤی گەنج :** چیم دەوێ ؟ بەلام باوکە تۆ خەڵکی لەلای خۆیانەوە دەلێت دەبێ چی بەسەر هاتبێ ؟

**پیرەگلاگۆلییێڤ :** کێ ؟

**گلاگۆلییێڤی گەنج:** ئەو خەڵکە.

**پیرەگلاگۆلییێڤ:** من دەڕۆم. (قیت دەبێتەوە بە ئانا پترۆڤنا دەلێ :) خاتوونە ئازیزەکەم ئەم مەسەلانە خۆیان چۆنن با وا بن. کە جوابت لێ گیرامەوە هەموو شتێ دەگۆڕێ.

(دەچێتە دەرەوە)

**دیمەنی بیست و دووەم:**

**گلاگۆلییێڤی گەنج، ئانا پترۆڤنە.**

**گلاگۆلییێڤی گەنج،** لە تەنیشت ئانا پترۆڤنا دادەنیشێ:- پیرەمێردی خلەفاو. خۆ کەسیش چاوەڕیی ناکات، دەزانێ گاڵتەم پێکرد.

**ئاناپترۆڤنە :** نەختێکی تر بە ساڵا بچیت، بەرامبەر بەو رەفتارانەی لەگەڵ باوکت دەیکەیت پەشیمان دەبیتەوە.

**گلاگۆلییێڤی گەنج :** دەمخەیتە پێکەنینەوە. بە هەر حاڵ: من خۆم لە دەستی ئەو ڕزگار کرد، تا لەگەڵ تۆ بە تەنیا بمێنمەوە.

**ئاناپترۆڤنە:-** ئاه؟

**گلاگۆلییێڤی گەنج :-** من وەڵامی ئێوەم دەویست: (بەڵێ) یان (نەء)؟

**ئاناپترۆڤنە:** چی؟

**گلاگۆلییێڤی گەنج:** زۆر گاڵتەم پێ مەکە. زۆر باش دەزانی، بەڵێ یان نا ؟

**ئاناپترۆڤنە:-** دووبارەی دەکەمەوە، کە تێ ناگەم مەبەستت چییە ؟



**گلاگۆلییێڤی گەنج:** دەزانم برێ پارە بیرت دەخاتەوە، بەڕاستی (جانتای پارەکانی دەردێنێ:) ئەگەر وەڵامەکەی بەڵێیە ئەوا ئەو پارانەت بەر دەکەوێ و ڕەنگە زیاتریشی تێدا بێت.

**ئاناپترۆڤنە:** تۆ زۆر قسەی لە ڕووی. بەڵێ هەندێ جار وا ڕێ دەکەوێ خەڵکی زۆر ئاقڵیش شەپازللایەکی دەوێ (بەڵێ)!

**ئاناپترۆڤنە** قیت دەبێتەوە : کڵاوەکەت هەڵگرەو یەکسەر بڕۆ دەرەوە.

**گلاگۆلییێڤی گەنج:** بۆ کوێ؟

**ئاناپترۆڤنە:-** هەر کوێیەکت پێ خۆشە. ئیدی نامەوێ بتبینم.

**گلاگۆلییێڤی گەنج :** ئاه...خۆت تووڕە مەکە، من ناڕۆم ئاناپترۆڤنە.

**ئاناپترۆڤنە:-** ئاوا دەرت دەکەم.

(بەرەو ماڵ دەڕواتەوە)

**گلاگۆلییێڤی گەنج،** بەدووی دەکەوێ:- خوایە، ئەم ژنە چەند حەساسە! چیم نەکردووە، خۆ من چیم نەکردووە، ئەم بەزم و ڕەزمەی نایەوە!

(بەدووی دەکەوێ).

**دیمەنی بیست و سێیەم:**

**پلاتۆنۆڤ، سۆفیا**

دەنگی مۆسیقای سەما، پێکەنینی مێوانان و زەنگی سەعاتی بان دیوار، بەرگوێ دەکەوێت و شەو ئارامە. پلاوتۆنۆڤ و سۆفیا دێنە ژوورەوە.

**پلاتۆنۆڤ:** من لەم دنیایە چ جێ و ڕێم نینە، مامۆستایەکم و ساڵانی زێڕینم ڕۆیی و بەجارێ فەرامۆشیان کردووم، هەموو شتێکم لە دەست چوو، هەموو شتێك، تەنیا لاشەکەم ماوەتەوە، سۆفیا، ئیدی من هەمووی سی ساڵم تەمەن نەماوە، جا ئومێدی چیم بێ. بوومەتە بووکە شووشەیەکی لە تەختە دروستکراو. ژیانێکی بابردەڵەو پاشانیش مەرگ چاوەڕوانمە. ئومێد دەکەم بچمە دۆزەخ، بەڵێ، بەلام ئەی تۆ؟ کوانێ گیانی پاکت؟ کوانێ هاوڕێیەتیت؟ هاوکاریت؟ (دەستی دەگرێ) ئازیزەکەم، ڕاستم پێ بڵێ، تو رابردووی هاوبەشمان، پێم بڵێ چی بووە هۆی ئەوەی ئەو پیاوە بۆ هاوسەریت هەڵبژێری؟

**سۆفیا:** ئەو وەك خەڵكی دی نییە.

**پلاتۆنۆڤ:** درۆ مەکە.

**سۆفیا**، هەڵدەسێتەوە: ئەو هاوسەری منەو دەبێ داوات لێ بکەم کە...

**پلاتۆنۆڤ** قسەی پێ دەبڕێ و ناچاری دەکات دانیشێتەوە:- بەلای منەوە هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ خەڵکی ترا نییە، من راستیت پێ دەڵێم، بۆ کرێکاریت هەڵنەبژارد؟ یەکێك جەور بکێشێ بۆچی ئەو کابرا رەشەت هەڵبژارد وا کەوتۆتە ژێر باری قەرزەوە؟ بۆچی لە نێو ئەو هەموو خەڵکە ئەو؟

**سۆفیا:** بەسە، هاوار مەکە، هەر تەنیا ئێمە لێرە نین.

(کۆمەڵی مێوان لە ماڵ دێنە دەرەوە و رەت دەبن)

**پلاتۆنۆڤ:** ئەگەر گوێیان لێ بێت ئەوجا باشە! لەو رووگرژیەم ببوورە، من تۆم خۆش دەویست، لەم دنیایەدا لە هەموو شتێ زیاتر خۆشم دەویستی.(دەست بەگۆنای سۆفیا دادێن) منداڵی بەستەزمان! بۆچی پۆدرە لە دەموچاوت دەدەی، سۆفیا ئەگرۆڤنا؟ ئەم پۆدرەیە پاك بکەرەوە، ئەگەر بتتوانیبایە جگە لە مێردەکەت بە دیداری پیاوێکی دیکە گەیشتبای ئەو پۆدرەیەت پاك دەکردەوە؟ ئەگەر تواناو شانسێکی باشترم دەبوو، سۆفیای ئازیزم، لەم زەلکاوە رزگارم دەکردی و نیشانم دەدای چۆن چۆنی بژیت.

(چەند مێوانێکی دی دەچنە دەرەوە، سەروسەدا لە ماڵەکەدا بەرگوێ دەکەوێت، سۆفیا لە پلاتۆنۆڤ دوور دەکەوێتەوە.)

**سۆفیا**، بەپێوەیە و بە هەردوو دەستی دەموچاوی خۆی داپۆشیوە:- وازم لێ بێنە، بڕۆ.

(بەرەو ماڵ دەبێتەوە.)

**پلاتۆنۆڤ** دەستی دەگرێ: بەڵێنم پێ بدە کە بەیانی نارۆینەوە... ئێمە دۆستی یەکدین، سۆفیا. دیسان بە دیداری یەك شاد دەبینەوە، ئەی وا نییە؟ دەبلێ: بەڵێ.

**سۆفیا:** بەڵێ.



**دیمەنی بیست و چوارەم:**

**هەر ئەوان، ڤۆی نیترۆڤ، ئانا پترۆڤنە، نیکۆلای تیرلیتیزکی، پیرەگلاگۆلییێڤ، گلاگۆلیڤی گەنج**

مێوانەکانی دی بە هۆی ڤۆی نیترۆڤەوە هیدایەت دەکرێن، هەموویان بە جۆش و خرۆشەوە دەدوێن.

**ڤۆی نیتزۆڤ:** ئاه، ئەوان کە ئێمە بە دوایاندا دەگەڕاین!

(بە پلاتۆنۆڤ دەڵێ:) بابچین ئاگربازی بکەین!

(بەرەو ڕاڕەوەکە رادەکەن) یاکۆڤ!

(بو سۆفیا دەڵێ:) ها بیرت کردەوە، سۆفیا؟

**پلاتۆنۆڤ:**- بڕیاری دا کە بمێنێتەوە.

**ڤۆی نیتزۆڤ:** ئافەرین!! مێشێل دەستم بگوشە! دەمزانێ بڕیارێکی چاك دەدەیت و ئەقڵت دینێتەوە سەر. با بچین ئاگر بازییەکە ببینین! (لە خەڵکی جیا دەبنەوە، بەردەوام دەبێ:) دایە، تۆ لە کۆییت؟

...پلاتۆنۆڤ !

**پلاتۆنۆڤ:** بەنەعلەتی شەیتان بن، من دەبێ بڕۆم (بە هاوارکردنەوە:) وادێم سێرگی پاڤلۆوڤیچ! دایمەگیرسێنە! چاوەڕیم بکەن.

(بەدووی خەڵکەکەدا دەڕوا، لەوکاتەدا ئاناپترۆڤنە لە ماڵ دێتە دەرەوە.)

**ئاناپترۆڤنە**، لەگەڵ تیرلیتزکی لەماڵ دێنە دەرەوە:- سێرگی هێواش کە، هێواش، مێوانەکانی دیش وا دێن. (بە سۆفیا دەڵێ: ) ئەوە بۆ وا ڕەنگت هەڵبزرکاوە، زۆر غەمگین دیاریت، هیچ بووە؟ - دەڕواتە دەرەوە، سۆفیا دەمێنێتەوە، لە باغ دوور دەکەوێتەوە.

**دەنگی پلاتۆنۆڤ:** کێ بە کەشتی لەگەڵما دێت؟

(هاوار دەکات:) سۆفیا ئەگرۆڤنا!

**سۆفیا، بەگومانەوە:** بڕۆم؟

**سەدای ڤۆی نیتزۆڤ:**- تیرلیتیزکی لە کوێیە! هۆی تیرلیتیزکی.

**نیکۆلای تیرلیتیزکی**، بەڕاکردن لە ماڵ دێتە دەرەوە:- هاتم ! هاتم ! (کە سۆفیا دەبینێ، دەوەستێ و سەیری دەکات.)

**سۆفیا :** ها چیت لێم دەوێ؟

**نیکۆلای تیرلیتیزکی:** هیچ.

**سۆفیا:** لوتفت هەبێ و بەتەنیا جێم بهێڵە، ئەمشەو تاقەتم نییە گوێ لە هیچ قسەیەك بگرم، قسەکردنیش ئەوە هەر هیچ!

**نیکۆلای تیرلیتیزکی،** بەبۆڵە بۆڵەوە:- تێدەگەم تێدەگەم، نازانم بۆ حەز دەکەم خاچێکت بە نێو چاواندا بکێشم، ئاه، زۆر حەز دەکەم بەڵام بۆچی ؟ نەك بۆ سووك کردنی تۆ بەڵك بۆ زڕاندنی ووشەی داوێن پاکی و بەس)!

**سۆفیا:** فێڵباز! (دوور دەکەوێتەوە.) فشەکەر!

**نیکۆلای تیرلیتیزکی،** دەچەمێتەوە:- داوایەکتان نییە ! من شانازی بەوە دەکەم بەرامبەرتان مل کەچ بم، دەمویست لەگەڵتان بمێنمەوەو لەگەڵتان بدوێم، بەڵام بانگم دەکەن، ماندووم. (ئای گوڵە هەنگ کوژ، لەگەڵ دوعاکانی خۆتدا گوناحەکانی منیش بێنەوە یادت.)

(دەچێتە دەرەوە. ئاگربازی دەت پێ دەکات.)

**سەدای ڤۆی نیتزۆڤ:** کێ بەبەلەم دەگەڵ پلاتۆنۆڤ دێت؟

**سۆفیا:-** ئاخر چی بکەین؟... (هاوار دەکات) من دێم؟!

(دەچێتە دەرەوە. پلاتۆنۆڤ و ڤۆی نیتزوڤ بانگ دەکات. هەر دوو گلاگۆلییێڤی گەنج و پیر لە ماڵی ڕا دێن.)

**پیرەگلاگۆلییێڤ،** زۆر هەستی دەبزوێ و دڵشادە:- تۆ درۆ دەکەی خوێڕی پیس، کە منداڵیش بوویت درۆزن بووی، باوەڕت پێ ناکەم.

**گلاگۆلییێڤی گەنج:-** خۆت پرسیاریی لێ بکە، بۆ درۆت لەگەڵ دەکەم؟

هەتایت تۆ ڕۆیشتی ئەو دەستی بەنازو خۆڕازاندنەوە کرد، منی لە باوەش گرت و ماچی کردم، هەوەڵجار داوای سێ هەزار ڕۆبڵی دەکرد، قسەم لەگەڵ کرد، دەی دەی دوا جار هاتەوە سەر هەزار ڕۆبڵ، بێنە تۆ هەزار ڕۆبڵم بدەرێ.

**پیرەگلاگۆلییێڤ:-** تۆ باسی شەرەفی ژنێك دەکەیت، کیریل! وابێ نرخی مەکە، شەرەفی شتێکی پیرۆزە، وس بە!

**گلاگۆلییێڤی گەنج:-** بەشەرەفم. تۆ باوەڕ بەقسەی من ناکەی؟

هەزار ڕۆبڵم بدەرێ تا بۆی بەرم.



**پیرەگلاگۆلییێڤ:-** من باوەڕ بەقسەکانت ناکەم، گاڵتەی پێ کردووی گەلحۆ.

**گلاگۆلییێڤی گەنج:-** من! پێت دەڵێم رازیم کردووە، ئەمرۆ ژنان هەموو هەروان، من دەیناسم، تۆ دەتویست بیهێنی.

**پیرە گلاگۆلییێڤ:-** کیریل، تو خودا تۆ خۆشت دەزانی چ دەڵێی ؟

**گلاگۆلییێڤی گەنج:-** ئەم هەزار ڕۆبڵەم بدەرێ، لەبەر چاوی خۆت دەیدەمێ، بەڵام تۆ باوەڕ بە قسەکانم ناکەیت، کە پێت دەڵێم دەتوانم ژنان ببەزێنم، دوو هەزار ڕۆبڵی خۆت بدە، ئەو دەبێتە ماڵی تۆ.

**پیرەگلاگۆلییێڤ،** جزدانی پارەکەی دەردێنێ:- بگرە.

(جزدانی پارەکەی دەخاتە سەرئەرز، کوڕەکەی جزدانەکە هەڵدەگرێتەوە بە وردی ئەسکەناسەکان دەژمێرێ. پیرەگلاگۆلییێڤ دادەنیشێ، لە کاتێکدا هەر دوو دەستی بەسەرییەوە گرتووە: ) من سوێندم بەو دەخوارد، ئاه، پەروەردگار!

## پەردەی دووەم

## پلاتۆنۆڤە شێت

**قامیــشە لان، کۆمــەڵێ دیمــەنی دەوروبــەر، دەســتە چــەپ قوتابخانــە. دوورتــر ستوونەکانی تەلەگراف بەر چاو دەکەون. شەوە.**



**دیمەنی یەکەم:**

**ئاسیپ، ساشا**

ساشا لە رۆخ پەنجەرە دانیشتووە، ئاسیپ تفەنگێکی بە دەستیەوەیە و لــە دەرەوە چـاوەڕێ دەکات.

**ئاسیپ:**- چۆن هاتە پێشەوە؟ (بەو پەڕی سادەییەوە).

**ساشا:**- ئەی تۆ چۆن ئەوت نەبینی؟

**ئاسیپ:**- هەر ئەو ڕۆژەی گەیشتمە دێ لە قەراخ رووبار پیاسەم دەکرد، لەناکاو ئەوم بینی. لەناو ئاوێ بووم و دامەنی خۆی هەڵکردبوو و ئاوی دەخواردەوە، راوەستام، سەیرم دەکرد، ئــەو سەیری منی نەدەکرد، ئەمن زۆر بەجووتیاران ناچم، بەم شێوەیە قسەم لەگــەڵ کــردو پــێم وت: (خاتوونەکەم، چون دەکرێ جەنابتان حەز لەئاوی ڕووبار نەکەن؟...وتی:(ئاگات لە زمانــت بــێ، بڕۆ ئیشی خۆت.) ئەمەی وت و چی دی تێم ڕانەما، من شەرمەزارم، شەرمەزار. وتی: (گەمژە بۆ وا خۆت لێرە بەعەردە دادایە؟ قەت ژنت نەدیوە؟) ڕێك دەیڕوانییە نێو چاوزانم: (یان وادیارە منت خۆش دەوێ؟) وەلامم دایەوە: (ئاه، خاتوونەکەم، ناتوانم ڕێگا بــەخۆم بــدەم و بڵــێم، کــە چەندم خۆش دەوێی) پێکەنی، منیش گــوتم ئــەو کەســە دەبــێ چ شانــسێکی هــەبێ، کــە تــۆ لەباوەشی دەگری، بێگومــان یەکــسەر دەمــرێ و هەڵناســێتەوە) وتــی: (زۆر باشــە، دەخــۆت تاقیکەرەوە ببینە!) بــەم شــێوەیە هــێن و منهــێن دەســتی پــێ کــرد، لیــێ نزیــك بوومــەوە، نەجوولاوە، لە باوەشم کرد، لێوەکانیم ماچ کرد.

**ساشا،** (بەخەندەوە):- باشە، باشە دوایی چیت وت؟

**ئاسیپ،**بە دەنگێکی بەرز پێکەنی و وتی :(دە ئێستا بمرە !)...

**ساشا:**- ئێ ئەتو چیت کرد؟

**ئاسیپ:**- نەء من وەك نەفامێك ئارام وەستابووم و یاریم بە ڕدێــنم دەکــرد، ئــەویش وتــی: (شێتە، بگەڕێوە سەر ئیشی خۆت و نینۆکەکانت بکەو ئەگەر بۆت کــرا خۆیــشت بــشۆ.) ئــەو ڕۆیشت و بەم شێوەیە منیش ئاشقی بووم.

**ساشا:**- ژنێکی سەیرە. (قاپێکی دەداتە دەستی) بگرە. دانیشە ئاشەکەت بخۆ.

**ئاسیپ:**- دەتوانم ڕاوەستم.(چێشت دەخوا) ڕۆژێ دێ یادی ئەو چاکانەت دەکەمەوە.

**ساشا:-** زۆر باشە، جارێ دەست بەو کارانە بکە، کە پێت دەڵێم. کاتی نان خواردن کـڵ و دێینە خوارەوە. (ئاسیپ کڵاوەکەی دادەگرێ ئەی بۆ هیچ کاتێ بەرامبەر نان دوعا ناکەی؟

**ئاسیپ:-** بێ ئەوەی جەختە لەسەر وشەی (ئەم کارە) بکا: ئاه، ماوەیەکی زۆرە من کارم وا ناکەم. (بێ دەنگی، نان دەخوا)، وەکو وتم: لەو ڕۆژەی بەدواوە، من هەرگیز وەك پێشترێ نیم. خوو خۆراکم لێ هەڵگێڕاوە. (نان دەخوا) هەمیشە ئەو دێتە بەر چاوم، ئەگەر چاوەکانیشم ببەستمەوە هەر لەبەر چاومە. (نان دەخوا) هەوڵ جار ویستم خۆم بخنکێنم، بەڵام من وەك سەگی ئاوی مەلەوانم، دوایی بیرم لەوە دەکردەوە مێردەکەی بکوژم، بەڵام پیرەمێردێکی شێتۆکە بوو، لەسەر قەرەوێڵەیەکەی بوو بێ ئەوەی ئاگای لەمن بێ ئیشەکانم کرد، خزمەتم کرد، دڵم مردووە، ئەمەش بۆ پیاو لە هەموو شتێ خراپترە، بەڵام چی بکەم؟

**ساشا:-** کە من عاشقی میشێل ڤاسیلی بووم، وامدەزانی ئەو گرنگی بە هیچ نادا وەك شەهیدێك رەنج دەدا، زۆربەی کات دوعام دەکرد مەرگیم دەخواست، لەناکاو ڕۆژێکیان سبەینە بوو لە لای باوکم هاتەوەو لێی پرسیم: (کیژۆڵە، دەڵێی چی زەماوەند بکەین؟) لە خۆشیاندا گریام و هەموو لە خۆبایی بوونێکم نابەلاوە و خۆم بە شان و ملی دا شۆڕ کردەوە.

**ئاسیپ:-** بەڵێ، بەڵێ، جوانە.(قاپەکەی بە بەتاڵی دەداتەوە دەستی) کەمێك شۆربای کەلەرم نەماوە؟ زۆرم برسییە.

(ساشا، ساتێ دەچێتە ژوورەوە. ئاسیپ پەنجەکانی پاك دەکاتەوە. ساشا دەگەڕێتەوە.)

**ساشا:-** نەخێر، بەڵام پەتاتەمان هەیە لە ڕۆنی پەرەوەردا سوورکراوەتەوە، حەزت لێیە؟ قاپێکی گەورەی بۆ رادەگرێ.

**ئاسیپ:-** سوپاس (قاپەکەی لێ وەردەگرێ و بەدەست پەتاتەکان هەڵدەگرێ و دەیخوا.) ساڵی پار کەروێشکێکم پەیدا کردبوو زۆر دەگمەن بوو، وتم: باشە دەی ئەمەش شتێکی تازەیە. کەروێشکێك چاوی خێل بوو. کەروێشکەکەی لێ وەردەگرتم و لەسەر چۆکی خۆی دادەناو دەیلاواندەوە ئینجا لیێ دەپرسیم: ((نازانم، خەڵکی بە نەوعێك باست دەکەن، راستە؟ دەزانی تۆ زۆر وەحشی ؟ منیش وەڵامم دەدایەوە : (بەڵێ، راستە.) ئینجا باسی بوونی خۆم بۆی کرد، کە چۆن بڕوام بە خوا نییە. ئەویش پێی وتم: (پێویستە ڕێگەی راست بگری.) بەپیادە تا (کیف) بڕۆم لەوێشەوە بۆ ئورشەلیم ئەوجا بەتەواوی دەگۆڕێی، بە شێوەیەکی باشتر دەگەڕێیەوە.)کیسەیەکم هەڵگرت و بەرەو (کیف) بەرێ کەوتم.(چێشتەکە دەخوا) پاشان، کە



گەیشتمە خارکۆف لەگەڵ کۆمەڵێ دز و ڕێگر پەیوەندیم پەیدا کرد، هەرچی پارەو پوولم هەبوو بەئارەق خواردنەوە سەرفم کردو گەڕامەوە. (بێ دەنگی). ئێستا نایەوێ دوای ئەوە ببینێ.

**ساشا:-** ئاسیپ، بۆ نارۆیتە کڵێسا؟

**ئاسیپ:-** ئەو خەڵکە سەیرن، دەڵێن: (پەشیمانن و داوای بەخشین دەکەن). نەء پێویست ناکات، ئەو گێلانە لەوە بگەن.

**ساشا:-** ئاسیپ، بۆچی قسەی ناشیرین بەجووتیاران دەڵێی ؟ جارێکیان تۆم بینی لە پیاوێکت دەداو ناچارت دەکرد لەبەر دەمتا بە ئەژنۆدا بکەوێ، تۆ بۆ وا بێ بەزەییت؟

**ئاسیپ:-** بۆچی نایەنە سەر ڕێگای ڕاست؟

**ساشا:-** بۆ ئەوەیان مەسیح وتویە...

**ئاسیپ:-** نا، نا، تۆ لەم بارەیەوە هیچ نازانی، باشە مێردە بەرێزەکەت لە منداڵان نادا؟

**ساشا:-** ئەگەر لێشیان بدا، لەبەلاش لێیان نادا، بۆ ئەوە لێیان دەدا ڕێگای راستیان پێ نیشان بدات.

**ئاسیپ:-** ئم..م..م.

**ساشا :-** لەناخی دڵەوە هەموویانی خۆش دەوێ، زۆر ڕێك و پێکە.

**ئاسیپ:-** من قەت ژنی وەك تۆم نەبینیوە، بەدخوو نەبێ.

(قاپەکە دەداتەوە ساشاو نەختێ نزیکتر دەبێتەوە، ساشا هەڵدەستێتەوە و کەمێك لێی دوور دەکەوێتەوە.)

**ساشا:-** گوێم لە دەنگی مێردەکەمە وا دەگەڕێتەوە.

**ئاسیپ:-** ئەڵبەتە وا نییە. ئەو خەریکی گفتوگۆیە لەگەڵ (خاتوونی ڕاستەقینەی جیهان)، کابرایەکی سەیرە، ژن هەمووی وەك پیشیلە بە دووی کەوتوون، رەفتارەکانی ئەویان پێ خۆشە). (قسەکانی دڵگیرن.) (پێ دەکەنێ) ئەو هەموو دەمێ لە دوی بێوەژنێیە، بەڵام ئەو هەر لە کۆڵ خۆی دەکاتەوە، هەر بزانە لەم ڕۆژانە تووشی دەردی سەری خۆی بوو.

**ساشا:-** زۆر قسە دەکەی، برۆ بنوو، خوا ئاگادارت بێ.

**ئاسیپ:-** ئاه، من گاڵتەم بەخوا دێت، باشە ئەوە بەڕاستی چاوەڕێی مێردەکەتی؟

**ساشا:-** بەڵێ.

**ئاسیپ:-** پلاتۆنۆڤ دەبێ هەموو هەفتەیەك دەرزەنێ مۆم بۆ پیاوچاکان بسوتێنێ، کە خوا تۆی پێ بەخشیوە و سوپاسگوزار بێت.

(بەفیکەوە دەڕواتە دەرەوە. دوای دەرچوونی ئەو ساشا بە خۆی و بە چرایەك و بەکتێبێ دەگەڕێتەوە.

**دیمەنی دووەم:**

**ساشا بە تەنیایە**

**ساشا:-** کات درەنگە.(دادەنیشێ) ئەو ئەگەر بەس ئاگای لە خۆی بێ، ئەو شەونشینییانە ئازاری دەدا. (باوێشك دەدا) منیش ماندووم، لە کوێ بووم؟ (دەخوێنێتەوە) (ڕۆژێکی خۆڵەمێشیی زستان...) (باوێشك دەدات: ) تاقەتم نییە ئەوە بخوێنمەوە هەمووی هەر وەسفە.(پەڕەکە ئاوا دەکات، گوێ دەگرێ:) یەکێ بۆ ئێرە دێت مێشێلە ؟ دواجار.

(قیت دەبێتەوە و چرایەکە کز دەکات) من لێرەم.

چەپ، چەپ،چەپ، ڕاست،چەپ !

**دیمەنی سێیەم:**

**نەء، ئەء، پلاتۆنۆڤ و ساشا**

**پلاتۆنۆڤ،** دێتە ژوورەوە:- نەء نەء تۆ بەهەڵەدا چوویت، ڕاست، ڕاست، ڕاست، چەپ، ڕاست، بچکۆلانەکەم،وەك فەرمانێکی ناسروشتی پێشەوە، دوواوە، سەرەوە و خوارەوە لێك جیادەکاتەوە.

**ساشا:-** دانیشن ئەوەی بیری لێ دەکەمەوە پێت دەڵێم، دانیشە.

**پلاتۆنۆڤ:-** بفەرموو. (دادەنیشێ. ساشا هەردوو دەستی لە ملی دەکا) (وەستان) کچە ناشیرینە بچکۆلانەکە تۆ بۆچی نەخەوتووی؟

**ساشا:-** خەوم نایێ، (لە نزیك ئەو دادەنیشێ) شەوێکی خۆشت بەسەر برد ؟

**پلاتۆنۆڤ:-** سەما کردن، خواردن، فیشەکە شێتە. حەتمەن فیشەکە شێتەت پێ خۆشە.

**ساشا:-** کە گەیشتمەوە ماڵێ بەچکەکەمان وا قەواقی بوو.



**پلاتۆنۆڤ:-** پیرەگلاگۆلییێڤ تووشی دڵەکوتێ بوو بوو.

**ساشا،** بە خرۆشانەوە:- خوایە گیان ! ئەی ئێستا چۆنە؟

**پلاتۆنۆڤ:-** دیار بوو براکەت تەماشای دەکرد.

**ساشا:-** باش دیار بوو؟

**پلاتۆنۆڤ:-** لە باغ ئەم دڵە کوتێییەی گرت. کوڕە گەلحۆیەکەی هەر گوێشی پێنەدا.

**ساشا:-** من سۆفیا ئەگرۆڤنام زۆر بەدڵە، زۆر شکۆمەندە، جا ژنێکی چەند جوانە!

**پلاتۆنۆڤ:-** ئاه، دیسان پەکم کەوت. (بەهەردوو دەستی دەم و چاوی دادەپۆشێ): شەیتان چۆتە کەوڵمانەوە.

**ساشا:-** پێم بڵێ چیت کردووە؟

**پلاتۆنۆڤ:-** بێ مانایە، شەرمەزارییە. مەگەر تەنها ئەو خوایە خۆی بزانێ چی بەسەر دێت.

**ساشا:-** وەرە بنوو، ناتوانی چی دی لەسەر پێیان ڕابوەستی.

**پلاتۆنۆڤ:-** هەر بیر دەکەمەوە، من براکەتم بەند کردووە، ئای ساشا، باشە هیچ گیانی دۆستایەتیم تێدا دەمێنێ؟

**ساشا،** بە میهرەبانییەوە:- با بچین، بنووین.

**پلاتۆنۆڤ:-** لە خەڵکیش خراپتر ڕەفتارم لەگەڵدا کرد، چۆن دەتوانم نرخێك بۆ خۆم دابنێم؟ بەدبەختی لەوە گەورەتر چییە مرۆڤ نەتوانێ نرخێك بۆ خۆی دابنێ، خوایە، شتێکم نەماوە ببێتە هۆی خۆشەویستیم، یان ڕێزێك بۆم...بەڵام لە هەمانکاتدا، باشە تۆ منت خۆش دەوێت؟ ڕاستییەکەی نازانم بۆچی.. باشە تۆ توانیوتە شتێ لە من بدۆزیتەوە بێتە هۆی ئەوەی منت خۆش بوێ؟ تۆ منت خۆش دەوێ؟

**ساشا:-** ئەمە چۆن پرسیارێکە. چۆن دەتوانم تۆم خۆش نەوێ؟ تۆ مێردم نیت؟

**ساشا:-** ئەمشەو تۆ چەند ناخۆشت کرد، نازانم لێت تێناگەم.

**پلاتۆنۆڤ** بەخەندەوە:- خۆشبەختبە و خۆت کوێرکە (هەنیەی ماچ دەکات.) خوا تێت گەیەنێ، خۆشەویستم، تۆ ژنێکی شایستەی.

**ساشا:-** ئەو قسە هیچانە چییە.

**پلاتۆنۆڤ:-** نەء ڕاستییەکەی تەواو تێگەیشتم، تۆ نابێ ژن بیت، تۆ دەبی مشك بیت، گێڵە بچکۆلانە ئازیزەکەم، تۆ بۆچی وەك مشکێك نەهاتیتە دونیاوە؟ بەو عەقڵەی هەتە بۆ خۆت

چاکترین زیندەوەری دونیا دەبوویت. تۆ ئاوا کوڕەکەمانت هەڵگرتبوو ؟ تۆ دەبوایە چەندان سەرباز لە نانی پرداویە بسازێنی. (پلاتۆنۆڤ دەیەوێ ماچی بکا.)

**ساشا** بە تووڕەییەوە:- وازم لێ بێنە! مادام گێڵم بۆ منت هێنا؟ بە داخەوەم، ئەی بۆ یەکێ لە دۆستە ئاقڵەکانی خۆت هەڵنەبژارد. خۆ من داوام لێ نەکردبووی بمهێنی.

**پلاتۆنۆڤ:-** خوایە ببەخشە، ئەمەشیان تازەیە: تۆ دەتوانی تووڕە بیت!

**ساشا:-** ئەی تۆ، تۆ مەستی، زۆر باشە، لێرە بمێنمەوە و بە قسەکانی خۆت زیاتر خۆت سەرخۆش بکە، من دەچم دەنووم.

(بەپەلە دەچێتە ژوورەوە)

**دیمەنی چوارەم:**

**پلاتۆنۆڤ، بەتەنیایە.**

**پلاتۆنۆڤ:-** مەستم؟ ئەشێ، گەر من مەست نەبم گشت ئەو هەموو دەبەنگییانەم لەگەڵ نەدەکرد...(دەڕوا بچێتە ژوورەوە، دەنگی چوار ناڵی ئەسپێك دەگاتە بەر دەرگای ماڵەوە، دێتە بەرگوێیەوە دەوەستێ.) دەبێ کێ بێ؟ ئاناپترۆڤنە!

**دیمەنی پێنجەم:**

**ئانا پترۆڤنە، پلاتۆنۆڤ**

**ئاناپترۆڤنە،** جل و بەرگی ئەسپ سواری پۆشیوەو قامچەیەکی بە دەستەوەیەو دێتە ژوورەوە:- وامزانی هێشتا نەخەوتوون.

**پلاتۆنۆڤ:-** بەڵام...

**ئاناپترۆڤنە:-** خوا زستانی بۆ نووستن داناوە، وا نییە؟ (وەستان) چیتان بەسەر هاتووە؟ دەستان درێژکەن. (پلاتۆنۆڤ دەستی بۆ لای ئەو درێژ دەکا) ئەوە چییە سەرخۆشی؟

**پلاتۆنۆڤ:-** بەڵام بۆ...وا لە خەوان کوێر دەبیت؟ وەرە تۆزێ هەوا هەڵمژە، خەو زڕاوی ئازیز و بەرڕێزم.



**ئاناپترۆڤنە،** لە پاڵی دادەنیشێ:- بەڵێ و نەخێر. میشێل ڤاسیلیڤیچی زۆر خۆشەویستم. (پێ دەکەنێ) بەو چاوانەت تێم دەڕوانی، کەلەبەر نەزانینی خۆت هەر دەم لەگەڵ ترس شەڕیانە.

**پلاتۆنۆڤ:-** من ناترسێم. هیچ کاتێ نە لە خۆم و (وەستان ئینجا دوای ساتە وەختێ) باشە تۆ بۆچی نارەحەتیت؟

**ئاناپترۆڤنە:-** ئەوەیان بۆ حیسێبی پیری بەجێ بێڵە.

**پلاتۆنۆڤ:-** ئەم هەوەسبازییە لە ژنێك قبوول دەکرێت، کە پیر بووبێت، بەڵام تۆ سەیرێکی خۆت بکە، تۆ گەنجییت...

(ئانا پترۆڤنە، دەیەوێ قسە بکات) وس. تۆ جارێ هەرەتی لاویتە، هێشتا عومرێکت لە پێش ماوە.

**ئاناپترۆڤنە:-** بەڵام من خۆم نامەوێ عومرێکم لە پێش بێ، من ئێستا ژیانم دەوێ. بەڵێ ئەمشەو، هەست بە گەنجییەتی خۆم دەکەم، بە راستی هەست بە گەنجییەتی خۆم دەکەم!

(وەستان.)

**پلاتۆنۆڤ:-** چیت لێم دەوێ، من هیچم ناوێ بەرێی خۆتدا بڕۆ. (وەستان...) تکات لێ دەکەم وازم لێ بێنە. (وەستان)...وازم لێ بێنەو واتێم مەڕوانە (وەستان.) بۆ ئازارم دەدەیت؟

**ئاناپترۆڤنە،** بەقاقاوە:- بەڵێ من ناچارت دەکەم، بەڵێ. هەتا بە زۆر ناچارت دەکەم. زۆر باشە ئەمە دوا هاوارە.

**پلاتۆنۆڤ:-** بۆچی من، لە نێو ئەو هەمو خەڵکە؟ من ناتوانم بەرەنگاری تۆ ببمەوە، من زۆر بێ دەسەڵاتم، لێم تێ بگە.

**ئاناپترۆڤنە،** لێی نزیك دەبێتەوە:- هەوەڵ جار لەبەر لوت بەرزی خۆم، ئینجا بۆ سووك کردنی خۆم! پلاتۆنۆڤ بۆ بەرگری لە خۆت دەکەیت؟ سوودی چییە! دەبێ ئەم بەزم و ڕەزمە کۆتایی بێت.

**پلاتۆنۆڤ:-** چۆن شتێ تەواو بکەم، کە هێشتا دەستم پێ نەکردبێ؟

**ئاناپترۆڤنە:-** ئاه، لەبەر خۆت و فەلسەفە سەنگینەکەت ! تۆ کاتی خۆت هەمووی بە درۆ بەسەر دەبەیت، بەتایبەتی شەوێکی وەك ئەمشەو.

میشێل ئەگەر حەزێ دەکەی درۆی بکەی لە پاییزاندا بیکە، کاتێ، کەباران دەبارێت و هەموو شتێ رەش و پڕ گڵە، نەك ئێستا کە، سەیرکە تۆ شێتیت، تەماشای ئەستێرەکان بکە! تەماشایان کە لە بەرانبەر درۆیەکانی تۆدا دەدرەوشێنەوە!

(ئاناپترۆڤنە، لە باوەشی دەکات)، کەسێ شك نابەم لەم دونیایە بە قەد تۆم خۆش بوێ، هیچ ژنێك لە دونیادا بەقەد من تۆی خۆش ناوێ تەنها بە عەشق رازی بێ و دەسبەرداری هەموو شتێ بێ. (دووبارە پلاتۆنۆڤ ماچ دەکاتەوە).

**پلاتۆنۆڤ:-** بەس ئەگەر دەمتوانی خۆشحالت بکەم. (ماچی دەکات.) ئای خوایە گیان تۆ چەندە جوانی، چەند نازکی، بەڵام من ناتوانم خۆشحاڵت بکەم وم زۆر زۆر بەدبەخت دەکەم، وەك هەموو ئەو ژنانەی تر،کە هاتنە لام و بەدبەخت بوون.

**ئاناپترۆڤنە:-** تۆ زۆر خۆت بەجددی دەزانی، وادەزانی وەك خۆت بیری لێ دەکەیتەوە ئاوەها ترسناکیت، دۆن جوان؟ (بەخەندەوە: ) لە ژێر تریفەی ئەو مانگەدا چەند جوانی! چەند دڵێری.

**پلاتۆنۆڤ،** بەساردییەوە:- من خۆم چاك دەناسم. (وەستان) ئەم جۆرە پەیوەندییانە تەنیا لە داستانەکاندا کۆتاییەکی چاکیان هەیە.

**ئاناپترۆڤنە،** بەدەم قسەکردنەوە، قۆڵی دەگرێ :- با لێرە دانیشین.

_لەسەر کۆلکە دارێك دادەنیشین، (وەستان.) کاکی فەیلەسووف، هیچی دی ماوە پێە بلێی؟

**پلاتۆنۆڤ:-**  ئەگەر ڕاستگۆ بوومایە هەڵدەهاتم، ترسنۆکی نەعلەتی.

**ئاناپترۆڤنە،** :- میشا، چەند شێتی: هەڵگرە، وەرگرە، خۆت خاوەن بە! (بەبێ هیچ تووڕە بوون بزەی دێتێ، پاشان گاڵتە بە میشێل دەکات): مێشێل، تۆ دەبەنگێکی واقیعییت، زۆر گەلحۆی ! ژنێك بۆ خۆی دێتە لات، خۆشی دەوەێی، تۆ خۆشت دەوێ، ئەم شەوە جوانە، چی لەوە ساناترە؟

**پلاتۆنۆڤ:-** ئاناپترۆڤنە، من تۆم خۆش دەوێ، من تۆم خۆش دەوێ و ڕێزت دەگرم...

**ئانا پترۆڤنە،** قسەی پێ دەردەبڕی:- لە نوێوە دەست پێ مەکەرەوە...

**پلاتۆنۆڤ:-** ... بەکورتی : من ڕێگا نادەم بە پلانێکی وا تڕوهات هەڵمخەلەتێنی.

**ئاناپترۆزڤە،** لێی نزیك دەبێتەوە:- تۆ منت خۆش دەوێ و ڕێزم دەگری، من تۆم خۆش دەوێ و پێشم وتوی وچاك دەیزانی، لەوە زێتر چی هەیە؟ (پلاتۆنۆڤ دەجوولێتەوە)، بەڵام من پێویستیم



بە ئارامی هەیە. (سەری بەسنگی پلاتۆنۆڤ دەکات.) بەئارامی، لێم تێ بگە، دەمەوێ پشوویەك بدەم و هەموو شتێ لە بیر خۆم بەرمەوە، هیچی دیم ناوێ خۆت دەزانی ژیانی من هەمووی دەردو ئازارە، من دەمەوێ بژیم.

**پلاتۆنۆڤ،** لەباوەشی دەگرێ:- گوێم لیێ بگرە... بۆ دواجار بەڕاستی پێت دەڵێم: برۆ.

**ئاناپترۆڤنە،** بەخەندەوە:- بەجێت ناهێڵم، حەز دەکەی هاوار بکە، بنەڕێنە، ئەوەندە فەلسەفە بێنەوە تا هەناسەت لەبەر دەبڕێ، من ناڕۆم.

**پلاتۆنۆڤ:-** لەبەر خاتری من...

**ئاناپترۆڤنە:-** خاترت بەجەهەننەم (دەستماڵەکەی وەك هەوسار لە ملی شەتەك دەدا.) دەی وەرە، وەرە...

**پلاتۆنۆڤ،** بەخەندەوە خۆی بەدەستەوە دەدات:- تۆ شێتی...بە خۆیشت نازانی چ دەکەی...

**ئاناپترۆڤنە،** بە پێکەنینەوە:- برۆ...(قۆڵی پلاتۆنۆڤ دەگرێ.) وەرە دەی خێراکە (دەنگی گۆرانی تیرلیتزکی لە نزیکەوە دێت.") هێواش کە! وا یەکێ هات. با خۆمان لە پشت ئەو دارە بشارینەوە.

**دیمەنی شەشەم:**

**نیکۆلای تیرلیتیزکی، ساشا.**

نیکۆلای تیرلیتیزکی دێتە ژوورەوە. مەستە.

**نیکۆلای تیرلیتیزکی،** لە پەنجەرەوە هاوار دەکات:- ساشا، خوشکە بچکۆلانە، ساشا، دەمەوێ بێمە ژوورێ.

**ساشا،** لە ژوورەوە:- کێیە، ئەوە؟

**نیکۆلای تیرلینزکی:-** دەزانم (کەمێ وەستان.) منیش بۆیە لێرەم...

**ساشا:-** بۆ نەچوویتە ماڵێ؟

**نیکۆلای تیرلیتیزکی:-** ئازیزم ئەو هەموو پرسیارانەم لێ مەپرسە، من ماندووم، ڕێگام لێ بزربووە، بهێڵە با ئەمشەو لێرە بخەوم.

**ساشا:-** وا دێم دەرگات لێ دەکەمەوە.

**نیکۆلای تیرلیتیزکی:**- ساشا، با میخائیل نەزانێ من لێرەم. دووبارە دەکەوێتە بەر لۆمەو سەرزەنشتان، دەچم لە ژووری دەرز خوێندن دەخەوم.

(نیکۆلای تیرلیتیزکی لە پەنجەرەدا دیارە، کە سەر دەکەوێ)

**ساشا:**- ئەوەندە قسە مەکە، خێراکە.

**نیکۆلای تیرلینزکی:**- بەڕاست بیرم کەوتەوە، لە نیزیك پردەکەوە دەمویست لووتم پاك بکەمەوەو، دەستە سڕەکەم دەرهێنا و چوار ڕۆبڵم لا بزر بوو، لوتفت هەبێ بەیانی بڕۆ بیاندۆزەرەوە، جوان ئەو ناوە بگەڕێ، ئەگەر دۆزیتەوە بۆ خۆت بێ.

**ساشا**، هەر ئەو گاڵتە جاڕیانەمان پێ دەوی :- خوایە، خەریك بوو لە بیرم بچێ : ژنی بەقاڵەکە بە دواتدا دەگەڕا، مێردەکەی نەخۆشەو هەناسەی تەنگ بووە، دەبێ زوو بچیت.

**نیکۆلای تیرلیتیزکی** :- خوا رەحمی پێ بکا! من چیم پێ دەکرێ، ساشا. خۆیشم نەخۆشم، سەرو دڵم ژانێ دەکا، لێگەڕێ با بێمە ژووری.

(دێتە ژوورەوە)

**ساشا**، بە دڵخۆشییەوە:- ئاه، وریا بە، بە پۆتینەکانت مەمدە بەر سەرەچمکان!

ساشا پەنجەرەکە دادەخا، ساشا و نیکۆلای تیرلیتیزکی بزر دەبن. ئاناپیرۆڤنە و پلاتۆنۆڤ لە ناوەڕاستی شانۆدا تووشی یەك دەبن.

**دیمەنی حەفتەم:**

**پلاتۆنۆڤ، ئاناپترۆڤنە**

**پلاتۆنۆڤ:**- شەیتان بەنەعلەت بێ، خوایە، ها، دیسان یەکێ هات.

**ئاناپترۆڤنە:**-وازم لێ بێنە، حەزم لە هەرچی بێ دەیکەم.

**ئاناپترۆڤنە:**- پێترن و بۆگەرۆڤن.



**دیمەنی هەشتەم**

هەر ئەوان، **پێترن و بۆگەرۆڤ.**

پێترن و بۆگەرۆڤ دێنە ژوورەوە، بەم لاو بەولادا دێن و چاکەتەکانیان لەسەر شان نییە. یەکەمیان کڵاوێکی رەشی بڵندو ئەوی دیان کڵاویکی خۆڵەمێشی لەسەرە.

**پێترن**، هۆ ! رۆ!هۆ! رۆ!- رێیەکە لە کام لایە؟ ئیمە لە کوێین؟ (پێ دەکەنێ.) پردە خۆشەویستەکەم، ئێرە میللەت فێرە حەرام خواردن دەکات. لێرە مناڵەکان فێر دەکەن، کە خوا لە بیرببەنەوەو هەڵگەڕێنەوە، لێرە پیاوێکی رۆشنبیری وەك پلاتی پلاتۆنۆڤی تیا دەژی، ئیستا ئەو پلاتی پلاتۆنۆڤە لە کوێیە؟ بێ شك ئیستا لەگەڵ بێوەژنێ بە دوو قۆڵی گۆرانی دەچڕن.

(**پێترن** گۆرانی دەڵێ):

(گلاسوتو، تۆ شێتی، ئەو تۆ لە کۆڵ خۆی دەکاتەوەو تۆیش دڵە کوتێ دەگری.)

**بۆگەرۆڤ** وا پشان دەدات دەگری :- جراسیا، دەمەوێ بگەڕێمەوە، زۆرم خەو دێت.

**پێترن:**- کوا چاکەتەکانمان؟ دەمانەوێ ئەمشەو لە لای سەرۆکی رێگای ئاسنین رابوێرین و چاکەتەکانیشمان نەبەین؟ کچەکانی ئەوێ هەڵیانگرتۆتەوە. شامپانی زۆرت خواردەوە، وا نییە؟ لە راستیدا تۆ هەرچییەکت تووش بێ پەیوەندی بە منیش هەیە، ئەو شتانەی خواردبێشت، ئەرێ جلەکانی بێوەژنیش لای منە. ئەوانە هەموویان لەگەڵ من بەدکارن، ئەری ئەوە من چیم لێ قەوماوە، وا هەموویان لە من روو گرژن.

**پلاتۆنۆڤ:**- لەوە زیاتر بەرگەیان ناگرم.

**ئاناپترۆڤنە**، تێی رادەمێنێ:- وازبێنە ئێستا دەڕۆن.

**پێترن:**- ئەو جوولەکەیەش شایانی رێزە، ڤانجرۆیچیش بۆ خۆی بزەو نانی چاکی دەست دەکەوێ- ئێ بۆ؟ چونکە ئەو جوولەکەیە، پارە بەقەرز بە خەڵك دەدات ! ئەوە من بەیانی فەرمانی دەست بەسەر داگرتنی رەهنەکەم دەردەکەم. هەر بەیانی، من ناتوانم، بەرگەی ئەوە ناگرم ئەوەندە خۆم تووڕەکەم. ئەو ژنە دەکوژم، بەر شەقی دەدەم...

**دیمەنی نۆیەم:**

**پلاتۆنۆڤ، پێترن، بۆگەڕۆڤ.**

**پلاتۆنۆڤ،** بازدەدات:- بڕۆن، گۆڕ بەگۆڕ بن.

**پێترن:-** چی بووە؟

**پلاتۆنۆڤ:-** نازانم؟ چاکی لیَ بدات! ها!

**پێترن** بە نیگەرانییەوە:- بۆ توورە دەبیت؟ سوودی نییە. ڕێگا لە کوێیە؟

پلاتۆنۆڤ خواحافیز، ئەوەی دەربارەی بێوەژنی وتم بیستت؟

**پلاتۆنۆڤ:-** بەڵێ.

**پێترن:-** شتی وای پێ نەڵێی، گاڵتەم دەکرد، خۆی شتی وا نییە؟

**پلاتۆنۆڤ:-** زۆرباشە، بەڵام یەکسەر وەبەر شەقی بدەو گراسیم کولزمیت: ئەگەر جارێکی دەی لە ماڵی ڤۆی نیتزۆڤ بتبینم، یان ئەگەر دووبارە ببیستمەوە باسی ئەو شازدە هەزار ڕۆبڵە بکەی، لە پەنجەرەی ڕا فڕێت دەدەمە خوارێ.

**پێترن:-** کوڕەلاو دەزانم. پارەکان بۆ خۆت، جا من کێم هەیە.

**دیمەنی دەیەم:**

**ئانا پترۆڤنە، پلاتۆنۆڤ.**

**ئاناپترۆڤنە،** وەدەردەکەوێ:- ڕۆیشتن؟

**پلاتۆنۆڤ:-** بەڵێ.

**ئاناپترۆڤنە:-** با ئێمەش بڕۆین !

**پلاتۆنۆڤ:-** هەر چییەك تۆ دەیڵێی، بەڵام هەر خوا بۆ خۆی دەزانێ، چەندە رقم لە خۆم دەبێتەوە... شەیتان چۆتە کلێشەمەوە، ئێستاش یەخەم بەرنادات. (هاوار دەکات:) بڕۆ! بڕۆ!)

**ئاناپترۆڤنە،** بەقەمچییەکەی لێی دەدات:- بێ ئەدەب! ئێستا بڕۆی یان بمێنیتەوە... بەلامەوە هیچ فەرقی نییە.

(ئانا پترۆڤنە، دوور دەکەوێتەوە)

**پلاتۆنۆڤ،** لە ئامێزی دەکات:- هێواش کە، من نەمدەویست تۆ سووك بکەم...

**ئاناپترۆڤنە،** خۆی لە باوەشی ڕادەپسکێنی:- بەڕاستتە!



**دیمەنی یازدەهەم:**

**هەرئەوان، ساشا**

**ساشا،** لە ڕۆخ پەنجەرەوە دەردەکەوێ:- مێشێل! مێشێل! ئەوە تۆ لە کوێی ؟

**پلاتۆنۆڤ:-** شەیتان بەنەعلەت بێ!

**ساشا:-** ئاه، ئەوە تۆ لێرەیت...کەست لەگەڵە؟

**ئاناپترۆڤنە:-**ساشا ئیڤانۆڤا، شەوباش.

**ساشا:-** ئەوە بەڕاست ئاناپترۆڤنە تۆیت؟ بەجل و بەرگی ئەسپ سوارییەوە؟ لە شەوێکی وا خۆش دا ئەسپ سواری چەند خۆشە.

**ئاناپترۆڤنە:-** من نەختێ رادەوەستم.

**ساشا:-** چۆنێك خۆت پێت خۆشە، مێشێل تۆ دییت؟ نیکۆلا نەخۆشە، ئارەقێکی زۆری خواردۆتەوە، وەرە، تکات لیَ دەکەم تۆیش ئاناپترۆڤنە، وەرە ژوورەوە من دەچم ئاو لە سەماوەرەکە دەکەم و چاییەك دەخەمە سەر.

**ئاناپترۆڤنە:-** نەخێر، سوپاس، من دەبێ بگەڕێمەوە. (بە پلاتۆنۆڤ دەڵێ.) چاوەڕێت دەکەم.

**ساشا:-** میشا وەرە.

(ساشا لە پەنجەرەوە بزر دەبێت.)

**دیمەنی دوازدەهەم:**

**پلاتۆنۆڤ، ئاناپترۆڤنە**

**پلاتۆنۆڤ:-** من ئەوم فەرامۆش کردووە، ئێستا دەیخەوێنم و دەگەڕێمەوە لات.

**ئاناپترۆڤنە:-** زۆر دوا نەکەوی.

(پلاتۆنۆڤ دەچێتە قوتابخانەوە)

**ئاناپترۆڤنە،** تەنیایە:- بەهەرحاڵ، ئەوە جاری یەکەمی نییە ناپاکی لەگەڵ ئەو کچە بەستەزمانەدا دەکات.

**دیمەنی سێزدەهەم:**

**ئاناپترۆڤنە، ڤانجرۆیچ، ئاسیپ**

ئاسیپ خۆی حەشارداوە، ڤانجرۆیچی مەستی گرتووە، دەردەکەوێ.

**ڤانجرۆیچ:-** ئاناپترۆڤنە!...

**ئاناپترۆڤنە،** بەترسەوە:- کێیە لێرە؟ تۆ کێیت؟

ڤانجرۆیچ، لەبەرانبەر بێوەژنی بەچۆك دادەکەوێ و دەستی دەگرێ... ئاناپترۆڤنە... ئاناپترۆڤنە! (دەستی ماچ دەکات.)

**ئاناپترۆڤنە:-** چۆن ئەوە تۆیت، ئابرام، ئابرامۆڤیچ.

(هەوڵ دەدات خۆی لە دەستی ڕزگار بکات:) ئاخر تۆ شێتی!

ڤانجرۆیچ یەکەم جارە بە ناوی بچووك کراوەی بانگی دەکات.ئازیزەکەم ئانا، (دەستی ماچ باران دەکات:)

(ئاناپترۆڤنە ئەمجارە خۆی لەبەر دەستی قورتار دەکات.) سەیرکە، بەسە، بەڕێی خۆتدا برۆ، برۆ!

**دیمەنی چواردەهەم:**

**ئانا پترۆڤنە، ئاسیپ**

**ئاناپترۆڤنە:-** ئاسیپ ئێستا تۆ هاتووی چاودێریی من بکەی.

**ئاسیپ:-** ئاه، گەورەم، خانم ئەو بەزم و ڕەزمە پەیوەندی بە تۆوە نییە.

**ئاناپترۆڤنە** چەنەگەی ئاسیپ دەگرێ:- زۆر باشە کەوابێ تۆ هەموو شتێکت بیست.

(وەستان.)

**ئاسیپ:-** هەمووی.

**ئاناپترۆڤنە:-** بۆ وا ڕەنگت پەریوە، منت خۆش دەوێ وا نییە؟

**ئاسیپ:-** ئازارم مەدە! (بەئەژنۆدا دەکەوێ) من هەمیشە ملکەچی تۆ بووم، ئەگەر ویسبێت خۆم بخەمە نێو ئاگرەوە کردوومە.

**ئاناپترۆڤنە:-** ئەی بۆ چی تا (کیف) بە پێ نەڕۆیشتی؟

**ئاسیپ:-** نەمتوانی تا (کیف) بەپێ بڕۆم! تۆ قەدیسی مەزنی من بوویت.

**ئاناپترۆڤنە:-** بەسە! سبەینێ وەرە: پارەی ڕێگات دەدەمێ بە شەمەندەفەر برۆ، شەوباش، دەست لە پلاتۆنۆڤ نەدەی ها، گوێت لێیە؟



**ئاسیپ:-** لەم ساتە فەرامۆشت ناکەم.

**ئاناپترۆڤنە:** بۆ؟

**ئاسیپ:-** چونکە نەتتوانی دەرەجەی خۆت بپارێزی.

**ئاناپترۆڤنە:-** بەڕاست، دەتوێ بەم شێوەیە ڕەوانەی دێرێکم بکەیت؟ برۆنێ، (خەریکە بگری)...یالّلا یالّلا! :- گوێ بگرە ئاسیپ... هەر کە ئەو لە ماڵ هاتە دەرێ تەقەیەك بکە.

**ئاسیپ:-** لێی بدەم؟

**ئاناپترۆڤنە:-** نەخێر، ڕووی لە ئاسمان بکە!

**ئاسیپ:-** زۆر چاکە... تەقەیەك دەکەم..

**ئاناپترۆڤنە:-** ئەتۆ کوڕی چاکی...

**ئاسیپ:-** بەس ئەو نایێت، ئێستا لە پاڵ ژنەکەی نووستووە.

**ئاناپترۆڤنە:-** نیگەران مەبە... پیاو کوژ!

(دەچێتە دەرەوە)

**دیمەنی پازدەهەم:**

**پلاتۆنۆڤ، نیکۆلای تیرلیتیزکی، ئاسیپ**

ئاسیپ بە تەنیایەو چاوەڕوانە و لەسەر شانۆ دادەنیشێ، لە پڕ پلاتۆنۆڤ دەبینێ، کە تیرلیتزکی بە پێش خۆی داوەو دێنە ژوورەوە.

**پلاتۆنۆڤ:-** برۆ.. دەی برۆ دەرەوە...

**تیرلیتیزکی،** هێشتا کە خەوالّوەوە:- ئاخر بۆ. ئاخر هەر هیچ نەبێ پێم بلّێ بۆ؟

**پلاتۆنۆڤ:-** خۆت باش دەزانی بەقاڵ نەخۆشەو پێویستی بە تۆیە، زوو برۆ بیگەیێ.

**تیرلیتیزکی** باوێشك دەدات:- نەمدەتوانی هەر هیچ نەبێ تا بەیانی ئارام بگری!

**پلاتۆنۆڤ:-** تیرلیتیزکی ئەتۆیش پیاوێکی کەمی، گوێت لێیە؟

گەمژە، گەلحۆ!

**تیرلیتیزکی:-** خوای بەخشندە منی دروست کردووە. حەتمەن خۆیشی دەزانێ چی دەکات.

**پلاتۆنۆڤ:-** باشە ئەگەر بەقاڵ بمرێ؟

**تیرلیتیزکی:-** باشە، ئەگەر بمرێ دەچێتە بەهەشت، ئەگەر نەشمرێ ئەوا بەلاش لە خەوی شیرینم دەکەن. (باوێشك دەدات:) نامەوێ بچم، دەمەوێ بنووم.

**پلاتۆنۆڤ:-** دەبێ شەرمێ لە خۆت بکەی، ئەی تۆ بەکەڵکی چی دێیت؟ (پاڵێکی پێوە دەنێت.)

**تیرلیتزکی:-** هیوادارم، هیوادارم تووڕە نەبیت، هەروەها دەڵێم بچووکترین هەڤێکت لەرووی خوورەوشتەوە نییە تا گاڵتە بە نەخشەی  نێوان پزیشك و نەخۆش بکەیت..(پلاتۆنۆڤ لێرەدا جولانەوەیەکی هەڕەشە ئامێزی هەیە) سوپاس! سوپاس! ئەگەر دووبارە دەست بە وتنەوەی دەرزی خوورەوشت بکەیتەوە من دەڕۆم. ڕۆژێکی دی رای خۆت لەم رووەوە دەربڕە.

**پلاتۆنۆڤ،** بەرشەقی دەدات:- چاکی لێدە.

**تیرلیتیزکی :-** من دەڕۆم (وا پێشان دەدات کە دەڕوا)، بەلام من تێ ناگەم تۆ بۆ تا ئەو رادەیە خەمی بە قالێکتە! نازانی چ ئارەقخۆزێکە؟ ئەوەش پەیوەندی بەخۆتانەوەیە! (دوور دەکەوێتەوەو دووبارە دەوەستێتەوە.) تەنیا یەك قسەت پێ دەڵێم و دەڕۆم، ڕێزی بیروڕای پزیشك بگرەو جوانی لەگەڵێدا بجووڵێوە. تێ دەگەم...(دەگەڕێتەوە) من هیچ نیم دەنا لە جیاتی ئەوەی گوێت لێبگرم، گوللەت پێوە دەنێم، تێکەیشتی؟

**پلاتۆنۆڤ،** بە واق وڕماوی و ناڕەحەتییەوە:- نەخێر.

**تیرلیتیزکی:-** نەخێر، کچێکی بچکۆلانەیە...خۆمن دەتوانم ئێستا باشتر بۆت روون بکەمەوە، بەس چی بکەم  من  فێڵبازێکی باش نیم، ئەمەش لە قازانجی تۆیە. شەوێکی شاد.

تیرلیتیزکی دەچێتە دەرەوە، پلاتۆنۆڤ جوولە ناکاو بەدوایدا هاوار دەکات.

### دیمەنی شازدەهەم:

**پلاتۆنۆڤ**

پلاتۆنۆڤ:- هەر تەنها من نیم چارەنوسم وابێ، هەموو خەڵك وان! هەموو خەڵك وان..بڕۆم یان نەڕۆم؟ ڕۆیشتن یان نەڕۆیشتن؟ (ئاهێك هەڵدەکێشێ) ئەگەر بڕۆم ئاوازێکی بەرز دەست پێ دەکات، ئەوەش جوان نییە، خەڵکی گیروگرفتی دنیایان هەیە، کەچی کێشەی من هەر یەك ژنەو بەس، هەموو ژیانی من ژنێکە. سیزار (ڕۆبێکن) ی خۆی هەبوو، منیش تەنها ژنێك بیری ئالۆز کردووم، من چیمە، تەنها عاشقێکی مێبازم، هەوڵ دەدەم، هەوڵەکەم بێ ئەنجامە، هەوڵ دەدەم، بەلام لاوازم و زۆر لاواز!



### دیمەنی حەڤدەهەم:

**ساشا، پلاتۆنۆڤ**

ساشا، لە ڕۆخ پەنجەرەوە: میشێل، لێرەی؟

پلاتۆنۆڤ:- بەڵێ، فریشتەکەم، لێرەم.

ساشا، بەباوێشکەوە:- ئێ دەوەرە دەرەوە.

پلاتۆنۆڤ:- پێویستیم بەهەوایەکی تازە هەیە، تۆ بنوو، کیژۆکە.

ساشا:- شەوێکی شاد.

(ساشا پەنجەرەکە دادەخات.)

### دیمەنی هەژدەهەم

**کاتیا، یاکۆڤ، پلاتۆنۆڤ**

کاتیا (بە یاکۆڤ دەڵێ):- نەختێ لێرە هێواش کە (بەرەو ماڵەوە دەبێتەوە) ئاه، ئەوە تۆیت، زۆر ترسام! خانم ئەم نامەیەی بۆ ئێوە ناردووە.

پلاتۆنۆڤ:- باسی کێ دەکەی؟

کاتیا:- سۆفیا ئەگرۆڤنا، من خزمەتکاری ئەوم.

### دیمەنی نۆزدەهەم

**هەر ئەوان.**

پلاتۆنۆڤ، بە سەرسوڕماوییەوە:- سۆفیا؟ گاڵتە دەکەی؟ بۆچی نامەی بۆ من نووسیوە؟

(پلاتۆنۆڤ خێرا نامەکە لە دەستی کاتیا رادەستێنێ...)

کاتیا:- دەیەوێ بەپەلە بگەیتە لای.

پلاتۆنۆڤ:- چی، ئەم گاڵتەجاڕییە چییە. (نامەکە دەخوێنێتەوە:) (بۆ دواجار بڕیارمدا قوربانی بە هەموو شتێك بدەم و بەو شێوەی، کە تۆ دەتویست بەیەکەوە رادەکەین، من بێ تۆ ناژیم.)شەیتان بەنەعلەت بێ! (بە تووڕەییەوە بە کاتیا دەڵێ:) سەیری چی دەکەی؟

کاتیا:- ئەی ئەو چاوانەم بۆ چییە نابێ  سوودیان لێ ببینم؟

پلاتۆنۆڤ:- باشە! سەیری لایەکی دی بکە! ئەم نامەیە بۆ منە!

کاتیا:- بەڵێ.

پلاتۆنۆڤ:- درۆی دەکەی! یاڵڵا برۆ!

(کاتیا دەچێتە دەرەوە، پلاتۆنۆڤ دووبارە نامە دەخوێنێتەوە): (بۆ دواجار بڕیارمدا، قوربانی بە هەموو شتێك بدەم و بەو شێوەی، کە تۆ دەتویست بەیەکەوە رادەکەین، من بێ تۆ ناژیم.)

**دیمەنی بیستەم**

**پلاتۆنۆڤ**

پلاتۆنۆڤ، تەنیایە:- سۆفیا؟ ژیانێکی تازە، کۆمەڵێ روخساری تازە... دەڕۆم.

(دەڕوا و دەگەڕێتەوە و بە هەردوو دەستییەوە توند سەری خۆی دەگوشێ.)نە؛ ناڕۆم، ناڕۆم. (رێ دەگرێ.) یاڵڵا، هەموو شتێ دەشکێنین، دەیخەینە ژێر پێمانەوە. دەڕۆم، (دەچێتە دەرەوە).

**دیمەنی بیست و یەکەم**

**ئاسیپ. ساشا**

ئاسیپ، دووبارە دەردەکەوێتەوەو لە پەنجەرە دەدات.

ئاسیپ:- ساشا ئیڤانۆنا.

ساشا: ئاسیپ.

ساشا بە جلی خەوەوەیە و مۆمێکی بە دەستەوەیە دەرگا دەکاتەوە.

ساشا:- کێیە؟

ئاسیپ:- خێراکە بانگی میشێل ڤاسیلی ڤیچ بکە!

ساشا:- لێرە نییە، بەڵام توخوا چی رووی داوە؟

ئاسیپ: لەگەڵ بێوەژن ڕایانکردوە، نەختێ لەمەو پێش لێرە بوون، هەموو شتێکم بیست، بەنەعلەت بن! لەگەڵ بێوەژنی جەنەڕاڵ رایانکردووە.

ساشا، لەسەرخۆ : درۆی دەکەی!

ئاسیپ:- رای کردووە! ئێستا تێ گەیشتی؟ ژنەکەی خۆی بەجێ هێشتووە، ئێستا تۆ تەنها ماویتەتەوە!



(تفەنگەکەی بەدەستەوە دەگرێ) ئاناپترۆڤنە فەرمانی پێ کردووم، منیش وا بۆ دواجار مل کەچی دەبم. (تەقەیەك دەکات.) ئەگەر پلاتۆنۆڤ بدۆزمەوە، ساشا ئیڤانۆنا، تۆڵەی خۆی لێدەکەمەوە! بەڵێ، دەبێ جەرگ و هەناوی بخەمە ئەو گۆڕە! (ساشا، دەترسێ، خۆی گرمۆڵە دەکات) ئاه، رۆح سووکی بەستەزمانە، نیگەران مەبە، دەیدۆزمەوە، تۆڵەی تۆی لێ دەکەمەوە، جەرگ و هەناوی دەخەمە ئەو گۆڕە، بەو دەستانەم، بەڵێ، جەرگ و هەناوی، ناڕەحەت مەبە، ساشا ئیڤانۆنا.

## پەردەی سێیەم

### پلاتۆنۆڤە شێت

ژوورێکی قوتابخانە، دەستە راست و دەستە چەپی دەرگایە، دەلاقەیەك، دۆلاَبێکی بچووکی دەرگاکراوە، چەند کورسییەك، قەرەوێڵەیەك، شتی دی...ژوورێکی قەرەباڵغە.



**دیمەنی یەکەم:**

**پلاتۆنۆڤ، ئاسیپ.**

پلاتۆنۆڤ لەسەر قەرەوێڵە خەوتووە، سەروچاوی بە کلاَوێکی حەسیر داپۆشیوە، نارێك، نووستووە.

لەو ساتەی پەردە هەڵدەدرێتەوە. پەنجەرەیەك کراوەتەوە، ئاسیپ خۆی ئامادە دەکات. بەرەو قەرەوێڵەکە دەڕوات، کلاَوەکە لەسەر چاوی پلاتۆنۆڤ هەڵدەگرێ، دەیەوێ پلاتۆنۆڤ وەئاگا بێنێ، کە سۆفیا گەیشتۆتەجێ و وادێتە ژوورەوە.

**دیمەنی دووەم:**

**سۆفیا، پلاتۆنۆڤ.**

ئاسیپ خۆی دەگەیەنێتە ژووری تەنیشتانەوە، پاشان سۆفیا دوای ئەوەی دووجار لە دەرگا دەدا، بە پەشۆکاوییەوە دێتە ژوورێ.

سۆفیا:- پلاتۆنۆڤ، مێخائیل ڤاسیلیڤیچ! مێشا دەهەڵسە، (کلاَوەکە لەسەرچاوی پلاتۆنۆڤ هەڵدەگرێ) چۆن دەتوانی ئەو کلاَوە چڵکنە لەسەر بنێی! میشێل لەگەڵ تۆمە.

پلاتۆنۆڤ:- خەواڵووە:- ئاه!

سۆفیا:- تکات لێ دەکەم، دەهەڵسە!

پلاتۆنۆڤ:- تۆزێکی دی...

سۆفیا:- دەهەڵسە، ئەوە بەینێکە نووستووی!

پلاتۆنۆڤ:- کێ لێرەیە؟ (قیت دەبێتەوە:) ئاه، ئەوە تۆی!

سۆفیا:- تەماشای سەعات کە.

پلاتۆنۆڤ:- زۆر باشە (دووبارە دەخەوێتەوە.)

سۆفیا:- پلاتۆنۆڤ.

پلاتۆنۆڤ:- چیت دەوێ؟

(قیت دەبێتەوە)

سۆفیا:- تەماشای سەعات کە!

پلاتۆنۆڤ:- ئێ چییە؟ تۆ هەر هاوار دەکەی!

سۆفیا، دەگرییێ:- بەڵێ من هاوار دەکەم، سەیری سەعات کە.

پلاتۆنۆڤ:- سەعات حەفت و نیوی ڕێکە.

سۆفیا:- بەڵێ حەفت و نیوە، باشە ئەو بەڵێنەی دات لەبیرت چۆوە؟

پلاتۆنۆڤ:- ئەو خەیاڵانەت بۆ ڕۆژێکی دی هەڵگرە، بەڵێنی چی؟

سۆفیا:- تۆ دەبوایە سەعات شەش لە شار بوویتایە.

پلاتۆنۆڤ، دەست بەسەری خۆیەوە دەگرێ:- چیی؟

سۆفیا، لەپاڵی دەدەنیشێ:- ئەوە شەرمەزار نابی؟ لای خۆی بەڵێنت دابوو.

پلاتۆنۆڤ:- خەوم لێ نەکەوتایە، بەڵێنەکەم بەجێ دەگەیاند.

سۆفیا:-تۆ هیچ ویژدانت نییە. ئاوا سەیرم دەکەی؟ من هاتوومەتە لای تۆو تۆیش ئـاوا بـە وشکی و ساردی و سڕییەوە لەگەڵم دەدوێی.

پلاتۆنۆڤ، دووبارەی دەکاتەوە:- (ئەو هاتووە!)

(قیت دەبێتەوە و بەدرێژیی و پانیی ژوورەکە هاتوچۆ دەکات.)

سۆفیا:- ئەوە تەواوە.

پلاتۆنۆڤ:- جا بۆ تۆ چ جیاوازییەکی هەیە؟

سۆفیا:- ئەوە تەواوە.

(سۆفیا دەگری.)

پلاتۆنۆڤ:- ئای ژن!

سۆفیا:- باسی ژنان مەکە، ڕۆژی هەزارجار باسیان دەکەی!

منیش خەڵکی دی نیم ڕێت پێبدەم... ئای خوایە.

پلاتۆنۆڤ:- بەسە! یەك تۆز بیرکەرەوە، من تۆم هێناوە بۆ ئاسایش و بۆ ئاییندە، یـان بـۆ شتی دی؟ من تۆم فڕاندووە بە زۆر ئاوا تۆ من بـە دوژمنـی خـۆت دەزانـی، ئـەو پەیوەندییـە نائاساییە ئێمە بەیەکەوە پەیوەست دەکات، بەدبەختییەکەمانە، ڕووخانمانە.

سۆفیا:- ئەم پەیوەندییە پیرۆزە،یەك...

پلاتۆنۆڤ، قسەکەی پێ دەبڕێ:- کاتی وشەبازی نییە، من ژیـانی تـۆم تێکـداوە، وا نییـە؟ ئەمەش نابێت: هەڵوێستەیەك بکە، ناوناوبانگی مێردەکەت پیسە، هەر ئەو دەتکوژێ.

سۆفیا :- ئەو هەموو شتێك دەزانێ.



پلاتۆنۆڤ:- چی؟

سۆفیا:- من خۆم ئەمڕۆ دوای نیوەڕۆ هەموو شتێکم پێ وت.

پلاتۆنۆڤ:- گاڵتە دەکەی!

سۆفیا:- تۆ بۆ وا ڕەنگت هەڵبزڕکاوە. بترسە، بەڵێ بترسە، بەشەرەفم ئـەو خـۆی دەزانـێ، بترسە!

پلاتۆنۆڤ:- ناشێ! ناشێ!

سۆفیا:- هەموو شتێکم پێ وت.

پلاتۆنۆڤ:- ئەی تۆ ترست نییە؟ باسی چیت بۆ بکەم.

سۆفیا:- پێم وت کە من پێشترێ...! ئیدی لەوە زێتر نەمتوانی بەرگە بگرم.

پلاتۆنۆڤ:- ئەو چی کرد؟

سۆفیا:- وەك تۆ ئاوا بەسەر سوڕماوییەوە سەیری دەکردو!

پلاتۆنۆڤ:- دوایی چی گوت؟

سۆفیا:- هەوەڵجار وای دەزانی گاڵتە دەکەم، دوایی ڕەنگی هەڵبزرکا، لەرزی و دەستی بـە گریانێ کرد، لە بەرامبەردا بە ئەژنۆدا کەوت! ڕوخساری ئەوەندە نەفرەت ئـەنگیز بـوو، وەکـو ئێستای تۆ.

پلاتۆنۆڤ:- شێتی نەعلەتی، تۆ کوشتوتە! چۆن دەتوانی، چۆن زاتی ئـەوە دەکـەی ئەوەنـدە بەسارد و سڕییەوە بدوێنێ.باشە ناوی منیشت هێنا؟

سۆفیا:- بەڵێ بۆ دەتویست چی بکەم؟

پلاتۆنۆڤ:- ئەو چی گوت؟

سۆفیا:- دەتویست تا بمێنم ئەم نهێنییانە ئاشکرا نەکەم؟ دەبوایە قسان بکەم، من ژنێکـی سەرڕاستم!

پلاتۆنۆڤ:- دەزانی چیت کردووە؟ بۆ هەتا هەتایە هاوسەرەکەی خۆت لە دەست خۆتدا.

سۆفیا:- ئەی دەبوایە چیم بکردایە؟ پلاتۆنۆڤ، تۆیش کابرایەکی گەلحۆی، چۆن بەم شـێوەیە لەگەڵمدا دەدوێی؟

پلاتۆنۆڤ:- تازە هەر وا دەبێ! ئەی ئەو ڕۆژەی لێك جیا دەبیتەوە چی دەکەی؟ هەوەڵجار تۆ دەڕۆیت! (وەستان) بەهەر حاڵ : دڵت چی دەخوازێ وا بکە، ئەوەی کە دەیڵێیت و دەیکەی من هەقم بە سەرەوە نییە.

سۆفیا:- ئێمە بەیانی دەڕۆین، بۆ دایکم نووسیوە، کە دەچینە لای ئەو.

پلاتۆنۆڤ:- میشێل! سبەینێ ژیانێکی تازە پێ دەکەین، باوەڕکە، ئازیزم، تۆ دووبارە لە دایك دەبیتەوە. کارێکی چاکت بۆ دەسازێنم. نانێك دەخۆین، کە بە ئارەقەی ناوچاوانی خۆمان بە دەستمان هێنابێ. (سەر دەخاتە سەر سنگی) من خۆیشم کار دەکەم، میشا.

پلاتۆنۆڤ:- لە کوێی؟

سۆفیا:- دەیبینی! پێت نیشان دەدەم، من ژنێکم هەر خۆم دەزانم چیم پێ دەکرێ، میخائیل من ڕێگات پێشان دەدەم بۆ ئەوەی تا لە ژیاندا مابیت هەر سوپاسم بکەیت، سەعات دە وەرە (ڤیلا) و کەلوپەلەکانیشت بێنە، ئاگادارم بکەرەوە.

**دیمەنی چوارەم:**

**مارکۆڤ، پلاتۆنۆڤ**

مارکۆڤ:- بۆم هەیە داوات لێ بکەم، کە ئیمزای بکەیت؟

پلاتۆنۆڤ:-لەسەر مێزەکە دادەنیشێ و لە مارکۆڤ رادەمێنێ:- برالە دەزانی مێشکی مرواریيەکی مردوویشت نییە؟

مارکۆڤ:- من بەندەی خوام، جەنابی پلاتۆنۆڤ ئەگەر دەتەوێ بزانی من گاورم، زیاتر لە بیست و پێنج ساڵە خزمەتی خوداوەندە قەیسەر دەکەم، من بە ئینجیلی پیرۆز سوێندم خواردووە.

پلاتۆنۆڤ:- یانی لە زەمانی قەیسەر نیکۆلا تۆ خزمەتت کردووە؟

مارکۆڤ:- بەڵێ، لە بەشی تۆپخانەدا گەورە بووم.

پلاتۆنۆڤ:- تۆپەکان باش بوون؟

مارکۆڤ:- ئاسایی بوون، تۆپەلوولە بڵندەکان بوون.

پلاتۆنۆڤ:- دەتوانم سوود لە قەڵەمەکەت ببینم؟

مارکۆڤ:- ئەڵبەتە، (کاغەزەکەی پێ نیشان دەدات.) لێرە:



(گەیشتنی خوازنامەکە لە رێکەوتی...) جەنابی پلاتۆنۆڤ دەتوانی پارەی پێکێ عەرەقم بۆ ببژێری ؟ جەنابی پلاتۆنۆڤ شتێکمان هەر دەکەوێ، ئەوە هەر نەریتە، تا گەیشتومەتە ئێرە ڕێگایەکی زۆرم بڕیوە.

پلاتۆنۆڤ:- پێکێ عەرەق؟ لە توانامدا نییە! دەچم سەماوەرەکە دادەگیرسێنم.

(لە سندوقەکەدا بە دوای زەرفی تۆچادا دەگەڕێ.)

مارکۆڤ:- جەنابی پلاتۆنۆڤ، ئەگەر زەحمەت نییە، وا ساناترە دەرمانچاکە لەگەڵ خۆم ببەم.

پلاتۆنۆڤ:- بە سەماوەرەوە؟

مارکۆڤ:- نەخێر، دەرمانچاکە دەخەمە گیرفانمەوە. (گیرفانێکی شاراوەی دەکاتەوە) سەیرکە! جێگای دەبێتەوە.(زەرفە تۆچاکە هەڵدەگرێ و دەرمانچاکە لە گیرفانی دەکات.)

پلاتۆنۆڤ:- قوتوویەکی نیمچە خاڵی لە دەرمانچاکەی لێ وەردەگرێ:- جا دڵنیاییت لەوەی ئەوەندە بەشت دەکات؟

مارکۆڤ:- بەڕاستی زۆر سوپاست دەکەم.

پلاتۆنۆڤ:- پیرە سەرباز! پیرە تالانکەر!

مارکۆڤ:- تەنیا خوا بێ گوناهە گەورەم. هیوای سەرکەوتنت بۆ دەخوازم.

پلاتۆنۆڤ:- دەقیقەیێ هێواش کە...(دادەنیشێ و چەند خەتێك دەنووسێ.) تۆ نازانی ماریا گرگۆڤا لە کوێ دەژی؟

مارکۆڤ:- بەڵێ دەزانم، دوازدە کیلۆمەتر لەولای رووبار دەژی.

پلاتۆنۆڤ:- زۆر چاکە، لە زیپلکۆڤ، هەر ئێستا ئەم نامەیەی بۆ بەرەو ئەو سێ سکەی زیوت دەداتێ، نامەکەی بدەرێ وە چاوەڕوانی وەڵام مەکە. بەڵام دەبێ تا سبەینێ بگاتە دەستی.

مارکۆڤ:- تێدەگەم جەنابی پلاتۆنۆڤ، خوا ئاگادارت بێ.

پلاتۆنۆڤ:- لەگەڵ تۆیش ! خوا حافیزت بێ هاوڕێ!

(مارکۆڤ دەچێتە دەرەوە)

**دیمەنی پێنجەم:**

**پلاتۆنۆڤ تەنیایە.**

پلاتۆنۆڤ:- زۆر باشە، گرکوڤە ئێمە وا بێ ئەدەب دەرچووین، هەوەڵجارمە من لە تەمەنمدا ژنێك من تـەمێ بكـات.(خـۆی دەخاتـە سـەر قەرەوێڵەكـەوە) ئـەی ساشـا! كـچە بـچكۆلانە بەستەزمانەكە... كە لە هقیقەتەكە تێگەیشت، هەڵسا بەچكەكەی هەڵگرت و رۆیشت.

**دیمەنی شەشەم:**

**ئانا پترۆڤنە، پلاتۆنۆڤ.**

ئاناپترۆڤنە دەگاتە جێ و بۆ ژووری مل دەنێ.

ئاناپترۆڤنە:- كێ لێرەیە؟

پلاتۆنۆڤ. لە پەنجەرەوە سەیر دەكا:- ئاناپترۆڤنە!

ئاناپترۆڤنە، بانگ دەكات:- بێ سوودە خۆت مەشێرەوە، ئەگەر خـۆتم پـێ نیـشان نـەدەی قفڵەكە دەشكێنم و دێمە ژوورەوە.

پلاتۆنۆڤ:- جا چۆن دەتوانم قایل نەبم...(هـەوڵ دەدات لەبەرامبـەر ئاوێنەیـەكی گـچكەدا تەماشایەكی خۆی بكات.) هەر هیچ نەبێ قژم شانە بكەم.

ئاناپیرۆڤنە:- زۆر باشە وادێمە ژوورەوە. (دێتە ژوورەوە) شەوباش میشێل.

پلاتۆنۆڤ:- ئەم دۆلابە نەعلەتییە خۆ داناخرێ.

ئاناپترۆڤنە:-ئەوە تۆ كەری؟ وتم شەوباش میشێل

پلاتۆنۆڤ:- ئاه، ئەوە تۆ یت ئاناپترۆڤنە؟ تۆم نەدی بوو، بریا ئەم دەرگایە دانەخرایە.

(كلیلی دەخاتە ناو و دەچەمێتەوە كە بیهێنێتە دەرێ.)

ئاناپترۆڤنە:- وەرە ئێرە واز لەم دەرگایە بێنە.

پلاتۆنۆڤ:- چۆنی؟

ئاناپترۆڤنە:- بۆ سەیرم ناكەی ؟

پلاتۆنۆڤ:- شەرمەزارم.

ئاناپترۆڤنە:- لە چی؟

پلاتۆنۆڤ:- لە هەموو شتێك.



ئاناپترۆڤنە:- ئاه، تێدەگەم، هەر دەبێ دیسان كەسێكت فریو دابێت.

پلاتۆنۆڤ:- لەوانەیە.

ئاناپترۆڤنە:- ئانی راستە ! كێیە؟

پلاتۆنۆڤ:- هیچ نالێم.

ئاناپترۆڤنە:- زۆر باشە با دانیشین.

(لەسەر قەرەوێڵەكە دادەنیشن.) ئێ دە ئێستا پێم بڵێ، بۆچی لێمی دەشاریەوە؟ یاڵڵا بیڵـێ خۆ من گوناهە بچووكەكانی ساڵانی پێشووشیت باش ئاگادارم.

پلاتۆنۆڤ:- من ئەورۆ تاقەتی ئەو لێپرسینەوەیەم نییە.

ئانا پترۆڤنە:- زۆر باشە. (وەستان) باشە نامەكەی منت پێ گەیشت؟

پلاتۆنۆڤ:- بەڵێ.

ئاناپترۆڤنە:- ئەی بۆچی ئەو شەو نەهاتی ؟

پلاتۆنۆڤ:- نەمتوانی.

ئانا پترۆڤنە:- بۆ؟

پلاتۆنۆڤ:- بەڕاستی نەمتوانی، توخواكەی ئەگەر لەوە زیاتر پرسیارم لێبكەی.

(پلاتۆنۆڤ هەڵدەسێتێتەوە)

ئاناپترۆڤنە:- وەڵام بدەرەوە میخائیل ڤاسیلی ڤیچ ! دانیشە.

(پلاتۆنۆڤ دادەنیشێ.) بۆچی پازدە ڕۆژ لەمەو پێش نەهاتی بۆ لام ؟

پلاتۆنۆڤ:- نەخۆش بووم.

ئاناپترۆڤنە:- درۆ دەكەی.

پلاتۆنۆڤ:- باشە درۆ دەكەم.

ئاناپترۆڤنە:- درۆ دەكەی، بۆن بۆگەنی عەرەقت لێ دیت، تـۆ خـۆت نـەفرەت ئـەنگیزی و ژورەكەشت تەوێلەی بەرازانە! عەرەق دەخۆیەوە؟

پلاتۆنۆڤ:- بەڵێ.

ئاناپترۆڤنە:- نەفسی تاس و حەمامی ساڵی پارە! ڕێگات نادەم چیدی عارەق بخۆیتەوە.

پلاتۆنۆڤ:- زۆرباشە.

ئاناپترۆڤنە:- بەڵێنی شەرەفم بدەرێ، ئاه، سوودی نییە! ئەو شەرابە لە كوێ دەشاریتەوە؟

(پلاتۆنۆڤ دۆلابی شەرابەکانی پێنیشان دەدات.) شەرمەزار نابی، میشا؟ بۆچی دەسەلات بەسەر خۆت دا نییە؟ (دۆلابێکی دەکاتەوە):

چەند پیسە! بێگومان حەز دەکەی ژنەکەت بگەڕێتەوە.

پلاتۆنۆڤ:- من تەنها یەك شتێکم گەرەکە: کە لەوە زیاتر پرسیارم لێ نەکەی چیدی تێم نەڕوانی، بەتایبەتی بەم شێوەیە.

ئاناپترۆڤنە:- لەمانە کامیان شووشەی شەرابی تۆیە؟

پلاتۆنۆڤ:- هەموویان ئاناپترۆڤنە، ئەوەندە بەشی مەستکردنی لەشکرێك دەکات، ئیدی وەختی ئەوە هاتووە هاوسەرەکەت بگەڕێتەوە، ئەم شەو بۆت دەگەڕێنمەوە، وانەزانی من حەسوودم، بەتەواوی هەستم پێ کردووە و دەزانم پێویستیتان بە خۆشەویستی یەکترە.

(شووشەیەکیان تاقی دەکاتەوە): ئەمەیان باشە، پێش ئەوەی هەموویان لەدوور برێژم پێکێك پێکەوە دەنۆشین.(پلاتۆنۆڤ دووگلاس لەسەر مێزەکە هەلّدەگرێ تۆ بەسیتەزمانی بەلاّم مەرخێکی چاکت هەیە: وابزانم ئەم شەرابەیان زۆر چاکە، ڕیگام بدە پێکێك بنۆشین وە دوایی هەموویان لە دوور برێژین.

پلاتۆنۆڤ:- کەیفی تۆیە.

ئاناپترۆڤنە، شەرابەکە تێدەکا:- خێراکە : (بەئومێدی خۆشبەختی)!

پلاتۆنۆڤ:- (بەئومێدی خۆش بەختی)! تاوەکە خوا خۆشبەختان بکات.(بێدەنگی. شەرابە کە دەنۆشن).

ئاناپترۆڤنە:- هیوادارم بەزەییت بەمن دابێتەوە، بادانیشین (دادەنیشن) باشە دلّت بۆم لێنادا؟

پلاتۆنۆڤ:- چۆن؟ هەموو کاتێك.

ئاناقترۆڤنە:- ئەی کەوابێ بۆ هەموو کاتێ بۆچی هەموو کاتێ هەولّ دەدەی لە دەستم رابکەی؟

پلاتۆنۆڤ:- تکات لێدەکەم پرسیارم لێ مەکە، بۆ ئەوەی، کە شەرمەزارم، بەلاّم من خۆم بوومەتە هۆی لەناو بردنی خۆم! لەناو بردنی تەواوی خۆم ویژدانم ئازارم دەدا زەمانە خستوومیەتە گیانەلاّ.



ئاناپترۆڤنە:- نەخشەی پالّەوانی ڕۆمانم بۆ دەکێشی ؟ ئاسپیلین؟ یان ئانوییی؟ دژی هەست و سۆز؟ ئافەرین بۆ خۆت بژی وبەس! تۆ دەزانی فریشتەی ڕەحمەتیت و ناتوانی لە نێوکۆمەلّی مرۆڤدا بمێنیتەوە؟

پلاتۆنۆڤ:- هەرچی دەیلێی بیلێ، بەلاّم من دەتوانم چ بکەم.

ئاناپترۆڤنە:- پێش هەموو شتی پیاو بە! واتا: بۆ مەی نۆشین خۆت مەشێرەوە، بەین بەینە خۆت بشۆ! وەرە دەیدەنی من! دواجار: لە چارەنووسی خۆت رازی بە. (قیت دەبێتەوە.) بڕۆ بچینە مالّەکەی من.

پلاتۆنۆڤ، قیت دەبێتەوە، پاشان:- نا! نا!

ئاناپترۆڤنە:- کلاّوەکەت! وەرە! یەك دوویەك دوو.

(بە پێش پلاتۆنۆڤ دەکەوێ)! میشا،ئازیزەکەم!

پلاتۆنۆڤ:- خۆی لە دەستی ڕزگار دەکات. ئاناپترۆڤنە لەگەلّ تۆ نایێم.

ئاناپترۆڤنە:- زۆر باشە، سەفەرێك بکە، بۆ مۆسکۆ یان سنت پترزبۆرگ بێ، روخساری تازە دەبینی، بۆ خۆت دەچیتە شانۆگەری، من پارەت بە قەرز دەدەمێ و بە دۆستەکانمت دەناسێنم. ئەگەر حەز بکەی بێگومان منیش دێم..ئینجا خۆش دەبێت، دەگەڕێتەوە بۆ ئێرە، بەشادی و دلّخۆشییەوە دەگەڕێتەوە.

پلاتۆنۆڤ:- باوەڕبکە، ئەمە دواجارە یەکتر دەبینین، ئەم پلاتۆنۆڤە شێت و چەنە بازو بەرەحمە لەبیر خۆت بەرەوە، زەمین قوتیدا، رەنگە رۆژێك بێت یەکتر ببینینەوە، ئەو کاتە پێکەنینمان بە هەموو ئەو شتانە دێت، بەلاّم ئەمرۆ (هەموو شتێ لە بیر خۆت بەرەوە)!

ئاناپترۆڤنە، شەراب تێ دەکات:- وەرە پێکێکی بنۆشین!

پلاتۆنۆڤ، شەرابەکە دەنۆشێ:- پەرییە جوانەکەم، تۆم هەر لە یاد دەبێ، پێ بکەنە، تۆ ژنێکی گەشبینی. سبەینێ رادەکەم، رادەکەم، پیاوێکی دی! ژیانێکی دی!

ئاناپترۆڤنە:- پێم بلّێ بزانم چیت بەسەر هاتووە؟

پلاتۆنۆڤ:- هەر وەختێ زانیت، نەفرەتیم لێ مەکە، مالاّوایی لە تۆ دەردێکی گەورەیە، پێ دەکەنێ؟؟ نا، باوەڕکە: بە ڕاستمە.

ئاناپترۆڤنە:- پێویستیت بە پارە نییە؟

پلاتۆنۆڤ:- نەخێر، نازانم، ڕەنگە داوای وێنەت لێبکەم، بەجێم بێڵە، ئاناپترۆڤنە! خوا دەزانێ چی ڕوودەدات! دەمەوێ بگریم! بۆ وا سەیرم دەکەی؟

ئاناپترۆڤنە:- زۆر باشە، خواحافیز! (دەستی بەرەو لای پلاتۆنۆڤ درێژ دەکات.) ڕەنگە ڕۆژێ بێ یەکدی ببینینەوە.

پلاتۆنۆڤ:- قەت! (دەستی ماچ دەکات.) نابێ! هەر ئێستا ڕێگەیێ بدۆزەرەوە! (دەم و چاوی خۆی بە دەستەکانی ئاناپترۆڤنەدادەپۆشێ.)

ئاناپترۆڤنە:- کوڕە گچکەڵەی بێچارە، دەستم بەردە با پێش ڕۆیشتن پێکی دوایی بنۆشین.(شەرابەکە تێ دەکات.) دەتوانی چ تاوانێك بکەی؟ ئەم دێیە بەم گچکەییەی خۆیەوە سەیر دێتە بەر چاو، واچاکە لێی دوور بکەویتەوە برۆی. پێکێکی دیش..(لەسەر غەمان)!...

پلاتۆنۆڤ:- بەڵێ.

ئاناپترۆڤنە، شەرابەکە تێ دەکا:- نۆش، خۆشەویستم. (دەخۆنەوە) ئاه! نەفرەتت لێ بێ! من حەز لە پێك ناکەم بەم نیوەییە. (دیسان شەرابەکی تێ دەکاتەوە:) شەراب بنۆشین هەر دەمرین؟، نەنۆشین هەر دەمرین، جا کەوابێ وا چاکترە بنۆشین و بمرین. (دەخۆنەوە.) پلاتۆنۆڤ دەمەوێ شتێکت بۆ بدرکێنم، من ماوەیەکی زۆرە دەخۆمەوە، کەسیش پێی نازانێ. بەڕاستمە! وەختێك هێشتا جەنەڕاڵ خۆی مابوو دەستمان پێکرد، هەر بەردەوامیش دەبم، شووشەیەکی دی هەڵپچڕم؟ نا باسی ئەمە ناکەین. چونکە ئیشێکی نییە؟ من سوودی چیم هەیە؟ بۆ کێ ژیاوم؟ ڕاوەستە شتێکت پێ بڵێم، من ژنێکی بەدکارم؟! (بە دەنگێکی بلند پێ دەکەنێ.) ڕەنگە هەر لەبەر ئەمەیش بێت من تۆم خۆش بوێ.

(دەستی دەخاتە سەر هەئیەی) دەڵێ پێویستە من بمرم. هەموو ئەو کەسانەی هاوتای من دەبێ نەمێنن، ئەگەر بە مامۆستا بوومایە، یا سەرۆکێك یا هەر شتێکی دی! یا سیاسییەك بوومایە خۆم لەباری سیاسی دنیا هەڵدەقورتاند ! (دەخۆنەوە) ژنی بەڕەڵڵا چەند ترسناکە، ئەسپەکان، چوارپێیەکان،هەتا سەگەکانیش لەم دونیایە پلانێکیانبۆ خۆیان داناوە، من زیادەم، تۆ دەڵێ چی؟

پلاتۆنۆڤ:- هیچ، هیچیان خەم بۆ یەك ناخۆین.



ئاناپترۆڤنە:- من ئەگەر کوڕێکم دەبەە! تۆ منداڵت خۆش دەوێن؟ مرۆڤ خەریك دەکەن (قیت دەبێتەوە.) دڵەکەم، لە ڤۆنیتزۆفسکابمێنەوە! من دەمەوێ هەر بەژنایەتی خۆم بمێنمەوە! وەك دایکێك! بدوێ، دەبدوێ، لێرە دەمێنێتەوە، وا نییە؟ چونکە منت خۆش دەوێت؟ بەڕاستی منت خۆش دەوێ؟

پلاتۆنۆڤ:- کەس هەیە بتوانێ تۆی خۆش نەوێ؟

ئاناپترۆڤنە:- ئەی کەوابێ بۆچ ئەو شەو نەهاتیتە لام؟ میشێل، دە پێم بڵێ دەمێنیتەوە.

پلاتۆنۆڤ:- بیکە خاتری عەشقێکی ئاسمانی، بڕۆ یا ئەوەتا هەموو شتێ دەڵێم، ئەگەر بشیانڵێم دەبێ خۆم بکوژم، ئەگەر کاتێ بە هەقیقەتەکان بزانی ئیدی حەز ناکەی ببینی: (دەیگری و ماچی دەکات.) دەبڕۆ بۆ دواجارپێت دەڵێم، بڕۆ خۆشبەختی ئینشالڵا!

ئاناپترۆڤنە:- زۆر باشە دەستم بگرە، ئارەزووی گەورەترین خۆشبەختیت بۆ دەکەم.

(پلاتۆنۆڤ دەستی دەگری)خواحافیز!

(دەچێتە دەرەوە.)

**دیمەنی حەفتەم:**

**پلاتۆنۆڤ تەنیایە**

پلاتۆنۆڤ، لەپەنجەرەدا خۆی خوارکردۆتەوە:- ڕۆیشتووە! ژنێکی دڵگیرە! بەس چ مەکربازە!

**دیمەنی هەشتەم:**

**ئاسیپ، پلاتۆنۆڤ**

ئاسیپ:- چۆنی، میخائیل ڤاسیلیڤیچ؟

پلاتۆنۆڤ:- باشم، دەبێ شانازی بە بیستنی چییەوە بکەم؟... قسەکانت بکەو زوو بچۆوە دەرەوە.

ئاسیپ:- سوپاس گەورەم، بەڵام با جارێ تۆزێ دانیشم.

پلاتۆنۆڤ:- تکات لێ دەکەم. (وەستان) خۆ نەخۆش نیت ؟ بۆو! ڕەنگت هەڵبزرکاوە! (وەستان)...بۆ هاتوویت؟

ئاسیپ:- هاتوم ماڵاواییت لێ ببکەم.

پلاتۆنۆڤ:- بۆ دەچیتە کوێ؟

ئاسیپ:- من ناچمە هیچ جێگایەك، تۆ.

پلاتۆنۆڤ:- بەڵێ ڕاستە، من دەڕۆم. ئاسیپ سەیرە؟، بۆ چ وا تووڕە دیاری.

ئاسیپ:- وادەبینی. من دەزانم، دەزانم دەڕۆیتە کوێ؟

پلاتۆنۆڤ:- باشە دەتوانی پێم بڵێی؟

ئاسیپ:- بەڕاستی حەز دەکەی بزانی؟

پلاتۆنۆڤ:- بێ گومان، بەخاو سەیرە، دەچمە کوێ؟

ئاسیپ:- بۆ ئەو دنیا.

پلاتۆنۆڤ:- سەفەرێکی درێژ دەکەم، (وەستان) لەو باوەڕەدام تۆ خۆشت بۆ ئەوێم دەنێری...

ئاسیپ:- وایە، عەرەبانەیشم هێناوە.

پلاتۆنۆڤ:- (وەستان) ئێ، چاوەڕێ دەکەی بمکوژی.

ئاسیپ:- بەڵێ.

پلاتۆنۆڤ، بەتووڕەییەوە:- ڕوو قایم ! کێ پێ وتی؟ کێ؟

ئاسیپ، پاکەتێکی پڕ لە ئەسکەناس لە گیرفنی خۆی دەردێنیٚ:- ئاه، خەڵکێکی زۆر، لە پێش هەموویانەوە، ڤانجرۆیچ، دوایی سەروەرم ڤۆی نیتزۆڤ، ئەم پارانەیان داومەتێ بەرامبەر بەوەی قوڕگی تۆ کون بکەم.

پلاتۆنۆڤ:- سێرگی لاو؟

ئاسیپ، ئەکەناسەکان دەردێنیٚ:- بەڵێ ئەو.

پلاتۆنۆڤ:- ئەم ئەسکەناسانە بۆ دەدڕێنیٚ؟ دەتەوێ گەورەیی ڕۆحی خۆتم پێ نیشان بدەی ؟

ئاسیپ:- من هیچم پێ نیشان نەداوی. ئەو ئەسکەناسانەم تەنها بۆ ئەوە دڕاند بۆ ئەوەی لەو دونیاش نەڵێ ئاسیپ بۆ پارە منی کوشت. ئەو ئەسکەناسانەم تەنها بۆ ئەوە دڕاند بۆ ئەوەی لەو دنیاش نەڵێی ئاسیپ بۆ پارە منی کوشت. (پلاتۆنۆڤ بەژوورەکەدا دێت و دەچێت. بێ دەنگی.)ها، دەترسی؟ (پێ دەکەنێ، وەستان.) هێشتا باوەڕم پێ ناکەی؟

پلاتۆنۆڤ، بەرو لای دی ڕواو تێ ڕادەمێنێ:- سەیرە !(وەستان) بۆ پێدەکەنی گێلە! (دەتەکانی دەگرێ). بەسە! پێ مەکەنە، دەگەڵ تۆمە! دەرسێکی وات دەدەم! دەتخەمە زیندانەوە. لادێیی!



(بەپەلە لە ئاسیپ دوور دەکەوێتەوە.)

ئاسیپ:- زللەیەکم لێ دەو تەنبێم بکە، چونکە لادێیم.

پلاتۆنۆڤ:- بۆ لای ئاسیپ دەگەڕێتەوە:- باشە بەکەیفی تۆ ! (زللەیەکی قایمی لە ڕوومەتی دەدات.) لەبیرتە فیلکا چۆن مرد؟

ئاسیپ:- وەك سەگ.

پلاتۆنۆڤ:-تۆ جانەوەرێکی نەفرەتی، دیچوی، ئامادەم بتکوژم، وەرە! (دووبارە زللەیەکی دی لە ئاسیپ دەدات.) بڕۆ، ون بە!

ئاسیپ:- پلاتۆنۆڤ من ڕێزێکی زۆری تۆم گرت...وەك گەورەیەك سەیرم دەکردی، ئێستا زۆر بەداخەوەم دەبێ بتکوژم، دەبێ ئەم کارە بکەم، تۆ زیانبەخشی!

پلاتۆنۆڤ:- یاڵڵا، بمکوژە، بمکوژە.

ئاسیپ:- ئەرێ بەڕاست بیوەژنی جەنەراڵ چۆن بوو خۆی هات بۆ ئێرە؟ گەمەت پێ کرد،وا نییە؟ ئەدی ژنەکەت لە کوێیە؟ لەم شێیانە کامیان خۆشەویستی ڕاستەقینەن؟ ها؟ وادەزانی تۆ زیانبەخش نیت؟ (پلاتۆنۆڤت دەخا بە عەرزا و بەرۆکی یەك دەگرن.) کە لەو دونیا ڤۆی نیتزۆڤت بینی سەلامی لێ بکە.

پلاتۆنۆڤ: - وازم لێ بێنە.

ئاسیپ، خەنجەرێك لەبەر پشتی دەردێنێ:- ڕاوەستە، هەر چۆنێك بێ باهەر من بتکوژم.

پلاتۆنۆڤ:-دەستم! دەستم! بەسە.

ئاسیپ:- دوا هەناسەتە، واچاکە دوعای خۆت بکەیت.

(دەنگی گالیسکەیەك دەبیسترێ)

پلاتۆنۆڤ:- دەستم بەردە...ژنم هەیە! بەچکەم هەیە! خەنجەر! نەء ئاسیپ، نەء!

(ساشا و هەردوو گلاگۆلییێڤ دەگەنەجێ.)

**دیمەنی نۆیەم:**

**هەر ئەوان، ساشا، پیرەگلاگۆلییێڤ، گلاگۆلییێڤی گەنج**

ساشا:- چییە ئەوە؟ (هاوار دەکات): میشێل! بە گلاگۆلییێڤەکان دەڵێ: (لێکیان بکەنەوە، خێراکەن! (ساشا هەوڵ دەدات لێکیان بکاتەوە، لە کاتێکدا هەر دوو گلاگۆلییێڤ خۆ بە پاش دەدەن بۆ ئەوەی خۆ تێکەڵ نەکەن.)

ئاسیپ، قیت دەبێتەوە:- نەختێ زوو گەیشتیتە جێ ساشا ئیڤانۆنا، شانسی هەبوو، هانێ ئەمەیش دیاریەکی جوانە بۆ تۆ. (خەنجەرەکەی خۆی دەداتێ.) ناتوانم لەبەردەم تۆ بیکوژم، من هەر دەیدۆزمەوە، ناتوانێ لە دەست ئاسیپ رابکات. (لە پەنجەرەوە خۆی هەڵدەداتە دەرەوە).

پلاتۆنۆڤ:- دەبەنگ! (وەستان) ئێوە چیتان دەوێ؟

پیرەگلاگۆلییێڤ:- میشیل پلاتۆنۆڤ، بمانبەخشە. من هاتبووم لێت بپرسم...، خۆم و کوڕەکەم لە باخ چاوەڕێ دەکەین، تا نەختێ دێنەوە سەر خۆتان، کیریل وەرە.

**دیمەنی دەیەم:**

**ساشا، پلاتۆنۆڤ.**

ساشا، لە پاڵ پلاتۆنۆڤ چۆکی داوەتەوە:- دەتوانی هەڵسیتەوە؟ هەوڵبدە

پلاتۆنۆڤ، بەناڵەوە:- رۆحێکی شەیتانی هەیە.

ساشا:- بەڕاستی تۆ بەرگەی هیچ ناگری. من پێم گوتبووی لێی دوورکەوتیەوە.

(پلاتۆنۆڤ درێژ دەکات.)

پلاتۆنۆڤ:- قەرەوێڵەکە لە کوێیە؟

ساشا:- بحەسێوە، سەرت بخەرە سەر ئەم سەرینە.

پلاتۆنۆڤ:- ئەوە تۆ گەڕایتەوە، ئازیزەکەم.

(دەستی ساشا دەخاتە سەر گۆنای خۆیەوە، وەستان)

ساشا:- کۆلیای بچووکمان نەخۆشە.

پلاتۆنۆڤ:- چییەتی؟



ساشا:- ڕەنگە سووڕێژەی بێ، ئەوە دوو شەوە هیچ نەنووستووە، هیچ ناخوات. (بەگریانەوە): ئاه، میشیل، من زۆری لێ دەترسم.

پلاتۆنۆڤ:- ئەی برایەکەت چ دەکا؟ هەر چۆنێك بێت ئەو پزیشکە!

ساشا:- چوار ڕۆژ لەمەو پیش هات سەیرێکی کرد.

پلاتۆنۆڤ:- ئێ؟

ساشا:- تەنیا باوێشکێکی داو وتی تۆ شێتی.

پلاتۆنۆڤ:- کابرایەکی بێ ئەقڵە، هیچ و پووچ! لەبیرت نەچێ، ڕۆژێك دێت لەبەر زۆریی باوێشك دەتەقێ.

ساشا:- بەڵێ، بەڵام ئێستا چ بکەین؟

پلاتۆنۆڤ:- خوا بمپارێزێ تۆ بۆچی خۆت ماندوو دەکەی؟ دیلی دەستی پلاتۆنۆڤی و ئەویش بە کەڵکی هیچ نایێت؟ (وەستان) چاوەدێری کوڕەکەمان بکەو رزگاری بکە، بەڵێنت پێ دەدەم، کە دەبێ بیکەمە پیاو، چونکە ئەویش بۆ خۆی پلاتۆنۆڤێکە ڕەنگە وەك هاوسەرێك پیاوێکی گەورە نەبم، بەڵام باوکێکی باش دەبم! بەڵێ، هەر سێکمان خۆشحاڵ دەبین، ساشا پێ دەکەنی، دەست بە گریان کردەوە. (ناوچاوانی ماچ دەکات.)خۆشم دەوێی، ئازیزە بچکۆلانەکەم، خۆشم دەوێی، تۆیش لێم دەبووری،وانییە؟

ساشا :-ئەو چەند و چۆنییە هەر بەردەوامە؟

پلاتۆنۆڤ:- چەندو چوون؟ ئەمە یانی چی!

ساشا:- بەردەوامە؟

پلاتۆنۆڤ:- خوایە! ئێمە لە یەك تێ ناگەین، ئەگەر تەواویش نەبووبێ، بەیانی کۆتایی پێ دێت.

ساشا:- کەی؟

پلاتۆنۆڤ:- ئاه، بەزوویی، چونکە چەند شتیکی ئەوتۆن من ناتوانم بەرگەیان بگرم، بەڵام ئەوە بزانە سۆفیا قەت نابێتە ناحەزی تۆ. (ساشا هەڵدەسێتەوە) چییە،(ئەویش هەڵدەسێتەوە) ساشا!

ساشا:- جا ئەگەر وابێ تۆ لەو کاتەی لەگەڵ بێوەژنی بووی، هەر هەینیش پەیوەندیت لەگەڵ سۆفیادا هەبووە؟

پلاتۆنۆڤ:- بۆ تۆ نەتدەزانی.

ساشا:- سۆفیا؟ ئەوەیان ترسناکە! پێوەندیت دەگەڵ بێوەژنی شتێکی گێلانە بوو، بەڵام پەیوەندی بەستن لەگەڵ ژنی کابرایەك، ئەمەیان گوناهێکی گەورەیە ! تۆ ویژدانت نییە!

(ساشا بەرەو دەرگا دەڕوات.)

پلاتۆنۆڤ:- ساشا تۆ رۆمان زۆر دەخوێنیتەوە، وازی لێ دێنم، بەس تۆ بمێنەرەوە.

ساشا:- نەء نامەوێ! ناکرێ ! ئاه! خوایە! (دەگرییێ. وەستان) نازانم چ بکەم.

پلاتۆنۆڤ، بۆ لای دەچیت :- ئاسانە، بمێنەوە! ساشا من هەرزەم، دەزانم، بەڵام تۆ لێم دەبووری، وا نییە؟

ساشا:- تۆ خۆت دەتوانی لە خۆت ببووری؟

پلاتۆنۆڤ:- ئازیزەکەم، ئەمە ئەفسانەیەکی فەلسەفییە.(نێو چاوانی ماچ دەکات.)

ساشا:- من لە ناو چاوم، ناتوانم دووبارە بەختیاری بنیات بنێمەوە، ئێمە بەختیار بووین، ئەی وا نییە.

پلاتۆنۆڤ:- تۆ پێشوازی ئاسیپ دەکەی، هەرچی سەگ و پشیلەیە لە خۆتیان خڕ دەکەیەوە، بەڵام یەك تۆز بەزەییت بەپیاوەکەتدا نایەتەوە.

ساشا:- تۆ بۆ تێ ناگەی؟ ناتوانم لەگەڵ تۆدا بژیم، تۆ شایستەی رێز نیت.

پلاتۆنۆڤ:- دەزانم، من گەمژەم، بەڵام چ کەسێك لە من زیاتر تۆی خۆش دەوێ؟ کێ وەك من لە تۆ تێدەگا؟ کێ لە من زیاتر لەخەیاڵی تۆدایە؟ (لەباوەشی دەگری.) تاکەکەسێك، کە بتوانێ خواردنی دەستی تۆ بخوات منم، تۆ هەمیشە خوێ زۆر لە چێشت دەکەیت، دە قسە بکەو دانی پێدابنێ.

ساشا:- لێم گەڕێ بابڕۆم من دڵم شکاوەو تۆیش گاڵتە دەکەی!

**پلاتۆنۆڤ:-** زۆر باشە بڕۆ. (بەر ی دەدات.) بڕۆ، خوا ئاگادارت بێ.

(ساشا دادەنیشێ و دەگرییێ.)

ساشا:- بۆ وات لێکردین؟ بۆ خۆمان من و کولیا، خۆشبەخت بووین و من....

پلاتۆنۆڤ:- تۆ هەر لێرەیت؟ وامزانی ڕۆیشتی....

(ساشا بە هەنسکە هەنسك دەچێتە دەرەوە.)



**دیمەنی یازدەهەم:**

**پلاتۆنۆڤ**

پلاتۆنۆڤ:- ساشا! ساشا!

(دەرگا دەکاتەوەو لە بەرامبەری پیرەگلاگۆلییێڤ دەبینێ.)

**دیمەنی دوازدەهەم:**

**پیرەگلاگۆلییێڤ، پلاتۆنۆڤ، پاشان گلاگۆلییێڤی گەنج**

پیرەگلاگۆلییێڤ، دێتە ژوورەوە، خۆی بەگۆپاڵەکەیەوە گرتووە:- سوودی نییە، هاوار مەکە، هاوسەرەکەت ڕۆیشتووە بەداخەوەشم کە نارەحەتتان دەکەم، بەڵام من زۆر نامێنمەوە، بەیەك رستە وەڵام بدەرەوە من دەڕۆم.

(ڕێگا دەگرێ)

پلاتۆنۆڤ: ئەوەی منم، (بەژوورەکەدا دەسوڕێتەوە.)

پیرەگلاگۆلییێڤ: ناتوانم زۆر چاوەڕێی وەڵامی پرسیارەکە بکەم، رەنگە کە ئەمە بلێم وابزانی گێلم، بەڵام توخوا وەڵامم بدەرەوە، چونکە مەسەلەکە بۆ من مەسەلەی مەرگ و ژینە. رای تۆیش پەسەند دەکەم، چونکە من تۆ بەدروستکار دەزانم، کەوتوومەتە بارێکی ناخۆشەوە، ئەتوو بۆ خۆت چاکی دەناسی، من بەرای خۆم ئەو پەڕی پێگەیشتووە. هەر کەسێك ئاناپترۆڤنە و ڤۆی نیتزۆڤ دەناسێ... (لە پلاتۆنۆڤ نێزیك دەبیتەوە و دەیگری) ئاه، وریا بە نەبورێیتەوە!

پلاتۆنۆڤ: لەم دونیایەدا، هەموو شتێك پیس و ناشیرین و بەدفەرە.

(پلاتۆنۆڤ دەکەوێت.)

گلاگۆلییێڤی گەنج، دێتە ژورێ: باوکە من ئەمرۆ لێرە هەر ئێشك بگرم؟ ناتوانم چیدی چاوەڕێی بکەم.

پیرەگلاگۆلییێڤ، ڕستەکەی پلاتۆنۆڤ دووپات دەکاتەوە: (لەم دونیایەدا هەموو شتێ پیس و ناشیرین و بەدفەڕە.)

گلاگۆلییێڤی گەنج، کە پلاتۆنۆڤ دەبینێ:- پلاتۆنۆڤ چی بەسەر هاتووە؟

پیرەگلاگۆلییێڤ: وەك بەرازێکی مەستی لێهاتووە! (لەگەڵ خۆیدا:) یش! (وەستان) بەیانی دەچینە پاریس.

گلاگۆلییێڤی گەنج، بە پێکەنینەوە:- لە پاریس چی دەکەی؟

(لەدەرەوە ڕەشەبا دەست پێ دەکات.)

پیرەگلاگۆلییێڤ:- دەمەوێ هەمان شت بکەم. کە ئەو حەیوانە لەوێدا دەیکرد.

گلاگۆلییێڤی گەنج: لە پاریس؟

پیرەگلاگۆلییێڤ: بەڵێ بەختی خۆمان لەوێش تاقی بکەینەوە، پێکەنین تەواو، ئیتر زەوقی هیچم نییە، نە ئیمام هەیە، نە عەشقم هەیە! دەبێ بجوولێین، هەموو شتێك تەواو بوو، جانتاکانم دەپێچمەوە.

گلاگۆلییێڤی گەنج: دەچینە پاریس ؟

پیرەگلاگۆلییێڤ: بەڵێ، پێویستە ئەگەر گوناهت کرد، وا چاکترە لە سەر زەمینی بێگانەدا بیکەی. من زۆر پیر نیم، وەرە کوڕم!

(دەچێتە دەرەوە و هەورە تریشقە دەست پێدەکات.)



# پەردەی چوارەم

## پلاتۆنۆڤە شێت

دوو ڕۆژدواتر. ساڵۆنی خوێندنەوەی ماڵی ڤۆی نیتزۆڤ. دوو دەرگا. چەند قەنەفەیێکی کۆن. مافووری ئێرانی. گوڵ. کۆمەڵێ دەمانچەو خەنجەری قەفقازی بە رووی دیوارەوەن. دوو باڵندەی وشکەوەبوو بە دیوارەوە هەڵواسراون. مێزێکی بە کاغەز داپۆشراو.

ڕۆژیەدەرەوە نییە: باران بە شووشەکان دەکەوێ و (با) پەنجەرەکان تەکان پێ دەدات. سۆفیا بە درێژایی ژوورەکە پیاسە دەکات و کاتیای خزمەتکاریشی لە پاڵییەتی.

**دیمەنی یەکەم:**

**سۆفیا، کاتیا**

کاتیا: سەیرە! دەرگاکان کراونەتەوە، چاوەڕوانی ئەو هەموو فەوزایەم نەدەکرد، یەك پەنجەرە لە جێگای خۆیدا نەماومە، هەڵبەت شتێکی خراپ روویداوە، بۆیە وا باڵندەکان وەك کەڵە شێر دەقوقێنن، ئەمەش نیشانەی شوومییە.

سۆفیا: بەڕای تۆ چی روویداوە؟

کاتیا: نازانم، خانم بیری بۆ ئەوە دەچێ یەکێ پلاتۆنۆڤی کوشتبێ، یان خۆی خۆی خنکاندبێ. (وەستان) ئەمڕۆ لە گوندیش دیار نییە، نێزیکەی چوار سەعات بەڕێوە بووم. (بەگرییەوە): خانم، لە بیری بکە، گوناهیکی گەورەیە.(وەستان)من لە هەمووتان زیاتر لە فیکری وی دام، ئەو کابرایەك بوو لایەکەوە سەرگەردانە، دەڵێی مێشکی لەکەللەدا نەماوە. بەڕاستی من خەفەتی بۆ دەخۆم،ئەمە شتێکی باش نییە. (وەستان) تۆ ئەم دڵدارییە ئەو چۆن دەبینی؟ کارەساتێکە بۆ خۆی، ئەتۆ بۆ خۆیشت لەم چەند ڕۆژەی دواییدا گۆڕای؟، نە نان دەخۆی، نە شتێ دەنۆشی، خەوت نییە، هەر کۆکە کۆکتە.

سۆفیا، (وەستان):- کاتیا بڕۆ جارێکی دیش سەرێکی قوتابخانە کە بدەوە.

کاتیا، بەدەم ڕۆیشتنەوە:- دەچم، بەڵام تۆیش واچاکە بچی بۆ خۆت ئیسراحەت بکەی.

(دەچیتە دەرەوە.)



**دیمەنی دووەم:**

**ڤۆی نیتزۆڤ، ڤۆی نیتزۆڤ**

ڤۆی نیتزۆڤ، لە دەرەوە: بەڵێ دایە، وادەچم پاڵ دەکەوم...

(دەچێتە دەرەوە و سۆفیا دەبینێ:) تۆ... لێرەیت؟ ئەوە بۆ؟

سۆفیا:- دەچم...

(دوور دەکەوێتەوە)

ڤۆی نیتزۆڤ، بەپەلە: بێ زەحمەت سۆفیا، یەك دەقە...

سۆفیا:- چییە، هیچ هەیە پێم بڵێی؟

ڤۆی نیتزۆڤ: بەلێ (وەستان) چییە دەڵێی قەت لەو ژوورەدا نەماوینەتەوە.

سۆفیا:- بەڵێ، وایە.

ڤۆی نیتزۆڤ: دەتەوێ بە جێم بێڵی؟

سۆفیا: بەڵێ.

ڤۆی نیتزۆڤ: وا بەپەلە؟

سۆفیا: هەر ئەمڕۆ.

ڤۆی نیتزۆڤ: ئەویش لەگەڵمە؟

سۆفیا: بەڵێ.

ڤۆی نیتزۆڤ: عیشقێکی دوڕاوی تر، بەختەوەرییەکی تری بەدەمەوەیە!

سۆفیا،بەپەلە: تۆ دەتویست شتێکم پێ بڵێی؟

ڤۆی نیتزۆڤ: داوای لێبووردن دەکەم بۆ ئەو شتانەی لەم چەند ڕۆژانەدا کردم، قسەی رەق و ناخۆشم لەگەڵدا کردی، ببوورە.

سۆفیا: بووراوی.

(سۆفیا دەیەوێ بچێتە دەرەوە.)

ڤۆی نیتزۆڤ، به پەرێشانییەوە بەردەوام دەبێ:- مەرۆ، هێشتا تەواوم نەکردووە،شێت دەبم، سۆفیا بەرگەی ئەو کارەساتە گەورەیە ناگرم، تەنیا خەڵکی رۆناك لە روحم دا بەدی دەکەم، ئەگەر ئەویش خامۆش بێ ئەمنیش تەواو لە ناو دەچم.

دەزانم، لە کتێبخانەی باوکم عالی جەناب،جەنەراڵ ڤۆی نیتزۆڤ، هەندێکیان بە خراپی ناوی دەبەن، دەزانم.خۆی وا پێشان دەدامرۆیەکی جەللادە، لە خەڵکی دەداو خەڵکە هەتك و سووك دەکات،بەڵام لەگەڵ ئەوەشەوە ئەگەر ئەو شتانەی بیینیایە شتی وای نەدەکرد (بەرەو رابردوومت پێ نباسێنم؟ (سۆفیا، هەوڵ دەدات بڕوات، بەڵام ئەو دەیوەستێنێ.)نەء مەرۆ گوێم لێ بگرە، هەر چۆنی بێت ئەمە دواجارە.

سۆفیا: ئێمە هەموو شتێکمان وتووە، من خۆم دەزانم چی دەکەم.

ڤۆی نیتزۆڤ: تۆ هیچ نازانی، هیچ، ئەگەر نا وا تێمڕانەدەمای، (بەئەژنۆدا دەکەوێ و دەستەکانی سۆفیا دەگری.) سۆفیا،ئەو کارەی دەیکەی زێتر بیری لێبکەرەوە...بەزەرییت بە من دابێتەوە، جێم مەهێڵە! سەیرکە، من لێت خۆش بووم، من بەختەوەرت دەکەم...لە توانامدا هەیە بەلام ئەو ناتوانێ بەختەوەرت بکات، هەر دووکتان لەناو دەچن، تۆ پلاتۆنۆڤیش هەر لەگەڵ رای مندایە، ئەو تۆی خۆش ناوێ، ئەو لەگەڵتا بوو، تەنها لەبەر وەی تۆ بۆ خۆت چوویتە لای.

سۆفیا: ئێوە هەمووتان نارەسەنن، ئەی ئەو لەکوێیە؟

ڤۆی نیتزۆڤ، قیت دەبیتەوە:- نازانم.

سۆفیا: بێزارم لێت، پلاتۆنۆڤ لە کوێیە؟

ڤۆی نیتزۆڤ: بڕێ پارەم داوەتێ و بڕیاری داوە بڕوات.

سۆفیا، بەبێتاقەتییەوە: درۆدەکەی

ڤۆی نیتزۆڤ: بەهەزار رۆبل وازی لە تۆ هێنا، نەخێر باوەڕ بە قسەکانم مەکە درۆیە، تۆ تەنها پەیوەندییەکی ساکارت لەگەڵیدا هەبوو، ئەی وا نییە؟

سۆفیا، بەساردییەوە: من ژنی ئەوم، بە تەمای چی؟

(دەیەوێ بڕواتە دەرەوە.)

ڤۆی نیتزۆڤ: دەیگری و هاوار دەکات:- تۆ هاوڕێی ئەوی و جنێویش بە من دەدەی؟



**دیمەنی سێیەم:**

**هەر ئەوان، ئاناپترۆڤنە**

ئانا پترۆڤنە دێتە ژوورەوە.

سۆفیا: لێگەڕێ با بڕۆم...

(دەچتە دەرەوە.)

**دیمەنی چوارەم:**

**ئاناپترۆڤنە، ڤۆی نیتزۆڤ**

ئاناپترۆڤنە: سێرگی ئاگات لەو بەزم و رەزمە هەیە؟

ڤۆی نیتزۆڤ: چی؟ پلاتۆنۆڤ بزر بووە، ئاگات لێیە.

ئاناپترۆڤنە: من باسی مەسەلەی مەلیك دەکەم.

ڤۆی نیتزۆڤ: مەسەلەی چی؟

ئاناپترۆڤنە: تەواو بوو.. تەواو... ئاه! دەستێکی سادە و ساکارمان هەیە، خاویە بۆ خۆی داماندانێ و هەر خۆیشی لێمان دەسێنێتەوە، گلاگۆلییێڤ! کێ بیری لەوەدەکردەوە؟

ڤۆی نیتزۆڤ: دەڵێ چی، تێ ناگەم! داوای لێبووردن دەکەم، من حالّم باش نییە.

ئاناپترۆڤنە: پیرۆڤێری گلاگۆلییێڤ بەڵێنی دابوو گرەوەکەمان بۆ ببژێرێ.

ڤۆی نیتزۆڤ: ئەوە ئیشیەتی هەر وایە.

ئاناپرۆڤنە: باشە ئەمجارە واناکا، بزر بووە، خزمەتکارەکانی دەڵێن چۆتە پاریس، ئەو بێ فەڕە حەتمەن ڕەنجاوە..ئەگەر تەنها بەشێك لە پارەکانی دەدامێ دەمتوانی بۆ ئەوەی

تری لەگەڵ داوەکارەکاندا بێم. لەم دونیایە پیاو باوەڕی نە لەسەر دۆست و نە لەسەر دوژمن نەبێ.

ڤۆی نیتزۆڤ: بەڵێ، نەدەبوو بڕواییت لەسەر دۆستان بێ.

ئانا پترۆڤنە، دەیەوێ بگاتە ئەنجامێك:- باشە جەنابی فیۆداڵ، ئێستا دەتەوێ چی بکەی؟ دەتەوێ بچیتە کوێ؟

ڤۆی نیتزۆڤ: فەرقی چییە بۆ من بچمە هەر شوێنێ.

ئاناپترۆڤنە: باوەڕکە وایە و هیچ گومانی تێدا نییە، دانیشە کوڕە بچکۆلانەکەم.. پێش هەموو شتێك باوەڕت بە توانای خۆت هەبێ.

ڤۆی نیتزۆڤ: دایە، مەڕوانە من، تۆ بیر لە خۆت بکەرەوە.. حەتمەن دەبێ ڕێگای رزگار بوون هەبێ.

ئاناپترۆڤنە: ژن بە هیچ ناچن، تەگبیری ئەوان لە پلەی دووەمە، بەر لە هەموو شتێ توانای خۆت لە دەست دەدەی، تۆ دەبێ ئومێدت هەبێ! ئەوە بۆ خۆی هەموو شتێکە، ژیانێکی سەر تاسەرو کارو هاوڕێیەتی لەگەڵ خەڵك بەسەر بەرە، بۆچی خۆت نارەحەت دەکەی ؟ دەتوانی لە قوتابخانە کارێکی چاکت دەست بکەوێ، تۆ ئاقڵی، بە تایبەتی لە زماننا‌سیدا شارەزاییەکی چاکت هەیە، تۆ باوەڕێکی پتەو و هەستێکی ورد و هاوسەرێکی هەتا بلێی باشت هەیە.

ڤۆی نیتزۆڤ: دایە...

ئاناپترۆڤنە: تۆ نەدەبوو شکایەت بکەی! بە هەموو شتێك دەگەیت.

ڤۆی نیتزۆڤ: بەڵام...

ئاناپترۆڤنە: هەر ئەوەندە لەگەڵ ژنەکاتدا قڕەو گاڵتەتان نەبێت! بۆچی لەگەڵ مندا راستگۆ نیت؟ هیچ لە نێوانتاندا روویداوە؟

ڤۆی نیتزۆڤ: چی ڕوویداوە، شتەکان هەموو پێشتر روویانداوە، منیش دوێنێ لەو راستییە تێگەیشتم.(وەستان) شانازی بەوە دەکەم، کە مێردێکی فریوخواردووی خۆمت پێ بناسێنم!

ئاناپترۆڤنە: سێرگی، ئەو گاڵتە دەبەنگانەیە چییە! دەزانی ئەمە تاوانێکی گەورەیە؟

ڤۆی نیتزۆڤ: دەزانم.



ئاناپترۆڤنە: بەخراپی باسی ژنەکەت دەکەی.

ڤۆی نیتزۆڤ: بەخوا ئاوایە.

ئاناپترۆڤنە، بە خرۆشانەوە: لێرە؟ لە ڤۆی نیتزۆڤ نیتزۆڤسکا؟

ڤۆی نیتزۆڤ: لە نیتزۆڤکای نەفرەتی.

ئاناپترۆڤنە: چ شەیتانێك لەم دێیە ئەمەی کردووە!

ڤۆی نیتزۆڤ، بەپەلە: پلاتۆنۆڤ!.

ئاناپترۆڤنە، بەبێ تواناییەوە دووبارەی دەکاتەوە:- پلاتۆنۆڤ؟

ڤۆی نیتزۆڤ: پلاتۆنۆڤ.

ئاناپترۆڤنە، دەچەمیتەوە: قسەی هیچ بکە، بەڵام نەك ئاواش! نەخێر بەسە!.

ڤۆی نیتزۆڤ: زۆر باشە پرسیار لە خۆیان، لە هەردووکیان دەڕۆن و من بەجێ دێڵن.

ئاناپترۆڤنە: یاڵڵا، سێرگی، وەك مناڵ ئەم هەموو شتانەت لە خۆتەوە دروست کردووە.

ڤۆی نیتزۆڤ: باوەڕ بکە دایە، ئەمڕۆ دەڕۆن، ئەو دوو ڕۆژەی رابردوو هەر دووبارەی دەکردەوە، کە هاوڕێیەتی دەگەڵ پلاتۆنۆڤدا هەیە.

ئاناپترۆڤنە: ئێستا بیرم کەوتەوە:، ئێستا بیرم کەوتەوە، ئێستا لە هەموو شتێ تێگەیشتم، وس بە شتێ تێ گەیشتم،...وس...

(ڤانجرۆیچ دێتە ژوورەوە.)

**دیمەنی پێنجەم:**

**هەر ئەوان و ڤانجرۆیچ**

ڤانجرۆیچ: بەیانیتان باش، ئومێدەوارم هەمووتان باش بن.

ئاناپترۆڤنە، لەگەڵ خۆیدا، بە نارەحەتییەوە:- بەڵێ.... بەڵێ...

ڤانجرۆیچ: شەستەبارانە، بەڵام هەواکەی گەرمە،. (نێوچەوانی وشك دەکاتەوە)ئاه، تا سەر ئێسکم تەڕ بووە، لای خۆی چەتریشم پێ بوو.(کە سەیر دەکا، کە ئاگای لەو نییە، دووبارەی دەکاتەوە.) هیوادارم باش بن؟ (کەس وەڵام ناداتەوە) ئامادەم دەربارەی ئەو شتانەی دەیفرۆشن قسەتان لەگەڵ بکەم، ئەڵبەتە شەرمەزاریشە، بۆ ئێوەش زۆر ناخۆشە، هیوا... هیوادارم بە خراپ لێم تێ نەگەن. لە ڕاستیدا من نیم چەکەکانی ئێوەم بەڕێ خستووە. داواکارەکانی ئێوەش دەستیان تێدا هەیە...

ڤۆی نیتزۆڤ، بە تووڕەییەوە،زەنگەکە لێدەدا:- ئەو خزمەتکارانە لە کوێن؟

ڤانجرۆیچ: ئەم خزمەتکارانە دەبێ تەمێ بکرێن، سەد جارم پێ گووتوون، کە من نامەوێ کەس ببینم.

ئاناپترۆڤنە: چەند مانگە مووچەیان نەدراوەتێ.

ڤۆی نیتزۆڤ: ئەم گەلحۆیانە! ئەمان دەبووایە لە زەمانی باوکمەوە خزمەتیان بکردینایە.

(زەنگەکە لەسەر روویی مێزەکە فڕێ دەدات و بەدرێژایی و پانی ژوورەکەدا پیاسە دەکات).

ڤانجرۆیچ: بەپێ یاسا، لە سەرەتاوە بەناوی منەوە دەستیان بەکار کردووە،ئاگات لێیە؟ بەڵام هەر بەناوی منەوە ئێوەش دەتوانن لێرە بژین، بەلانی کەمەوە تا سەری ساڵ، بێگومان چەند گۆڕانکارییەك دێتە پێشەوە، بەڵام هەر چۆنێك بێت زەحمەت ناخەینە ئەستۆی ئێوەوە،ئەگەر زۆر نارەحەتیشن دەتوانن لە زەوی و زاری خزمەکان دا بمێننەوە. ئەوێ گەرمتریشەو ژووریشی زیاترە. (وەستان) ئەوان منیان راپاردووە، کە بە ئێوە بڵێم ئەگەر خۆتان حەزتان لێیە بەشێکی زەوی و زارەکانتان بفرۆشن، ئاناپترۆڤنە؟ ئەو کانزایانەی لە خاکەکەدا سووتاون و مێردەکەت بە جێی هێشتووە، ئەگەر پێشکەشیشی منی بکەن بە نرخیکی باش دێمەپێشەوە...



ئاناپترۆڤنە: نایانفرۆشینە کەس! چیم دەدەیتێ! کوپەیەك؟ پارەکەتان بشێرەوەو ئاگات لێی بێ.

ڤانجرۆیچ: ئەوان منیان راسپاردووە، کە یە ئێوە بلێم، ئەگەر قایل نەبن بە فرۆشتنی زەویو زارەکانتان، لەگەڵتان دەت بە جددی یات بکەن، هەروا منیش دەبێ بچمەوە بۆ لایان، چونکە قەرزەکانی ئێوەم داوەتە پێترن و بۆگرۆڤ. دانی پێدادەنێم، من لەم ڕێگەیە بێزارم، بەڵام چ دەکەی! دۆستی یەك و پارەش هی یەکێکی دی بێ، بازرگانی! بازرگانی! ترسناکە، دەزانم.

ڤۆی نیتزۆڤ: من ڕێگا بەکەس نادەم دەست بەسەر زەوی و زارەکانی دایکمدا بگرین، ئیتر هەر چییەکت نەکردووە بیکە.

ئاناپترۆڤنە: بەداخەوە، ئابرام ئابرامۆیچ،تکایە بە جێمان بێڵە.

ڤانجرۆیچ قیت دەبێتەوە: زۆر قباشە! زۆرباشە! خۆت نارەحەت مەکە، لەلایەن تۆوە دەتوانن تا سەری ساڵ لێرە بمێنمەوە، من دەگەڕێمەوە، سوپاستان دەکەم.

(دەچێتە دەرەوە.)

**دیمەنی شەشەم:**

**ئانا پترۆڤنە، ڤۆی نیتزۆڤ.**

ئاناپترۆڤنە،(بە ڤۆی نیتزۆڤ دەڵێ): ئێمە بەیانی دەڕۆین. (لەگەڵ خۆیدا): بەڵێ، ئێستا تێ گەیشتم ئەوە لەبەر ئەمەیە رایکردووە.

ڤۆی نیتزۆڤ: ئاه ! هەر چی نەیکردووە با بیکا!

**دیمەنی حەفتەم:**

**هەر ئەوان، گرگۆڤا.**

گرگۆڤا، زۆر دڵشاد و خۆشحاڵە:- ئی بەڵێ! (دەست بۆ لای ئاناپترۆڤنە درێژدەکات.) سێرگی پاڤلۆیچ چۆنی؟ داوای لێبووردن دەکەم، وابزانم لە کاتێکی ناوەختیشدا هاتووم! چی بڵێم، بەڵام لە دەقیقەیەکم زیاتر پێ ناچێت. (بە دەنگێکی تایبەتم بۆ ئاناپترۆڤنە هەیە. _دەستی ئاناپترۆڤنە دەگرێ و نامەیەکی دەداتێ.)دوێنێ بە دەستم گەیشتووە.

ئاناپترۆڤنە: بە ڕاستتە!

گرگۆڤا: گوێ بگرە، ئەو ناردوویەتی.(دەت بە خوێندنەوەی دەکات: (ئەگەر لە دانیشتنەکەی ئەو شەوەی کە ماچم کردی، لەبەر ئەوە ڕەنجا بیت و تووڕە بووبی، ئەوە ئاگام لە خۆم نەبوو، بەهەر حاڵ، تۆ لە لای من پیرۆزیت و ماچت دەکەم، ئەو شەوە وەك حەیوانێك ڕەفتارم لەگەڵدا کردی، جا خۆ لەگەڵ خەڵکیش هەروا نەبوویمە؟ لە ساڵۆنی دادگادا یەکتر نابینینەوە، بەیانی بۆ یەکجاری ئێرە بەجێ دێڵم، هەر بژیت، بەڵام تەنها ئەم لە تۆ دەوێ لێم نەبووریت، نەخێر.)

ئاناپترۆڤنە بەدوایدا بنێرە با بیدۆزینەوە.

ئاناپترۆڤنە: چ پێویست دەکات؟

گرگۆڤا: دەزانی: میشێل ڤاسیلی ڤیچ لە کارەکەی دوور دەخرێتەوە!من خۆم لەلای بەرێوەبەری قوتابخانە شکایەتم لێ کردووە، زۆر گەمژەیە! سەیری سێرگی پاڤلۆیچ مەکە.(بە ئاناپترۆڤنە دەڵێ: (جا چۆن بزانیایە نامەیەکی وای نوسیووە،ئەگەر دەمزانی، ئەوەندە خۆم پێوە ماندوو نەدەکرد.

ئاناپترۆڤنە: ئازیزم بچۆ کتێبخانە منیش دێم. دەبێ قسەیەك لەگەڵ سێرگیدا بکەم.

گرگۆڤا: کتێبخانە؟ باشە؟ بەدوایدا دەنێرین؟ دەمەوێ چارەی بینم،نامەکە لە کوێیە؟ ئاه، بەڵێ! (بە گۆرەویەکەیەوە گرێ دەدات.) ئازیزم، تکات لێ دەکەم حەز دەکەم بە دوایدا بنێرین.

ئاناپترۆڤنە، بەرەو کتێبخانەی ڕەوان دەکات:- دێم، دێم.

گرگۆڤا: زۆرباشە (ماچی دەکا.) لێم تووڕە نەبیت، نازانی چ ڕەنجێك دەدەم.

(دەچێتە دەرەوە.)



**دیمەنی هەشتەم:**

**ئاناپترۆڤنە، ڤۆی نیتزۆڤ.**

ئاناپترۆڤنە،(بەڤۆی نیتزۆڤ دەڵێ): من دەچم سۆفیا ببینم...و قسەی لەگەڵ دەکەم...پلاتۆنۆڤیش دەبینم...تۆ، دانیشە بۆ خۆتبگری، ئارامبە، من بە هەست هەموو شتێك دەکەم، تێ دەگەم مەسەلە چییە.

**دیمەنی نۆیەم:**

**پلاتۆنۆڤ، ڤۆی نیتزۆڤ.**

پلاتۆنۆڤ: ئەوە دۆستە بێچارەکەم دەگری.(لێی نیزیك دەبێتەوە.) گوێ بگرە.

(ئاناپترۆڤنە دێتە ژوورەوە.)

**دیمەنی دەیەم:**

**هەرئەوان، ئاناپترۆڤنە**

ئاناپترۆڤنە: چۆن، چما ئەوە لێرەیە؟ (لە پلاتۆنۆڤ نێزیك دەبێتەوە.) پلاتۆنۆڤ، ئەو بەزمە راستە؟

پلاتۆنۆڤ: بەڵێ.

ئاناپترۆڤنە: هەرزە!

پلاتۆنۆڤ: دەبێ بە ئەدەبتر بیت.

ئاناپترۆڤنە،دەنگی بەرز دەکاتەوە: تۆ ئەوت خۆش ناوێت.

ڤۆی نیتزۆڤ: دایە لەوبپرسە، بزانە بۆچی هاتوو؟

ئاناپترۆڤنە: گاڵتە کردن بەخەڵکی، کارێکی جوان نییە! ئەمانەش وەك ئێوە بنیادەمن ڕۆشنبیرن!

پلاتۆنۆڤ: ئاناپترۆڤنە، وا هەست دەکەم لە یەکتر تێ ناگەین،بەڵێ،ئەو کەسەی لە بەدبەختیدا ناچێتە لای برادەرەکانی و مەیخانە هەڵدەبژێرێ. هەقی خۆیەتی، من وامدەزانی تۆ ڕۆشنبیریت، بەڵام هیچت لە جووتیارەکانی دی زیاتر نییە و هاوکوفی ئەوانی، بەهەڵەدا چووبووم، لە خۆڕایی خۆم سووك کرد. (**بەڤۆی نیتزۆڤ** دەڵێ: لە بیرت نەچێ، من ئەم ماندووبوونەم بۆ تۆ بوو.

(دەچێتە دەرەوە)

**دیمەنی یازدەهەم:**

**ئاناپترۆڤنە، ڤۆی نیتزۆڤ.**

ئاناپترۆڤنە: سێرگی، مەبەستی چی بوو؟ باشە خۆ تۆ دوێنێ ئەوت بینی؟ دە قسە بکە.

ڤۆی نیتزۆڤ: جا پێویست دەکات؟

ئاناپترۆڤنە: دە قسە بکە، چی روویداوە؟

ڤۆی نیتزۆڤ: بۆ ئەوەی بەزەییت پێمدا بێتەوە.

ئاناپترۆڤنە: دەقسان بکە.

ڤۆی نیتزۆڤ: ئاسیپم نارد بیکوژێ.

ئاناپترۆڤنە: بەویشمان دەوت هەرزە؟ بڕۆ بەدوایدا، هیچ نەبێ ئینسانییەتی خۆتی پێنیشان بدە.

**دیمەنی دوازدەهەم:**

**هەر ئەوان، پلاتۆنۆڤ.**

پلاتۆنۆڤ دووبارە دەردەکەوێتەوە، دەیەوێ لەسەر قەرەوێڵەکە درێژبێت. ڤۆی نیتزۆڤ قیت دەبێتەوە.

پلاتۆنۆڤ: دەستم زۆر ژان دەکا. سەرمامەو لەرزم لێیە، حالّم باش نییە.

ڤۆی نیتزۆڤ، بۆ لای پلاتۆنۆڤ دەڕوات:- میشیل ڤاسیلی ڤیچ...ئێمە دەبێ هەردووکمان داوای لێبووردن لەیەکدی بکەین، ئەمن،...دڵنیام کە تۆ لە هەستی من تێ دەگەی.(وەستان) من لێت خۆش دەبم. بەشەرەفم ئەگەر بمتوانیایە هەموو شتێ لەبیر بەرمەوە، خۆش بەخت دەبووم وەرە با هەوڵ بدەین ژیانێکی ئارام هەڵبژێرین.

پلاتۆنۆڤ: بەڵێ!...(وەستان) من لەناو چووم ! سۆفیا بەزەیت پێمدا بێتەوە، ئێوە هەموتان لایەك و من بەتاقی تەنێمە. من جگە لە ئارامی هیچی دیم گەرەك نییە.(ئیشارەت بۆ سۆفیا دەکا کە دوورکەوێتەوە.)



سۆفیا: هەرزەی پیس.

(دەگریێ)

پلاتۆنۆڤ: دەزانم، سەد جار ئەمەم بیستووە،(وەستان) فرمێسك بێهوودەترین سەرچاوەی عەشقە، دەبووایە هەر وا بیت، سروشت یاسای خۆی هەیە وەژیانی ئێمەش لۆچیکی خۆی.

هەموو ئەمانە لەسەر لۆچێکی ژیانی خۆمان بنیات نراون وە دێنە ڕێمان.(بەهاوارەوە:) مەگەر نابینی من نەخۆشم؟

سۆفیا، دەستەکانی لێکدەدات: پلاتۆنۆڤ ڕزگارم کە یان با بۆ خۆم بمرم، لەوە زیاتر بەرگەی ئەم دۆزەخە ناگرم.

ڤۆی نیتزۆڤ، لە سۆفیا نزیك دەبێتەوە: سۆفیا!

سۆفیا، بەرەو لای ئاناپترۆڤنە دەگەڕێتەوە:- دەزانم هەموو ئەمانە گوناهی کێن، ئەمیش لەسەرتان بەگران دەکەوێ.

ئاناپترۆڤنە: بێهودە هەوڵ دەدەیت.

سۆفیا، بەتوڕەییەوە شانۆ بەجی دێڵێ.

ڤۆی نیتزۆڤ لە پلاتۆنۆڤ دوور دەکەوێتەوە.

پلاتۆنۆڤ، لەسەر قەرەوێڵەکە درێژ دەبێت : بەتانییەك...بارانە، من لێرە دەنووم.

ئاناپترۆڤنە: لەگەڵ خزمەتکارێکدا دەتنێرم، واش دەکەم کە پێشوازیت بکەن، بەڵام وا چاکە گەڕێیتەوە.

پلاتۆنۆڤ: ئەگەر کەسی مانەوەی منی پێخۆش نییە، چاکترە سالۆنەکە بەجێ بێڵێ.

**دیمەنی سێزدەهەم:**

**هەر ئەوان، سۆفیا.**

سۆفیادێتە ژوورەوە: ئاسیپ خۆی خنکاندووە، لاشەکایان لە نێزیك چالێك دۆزیوەتەوە.

پلاتۆنۆڤ، زۆر خۆشحالّ بەرچاو دەکەوێت:- ئێ، ئیتر!

سۆفیا، دەیبینێ: چ دەکەی لێرە؟

پلاتۆنۆڤ: هەموو شتێ تەواو، سۆفیا.

سۆفیا: مەبەستت چییە؟

پلاتۆنۆڤ: دوایی قسەی لی دەکەین.

سەدای گفتوگۆیەکی توندوتیژ لە دالانەکەدا بەرگوێ دەکەوێت.

**دیمەنی چواردەهەم:**

**هەر ئەوان، نیکۆلای تیرلیتیزکی، یاکۆڤ.**

تیرلیتیزکی، لە دەرەوە بە یاکۆڤ دەڵێ: دواجارن هاتنە ناوەوەی من ئاشکرا دەکەیت؟

یاکۆڤ: جەناب، فەرمامانیان بەسەردا کردووم.

تیرلیتیزکی: برۆ ئاغات ماچ بکە، ئەویش وەك تۆ رەشەولاخە. (خۆی هەلدەداتە سەر قەرەوێلەکە) بەرگەی ئەوە ناگرم! (بەبینینی پلاتۆنۆڤ لە جێیەکەی رادەپەڕی) ئاه، نووسەری بەڕێز! داستانەکەتان گەیشتۆتە ئەو پەڕییەکەی ؟ (وەستان) باشە، بۆ خۆتان لێرە مانووبوونەکەتان لە بیر دەچێتەوە، ئێستاش خەریکە فەلسەفە هێنانەوەی، وانییە؟ خەریکی قسەکردنی؟

پلاتۆنۆڤ: نیکۆلا وەك ئینسان قسە بکە، چیت دەوێ؟

تیرلیتیزکی: پلاتۆنۆڤن باوەڕکە تۆ ئاژەڵێکی سەیری (دادەنیشێ و دەم و چاوی بەدەستکەکانی خۆی دادەپۆشێ. چ کارەساتێکە! کەچی پێشبینینی چی لێدەکرا؟

پلاتۆنۆڤ: چی بووە؟

تیرلتیزکی: ئاگات لێ نییە؟ ئەویش ئاگات لێ نییە ! ئاه، ئەڵبەتە.

**دیمەنی پازدەهەم:**

**هەر ئەوان، ئیڤان تیرلیتیزکی، پاشان سۆفیا دێت.**

ئیڤان تیرلیتیزکی کە جلی ماڵەوەی پۆشیوە دێتە ژوورێ.

نیکۆلای تیرلیتیزکی: تەنها تۆمان پێ دەویست!

ئیڤان تیرلیتیزکی: ساشاکەم، ئاه، ساشا بچکۆلانەکەم.(بەرەو لای پلاتۆنۆڤ دەڕوات.) ئاه ! مێشای ئەزیز، میشێلی خۆشەویست، بیکە بۆ خاتری خوا و پەری و فریشتەکانی ئەگەر بۆ لای ئەو نەگەڕێیتەوە! تۆ پیاوێکی بە هۆش و عاقڵ و شەریف و راستگۆ و



بەخشندەی، دووبارە بگەرێوە بۆ لای! پەلەکە، پیێ بلێ خۆشم دەوێی ! ئاواتە خوازم ئەو خاتونە رۆمانسییەی رزگار بکەی.(بە ئەژنۆدا دەکەوێت:) سەیر کە، من بە چۆکداهاتووم ! ئەگەر ئەو بمرێت، من هەتا هەتایەلە نێو دەچم، میشا،وەرە پێ بلێ خۆشم دەوێی وە بۆ یەکجارەکی دەبێتە هاوسەرت.هەندێ جار بۆ رزگار کردنی یەکێ درۆیش بکەی قەیدی ناکا ! خوا بەخۆی دیزانێ کەتۆ پیاوێکی چاکی بەلام تەنها لەپێناوی رزگارکرنی ئەو بیلێ قەیدی ناکا. بەناوی مەسیحەوە ئەم بەخشیشە بکە، من پیرەمێردێکی بێ دەسەلاتم. پەیوەندی بەوە نییە ؟ وەختی ئەوە نەبوو !

ئاناپترۆڤنە، بە تیرلیتیزکی دەلێ : نیکۆلای ئیڤانۆچ...

پلاتۆنۆڤ: ساشا؟

تیرلیتیزکی: کاسەیەکی پڕ فسفۆری جۆشاندووەوەو...

ئاناپترۆڤنە: چی ؟

تیرلیتیزکی، بەهاوارەوە: بەفسفۆرخۆی ژەهراوی کردووە.(دەچەمێتەوە کاغەزێك بەژێر لووتی پلاتۆنۆڤەوە دەگرێت. بە هاوارەوە.) بگرە...بیخوێنەوە...بیخوێنەوە...جەنابی فەیلەسووف؟

پلاتۆنۆڤ: (خۆکوشتن گوناهێکی گەورەیە،دەزانم. بەلام ئەزیزم، من لەیادکە، ئەم کارەم کرد چونکە هیچ چارێکی ترم نەبوو، کولیای بچکۆلەمانت خۆش بوێ وەك چۆن من خۆشم دەویست، چاودێری براکەم بکە، باوکم رزگار نەکەی، هەروەك کتێبی پیرۆز دەستوری داوە ئاوا بژی و خوابتپارێزێ، من تاوانبارم، لێم ببوورە، کلیلی دۆلابە دارەکە لە گیرفانی جلەکانمە)...ئازیزەکەم.

(پلاتۆنۆڤ دەگری.)

تیرلیتیزکی: تازە، دەگرییێ؟ تەمێ کردنێکی گەورەی وابوو، کە شایستەی تۆ بوو، کلاوەکەت داگرەو برۆین. پلاتۆنۆڤ بە خۆرایی ژنێکت لە ناوبرد، ئەو خەلکەی دەوروبەرەت بەوە خۆشیان دەوێی، ئەمان وادەزانن کە پیاوێکی لایقی و نیگایەکانت خەماوین.زۆر باشە، با بچین کارەساتی ئەم بنیادەمە عەنتیکەیە ببینین.

پلاتۆنۆڤ: تیرلتیزکی، بەسە.

تیرلیتیزکی: شانسێکی زۆر گەورەم هەبوو،ئەمڕۆ بەیانییەکەت زوو هاتمە دەرەوەو مەگەر نا ئەو مردبوو (لاسایی پلاتۆنۆڤ دەکاتەوە.)

تێدەگەی، بابڕۆین، ڕێگەیێ بدۆزەرەوە.من ساشا بە دە کەسی عاجباتی وەك تۆ ناگۆڕمەوە.

پلاتۆنۆڤ: دەتەوێ بڵێی نەمردوە؟

تیرلیتیزکی: حەز دەکەی مرد بێ؟

(پلاتۆنۆڤ پی دەکەنێ و تیرلتیزکی لە باوەش دەگرێت.)

ئاناپترۆڤنە: تی ناگەم، بەروونی بدوێ، تیرلیتیزکی بۆچی ئێمە قەشمەر جارێ تۆین، من ئەمەم بەدڵ نییە، ئەم نامەیە چی دەگەیەنێ؟

تیرلیتیزکی: ئەگەر من نەگەیشتمابایە مردبوو، ئێستاش جێی مەترسییە، پێوسیتی بە چاوەدێرییەکی زۆر هەیە. (بە پلاتۆنۆڤ دەڵێ:) تکا دەکەم، لێم نێزیك مەبەوە!

نیکۆلای تیرلیتیزکی: باوکە!

ئیڤان تیرلییتزکی : گاڵتەم پێ مەکە، من پیرەمێردێکی شێتم، بەڵانەکێنی پیاوێکی باشیشم، تەمەنم هەشتا ساڵ زیاتر دەبێ.

**پلاتۆنۆڤ، بەبزەوە:** زۆر باشە کۆلۆنێل، هەڵسەوە! با بچین چارەیەکی کچەکەت بکەین و شەرابێ بنۆشین.

ئیڤان تیرلییتزکی: بابڕۆین، دۆستی نەجیبم! ئەتۆ تەنها دوو قسان بکەیت، ژیانی ساشا رزگار دەکەیت، هیچ پزیشکێك چاری ئەوی پێ ناکرێ، دەبێ چارەیەکی ڕۆحی زامداری بکەیت.

پلاتۆنۆڤ،دووبارە لەسەر قەرەوێڵەکە دادەنیشێتەوە.

نیکۆلای تیرلیتزکی، لە بابی دورەوە دەکەوێتەوە: دەڵێی چی بابە؟ جێگەی ترسە، دەبێ شەرم لە خۆت بکەیت، کە بەو جلانەوە هاتویتە ئێرە؟

ئیڤان تیرلیتزکی، بە ئاناپترۆڤنە دەڵێ:- هەمووی خوا غەزەبی لە تۆ گرتووە، ئەوکارەساتانەمان دێنە پێشێ، خانم تۆ گوناهکاری، ئەو کوڕێکی گەنج و بێ ئەزموونە، بەڵام خۆ تۆ ژنێکی دنیادیدەی.

نیکۆلای تیرلییتزکی: باوکە! برۆ دەرەوە!



ئیڤان تیرلییتزکی: بەڵێ بەڵێ.

نیکۆلا باوکی بەرەو ڕارەوەکە پاڵ پێوە دەنێت.

نیکۆلای تیرلییتزکی برۆ دەروەوە.(بە پلاتۆنۆڤ دەڵێ:) تۆ دەڵێی چی، لەگەڵم دییێت یان نا ؟

پلاتۆنۆڤ، هەوڵ دەدات هەڵسێتەوە: بەلێ با بڕۆین.

(سۆفیا دێتەوە ژوورەوە.)

**دیمەنی شازدەهەم:**

**سۆفیا، ئانا پترۆڤنە، پلاتۆنۆڤ، نیکۆلایتیرلیتزکی، ڤۆی نیتزۆڤ.**

سۆفیا،(بە پلاتۆنۆڤ دەڵێ): پلاتۆنۆڤ جارێکی تریش تکات لێ دەکەم...

ئاناپترۆڤنە: سۆفیا !

سۆفیا،(پلاتۆنۆڤ دەڵێ): بەبێ من دەڕۆی؟

پلاتۆنۆڤ: ئاه،...ئاه،...ئاه،...ه؟!

(بە هەردوو دەستی دەموچاوی خۆی دادەپۆشێ.)

سۆفیا بە ئەژنۆدا دێت: پلاتۆنۆڤ!

ئاناپترۆڤنە: سۆفیا، بەسە هەڵسەوە.(بەرزی دەکاتەوەو ناچاری دەکات لە سەر کورسی دابنیشێ.) نەدەبوو ئەو نیشانە بکەی، کەس شایستەی ئەوە نییە، نەك بە ئەژنۆدا کەوتن، نەء!

سۆفیا، بەگریاەوە: یارمەتیم بدە...داوای لێ بکە...خانەنشینی بکەن.

ئاناپترۆڤنە: بەسە ! برۆ ژوورەکەی خۆت بخەوە!

(بە تیرلییتزکی دەڵێ:) چیمان پێ دەکرێ، نیکۆلای ئیڤانۆیچ؟

(بەڤۆی نیتزۆڤ، دەڵێ،کە دەگریێ): سێرگی پیاو بە، ئەقڵت هەبێ. من تۆ زیاتر کارەساتم بەسەر هاتووەو گوێشم نەداوەتێ. سۆفیا...سۆفیا...چ ڕۆژێکە! (ئەمان سۆفیا دەبەن) سێرگی پیاو بە.

ڤۆی نیتزۆڤ: بەڵێ.

تیرلییتزکی: براله، سێرگی، خۆت نارەحەت مەکە، تۆ ئەمە جاری هەوەڵ و دوایت نییە، (ئەمان سۆفیا دەبەنە دەرەوەو پلاتۆنۆڤ بە تەنیا جێ دێڵن.)

**دیمەنی حەڤدەهەم:**

**پلاتۆنۆڤ، تەنیایە**

پلاتۆنۆڤ، سەیری دەوروبەری خۆی دەکات: (وەستان) :- ئەمە کارەساتێکە! من ئەو ژنە بەستەعەزمانانم کوشتووە بێ گوناه. دەبوایە وەکو ئیسپانییەك ئەویندارییم بکردایە، نەك وەکو گەلحۆیەکی رووسی ئازاریان بدەم! (بە هەردوو دەستی دەم و چاوی خۆی دادەپۆشێ.) شەرم، شەرم دەکەم! بەئازارم! (وەستان) دەبوایە خۆم بکوشتبایە. (دەمانچەیەك هەڵدەگرێ) هاملێت لە خەون دەترساو من لە ژیان دەترسم.(دەمانچەکە دەخاتە سەر ناوچاوانی) یا حەزرەتی مەسیح! ببەخشە. لەسر قەرەوێڵەکە دادەنیشێ. گرکۆڤا دێتە ژوورەوە.



**دیمەنی هەژدەهەم:**

**پلاتۆنۆڤ، گرکۆڤا**

پلاتۆنۆڤ: ئاو، ئاو، تیرلییتزکی لە کوێیە ؟ (ئاخیرەکەی گرکۆڤا دەبینێ. پێ دەکەنێ؟ گرکۆڤا دەڵێ:) باشە،بەیانی دەچینە دادگا؟

گرکۆڤا: بێگومان نەء! دوای ئەو نامەیەت ئیدی حسێب بکە ئێمە دوژمنایەتیمان لە نێوندا نەما.

پلاتۆنۆڤ: زۆرباشە، هەوڵمدا خۆم بکوژم.(پێ دەکەنێ.) سەرنەکەوتم.(غەریزە) رۆح دەکەی گوێم لێ بگری؟

گرکۆڤا: بەڵێ، بەڵێ، بەڵێ.

پلاتۆنۆڤ: من شەرمەزارم، منیش دەگەڵ خۆتاندا ببەن.

گرکۆڤا: بێگومان تۆیش دەبەین،بەو پەڕی خۆشحاڵییەوە.

پلاتۆنۆڤ: سوپاست دەکەم، کچە بچکۆلانە ئاقلچەکە، جگەرەیەك و نەختێ ئاوو تەختێکم هەیەو هیچی دی. بارانە؟

گرکۆڤا: بەڵێ.

پلاتۆنۆڤ: کەوابێ ئەو بارانەیشمان لێ دەدات. ناچینە دادگایش.

گرکۆڤا، هەڵدەستێتەوەو پلاتۆنۆڤ تیێ ڕادەمێنێ.

گرگۆڤا: قەیدی چییە بارانە. گالیسکەم پێیە.

پلاتۆنۆڤ:- هێواش کە، تۆ شایانی پەرەستنی:- بۆ وا سوورهەڵدەگەڕێی؟

گرکۆڤا:- نا، نا تکات لێ دەکەم.

پلاتۆنۆڤ:-ئیلاقەت ناکەم، تەنها دەمەوێ دەستە ناسکەکانت ماچ بکەم، (دەستی ماچ دەکات و پڕکێشی دەکات.)

گرکۆڤا:- ئەو تەماشا کردنە! دەستم بەردە!

پلاتۆنۆڤ:- کەوایە گۆناشت ماچ دەکەم...(گۆنای ماچ دەکات.) و هیچی دی. تەنیا گۆنای ماچ دەکەم (گۆنای ماچ دەکات) من وڕێنە دەکەم...دەزانم...من هەموو خەڵکم

خۆش دەوێ...تۆیش...نەمدەویست خراپە دەگەڵ کەسدا بکەم و لەگەڵ هەمووانیش خراپەم کرد.

(دووبارە دەستی ماچ دەکاتەوە.)

گرکۆڤا:- دەزانم، مەبەستت سۆفیایە، وانییە؟

پلاتۆنۆڤ: سۆفیا، ساشا، ساشا، میشا، ئاناپترۆڤنە، کاترینا، هەموویان. من هەمووتانم خۆش دەوێ. کە لە زانستگا بووم عادەتم بوو قسەی جوان بە رووسوورەکانی مەیدانی شانۆ بڵێم. خەڵکی دەچوونە شانۆگەری و من بە تەنیا دەمامەوە.

گرکۆڤا:- بحەسێوە، هێمن بە.

پلاتۆنۆڤ: ئەمان هەموویان منیان خۆش دەویست، هەموویان ! بەڵێ ! لەگەڵ ئەوەشەوە سووکیشم دەکردن هەر منیان خۆش دەویست،

بۆ نموونە: گرکۆڤا، زۆر پیس سووکم کرد، ئاە، بەڵێ...تۆ گرکۆڤا خۆت، بە داخەوەم.

گرکۆڤا:- چ شتێك وا ئازارت دەدات؟

پلاتۆنۆڤ:- پلاتۆنۆڤ، دنیاو پلاتۆنۆڤ...تۆ منت خۆش دەوێ وا نییە؟ خۆشت دەوێم، دەبڵێ بەڵێ.

گرکۆڤا:- بەڵێ.

(گرکۆڤا سەری دەخاتە سەر شانی پلاتۆنۆڤ. سۆفیا دێتە ژوورەوە.)



**دیمەنی نۆزدەهەم:**

**هەر ئەوان، سۆفیا**

سۆفیا، بەرو لای دەڕوا، بە دوای شتێکدا دەگەڕێ.

گرکۆڤا، پلاتۆنۆڤ دەگرێت:- وس! وس!

سۆفیا دەمانچەکە دەردەهێنێ و لە پلاتۆنۆڤی دەگرێت، بەڵام گوللەکەی سەر دەکا.

گرکۆڤا، خۆی دەخاتە نێوان پلاتۆنۆڤ و سۆفیاوە :- چ دەکەی؟

(هەڵدەکوتێتە سەر سۆفیا.) بە هانامان وەرن، خێراکەن.

سۆفیا :- بەرمدە.

پالێك بە گرگۆڤا وە دەنێن. دەمانچەکە دەخاتە سەر سنگی پلاتۆنۆڤ و دەیتەقێنێ.)

پلاتۆنۆڤ:- هێواش کە...هێواش کە...بۆ ؟...

(پلاتۆنۆڤ دەمرێ. ئاناپترۆڤنە، پیرە تیرلیتزکی، نیکۆلای تیرلییتزکی، ڤۆی نیتزۆڤ،بە پەشۆکاوییەوە دێنە سەر شانۆ.)

**پەردە بە ئارامی دادەدرێتەوە.**

## سەرچاوەکان

**بە زمانی کوردی:**


- ئەحمەد محمد ئابلاخی : سوریالی، ڕۆژی کوردستان، ژمارە (٥٥) بەغداد. ١٩٧٩.
- ئەحمەد هەردی، رازی تەنیایی، چاپی دووەم، هەولێر، ١٩٨٤.
- ئەنوەر قادر محمەمەد، هەندێ رەخنەی لای ئێمە و دەردی بە یەك چاو بۆ بابەت روانین، گۆڤاری نووسەری کورد، ژمارە ٧، خولی دووەم، تەمووزی ١٩٨١.
- ابراهیم احمد، کوێرەوەری، چ: النجاح، بەغدا، ١٩٥٩.
- ا٠ب٠هەوری، دڵداری و پەیمان پەروەری، چ٢، سلێمانی، ١٩٧١ ٠
- ئیدریس عەبدوللا مستەفا، قۆناغی پێش رۆمانسیزمی شیعری کوردی (١٨٥١- ١٩٢١) لێکۆڵینەوەیەکی رەخنەیی مێژووییە، هەولێر ٢٠٠٦.
- پیرەمێرد، لە بینای زانستیدا تەمسیل، رۆژنامەی ژیان، ژ٢،٧٦ی ئاغۆستۆسی١٩٢٧.
- پیرەمێرد، سەداییێکی ئاشنا، رۆژنامەی ژین، ژ ٨٥٥ س٢٠ پێنج شەممە ١٦ کانونی دووەمی ١٩٤٧.
- پیرەمێرد، تمثیل، سەرگوزشتەنمایی، بەغدا، ١٩٨٥ ٠
- پیرەمێرد، محمود ئاغای شیوەکەل، چ٢، چاپخانەی کاکەی فەلاح، سلێمانی، ١٩٨٥ ٠
- جەمشید حەیدەری، چەند سەرنجێکی رەخنەیی دەربارەی چیرۆکی لە خەوما جەمیل صائب، پاشکۆی عێراق، ژ١٠، کانونی یەکەمی ١٩٧٧.
- جەمیل صائب، لە خەوما، چاپکردنی د. ئیحسان فوئاد، بەغدا، ١٩٧٥.
- چیخۆف، پلاتۆنۆڤە شێت، وەرگێڕانی لە فارسییەوە، هیمدادی حوسێن، سلێمانی، ٢٠٠١.
- حەیات سەعید عەبدولکەریم، نۆڤلێت لە ئەدەبی کوردیدا ١٩٧٠ -٢٠٠٠، نامەی ماستەر، زانکۆی سەحەدین،٢٠٠٥.
- حسن تەنیا، شانۆو شانۆی کوردەواری، بەغدا، ١٩٨٥.
- حسن قزڵجی، پێکەنینی گەدا، بەغدا، ١٩٧٢.
- دەنگ گەورە، مێژووی شانۆگەری کوردەواری، رۆژنامەی هاوکاری، ژ١١٦،،١٩٧٢.





- د. دڵشاد عەلی، دیاردەی کاریگەری مەولەوی لەسەر شاعیرانی کرمانجی خواروو (پیرەمێرد، گۆران، دیلان)، گ زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠٠.
- دیوانی نالی، لێکدانەوەو لێکۆڵینەوەی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و فاتح عبدالکریم،بەغدا، ١٩٧٦.
- دیوانا مەلایێ جزیری، بەرهەڤکرن و ڤەوژارتنا تحسین ابراهیم دۆسکی، پێداچوون و لێ زڤڕینا اسماعیل طه شاهین، دهۆك،٢٠٠٠.
- ڕەوف حەسەن، کرێکار لە چیرۆکی کوردیدا، بەغدا، ١٩٨٢.
- سەباحی غالب، ئافرەت لە چیرۆکی کوردیدا، بەغدا، ١٩٧٩.
- شاکر فتاح، هاواری و خۆشەویستەکەمان، رۆژنامەی ژیان، ژ٥٢، س٢،٣ی شوباتی ١٩٢٧.
- طاهر احمد حەوێزی، مێژووی کۆیە، بەرگی دووەم، یەکەم، بەغدا، ١٩٨٤.
- علاءالدین سجادی، هەمیشە بەهار، چ المعارف، بەغدا،١٩٦٠.
- د. عزالدین مصطفی رسول، ریالیزمی سۆشیالیستی و ئەدەبیاتی کوردی، گ رۆشنبیری نوێ، ژ ١١٣، ١٩٨٧.
- د. عیزەدین مستەفا رەسوولْ، ئەدەبیاتی نوێی کوردی، هەولێر،١٩٩٠.
- عومەر مەعروف بەرزنجی، لێکۆڵینەوەو بیبلۆگرافیای چیرۆکی کوردی، بەغدا، ١٩٧٨.
- غەفور میرزا کەریم، تەقەلّلایەکی دڵسۆزانە بۆ لەناو بردنی خوێندەواریی و کۆمەڵەی زانستی لە سلێمانی، ١٩٨٥.
- د..فەرهاد پیربالْ : چیرۆکەکانی گۆڤاری هاوار،گ مامۆستای کورد، ژ ١١- ١٢، سوید، ١٩٩١.
- د٠ فەرهاد پیربالْ، کورتە پێشەکیەك بۆ سەرهەڵدانی شانۆ نامە لە ئەدەبیاتی کوردیدا،گ؛ هیوا، ژ٨، پاریس، ١٩٩٣ ٠
- د٠ فەرهاد پیربالْ،ع٠رەحیمی هەکاری، رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژ٨٢٩، س٣، یەکشەممە٦/٨/١٩٩٤ ٠
- د. فەرهاد پیربال، رێبازە ئەدەبییەکان، هەولێر، ٢٠٠٥.
- د. کامل حسن عزیز البصیر، وێژەی کوردی و رەخنەسازی، بەغدا،١٩٨٣.

- د٠كمال مەزهەر ئەحمەد، تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسی کوردیدا، چاپخانەی: کۆڕی زانیاری کورد،بەغدا، ١٩٧٨ ٠
- مەغدید حاجی، ئافرەت لە شانۆی کوردیدا، بەغدا، ١٩٨٩.
- محمد بکر تیمور، دەربارەی دراما و ڕەخنە، گ کاروان، ژ٤١، ١٩٨٦.
- مەجید عەبدولرەحمان، ڕەخنەی دەروونی، گ نووسەری نوێ، ژ٢، ئایاری ١٩٩٨.
- د.مارف خەزنەدار، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی پێنجەم، هەولێر، ٢٠٠٥.
= د.نەجم ئەڵوەنی، ئایا ڕاستە کلاسیك لە مێژووی ئەدەبی کوردی سەری هەڵنەداوە؟!، گ؛ کاروان، ژ ١٨٥، ٢٠٠٤.
- هوشەنگ حسامی، چیخۆفی شانۆنامەنووس و(باخی ئاڵوباڵۆ)، وەرگێڕانی: پێشەنگ، گ؛ پێشەنگ، ژ ٩، پاییزی ١٣٨٤.
- هیمدادی حوسێن، پەیامی کافکا، سلێمانی،٢٠٠٠.
- د.هیمدادی حوسێن، ڕۆژنامەنووسیی کوردی سەردەمی کۆماری دێموکراتی کوردستان ١٩٤٢- ١٩٤٧، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠١.
- یاسین قادر بەرزنجی، دوو شانۆگەری ساڵی ١٩٣٥، لە سلێمانی، گ کاروان، ژ٤٩، س٥، تشرینی یەکەمی ١٩٧٦ ٠

**بە زمانی عەرەبی :**

- اكمل الدين احسان : نشاة القصة فى الادب التركى، مجلة القصة ع. ٢. س٢، مصر ١٩٦٥.
- الكسى سوركوف، نيكولاى نكراسوف الشاعر الديمقراطى الثورى، ترجمة: شاكر نورى، مجلة الثقافة، العدد الثانى، السنة الثانية، شباط،١٩٧٢.
- د.بدوى طبانة، النقد الادبى عند اليونان، دار الثقافة، بيروت — لبنان، ١٩٨٦.
- بوريس بورسوف، الواقعية اليوم و ابدا، بغداد، ١٩٧٤.
- بيار دى بواديفر، معجم الادب المعاصر، ترجمة: بهيج شعبان، منشورات عويدات، بيروت — لبنان، ١٩٦٨.
- دیمین كرانت، الواقعية، ترجمة عبدالواحد لؤلؤة، بغداد ١٩٨٠.



- د. حياة شرارة و د. محمد يونس، مدخل الى الادب الروسى فى القرن التاسع عشر، الطبعة الاولى، ١٩٧٨.
- دانتى اليجييرى، الكوميديا الالهية، المطهر، ترجمة: حسن عثمان، ط ٢، دار المعارف بمصر، ١٩٦٩، ص ٢٤٧.
- د. سالم احمد الحمدانى، مذاهب الادب الغربى و مظاهرها فى الادب العربى الحديث، الموصل، ١٩٨٩.
- سامى الدروبى، علم النفس و الادب (معرفة الانسان بين بحوث علم النفس و بصيرة الاديب والفنان)، القاهرة، ١٩٧١.
- شجاع مسلم دغيم العانى، البناء الفنى في الرواية العربية في العراق، (رسالة ماجستير) جامعة بغداد ١٩٨٧، ص١٠٦.
- د. صفاء خلوصى، دراسات فى الادب المقارن و المذاهب الادبية، بغداد.
- عادل گرميانى، احمد مختار الجاف ومسالة الضمير، بغداد، ١٩٨٩.
- عبدالرحمن البدوى، نيتشه، القاهرة،؟
- د. عبدالله الدباغ، نظرة جديدة على رواية مسالة الضمير جريدة العراق، ع ٣٤٧٥، ٢٥/ ١٩٨٧/٦.
- د. عبد المنعم تليمة، مقدمة فى نظرية الادب، دار الثقافة، القاهرة، ١٩٧٦.
- د.عزالدين اسماعيل، التفسير النفسى للادب، القاهرة،؟.
- د.عزالدين مصطفى رسول، الواقعية فى الادب الكردى، صيدا، ١٩٦٦.
- د.على جواد الطاهر، الخلاصة فى مذاهب الادب الغربى، بغداد،١٩٨٣.
- د. عماد حاتم، مدخل الى الاداب الاوروبية، ليبيا، ١٩٨٥.
- ف. ل. سولنية، الرومنطقية فى الادب الفرنسى، ترجمة: احمد دمشقية، بيروت، ١٩٦٠.
- كاوه احمد ميرزا، دراسات عن الحركة المسرحية فى مدينة السليمانية، مجلة كاروان،ع ١٨.
- د. محمد غلاب،ادباء الرومانتكية الفرنسية، مكتبه نهضه مصر، ؟.
- مختارات من شعر التركى، ترجمة: فاضل جتكر، ١٩٩٥.

